

# مەحـرەمــی راز

## شەرحی غەزەلیاتی حافز

بەرگی یەکەم

# مەحــرەمــی راز

## شەرحی غەزەلیاتی حافز

ئەکرەم عەنەبی

هەولێر - ٢٠٠٨


دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● **مەحــرەمــی راز (شەرحی غەزەلیاتی حافز)**

● نووسین: ئەکرەم عەنەبی

● نەخشەسازی ناوەوە: طــە حسین

● پیتچنین: موسلیح

● بەرگ: ئاسۆ مامزادە

● ژمارەی سپاردن: (١٦٣٣)

● نرخ: ٢٥٠٠٠ دینار (سێ بەرگ)

● چاپی یەکەم : ٢٠٠٨

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی - دهۆك

**زنجیرەی کتێب (٣١٢)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێشەکی:

کەس چوزانێ ئەو منداڵە بێتوانایەی بە گریانەوە لە دایك دەبێت لە دوارۆژدا دەبێتە پیاوێکی گەورەی دونیا و لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا ئاماژەی بۆ دەکەن. ئەگەر ئەم حەقیقەتە هەر لە سەرەتاوە دیار بوایە ئەوا ژیانی هیچ یەکێ لە گەورەکانی دنیا شاراوە و لێڵ نەدەبوو، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە ئەم نەزانینە وای کردووە کە ژیانی گەورەکان تا ئاستێکی زۆر شاراوە و لێڵ بێت, بەتایبەتی سەردەم و ساڵی لەدایکبوونیان و چۆنیەتی ژیانیان و تەنانەت هەڵوێستیان لە رووداو و دیاردەکانی سەردەمەکەی خۆیان ، ئەو کەمە زانیارییەشی کە دەستدەکەوێت هەڵێنجانە لە شیعر و گوتە دوور و نزیکەکانی خۆیان و خەڵکی دیکەوە.

ئێمە هەر لەم پێشەکییەوە دەبێ, نەك هەستبکەین, بەڵکو لەوە دڵنیابین کە لەبەردەم پیاوێکی گەورەی مێژووی مرۆڤایەتیدا وەستاوین و، دەمانەوێ شرۆڤە و وەرگێڕانی شیعر و بیرەکانی پیاوێکی گەورەی مرۆڤایەتی بخوێنینەوە کە گۆتەی ئەڵمانی ئاواتەخوازبوو یەکێ لە قوتابی و شاگردەکانی ئەو بوایە، لە حزوری پیاوێکدابین کە یەکێ لە نووسەرەکانی ئەورووپا بە مرۆڤی کامڵ(سوپەرمان)ی ئەداتە قەڵەم.

(حافظ زي شيرازى) خواجە محمد حافظ کە لە یەکەم پێشەکی کۆکردنەوەی دیوانەکەی دا بە ( ذات مَلِك صفات ، مولانای اعظم ، مرحوم سعيد شهيد ، مَفخَر افاضل العلماء ، استاد نحارير الادباء ، معدن اللّطائف الرُّوحانية ، مخزن المعارف السُّبحانية، شمس الملّة والدِّين محمد حافظ) وەسفکراوە . جەنابی خواجە حافزی شیرازی لە سەدەی هەشتەمی کۆچیی مانگیدا ژیاوە و درووست لە بیستەکانی ئەو سەدەیەدا ( بە نزیکەیی) ــ ٧٢٥ ــ لەدایکبووە و لە کۆتایەکانی هەمان سەدەدا ــ لە ساڵی ٧٩٢ ــ دا وەفاتی فەرمووە و دونیای پڕ لە گێرە و کێشمەی ئەو سەردەمەی خۆی ــ هەروەك ئێستا ــ بەجێهێشتووە، وەك لە هەمان پێشەکیدا



هاتووە:" تا در تاريخ سنەء اثنى و تسعين وسبعمائة ويدعت حيات بە موكلان قضا و قدر سپرد..."{ مقدمة جامع ديوان ، بە نەقڵ لە: عيوضى..} .

هەرچەند و هەرچی سەبارەت بە خودی خواجە حافز و غەزەل و شیعرەکانی و بیر و عیرفان و ژیان و ئایین و دونیا و ...هتدی ئەو مەزنەی دونیا بگوترێ هێشتا هەر کەمە و مەحاڵە بە کورتی لە پێشەکیدا بتوانین سەبارەت بەو کەڵەمەزنەی مرۆڤایەتی بدوێین کە ئێستاش لە ئێراندا پاش قورئان ساڵانە زۆرترین دانە لە دیوانەکەی و شرۆڤە و ئەو سەرچاوانەی دوور و نزیك تایبەتن بەوەوە چاپدەکرێت . ئەو پیاوەی کە زۆرجار لە ئەنجامی سەمەرەبوونی مرۆڤەکانی ترەوە ئەو بە مرۆڤی کامڵ یا ئەسڵەن بە تایپێکی دیکەی مرۆڤ دەزانن، بەڵام جوانترین وەسفێ بۆ ئەو هەر ئەم گوتەیەی جەنابی (دکتۆر بەهادین خورەمشاهی)یە کە گوتوویەتی : حافز کامڵەن مرۆڤە نەوەك مرۆڤی کامڵ {حافظ نامە ، پێشەکی} . لەڕاستیدا حافز تەنیا مرۆڤێك بووە و وەك حەقیقەتی مرۆڤی راستەقینە ژیاوە. بەڵام ئەوە ئێمەین کە لەو حەقیقەتە لامان داوە و وا هەست دەکەین کە ئەو جۆرێکی تر بووە .حافز مرۆڤ بووە وەك هەر مرۆڤێکی تر، ئەو مرۆڤە راستییەی کە هەمیشە چاودێری خۆی دەکات لە هەر کەوتنێکدا هەستانەوەیەك دەبینێت و لە هەر شکستێکدا خۆی بۆ سەرکەوتنێك ئامادەدەکات و هەر گوناهێکی تۆبەیەکی بەدوادا دێت و هەرگیزیش ئامادەنییە وەك فریشتەکان ماڵئاوایی یەکجارەکی لە گوناه بکات .

لەڕاستیدا لەبەر ئەوەی من بە تەواوی دڵنیام لەم پێشەکییدا مافی ئەو قسەکردنە نادەم کە لەسەر حافز و بیرەکانی ئەو و ... دەیکەم ، بۆیە ئەم پێشەکییەم بۆ شیکردنەوەی رێباز و چۆنیەتی کارکردنەکەی خۆم لەسەر دیوانی خواجە حافز تەرخاندەکەم و ئاواتەخوازم بەو شرۆڤانەی ناو تێکستە ئەسڵییەکە توانیبێتم وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانی ناخی خۆم و خوێنەری کوردیی حافزم دابێتەوە.

لەم وەرگێڕان و شرۆڤەیەدا هەوڵدراوە زۆرترین زانیاری بە خوێنەر بگەیەنرێت، بۆیە کارەکە بەسەر ئەم قۆناغانەی خوارەوەدا دابەشکراوە:

١- هەڵبژاردنی راسترین و باوترین جۆری ساغکردنەوەی بەیتەکان و خۆدوورگرتن لەو بەیت و غەزەلانەی کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرێت هی حافز نەبن، لەمەشدا پشت بە نووسخە دێرین و باوەڕپێکراوەکانی حافز بەستراوە و بۆ تەنیا بەیتێك سەیری چەندین نووسخەی جیاواز کراوە، هەربۆیە خوێنەر لەم شرۆڤەیەوە بە ساغکراوەترین و باوترین نووسخەی دیوانی حافزی شیرازی ئاشنا دەبێت و لە شوێنی خۆشیدا و لە کاتی پێویستدا ئاماژە بە جیاوازییەکان و سەرچاوەکانیان کراوە و هۆکاری هەڵبژاردنەکەش خراوەتەڕوو.

٢- لە سەرەتای هەر غەزەلێکدا بەحر و تەفعیلەکانی غەزەلەکە نووسراوەتەوە کە لەڕاستیدا ئەم کارە بۆ پسپۆڕەکانی بواری ئەدەبیاتی کلاسیکی زۆر سوودمەندە و دەتوانن لەرێیەوە بەراوردی بەحر و تەفعیلەی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی لەگەڵ فارسیدا بکەن، بۆ دڵنیابوونیش من لەم کارەدا پشتم بە گەورەکانی بواری ئەو مەیدانە بەستووە و بەتەواوی ودروستی و بەوردی کارەکە ئەنجام دراوە.

٣- لەدوای نووسینەوەی ساغترین نووسینەوەی بەیتەکە شێوەی گۆکردنی بەیتەکە بە رێنووسی کوردی سەرلەنوێ نوسراوەتەوە ئەمەش بۆ هاوکاری کردنی ئەو خوێنەرانەی کە ناتوانن رێنووسی فارسی بخوێننەوە و بەمەش دەتوانن هەست بە تام و چێژی بەیتەکان بکەن.

٤- بەیتە شیعرییەکە بە کورتی بە پەخشان کراوەتە کوردی کە ئەمەش بەو مەبەستە کراوە تا بیر و بۆچونی من تێکەڵاو بە مانا رەسەنەکە نەبێت و هەر لێکۆڵەرێکی دیکەش بتوانێ لەژێر رۆشنایی ئەم وەرگێڕانەدا لێکۆڵینەوەی تر لەسەر بەیتەکان بکات.

٥- لە قۆناغی پێنجەمدا واتای کوردی ئەو وشانە نووسراوە کە لە بەیتەکەدا هاتوون و زۆرجار ئەو واتایانە لێکدراوەتەوە کە لە بەیتەکەدا مەبەستە نەوەك تەواوی واتا فەرهەنگییەکانی وشە و زاراوەکە. هەر لەم قۆناغەدا و لە کاتی پێویستدا زانیاری زیاتر لەسەر وشە و زاراوەکە دراوە بۆ نموونە زاراوەیەکی عیرفانییە یاخود وشەیەکە پەیوەندی بە قۆناغێکی مێژوویی و شتی تایبەتی سەردەمەکە و...هتدەوە هەیە.

٦- پاش شیکردنەوەی وشە و زاراوەکان ئەو باکگراوند و روونکردنەوە پێویستانە دراوە کە یارمەتی شرۆڤەی بەیتەکە دەدەن و زۆرجاریش شیکردنەوەی ئەم باکگراوندە کات و ماندوبوونی زیاتری ویستووە، بۆ نموونە لە شرۆڤەی بەیتێکدا کە (چهارده ریوایت)ی تێدایە چەند لاپەڕەیەك لەسەر ئەو چواردە ریوایەتە و جۆرەکانی نووسراوە کە بەبێ ئەو روونکردنەوە پێشوەختانە تێگەیشتنی ورد و دروست لە بەیتەکان زەحمەتە.

٧- دواجار بەیتەکە لە تێگەیشتنی منەوە شرۆڤەکراوە. هەڵبەت ئەم شرۆڤەکردنەش بەدەر نییە لەو باکگراوندە هزری و ئایینی و نیمچە عیرفانییەی منەوە، بەمەش دەکرێ هەمان بەیت چەندین لێکدانەوەی دیکەش هەڵبگرێ کە پەیوەستن بە جۆری بیرکردنەوەی ترەوە، بەڵام بە بڕوای من بۆ تێگەیشتن لە ناخ و رۆحی بەیتەکان پێویستە لە بیرکردنەوەی حافز نزیك بینەوە نەوەك باکگراوندی هزری و... هتدی خۆمانی بەسەردا بسەپێنین کە بەندە تا ئەوپەڕی ئاست ئەم هەوڵەی داوە.



لەڕاستیدا من لەگەڵ ئەم کارەدا ماندونەبووم چونکە تەواوی ئەو ساتانەی کە شەونخونیم بەم کارەوە کێشاوە سات بە سات تیایاندا گەورە بووم و ئێستا بەتەواوی هەست بە خۆم دەکەم کە من ئەو کوڕێژگەیەی جاران نیم و لە حزوری پیاوێکدا گەورەبووم، بۆیە هێندە خۆشحاڵبووم ئەوندە هەست بە ماندوویی ناکەم.

لە ژیاندا هەمیشە ئاواتەخوازبووم کە مرۆڤەکان کاری جیدی و مرۆییانە بکەن و لە روکار و نەفسی کەمی غەریزییانە دوورکەونەوە. خۆشحاڵم بەوەی کە وادەزانم بەم کارەی بەردەستت ئەو ئاواتەم بەجێهێناوە، تەنیا هیوام ئەوەیە کە تەواوی بەرگەکانی دیکەی کە هێشتا هەندێکی لای منیش تەواو نەبووە بکەوێتە بەردەستی خوێنەری کورد و سوود لەو گەوهەرە دانسقانەی خواجە حافزی شیرازی وەرگرین .

دواجار سوپاس بۆ هەمو ئەو خۆشەویستانەی کە رەنجی ئەم بەرهەمەیان لە ئەستۆگرتووە بەتایبەتی خێزانەکەم و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی.

## غەزەلی یەکەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١- الا یا ایها الساقی ادر کأساً و ناولها**

**که عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشکلها**

**ئەلا یا ئەییوهەسساقی ئەدیر کەئسەن ڤە ناڤیلها، کە ئیشق ئاسان نەمود ئەڤڤەل ڤەلی ئوفتاد موشکیلها.**

ئەی ساقی (مەیگێڕ) پێکێك بگێڕە و لەو پێکەش بدە بە من، چونکە لە سەرەتاوە عەشق بە ئاسانی هاتە پێش چاوان، بەڵام پاشان گرفت و کێشەکان روویاندا.

ساقی: مەیگێڕ، شەرابگێڕ، لە شەرحی (لاهوری)دا هاتووە: "ساقی مورشیدی کاملە یا مەعشوقی حەقە، ئەکرێ مەبەست لە خدری زیندە بێت، کە لای عارفەکان بە رابەری زانستی روحانی و عیرفانی و (علم لدنی) ناسراوە و زۆر ئاماژەی پێدەکرێت"{لاهوری، ج١، ل٥}.

أدر: کاری فەرماندانە بە واتای گێڕان، گەڕانەدن وەك مەیگێڕ. کأساً: پێکێك، کاسێك، جامێك، لای (لاهوری) پێك بە رووی یار یا فەیز و رەحمەتی ئەو لێکدراونەتەوە، لە فەرهەنگی هەندێ گرووپی عیرفانیشدا دڵە ناول: کاری فەرماندانە بە واتای پێدان یاخود دەستدرێژکردن.

نمود: دەرکەوت افتاد: کاری رابردووی (افتادن)ە، بەواتای روودان یاخود هاتنە ئارا، هەرچەندە واتای کەوتنیش دەگەیەنێ.

سەبارەت بە خاوەنی سەرەکی (صدر) نیوە دێڕی یەکەمی ئەم بەیتە رەخنەگرەکان بیروڕای دژ و جیاوازییان هەیە لەوانە؛ (خەتمی لاهوری ـ خاوەنی شەرحی عیرفانی غەزەلەکانی حافز ـ) ئەم میسراعە بە هی شاعیری گەورەی عەرەب (لبید) دەزانێت {لاهوری، شرح عرفانی غزلهای حافظ، ج١، ل ٢}.

(سودی بۆسنەیی ـ خاوەنی شەرحی تورکی غەزەلەکانی خواجە حافظ ـ) رای وایە کە ئەم دێڕە لە پارچەیەکی (یەزیدی کوڕی معاویە) وەرگیراوە بە هەندێ دەستکارییەوە، کە بەیتەکە بەم شێوەیە:

انا المسموم ماعندی بتریاق ولا راقی

ادر کأساً و ناولها الا یا ایها الساقی



سودی لە شەرحەکەی خۆیدا و بۆ پاڵپشتی ئەم رایەی دوو بەڵگەی شیعری فارسیی هێناوەتەوە کە تیایدا گلەیی لە حافز دەکەن کە بۆچی دێڕێکی سەرەتای غەزەلەکانی خۆی لە کەسێکی کافری وەك یەزید وەرگرتووە ـ چونکە ئەهلی شیعە دوژمنایەتییەکی زۆری یەزید دەکەن و بە کافری دەزانن. بۆ نموونە ئەم بەیتە بەڵگەی ئەم راستییەیە:

شاهی دینداران حسین و شاهی بی دینان یزید

هردو سلطانن اما این کجا و آن کجا

واتە: شاهی دینداران حوسەین و شاهی بێ دینان یەزید. هەردووکیان سوڵتانن، بەڵام ئەم لەکوێ و ئەو لەکوێ.

بۆ نموونە: (ئەهلی شیرازی) نووسیویەتی:

خواجه حافظ را شبی دیدم به خواب

گفتم ای در فضل و دانش بی حساب

از چه بستی برخود این شعر یزید

با وجود این همه فضل وکمال

گفت واقف نیستی زین مسئله

مال کافر هست بر مؤمن حلال

(واتە: شەوێك حافزم لە خەودا بینی و گوتم ئەی ئەو کەسەی لە داناییدا بێ سنوور و حسێبی بەم هەموو زانست و گەورەییەوە بۆچی ئەو بەیتەی یەزیدت خستە دیوانەکەتەوە، گوتی ئاگات لەم مەسەلەیە نییە کە ماڵی کافر بۆ موسوڵمان حەڵاڵە.)

هەروەها (کاتبی نیشابوری)یش نووسیویەتی:

| | |
|---|---|
| عجب در حیرتم از خواجه حافظ | بنوعی کش خرد زان عاجز آید |
| چه حکمت دید در شعر یزید او | که در دیوان نخست از وی سراید |
| اگر چه مال کافر بر مسلمان | حلال است و درو قیلی نشاید |
| ولی از شیر عیبی بس عجیب است | که لقمه‌اش از دهان سگ رباید |

(واتە: زۆر سەرم لە خواجە حافز سوڕماوە بە جۆرێ کە عەقڵیش تیایدا دەستەوسانە، ئەو چ حیکمەتێکی لە شیعری یەزیدا بینی کەوا لە سەرەتای دیوانەکەیدا هێنایەوە. گەرچی ماڵی کافر بۆ موسوڵمان حەڵاڵە و قسەی تێدا نییە، بەڵام بۆ شێر عەیبێکی زۆر گەورەیە کە پارو لە دەمی سەگ بڕفێنێ).

له بەرامبەر ئەم رایەشدا (عەللامە قەزوینی و دکتۆر غەنی) ئەم دێڕە بە هی (یەزید) نازانن و (ئوستاد مینوی) لە پەراوێزی (حافظ)دا نووسیویەتی: "ئەمیر خسرەوی دەهلەوی ـ کۆچکردووی ٧٢٥ ی کۆچیی مانگی کە ساڵی لە دایکبوونی حافزە ـ لەم بەیتەی ژێرەوەدا ئەو نیوە دێڕەی هێناوە:

شراب لعل باشد قوت جانها، قوَّت دلها

الا یا ایها الساقی ادر کأساً و ناولها

هەورەها (د. هروی) یش لە شەرحەکەی خۆیدا دەڵێ: " لە دیوانی چاپکراوی یەزیدی کوڕی معاویەدا - کە شیعرەکانی خۆی و ئەو شیعرانەشە دراونەتە پاڵی ـ ئەم نیوە دێڕەم نەدیوە.

لە ڕاستیدا گەر ئەم دێڕە هی یەزید بێت یا هەر کەسێکی تر گرفتێکی گەورە دروست ناکات، بەڵام لە هزری شیعەدا باوەڕهێنان بەوەی کە شاعیرێکی فارس دێڕێکی گەورەترین دوژمنی دەروونیی و مێژوویی ئەوانی وەرگرتبێ کارێکی دژوارە، هەرچەندە لەو چەند دێڕە شیعرەی (ئەهلی شیرازی و کاتبی نیشاپوری) دا وادەرکەوێ کە هی یەزید بێت و هەروەها حافزیش شیعە نەبووە تا ئەو رقەی لە یەزید بێت . بەڵام ئەوەی جێگای ئاماژەیە و سوودی زانستی دەبێت ئەوەیە کە رۆژی (٥/١٠/٢٠٠٢) (پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار) کاتێ ئەم دێڕەی لە شەرحی سودیدا بینی گوتی: ئەم دێڕە شیعرە عەرەبی سەردەمی ئەمەوی نییە، یەزیدی کوڕی معاویەش لەم سەردەمەدا ژیاوە و (ماعندی) دەربڕینێکی تازەی زمانی عەرەبییە و لە شیعری عەرەبی ئەو سەردەمەدا بەکارنەهاتووە، رەنگە ئەم شیعرە هی فارسێك بێت.

خواجە حافز لەم بەیتەدا لە ناڕەحەتی عەشق دەدوێت و دەڵێ: ئەی ساقی پێکی شەراب بگێڕە و پێکێکیش بدە بە من، چونکە عەشق سەرەتا بە ئاسانی هاتە بەرچاو، بەڵام پاشان گرفتەکان روویاندا، بەو واتایەی ئێمە لە نیوە رێگەی عەشقداین کە ناڕەحەتی و گرفتەکان روویانداوە و پێویستمان بە بادە و پێکی عەشق هەیە بۆ ئەوەی بەرگەی ئەو ناڕەحەتی و عەزابانە بگرین کە رووبەڕوومان دەبنەوە.

هەر لەم سەرەتایەوە شاعیر دەروازەیەك بۆ شیعری عاشقانەی عارفانە دەکاتەوە کە سەراپای سووتان و نەهاتییە و عەزابی دووری مەعشوقە، بێگومان ئەم عەشقەی حافز عەشقی ئیلاهییانەی عیرفانییە کە بە شێوەیەکی سەختی عاشقانە نووسراوە و پێویستی بە کردنەوەی وردی کۆدە واتاییەکانی هەیە کە ئێمە هەوڵ دەدەین لە دووتوێی شیکردنەوەکان و لە کات و شوێنی خۆیاندا لێیان بدوێین.



**٢- بە بووی نافەای کە آخر صبا زآن طرە بگشاید**

**ز تاب جعد مشکینش چە خون افتاد در دلها**

**بە بووی نافەیی کە ئاخەر سەبا زان توڕڕە بگوشایەد، ز تابی جەئدی موشکینەش چە خون ئوفتاد دەر دلها.**

بە ئومێدی نافەیەك کە ئاخرییەکەی سەبا، لولیی ئەو سەری زوڵفەی بکاتەوە، لە تاو چین چین و لولیی پرچی میسکباری چ خوێنێك کەوتە دڵانەوە.

بەبووی: بەهیوای، بەئومێدی، بەئاواتی نافە: ئەو کیسە بچووکەی لە سەر ناوکی ئاسکدایە و خوێنی وشکبووەوەی تێدایە و پاشان میسکی لێدەردەهێنرێت

صبا: سەبا، سروە، هەوای فێنکی باکوور کە لای دۆستانەوە هەڵدەکات و حەریمی حەرەمسەرای یار و مەعشوقەکانە و لای عاشقان راززان و هەواڵهێنی عاشقانە لای یارەوە

جعد: موی موجەعەد، موی لول و ئاڵۆسکاو وەك ئەڵقەی زنجیر، لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا بەواتای پەردەی بەردەم روو و وەسڵی مەعشوق دێت مشك: میسك

لە شرۆڤەی ئەم بەیتەدا پێویستە ئەوە روونکرێتەوە کە میسك خوێنی دڵی ئاسکە و نافەش ئەو کیسە بچووکە وشکبووەوە سەربەستراوەیە کە لەسەر ناوکی ئاسکدا پەترۆکە دەبەستێت کاتێك ئەم کیسەیە وردەکرێت بۆنەکەی لێ دەردەهێنرێت و بڵاو دەبێتەوە، شاعیر زوڵف و پەرچەمی یاریی بەمە چواندووە کە لول و گرێدراوە و وەك میسکیش رەش و بۆنخۆشە. دەڵێ: بە ئومێدی ئەوەی کە بای سەبا گرێ و لولیی سەر پەرچەمی یار بکاتەوە تا بۆنی خۆشی وەسڵی یارمان بە نسیب ببێت (بگەین بە بۆنی خۆشی وەسڵی رووی دولبەر) چەندە دڵ لە چاوەڕوانیدا بوونەتە خوێن. واتە: دڵان لە چاوەڕوانی زۆردا دوچاری دڵتەنگی و ناڕەحەتی زۆر بوون و بوونەتە خوێناو، ئەمەش مانایەکی شاراوەی تێدایە کە سەبا درەنگی کرد و ناتوانێ یا نایەوێت لە زوڵفی یارەوە بۆنی خۆشی وەسڵ و ژوانمان بۆ بکاتە دیاری، چونکە زوڵفی مەعشوق ئاڵۆسکاوە و رووی یاری لەژێر لولیی خۆیدا حەشارداوە.

بەتێبینیکردنی ئەوەی کە زوڵف و پرچی لول لە زاراوەی عیرفانییدا نیشانەی شاردنەوە و پەردەی سەر رووی مەعشوقە واتای عیرفانیی بەیتەکە دەبێتە:

بە ئومێدی ئەوەی کە رازێك لە نهێنییە ئیلاهییەکان بزانین دەبێ چەندە رەنج و دەردیسەری بکێشین. دڵان چاوەڕێی بای سەبا دەکەن کە ئەو پەردانە هەڵداتەوە و بۆنی خۆشی ئەو نهێنییانە بزانن، بەڵام لە لولی پرچ و زۆری حیجاب و پەردەکانەوە ئەم ئاواتە روو لە کزییە و چاوەڕوانی دڵی عاشقان بە خوێن دەکات.

**٣- به می سجاده رنگین کن گرت پیر مغان گوید**

**که سالك بی خبر نبوود ز راه و رسم منزلها**

**به مەی سەجادە رەنگین کون گەرەت پیری موغان گویەد، کە سالك بی خەبەر نەبووڤەد ز راه و رەسمی مەنزیلها.**

ئەگەر پیری موغان پێی گوتی بەرماڵەکەت بە شەراب رەنگین کە، بیکە! چونکە رێبواری رێگەی تەریقەت بێئاگا نییە لە داب و نەریت و رێورەسمی قۆناغەکانی نێوەندی رێگە.

سجادە: بەرماڵ، بەردەنوێژ پیر مغان: پیری موغان، پیری مەیفرۆش موغ/ماگ: پیاوی ئایینی زەردەشتییە، بەڵام (د. غەنی) دەڵێ: "موسوڵمانەکانی پێشوو لە دوو جێگاوە شەرابیان دەهێنا، یەکێکیان لە دێرەکان و لای مەسیحییەکانەوە و ئەوی دیکەشیان لای مەجوسییەکانەوە، واتە موغەکان... لە سەرەتاوە پیری موغان هەمان پیری مەیفرۆش بوو، بەڵام پاشان لە زاراوەی سۆفیگەریدا واتای دیکەی پەیداکردووە، پیری نورانی لە زاراوەی مەسیحیدا (نستوری)یە سالك: رێبواری رێگەی حەق.

لە راستیدا زۆربەی بەیتەکانی (حافز) چەند مانایەکییان هەیە، لێرەدا (منزلها) کە بەواتای مەنزڵی نێوەندی رێگا دێت، بەڵام لە عیرفاندا قۆناغەکانی تەیکردنی رێگەی تەریقەتە لەلایەکی دیکەوە (مەی) و (پیری موغان) و زۆربەی ئەو زاراوانەی کە واتای سەرزارەکییان نێگەتیڤی و سلبیێ بە واتای نوێ بەکارهێنراون. هەر ئەمەیە کە ئەمڕۆ بە مانادان بە وشەکان دەستنیشان دەکرێت و دەکرێ بڵێین حافز و شاعیرانی سەردەمی ئەو و پاش ئەویش جۆرێك لە مانایان داوە بەو وشانەی کە واتاکانیان لەگەڵ توێژی سادەی کۆمەڵگەدا ناگونجێ.

(حافز) لەم بەیتەدا ئەوە دەڵێ کە رێبوارانی رێگەی حەق بێ ئاگا نین لە داب و نەریتی قۆناغەکانی نێوەندی رێگەی بەرەو حەق و کەماڵ چوون بە تایبەتی پیر و نورانییەکانیان، هەربۆیە کاتێك پیری نورانی و مورشید پێت دەڵێ بەرماڵەکەت بە شەرابی عەشق بشۆ و رەنگینی بکە پێویستە بەگوێی بکەی، چونکە ئەو لە تۆیەکی بێئاگای تازەکار باشتر دەزانێت. (لاهوری) لە شەرحەکەی خۆیدا نووسیویەتی:

گەر مورشیدی کامڵ ئەمری پێکردی کارێ بکەیت کە رازەکەی لای تۆ شاراوە بوو، رووە ئاشکراکەشی لەگەڵ عەقڵتدا نەدەگونجا، بێ دوودڵی بیکە و بە خێری مەحزی بزانە وەك مردووی نێو دەستی مردووشۆر خۆت بدەرە دەستی ئەو کامڵە چونکە (المحبة العمل لطاعة المعشوق = عەشق کارکردنە بۆ ئیتاعەتی مەعشوق){ لاهوری، ج١، ل ٨-٩}



**٤- مرا در منزل جانان چه امن عیش چون هردم**

**جرس فریاد میدارد که بربندید محملها**

**مەرا دەر مەنزڵی جانان چە ئەمنی عەیش چون هەردەم، جەرەس فەریاد میدارەد کە بەربەندید مەهمیلها.**

من لە مەنزڵگەی مەعشوقدا ئارامی و ئەمانێك بۆ ژیان و شادی شکنابەم ! چونکە بەردەوام زەنگەکان هاوار دەکەن بارەکانتان بپێچنەوە.

مرا /من را: من لە دۆخی بەرکارییدا منزل: جێگەیەکە کە لەکاتی سەفەردا قافڵەیەك باری تێدا دەخات، مەنزڵگە

جرس: زەنگ، یاخود زەنگۆڵەی ملی حوشتر کە کاروانچییەکان لە جوڵانی قافڵەکە ئاگادار دەکاتەوە.

فریاد: هاوار بربندید: کۆبکەنەوە، تێکنێن محمل: بارگە و بنە

مەبەستی بەیتەکە ئەوەیە کە چۆن دەتوانرێت لە مەنزڵگەی مەعشوق و خۆشەویستدا بەئارامی و ئاسایشەوە بژین لە کاتێکدا زەنگی رۆشتن و کۆکردنەوەی بنە و بارگەی سەفەر بەردەوام لێدەدرێت.(د.هروی) لە مەبەستی ئەم بەیتەدا دەڵێ: " لە دنیادا ترسی مەرگ وەك دەنگی زەنگ هەمیشە کاتی رۆشتن و جوڵان بە کاروانییەکان دەڵێ، هەمیشە ئێمە دەخاتە بەر هەرەشەی خۆیی و ئاگادارمان دەکاتەوە ئیدی چۆن بە خەیاڵی ئاسوودە و ئارامەوە بژین."مەنزڵگەبوونی دنیاش ئاماژەیەکە بۆ دروستی ئەم واتایە، بەڵام ئەکرێ ئەو مەنزڵگەیە حاڵی کورت خایەنی عارفان بێت و زەنگی ئاگادارکردنەوەکەش کۆتایی هاتنی ئەو حاڵە بێت.

**٥- شب تاریك و بیم موج و گرداب چنین هائل**

**کجا دانند حال ما سبك باران ساحلها**

**شەبی تاریك و بیمی مەوج و گیردابی چونین هائیل، کوجا دانەند هالی ما سەبووکبارانی ساهیلها.**

شەوی تاریك و ترسی شەپۆل و گێژاوی وا ترسناك، خەیاڵئاسوودە و بارسووکەکانی کەنار باروودۆخی ئێمە لەکوێوە دەزانن.

شب: شەو موج: شەپۆل گرداب: گێژاو هائل: ترسناك

سبکباران: بارسووکەکان، بەمانای مرۆڤی خەیاڵئاسوودەی بیرنەکەرەوە دێت ساحل: کەنار

شاعیر بۆ دەستنیشانکردن و خستنەرووی ترس و سەرگەردانی خۆی لە لێکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ کەشفکردن و خستنەرووی نهێنی و رازی دروستبوون و بوون و وجود، وێنەیەکی ترسناك لە شەوێکی ترسناکدا و لە نێو شەپۆل و گێژاوەکانی دەریادا دەکێشێ، لە بەرامبەر

ئەمەشدا ئارامی کەنارەکانی دەریای هێناوەتەوە، لای ئەو تەریقەت ئەو دەریایەیە و خۆی وەك ڕێبوارێکی ئەو ڕێگەیە بە کەسێك چواندووە کە لە شەوێکی تاریکدا و لە کەشتییەکدایە و ترسی شەپۆلە سەرشێت و گێژاوە مەرگهێنەرەکان بەردەوام هێرشی دەکەنە سەر و خەیاڵئاسوودە و بارسووکەکانی کەنارەکانیش ئەوانەن کە خاڵی و بەتاڵن لە بیرکردنەوە و وردبوونەوە لەم جۆرە مەسەلانە و بە ئاسوودەیی دەژین. ئەکرێ ئەم دەریا پڕ ترسەی حافز لە ناخی هەموو کەسێکدا هەبێت و بارسووکەکان ئەوانەبن کە هەست بەو پشێوییەی ناخیان ناکەن، وەك (کولن ویلسون) لە (سقوط الحضارة)دا ئەوە دەخاتەڕوو کە پشێوی لە ناخی هەموو کەسێکدا هەیە، بەڵام خۆشبەختن ئەوانەی کە ئەم پشێوییە کەشف ناکەن.

**٦- همه کارم ز خودکامی به بدنامی کشید آری**

**نهان کی ماند آن رازی کزو سازند محفلها**

**هەمەکارەم ز خودکامی بە بەدنامی کەشید ئاری، نەهان کەی مانەد ئان رازی کزو سازەند مەهفیلها.**

هەموو کارم بە هۆی خۆسەرییەوە بە بەدناوی کۆتایی هات، ئەرێ، ئەو رازەی کە کۆڕی لێ ساز بکەن و ببێتە بنێشتەخۆشەی سەر زاران چۆن بە نهێنی دەمێنێتەوە.

خودکامی: خۆسەری، بەئارەزوو و مەیلی خۆ                بدنامی: بەدناوی، رسوایی

نهان: پەنهان، شاراوە          کزوسازند: کەلێی دروستکەن      **محفل**: کۆڕ، کۆبوونەوە

لێرەدا (حافز) دەیەوێت ئەوە بڵێت کە هەرکارێك بە ئارەزوو و مەیلی تاکەکەسی بکرێت و مرۆڤ هەمیشە لە خۆوە و بە مەیلی خۆیی و بەبێ رەچاوکردنی دەورووبەر و کۆمەڵگە کارەکانی بکات دواجار ریسوا دەبێت، ئەم ریسواییەش بە شێوەیەك دەبێ کە هەمووان پێی دەزانن و لێرە و لەوێ باسدەکرێت و ناشاردرێتەوە. هەرچەندە (سودی) لە شەرحەکەی خۆیدا دەڵێ: "میسراعی دووەمی وەك پەندێك بۆ میسراعی یەکەم هێناوەتەوە" {سودی، ج١، ل١٤- ١٥} بەڵام دەکرێت وەك تەواوکەرێك لێی بڕوانرێت نەوەك پەندێك.

واتە: لە بری ئەوەی داب و نەریت و ڕێوڕەسمی کۆمەڵگە لەبەرچاو بگرم بە خۆسەری خۆم بەدوای ئارەزووەکانم کەوتم و ئەمەش بووە مایەی ریسوابوونم بە جۆرێك کە خەڵکی دەستەدەستە لە رسوابوونەکەم دەدوێن و بەمەش ناتوانم ئەم ریسوابوونەم بشارمەوە.

**٧- حضوری گر همی خواهی ازو غایب مشو حافظ**

**متی ما تلق من تهوی دع الدنیا و اهملها**



**هزوری گەر هەمیخاهی ئەزو غایب مەشو هافز، مەتا ما تەلقە مەن تەهڤا دەئی دونیا ڤە ئەهمیلها.**

حافز گەر (حزوری)ت دەوێ لێی (غایب) مەبە، هەرکاتێ گەشتی بەو کەسەی کە خۆشت دەوێ دنیا بخە لاوە و پشتگوێی بخە.

حضور: ئامادەیی لە حەرامسەرای دۆستدا (زاراوەیەکی عیرفانییە)

همی خواهی: ئەتەوێ                ازو: لە ئەو

سودی (حضور) بەمانای ئاسایش و ئارامی لێکدەداتەوە، بەم واتایەش مانای دێڕەکە دەبێتە: گەر دەتەوێ ئارامی و ئاسایشت دەستکەوێ هەرگیز لەو غایب مەبە کە لێرەدا ئەو مەعشوقی ئەزەلییە، بەڵام لەهەر بارێکدا دەبێ دونیا پشتگوێ بخەیت. (هروی) یش دەڵێ: " مەبەست لەوەیە کە ئەگەر ئامادەیی و حازربوونی گیانی و روحیت لەگەڵ مەعشوقدا دەوێ لە یادی ئەو غافڵ مەبە و هەمیشە یادی بکەرەوە و هەرکە گەیشتی بە مەعشوق هەموو شتێك جگە لەو فەرامۆش بکە.



## غەزەلی دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**١- صلاح کار کجا و من خراب کجا**

**ببین تفاوت ره کز کجاست تا به کجا**

**سەلاهی کار کوجاڤو مەنی خەراب کوجا، ببین تەفاڤوتی رەھ کەز کوجاست تا بە کوجا.**

رێکیی کاروباری ژیان لە کوێ و منی خراپ و مەست لە کوێ، سەیرکە جیاوازیی نێوان ئەم دوو رێگا و رێبازە لە کوێ تا کوێیە.

صەلاح کار: چاکتربیرکردنەوە لە کاروباری ژیان، بە مەسڵەحەت زانین و گونجان
کجا: لەکوێ        خراب: فاسد و گوناهکار یاخود بەمانای مەست و بیرنەکەرەوە هێنراوە
تفاوت: جیاوازیی       رە: راە، رێگە

دەڵێ: بیرکردنەوەی چاك و بەرژەوەندی خوازی لە کاروباری ژیاندا پێویستی بە دووربینی و وردبینی هەیە و منیش مەست و بێ پەراوم و بەم جۆرە نیم، هەربۆیە ئەو لەکوێ و من لەکوێ.

لە نێوان من و بیرکردنەوە لە بەرژەوەندییەکانی ژیان و رێکخستنەوەی کاروبارەکاندا جیاوازییەکی زۆر هەیە و دوو رێگەی جیاوازن.

(سودی) کە (صلاح یار) لە جیاتی (صلاح کار) دادەنێت. لە شەرحەکەیدا دەڵێ: یار لە بیری خۆ رازاندنەوە و رێکخستنی خۆیدایە، بەڵام من لە بیری بادەنۆشی و مەستی دام و هیچ لێکچوونێك لە نێوان من و یاردا نییە، ببینە کە لە نێوان رێگەی عەشق و رێگەی زوهددا چەندە جیاوازیی هەیە.

**٢- چه نسبت است به رندی صلاح و تقوی را**

**سماع وعظ کجا و نغمەء رباب کجا**

**چە نسبەتەست بە رەندی سەلاھ و تەقڤارا، سەمائی ڤەئز کوجا و نەغمەیی روباب کوجا.**

تەقوا و خۆپارێزی چ پەیوەندییەکی لەگەڵ جیهانی رەندی و بادەنۆشیدا هەیە، بیستنی وەعز و قسەی ئامۆژگاری لەکوێ و بیستنی ئاوازی روباب لەکوێ.

رەند: کەسێکی زیرەك، گوێ بەهیچ نەدەر (لاابالی)، نەبەستراوە بەداب و نەریتە کۆمەلایەتییەکانەوە و گوێ نەدەر بە دەوروبەر.



سماع: بە واتای بیستن وەکو بیستنی قورئان، بەڵام لە زاراوەی سۆفیگەریدا واتای جیاوازیی هەیە کە لە شوێنی خۆیدا بە درێژی لێی دەدوێن، چونکە لێرەدا بە واتا زمانییەکەی بەکارهاتووە.

نغمە: دەنگی خۆش، ئاواز     رباب: روباب، جۆرە سازێکە

هەروەکو چۆن گوێگرتن لە ئامۆژگاریی و وەعز و گوێگرتن لە ئاوازی مۆسیقا بەیەکەوە کۆناکرێتەوە ناتوانرێت پەیوەندییەك لە هەمانکاتدا لە نێوانیاندا دروست بکرێت هەرواش جیهانی رەندی و بێ پەروایی یاخود مەستی و بادەنۆشی لەگەڵ جیهانی تەقوا و خۆپارێزی و دوورە پەرێزیدا پەیوەندییان نییە.

**٣- دلم ز صومعه بگرفت و خرقەء سالوس**

**کجاست دیرمغان و شراب ناب کجا**

**دلەم ز سۆومەئە بگرفت و خیرقەیی سالوس، کوجاست دەیری موغان و شەرابی ناب کوجا.**

دڵم لە خانەقا و خرقەی ریا و خەڵەتێنەر بێزاربووە، مەیخانە و شەرابی بێخەوش لە کوێیە.

دڵم بگرفت: دڵم گیراوە، بێزارم      صومعە: لە ئەسڵدا بەشوێنی پەرستنی مەسیحییەکان دەگوترێت کە لەسەر کێو یاخود تەپۆڵکە دروست کرابێت، دێر، کەنیسە، کڵێسا، بەڵام لە ئەدەبیاتی فارسیدا بەمانای خانەقا دێت و لەم بەیتەشدا مەبەست ئەم مانایەیە خرقە: عەبایەکە کە سۆفی لەبەری دەکات   سالوس: فریودەر، ریاکاری دیرمغان: شوێنی پەرستشی زەردەشتی، عیبادەتگای زەردەشتی، هەرچەندە لێرەدا بە مانای شوێنی عەشق و عیرفان دێت.

واتە لە خانەقا و خرقە کە بە ریا و فریودەری و خەڵەتاندن ئالودە و پیسبوون، بێزارم و دەمەوێ رزگارم بێت، دێری موغان و مەیخانە و شەرابی بێ خەوشی ساف لە کوێیە (کە رەمزی عەشق و عیرفانن).

وەك خانەقا بە خرقەی ریاکاری پەیوەستە مەیخانە و دێری موغانیش بە شەرابەوە پەیوەستە، شاعیر مەبەستی لەوەیە کە لە زەرق و بەرقی ریاکاری و رواڵەتبازی بێزارم و رێگای عەشق و رەندی هەڵدەبژێرم.

**٤- بشد که یاد خوشش باد روزگار وصال**

**خود آن کرشمه کجا رفت و آن عتاب کجا**

**بشود کە یادی خوشەش باد روزگاری ڤیسال، خودی ئان کریشمە کوجا رەفت و ئان ئیتاب کوجا.**

رۆژگاری پێکەوەبوون و ویساڵ یادی بە خێر تێپەڕی، ئەو ناز و غەمزەی مەعشوق بۆ کوێ ڕۆشت و ئەو سەرزەنشت و عتابە بۆ کوێ.

بـشد: تێپەڕی، بەسەرچوو    روزگار: رۆژگار    وصال: پێکەوەبوون، ویساڵ
کرشمە: ناز    عتاب: سەرزەنشت و عیتاب

پاش تێپەڕینی رۆژگاری پێکەوەبوونی شاعیر لەگەڵ مەعشوق و جارجارەی ناز و غەمزە و جارجارەی تورەبوون و سەرزەنشتدا. شاعیر یادێکی ئەو رۆژگارە بەسەرچووە دەکاتەوە و دەڵێ: رۆژگاری پێکەوەبوون و وەسڵ کە هیوادارم هەمیشە بە خۆشی و چاکی باس و یادبکرێتەوە تێپەڕی، ئەو رۆژگارەی کە جارجار ناز و غەمزە و جارجار بە سەرزەنشت و عیتاب لێگرتنمان لە نێوان ئێمە و مەحبووبدا تێپەڕی بۆ کوێ چوو یاخود چیی بەسەر هات.

**٥- ز روی دوست دل دشمنان چە دریابد**

**چراغ مردە کجا و شمع آفتاب کجا**

**ز رووی دوست دڵی دوشمنان چە دەریابەد، چراغی موردە کوجا ڤو شەمئی ئافتاب کوجا.**

دڵی دوژمنان چی لە رووی دۆست تێدەگات، چرای کوژاوە لە کوێ و مۆمی درەوشاوەی رۆژ لە کوێ.

دریابد: تێدەگات، لە چاوگی دریافتن، وەرگیراوە    چراغ: چرا
مردە: مردوو، لێرەدا بە مانای کوژاوە هاتووە    شمع: مۆم    آفتاب: رۆژ، خۆر

دەڵێ: دڵی دوژمن لە ئەنجامی رق و کینەوە تاریکە و هیچ لە رووخساری دۆست تێناگات و ناتوانێت و پرشنگێکی لێ وەرگرێ ئەم دوانەش (دڵی دوژمن و رووی دۆست) وەك چرایەکی کوژاوە و مۆمی خۆر وان، واتە دڵی دوژمن چرای کوژاوەیە و رووخساری دۆستیش وەك رۆژ وایە. (سودی) دەڵێ: پەیوەندیی نێوان ئەم دوانە ئەوەیە کە هەروەك چۆن چرای کوژاوە ناتوانێ هیچ رووناکییەك لە رۆژەوە وەرگرێ هەورەها دڵی دوژمنیش ناتوانێ لە رووخساری دۆستەوە نور و رووناکی وەرگرێت، بێگومان لێرەدا رووی دۆستی حەقە.

**٦- مبین بە سیب زنخدان کە چاە در راە است**

**کجا همی روی ای دل بدین شتاب کجا**

**مەبین بە سیبی زەنەخدان کە چاە دەر راهەست، کوجا هەمی رەڤی ئەی دل بەدین شتاب کوجا.**

سەیری سێوی چەناگە مەکە و ئاگاداربە کە چاڵ لە رێگەدایە، ئەی دڵی من بەم پەلەپەلی و پەرۆشییەوە بۆ کوێ دەڕۆی.



زنخدان: چەناگە    سیب زنخدان: چەناگەی جوان وەك سێو (خڕ)
چاە زنخدان: چاڵی چەناگە    همی روی: دەڕۆی    بدین: بەم    شتاب: پەلەپەلی، خێرایی

لە ئەدەبیاتی فارسیدا هەمیشە چاڵی چەناگە وەك داوێك یاخود رێگرێکە لە بەردەم عاشق و عارفەکاندا و رەمزی گرفتی سەرە ڕێی عەشقە. لێرەشدا هەمان مانای پێدراوە و بە دڵ دەڵێ: ئەی دڵ بەم پەلەپەل و پەرۆشییەوە و بە ئومێدی گەشتن بە سێوی چەناگە و ویساڵی یار بۆ کوێ دەڕۆی، بزانە کە چاڵی چەناگەی یار لە بەردەم رێگەی عەشقی تۆدایە، واتە لە رێگەی عەشقدا هەمیشە خۆشی و ئارامی نییە و گرفتاری و نارەحەتیی زۆریش لە سەر رێدایە و بە پەلەپەل و پەرۆشییەوە هەنگاو هەڵمەگرە تا نەکەویتە نێو چاڵ.

**٧- چو کحل بینش ما خاك آستان شما است**

**کجا رویم بفرما ازین جناب کجا**

**چو کهلی بینشی ما خاکی ئاستانی شوماست، کوجا رەڤیم بفەرما ئەزین جەناب کوجا.**

کە خۆڵی بەردەرگای ئێوە (تۆ) کلی چاوی ئێمەیە، بفەرموو لەم ئاستانە و بەردەرگایەدا بۆ کوێ بڕۆین؟

کحل: کل، سورمە    بینش: بینین، بەڵام لێرەدا مانای چاو دەگەیەنێ
آستان، جناب: بەردەرگا    بفرما: بفەرموو، بڵێ

بەرامبەر بە مەعشوق و خۆشەویستەکەی دەڵێت: ئێمە هەر لە کۆنەوە لە بەردەرگای تۆ داین و بە خۆڵی ژێرپێ و بەردەرگای تۆ چاومان دەڕەژین و خاکی بەردەم ئاستانەت بووەتە کل و سورمەی چاومان و بە هۆی ئەوەوە چاومان بەهێز دەبێت. ئیدی پێمان بڵێ بڕۆین بۆ کوێ ناچار سەر دەخەینە سەر دەرگای تۆ تا ئەو خاکە بچێتە چاومان و تا رۆژی مەرگ بۆ هیچ بەردەرگایەکی دیکە ناڕۆین.

**٨- قرار و خواب ز حافظ طمع مدار ای دوست**

**قرار چیست، صبووری کدام، خواب کجا**

**قەرار و خاب ز هافز تەمەء مەدار ئەی دوست، قەرار چیست سەبووری کودام خاب کوجا.**

ئەی دۆست چاوەڕوانی ئارامی و خەو لە حافز مەکە ئارامگرتن چییە، کامەیە سەبر خەو لەکوێیە.

قرار: ئارامگرتن    خواب: خەو    طمع مدار: چاوەڕێ مەبە، بەتەما مەبە

بەم پێیە بەستنەوەیەك لە نێوان دێڕی یەكەمدا دروست دەبێ كە منی خراپ و رەند بێ قەرار و سەبرم و بە دۆست دەڵێ: بە تەمای سەبر و خەو و ئارامی مەبە لە حافز، چونكە منی رەندی رێگەی عەشق و خەرابات سەبر و خەو و قەرارم نییە و ئەم شتانە لە پلەی عاشقیدا بوونیان نییە و منی عاشقیش بێبەشم لەمانە.

لە شەرحی سودیدا لە جیاتی (قرار و خواب) (قرار و صبر) هاتووە.



## غەزەلی سێیەم:

**بە حری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەكفوف**
**(فعلات فاعلاتن فعلات فاعلاتن)**

**١- بە ملازمان سلطان كە رساند این دعا را**
**كە بە شكر پادشاهی ز نظر مران گدا را**

**بە مولازمانی سولتان كی رەسانەد ئین دوئا را، كە بە شوكری پادشاهی ز نەزەر مەران گەدارا.**

چ كەسێك ئەم داوایە بە خزمەتگوزارانی سوڵتان دەگەیەنێت، كە بۆ سوپاسگوزاری ئەوەی پاشایت، بێ میهری لەگەڵ بێچارە و گەداكاندا مەكە.

ملازمان: خزمەتگوزاران، ئەوانەی هەمیشە لەگەڵ پادشادان
سلطان: پادشا، سوڵتان، گەورە رساند: دەگەیەنێت دعا: دۆعا، داوا

چونكە لەڕووی ئەدەبەوە یەكراست داوایەك بۆ سوڵتان نانێرێت، داوایەك بۆ خزمەتگوزارەكانی پاشا دەنێرێت كە بە سوڵتان بڵێن تەنیا بۆ سوپاگوزاری لەسەر ئەوەی كە پاشایت گەدا و لانەوازەكان لە پێش چاوتا دەرمەكە و چاوی میهر و بەزەییت لێیانەوە بێت. هەرچەندە گەدا بە مانای سواڵكەر دێت، بەڵام زۆرجار لە بەرامبەر پادشادا بەكاردەهێنرێت و ئەو كەسەیە كە نیاز و پێویستی بە میهر و بەزەیی پادشا هەیە و هەرگیز پادشا پێویستی بەوان نییە، بەڵام شاعیر دەڵێ: گەر بە هۆی سوپاسگوزاریی پادشاوە بێت لەسەر ئەوەی كە تەخت و تاجی پێ بەخشراوە پێویستە بەزەیی بە گەدا و بێچارەكاندا بێتەوە.

**٢- ز رقیب دیوسیرت بە خدای خود پناهم**
**مگر آن شهاب ثاقب مددی كند سها را**

**ز رەقیبی دیڤسیرەت بە خودای خود پەناهەم، مەگەر ئان شیهابی ساقب مەدەدی كونەد سوهارا.**

پەنا بە خودای خۆم دەگرم لە رەقیبی دێو سیفەت، مەگەر ئەو نەیزەكە ئاگراوییانە یارمەتی ئەم ئەستێرە بچووكەی (سوها) بدەن.

رقیب: چاودێر، مراقب، كاتێ دوو كەس عاشقی یەك كەس دەبن یەكتری بە رەقیبی خۆیان دەزانن، لە ئەدەبیاتدا بە زۆری بە مانای ناكەس و مودەعی یان خراپ هاتووە.

دیو: دێو، شەیتان

شهاب ثاقب: پەیوەندی نێوان تیشکی ئاگر و شەیتان لە ئایەتی (١٨)ی سورەتی (حجر)دا هاتووە: ئەویش ئەوەیە کاتێ شەیتانەکان لە زەوییەوە دەچنە ئاسمان بە مەبەستی گوێگرتن لە رازە نادیارەکان، فریشتەکان بە تیری ئاگرین رێگری سەرکەوتنیان لێ دەکەن، شهاب ساقبیش هەر ئەم تیرە ئاگرینەیە        مدد: یارمەتی

سها: ئەستێرەیەکی بچووکە لە ئاسماندا و نیشانەی عاقڵییە و رووناکی کەمە سووهەیل و سوها وەك دوو دژ بەکارهێنراون کە سوهەیل لەبەر تیشکداری و رۆشنی زۆر سوهاش بە هۆی کەم تیشکییەوە.

شاعیر رەقیبی بەو شەیتانانە چواندووە کە دەچنە ئاسمان و خۆشی بە ئەستێرەی بچووك و کزی سوها، دەڵێ: کاتێ رەقیبی شەیتانسیفەت دێتە ئاسمانی عەشقمەوە پەنا بۆ خوا دەبەم تا ئاگری نەیزەکەکان لەو بگرێت. من کە ئەستێرەیەکی لاوازم لە شەڕی ئەو بپارێزێت.

**٣- مژه ء سیاهت ار کرد به خون ما اشارت**

**ز فریب او بیندیش و غلط مکن نگارا**

**موژەیی سیاهەت ئەر کەرد بە خونی ما ئیشارەت، ز فەریبی ئو بیەندیش و غەلەت مەکون نیگارا.**

ئەی نیگاری من گەر برژانگی رەشت بە ئاماژە فەرمانی کوشتنی ئێمەی دەرکرد، بیر لە فریوکاریی ئەو بکەرەوە و کارێکی هەڵە مەکە.

مژە: برژانگ   سیاە: رەش   خون: خوێن   ما: ئێمە   فریب: فریو   بیندیش: بیربکەرەوە

نگار: لە ئەدەبیاتی فارسیدا یەکێکە لە ناوەکانی یار وەك شیرین و لەیلا و سەلما

نگارا: ئەی نیگاری من، ئەی یاری من.

شاعیر بە یاری دەڵێت: ئەگەر چاو و برژانگی تۆ بە ناز و عیشوەوە ویستیان من بکوژن، تۆ دڵڕەق مەبە و فریو مەخۆ و ئێمە مەکوژە، چونکە ئەمە کارێکی هەڵەیە واتە کوشتنی عاشق کارێکی هەڵەیە هەرچەندە کە عیشوە و نازی چاو و برژانگت نیازی ئەوەی هەبێت.

**٤- دل عالمی بسوزی چو عذار برفروزی**

**تو از این چه سود داری که نمیکنی مدارا**

**دلی ئالەمی بسوزی چو ئیزار بەرفروزی، تو ئەزین چە سود داری کە نەمیکونی مودارا.**



کاتێ رووخسارت دەڕازێنیتەوە دڵی عالەمێ دەسووتێنی، تۆ چ سوودێك لەمە دەبینی کە لەگەڵ خەڵکدا هەڵناکەیت.

عذار: موی گۆنایە، هەمان (خطی سبز) یا (خط چهره) یە کە لە شیعری فارسیدا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام بە واتای رووخساریش دێت.

عذار برفروزی: رووخسارت ئارایش بکەیت، رووخسارت بڕازێنیتەوە.

شاعیر بە نیگاری خۆی دەڵێ: کاتێك رووخسارت دەڕازێنیتەوە و خۆت بۆ خەڵکی دەردەخەیت دڵی هەموو خەڵکی جیهان لە تاو جوانی رووخسارت دەسووتێت، بەڵام تۆ چ سوودێك لەم سووتاندنی دڵە دەبینیت و لەگەڵ کەسدا هەڵناکەیت و ناژیت.

**٥- همه شب درین امیدم که نسیم صبحگاهی**

**به پیام آشنایی بنوازد آشنا را**

**همە شەب دەرین ئومیدەم کە نەسیمی سوبهگاهیی، بە پەیامی ئاشنایی بنەڤازەد ئاشنارا.**

تەواوی شەو بەو ئومێدەوە بەسەر دەبەم کە شەماڵی بەرەبەیان لەلای ئاشنایەکەوە پەیامی خۆشەویستیم بۆ بهێنێ تا بێتە مایەی دڵدانەوەم.

همه شب: سەرانسەری شەو، تەواوی شەو، هەموو شەو، (د.هروی) دەڵێ:" ئەم دەستەواژەیە (همه شب) لە ئەدەبیاتی سەدەی پێنجەم تا نۆیەمی کۆچیدا بە شێوەیەکی فراوان بەرچاو دەکەوێ".

شاعیر خەوی شەوانی لە چاوان تۆراندووە و تا بەیانی بە ئومێدەوەیە کە بەرەبەیان شەماڵێك لە لای دۆستەوە بێنێت و پەیامێکی بۆ بهێنێ کە هزر و خەیاڵی ئارام بکاتەوە و ببێتە مایەی دڵدانەوە و دڵنەوازیی.

**٦- چه قیامت است جانا که به عاشقان نمودی**

**رخ همچو ماه تابان قد سرو دلربا را**

**چە قیامەتەست جانا کە بە ئاشقان نەمودی، روخی هەمچو ماهی تابان و قەددی سەرڤی دلروبارا.**

خۆشەویستم چ قیامەتێکت هەڵگیرساند کاتێ رووخساری درەوشاوەی وەك مانگ و باڵای وەك سەرووی سەرنج راکێشی خۆت نیشان دان.

جانا: ئاوەڵناوێکە بۆ خۆشەویست، گیانەکەم   نمودی: پیشانتدا   رخ: رووخسار   ماە: مانگ   تابان: درەوشاوە، رووناك   قد: باڵا، بەژن   سرو: داری سەرو

دلربا: سەرنجراکێش

ئەی گیانی من چ پشێوی و غەوغایەکت دروست کرد کە لە پشێوی و غەوغای رۆژی قیامەت و زیندووبوونەوە دەچوو، کاتێ رووخساری درەوشاوەی مانگ ئاسا و بەژن و بالآی بەرز و سەرنجراکێشی خۆت بۆ عاشقان خستەڕوو: واتە کاتێ عاشقان ئەمانەیان بینی غەوغا و پشێوییەك لە نێویاندا دروست بوو هەر لە غەوغا و پشێوی رۆژی حەشر دەچوو (سەرنج بدەنە غەوغای دەروێش و عارفەکان لە کاتی وەسڵی حەقدا).

**٧-به خدا که جرعه‌ای ده تو به حافظ سحرخیز**

**که دعای صبحگاهی اثری کند شما را**

**بە خودا کە جورئەیی دە تو بە هافزی سەهەرخیز، کە دوئای سوبهگاهی ئەسەری کونەد شومارا.**

بەخودا سوێندت دەدەم کە قومێك شەراب بدە بە حافزی شەوبێدار تا ئەو دۆعایەی کە بەیانیان بۆ تۆی دەکات کاریگەریی هەبێت و گیرابێت.

جرعە: قومێك، کەمێك، بەزۆری بە واتای قومە شەراب دێت

دە: بدە سحرخیز: ئەو کەسەی کە شەو بێدارە و بەیانیان زوو لە خەودانییە

دعای صبحگاهی: دۆعای بەیانیان زوو اثر: کاریگەری

حافز لە شەوبێدارانە و دۆعا و نزای بەیانیانیش بەزۆری گیرا دەبێت. بە یار یاخود ساقی دەڵێت: توخوا قومێك شەرابم بدەرێ تا لە دۆعای بەیانیاندا دۆعاتان بۆ بکەم و گیرابێت.

بە گوتەی (د.غنی) پێدەچێ ئەم غەزەلە رۆژگاری وەستانی شجاع پادشا لە مەیدانی سەعادەت لە دەرەوەی دەروازەی شاری شیراز و هاتنی بۆ شار دانرابێت، هەروەك (حافظ ابرو) نووسیویەتی: (چونکە دانیشتوانی شیراز لە مەحموود پادشا بێزاربوون بە نهێنی داوایان لە شجاع پادشا کرد کە بەرەو شیراز بێت کە لەوکاتەدا دەسەڵاتی بەسەر (کرمان)دا هەبوو ئەمەش ساڵی (٧٦٧ ك) بوو {دکتر غنی ـ تاریخ عصر حافظ ل٢٤٣، حافظ ابرو بە وەرگرتن لە هروی}





## غەزەلی چوارەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی تەواو**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)**

**١-اگر آن ترک شیرازی به دست آرد دل ما را**

**به خال هندویش بخشم سمرقند و بخارا را**

**ئەگەر ئان تورکی شیرازی بەدەست ئارەد دلی ما را، بە خالی هیندویەش بەخشەم سەمەرقەند و بووخارا را.**

ئەگەر ئەو دڵدارە جوانە شیرازییە رەزامەندی دڵی ئێمە بەدەست بهێنێ، شاری سەمەرقەند و بووخارا وەك دیاری پێشکەش بە خاڵی رەشی دەکەم.

ترك: تورك، لە بنەڕەتدا بە واتای تەتەر و تورك دێت، چونکە ئەم هۆزە زاڵم و خوێنخۆر و بێ بەزەیی بوون شاعیرەکان یاری بێ بەزەییان بە تورك چواندووە، هەروەها دەگوترێت لای فارس و نەتەوەکانی دیکە تورك جوان بوون و بە رەمزی جوانیش دادەنرێت.

شیراز: شاری شیرازی ئێران      ترك شیرازی: جوانی شیرازی (کچی جوانی شیراز)، بەڵام سوودی دەڵێ: بەپێی قسەی هەندێ لە خەڵکی شیراز ژمارەیەکی زۆر لە سوپاکەی هۆلاکۆ لە شیراز ماونەتەوە و لەوێ ژیاون و نەوەیان خستووەتەوە و پاشان بە منداڵی ئەوان گوتراوە تورکی شیرازی، لێرەشدا تورکی شیرازی مەبەست لەو تورکانەیە کە لە شیراز ژیاون نەوەك لێکچواندن، بەڵام لە راستیدا چواندنەکە دروستتر دێتە بەرچاو.

خاڵی هندو: خاڵی رەش، یاخود بە خاڵێك دەگوترێت کە بە رێوڕەسمی هیندییەکان کوترابێت.

سمرقند و بخارا: دوو شاری گرینگی تورکستانن کە لە سەردەمی ئیسلامیدا بە ئاوەدانی و دەوڵەمەندی و خەڵکی جوان ناوداربوون.

مەبەستی بەیتەکە ئەوەیە کە ئەگەر ئەو نازدار و جوانە شیرازییە بەپێی رەزامەندی دڵی ئێمە بجوڵێتەوە و بەرامبەر بە ئێمە بەزەیی و میهرەبانیی هەبێت هەردوو شاری سەمەرقەند و بووخارا دەکەمە دیاری خاڵی رەشی سەر روومەتی.

دەڵێن گوایە ئەمیر تەیمور (تەیمور لەنگ) حافزی بینیوە کە کەسێکی رووت و رەجاڵی هەژار بووە، ئەم دێڕەشی بیستووە پێی گوتووە: حافز بە زەبری شمشێر دنیام وێران کردووە تا



(سەمەرقەند و بووخارا) م ئاوەدان کردەوە و تۆ هەردووکیان بە خاڵێکی رەش دەبەخشی. خواجەش دەڵێت: هەر لەبەر ئەم بەخشینانەیە کە ئاوا دووچاری هەژاری بوومەتەوە، ئەمیر تەیموریش پێدەکەنێت و حافز لە جێگایەکی شیاودا دادەمەزرێنێت{هروی، ج ١، ل ١٥ }.

هەرچەندە ئەم بەسەرهاتە لەسەرچاوە جیاوازەکاندا زۆر دووبارە کراوەتەوە، بەڵام لەوە دەچێت رووداوێکی راستی نەبێت و هزر و خەیاڵی مێژوونووسەکان دروستی کردبێت، چونکە وەك (تیمور بوورهان لیمودهی) لە پێشەکی دیوانی حافز لە (جلال الدین همایی) وەرگرتووە و نووسیویەتی: "تەیمورلەنگ تەنیا دوو جار سەردانی وڵاتی فارس (شیراز)ی کردووە و ئەو دوو جارەش ساڵانی (٧٨٩) و (٧٩٥) بووە، ئاشکرایە کە سەفەری دووەمی تەیمورلەنگ پاش مەرگی خواجە حافزە و بەم پێیە دەبێت جاری یەکەم تەیمورلەنگ خواجەی بینیبێت.

جەنابی (هومایی) بە چەند بەڵگەیەك ئەم بەسەرهاتە رەتدەکاتەوە کە ئەمانەن:

١- بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە کە ئایا خواجە لە چ مێژوویەکدا ئەم غەزەلەی نووسیوە تا بگاتە گوێی تەیمورلەنگ.

٢-تەیمورلەنگ پیاوێکی شەڕکەر و خوێنخۆر بووە و هەمیشە خەریکی کوشت و بڕین و داگیرکاری بووە و تاقەت و زەوقی ئەم جۆرە شیعرە عاشقانەیەی نەبووە{دیوان حافظ، با مقدمه تصحیح و اهتمام: تیمور برهان لیمودهی، چاپی شەشم، ل ٢٩ـــ٣١ بە نقل لە مقام حافظ: استاد جلال الدین همائی، ص٢٢ و صفحات دیگر}.

لەڕاستیدا نە جەنابی (استاد هومایی) و نە خودی (لیمودهی)یش بە تەواوی رەتی ئەم بەسەرهاتە ناکەنەوە، بەڵام گومان لەوە دەکەن کە ئەگەر ئەم بەسەرهاتە راستیش بێت رەنگە بۆ غەزەلی (سحر با باد می گفتم حدیث آزورمندی) بگەڕێتەوە.

**٢-بده ساقی می باقی که در جنت نخواهی یافت**

**کنار آب رکناباد و گلگشت مصلا را**

**بدە ساقی مەیی باقی کە دەر جەننەت نەخاهی یافت، کەناری ئابی روکنابادو گولگەشتی موسەللا را.**

ساقی ئەو مەیەی ماوەتەوە بیهێنە و بیدە بە من، چونکە کەناری ئاوی روکناباد و گوڵزاری مصلا لە بەهەشتدا پەیدا ناکەیت.

باقی: ماوە      جنت: بەهەشت      نخواهی یافت: پەیدا ناکەیت

رکناباد: رکن آباد: چەمێکە نزیکەی (١٠) کیلۆمەتر لە شیراز دوورە و سەرچاوەکەی لە دامێنی تەپۆڵکەیەکە بەناوی (الله اکبر) لە چیای بەمۆ دایە. هۆی ناونانی بە(رکناباد)یش

ئەوەیە کە لەساڵی (٣٣٨) کۆچیدا (رکن الدولە دیلمی) ئەو دەوروبەرەی ئاوەدانکردووەتەوە ئەم ئاوە دەشتی (مصلی)ی ئاو داوە، بەڵام بەرە بەرە ئاوەکەی کەم بووەتەوە و ئەمڕۆ لە جۆگەیەك زیاتر نییە    گلگشت: پیاسەی نێوگوڵان، گەڕانی نێو گوڵزار    مصلا: دەشتێکی رازاوەیە لە شیراز کە بە ئاوی رکناباد ئاو دەدرێت و ئێستاش گۆڕی حافز لەوێیە.

وەك باس دەکرێت حافز زۆر هۆگری شیراز و ناوچەکە بووە لێرەشدا دووبارە ئەوە دووپات دەکاتەوە و لەکاتێکدا کە لە جوانی (ئاوی رکناباد و دەشتی مصلا) ورد دەبێتەوە بە ساقی دەڵێ: کە هەرچی مەی ماوەتەوە بیدە بە من، تۆ لە بەهەشتیشدا ئاوی رکناباد و دەشتی مصلا پەیدا ناکەیت، ئەم وتەیەی کۆتایی حافز (لە بەهشتدا ئاوی رکناباد و دەشتی مصلا) پەیدا ناکەیت حەقیقییە، چونکە بەهەشت دنیا نییە و هەرگیز ئەو دوو شوێنە لە بەهەشتدا بوونیان نییە لە هەمانکاتدا دەکرێ درکەیەك بێت لە جوانی و دڵگیری ئەو دوو شوێنە.

**٣-فغان کاین لولیان شوخ شیرینکار شهر آشوب**

**چنان بردن صبر از دل که ترکان خوان یغما را**

**فەغان کین لولیان شوخی شیرینکاری شەهراشوب، چونان بووردەن سەبر ئەز دل کە تورکان خانی یەغما را.**

داد و هاوار ئەم لولیە شۆخ و شەنگانە کە بە هەڵسوکەوتی شیرینی خۆیان ئاشوب لە شاردا بەرپا دەکەن، وا سەبر و ئارامیان لە دڵی من رفاندووە کە تورکان سفرەی یەغما دەڕفێنن.

فغان، افغان: داد و هاوار    کاین/کە این: کە ئەم

لولیان: کۆی لولییە، لولی: میهرەبان، ناسك، هۆزێکی چادرنشینن، کە بۆ یەکەم جار لە سەردەمی (بەهرامی گور)و بە داوای ئەو نزیکەی چوار هەزار کەس بۆ گۆرانی گوتن و سازلێدان لە هیندستانەوە هاتنە ئێران، فیردەوسی بە لوری ناویان دەبات، ئێستاش هۆزێکن کە بە زۆری چاو و برۆ رەشن و گۆرانی گوتن و سازلێدان لە تایبەتمەندییەکانی ئەم هۆزەن (وەك دۆمەکانی لای خۆمان)    شوخ: شۆخ، بێ شەرم    آشوب: ئاشوب، ئاژاوە و فیتنە

خوان: سفرە    یغما: تالانی، تالانکردن    خوان یغما: بە گوتەی (د.زرین کوب) سفرەیەکی گشتی بووە کە بەزۆری کار بەدەست و دەسەڵاتدارەکان لە رۆژەکانی جەژندا بە تایبەتی جەژنی قوربان دەیان رازاندەوە و هەژار و لێقەوماو و خەڵکی رەمەکی تالانیان دەکرد (جاران لە کوردستان فڕاندنی گۆشتی قوربانی بە خێر دەزانرا) (ترکان خوان یغما) ئەو خزمەتکارە تورکانەی کە لە تالانکردندا دەستپێشخەر بوون.



مەبەستی بەیتەکە: هەروەك چۆن خەڵکی و خزمەتکارەکان سفرەی رازاوەی کاتی جەژنەکان تالان دەکەن و دەڕفێنن لولییە شۆخ و شەنگە ئاشوبگێڕەکانی شاریش کە بە جوانی خۆیان ئاشوب و ئاژاوە بەرپا دەکەن سەبر و ئارامی دڵی من دەڕفێنن و ئارامم نامێنی و منیش هەروەك تەواوی خەڵکی شار لە بینینی لولییە شەنگەکانەوە لە نێو دڵمدا تووشی نائارامی و ئاژاوە دەبمەوە.

**٤- ز عشق ناتمام ما جمال یار مستغنی است**

**به آب و رنگ و خال و خط چه حاجت روی زیبا را**

**ز ئیشقی ناتەمامی ما جەمالی یار موستەغنیست، بە ئاب و رەنگ و خال و خەت چە هاجەت رووی زیبا را.**

جەمال و جوانی یار پێویستی بە عەشقی ناتەواوی ئێمە نییە رووخساری جوان چ پێویستی بە ئاو و رەنگ و خەت و خاڵە.

ناتمام: ناتەواو، مەبەست لە عەشقی ناتەواویش عەشقێکە کە بە پیاهەڵدان و وەسفکردنی مەعشوق کۆتایی پێ بێت و نەگاتە قۆناغی فیداکاری و خۆبەخشی

زیبا: جوان

هەندێ لە عاشقەکان پێیان وایە کە عەشقی عاشقە ئەبێتە هۆی ئەوەی مەعشوق دەرکەوێت و بگاتە لوتکەی جوانی، بەڵام لەبەر ئەوەی حافز لە عەشقی مەعشوقی حەق ئەدوێت پێیوایە عەشقی ئێمە لە ئاست کەماڵی خۆیدا نییە و ناتەواوە و جوانی یاری حەق کە لە حاڵەتی دوا پلەی جوانیدایە پێویستی بە عەشقی ئێمە نییە تا جوانتری بکات هەروەك چۆن رووخساری جوان پێویستی بە ئارایشتکردن نییە و خۆی لەخۆیدا جوانە.

بە گوتەیەکی دیکە: جوانی یار خۆی لەخۆیدا رازاوەیە و پێویستی بە عەشقی ناکاملی ئێمە نییە بیڕازێنێتەوە.

**٥- حدیث از مطرب و می گو و راز دهر کمتر جو**

**که کس نگشود و نگشاید به حکمت این معما را**

**هەدیس ئەز موتریب و مەی گوڤو رازی دەهر کەمتەر جو، کە کەس نەگشود و نەگشایەد بە هیکمەت این موئەمارا.**

باسی گۆرانیبێژ و مەی بکە و لە هەوڵی ئاشکراکردنی نهێنی گەردوون و بووندا مەبە، چونکە کەس بە فەلسەفە و حیکمەت ئەم مەتەڵەی بوونی نەزانیوە و ناشی زانێت.

حدیث: باس، قسە    مطرب: گۆرانیبێژ

دهر: زەمانە، فەلەك، گەردوون                گشودن: کردنەوە، حەلکردن، زانین
حکمت: زانست، فەلسەفە

لەم بەیتەدا قسە لەگەڵ کەسانێکدا دەکرێت کە دەیانەوێ لە ڕێگەی عەقڵ و فەلسەفەوە کێشەکانی ئەودیو سروشت و گەردوون چارە و راڤە بکەن. عارفەکان پێیان وایە عەقڵی مرۆڤ کە تەنیا شتە هەستپێکراوەکان دەبینێ و تەفسیردەکات و پابەندی هەستەکانە توانایەکی سنووردرای هەیە و ناتوانێت پەی بە نهێنی و رازەکانی دروستبوون کە نادیار و دوایی نەهاتوون ببات و راڤەیان بکات، هەر ئەم رەخنەیەشە کە هیگل لە فەلسەفەی یۆنانی دەگرێت و دەڵێ: (فەلسەفەی یۆنانی دەیەوێت دوایی نەهاتوو لە دواییهاتوودا جێگە بکاتەوە). شاعیر مەبەستی لە (حکمەت) لە بەیتەکەدا ئەم حیکمەتەی یۆنانی یە.حافز (عارفانە) بەوانە دەڵێت کە رازەکانی دروستبوون مەتەڵێکن کە بە فەلسەفە هەڵنایەن جا چاکترە لە بری خۆ هیلاککردن بەو نهێنیانەوە کە تەنێ خودا بۆ خۆی دەیانزانێ لە بارەی عیرفان و ڕێگەی عەشقی ئیلاهییەوە بدوێین و سەرگەرمی ڕێگە و تەریقەتی عیرفان و عەشق بین.

**٦- من از آن حسن روزافزون که یوسف داشت دانستم**

**که عشق از پردهء عصمت برون آرد زلیخا را**

**مەن ئەز ئان هوسنی روزەفزون کە یوسف داشت دانستەم، کە ئیشق ئەز پەردەیی ئیسمەت برون ئارەد زولەیخا را**

من دەمزانی ئەو جوانییەی یوسف کە ڕۆژ بەرۆژ لە نەشونمادا بوو سەرەنجام دەبێتە مایەی ئەوەی کە عەشق زولێخا لە پەردەی شەرم و پاکی بهێنێتە دەرەوە.

حسن: جوانی     روزافزون: شتێ ڕۆژ بە ڕۆژ لە نەشونمادابێت     عصمت: شەرم و حەیا
برون: دەرەوە  یوسف و زلیخا: حەزرەتی یوسف و زولێخای ژنی (پوطیفار)ی عەزیزی میسر

بەیتەکە لە چیرۆکی یوسف و زولێخا وەرگیراوە، وەك ئاشکرایە حەزرەتی یوسف بە جوانی بە ناوبانگە و رەمزێکە بۆ قۆزی و پێکەوتەیی. کاتێك عەزیزی میسر دەیکرێت و دەیباتەوە کۆشك، ژنەکەی حەزی لێدەکات و لە تاو عەشقی یوسف گشت شەرم و حەیایەك دەخاتە لاوە و شەیدای یوسف دەبێت. لە ئەفسانەکاندا هاتووە کە لە کۆتایی تەمەنیدا و پاش بوونە پاشای یوسف جارێکی دیکە بە دۆعای یوسف جوان دەبێتەوە و چاوە کوێرەکانی چاکدەبێتەوە و یوسف دەیخوازێ.

شاعیر دەڵێ: من هەر لەسەرەتاوە کە هەستم بەوە کرد جوانی و پێکەوتەیی یوسف ڕۆژ بەرۆژ لە گەشە و نەشونمادایە زانیم لە کۆتاییدا ئەم قۆزی و جوانخاسییە دەبێتە عەشقی



زولیخا و خۆی بۆ ناگیرێت و سەرەنجام پەردەی شەرم و حەیا دەدڕێنێت و دێتە دەرەوە و شەیدای یوسف دەبێت.

**٧- بدم گفتی و خرسندم عفاك الله نکو گفتی**

**جواب تلخ می زیبد لب لعل شکرخا را**

**بەدەم گوفتی و خورسەندەم ئەفاکەڵلا نیکو گوفتی، جەڤابی تەلخ میزیبەد لەبی لەئلی شەکەرخا را.**

قسەی خراپت پێ گوتم و رازیم و خوا بتبەخشێ چاکت گوت، چونکە لێوی سوری یاقوتین وەڵامی تاڵ شیرین دەکات.

بد: خراپ     خرسند: رازی     عفاك الله: خوا عەفوت کات          نکو: چاك    تلخ: تاڵ     می زیبد: جوانی دەکات، شیاوی دەکات     لب: لێو     لعل: یاقوت، سور     شکر: شەکر
شکرخا: شەکرکرمێن       لب لعل شکرخا: لێوی یاقوتی و سوری شیرین و قسەخۆش

دەڵێ: قسەی خراپت پێ گوتم و قسەکانت تاڵ بوون، بەڵام من رازیم و خواش لە تۆ خۆش ببێ، ئەسڵەن تۆ خراپت بە من نەگوتووە و چاکت گوتووە، چونکە لێوی سوری یاقوتینی شیرینی تۆ هەرچی بڵێت شیرینی دەکات و هەرگیز وەڵامی تاڵی لێوە دەرناچێت و شیرینی لێوت ئەویش شیرین دەکات، روونتر من لە هەموو قسەیەکی تۆ رازیم و هیچ قسەیەکت بۆ من ناخۆش نییە.

**٨- نصیحت گوش کن جانا که از جان دوستتر دارند**

**جوانان سعادتمند پند پیر دانا را**

**نەسیهەت گوش کون جانا کە ئەزجان دوستتەر دارەند، جەڤانانی سەئادەتمەند پەندی پیری دانارا.**

گوێ لە ئامۆژگاری بگرە گیانەکەم چونکە لاوانی خۆشبەخت ئامۆژگاریی پیری دانایان لە گیان خۆشتر دەوێ.

گوش کن: گوێیلێبگرە، بەگوێبکە      پند: ئامۆژگاری     دوست تردارند: خۆشتریان دەوێ

بەرامبەر خۆشەویست دەڵێ: گیانەکەم هەمیشە گوێ لە پەند و ئامۆژگاریی بگرە، ئەگەر دەتەوێ خۆشبەخت بیت گوێ لە ئامۆژگاریی پیاوی دنیادیدە و عاقڵ بگرە، چونکە لاوانی خۆشبەخت پەند و قسەی پیری دانا و ئاقڵیان لەگیانیان خۆشتر دەوێ.

**٩-غزل گفتی و در سفتی بیا و خوش بخوان حافظ**

**که بر نظم تو افشاند فلک عقد ثریا را**

**غەزەل گوفتی و دوور سوفتی بیاڤو خوش بخان هافز، کە بەر نەزمی تو ئەفشانەد فەلەك ئیقدی سورەییا را.**

حافز غەزەلت گوت و مرواریت دۆزییەوە ئێستا وەرە و بە ئاوازی خۆش گۆرانی بلێ تا گەردوون ملوانکەی سورەیا بکاتە ملی شیعری تۆ.

غزل: جۆرێکە لە شیعر کە ژمارەی بەیتەکانی (٥ ــ ١٣) یە رەنگە زیاتریش بێت

در: مرواری سفتن: دۆزینەوە، گەڕان در سفتن: گەڕان بۆ مرواری، درکەیە لە قسەی جوان و گرانبەهاکردن، واتە قورس و گران خستنەڕوو

خوش بخوان: گۆرانی خۆش بلێ (سودی) دەڵێ: "حافز زۆر دەنگی خۆش بووە"

نظم: هۆنراوە فلك: گەردوون ثریا: سورەیا، ئەستێرەی پەروین، شەش ئەستێرەی بچووکی نزیکن، بە گەردانە یاخود هێشوەترێی دەچوێنێن

حافز غەزەلەکانی خۆی بە مرواریی گرانبەها دەزانێت کە دۆزراونەتەوە و بە خۆی دەڵێ: کە غەزەلەکانت بە گۆرانی خۆش بڵێ تا سەرنجی ئاسمان راکێشی و لە جوانی و خۆشی غەزەل و گۆرانییەکانتدا گەردوون و ئاسمان سورەیا وەك گەردانەیەك بکاتە دیاری بۆ شیعرەکانت، لەم بەیتەدا شاعیر شانازی و ستایشی خۆی دەکات.





## غەزەلی پێنجەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١- دل میرود ز دستم صاحبدلان خدا را**

**دردا که راز پنهان خواهد شد آشکارا**

**دل میرەڤەد ز دەستەم ساهیبدلان خودا را، دەردا کە رازی پەنهان خاهەد شود ئاشکارا.**

دڵم لە دەستم دەردەچێ (دەڕوا) خاوەن دڵان بۆ خاتری خودا، حەیفێ کە رازە شاراوەکەی من ئاشکرا دەبێت.

دل می رود زدستم: دڵ لەدەستم دەردەچێ و ناتوانم پێش لە حەز و ئاواتەکانی بگرم و لە کۆنترۆڵم دەردەچێ.

صاحبدلان: کەسی هەستەوەر، حەساس، و خاوەنی هەستی بەهێز، عارف، رێبوار، لێرەدا لە بەرامبەر (دڵ لە دەست دەرچوو) هاتووە بە مانای خاوەن دڵ.

خدارا: بۆ خاتری خوا، لەڕای خوا

دردا: وشەی حەسرەتە، وەك بەداخەوە، بمرم، حەیف راز پنهان: رازی شاراوە

آشکار: ئاشکرا

لە کاتێکدایە کە شاعیر هەست دەکات دڵی سەودایەکی گرتووەتە سەر و لەژێر کۆنترۆڵی دەردەچێت و بەمەش گشت رازە شاراوەکانی ئاشکرا دەبن بۆیە روو لە خاوەن دڵان واتە ئەوانەی عارفن دەکات تا چارەیەکی بکەن بۆ ئەوەی دڵی بخەنەوە ژێر کۆنترۆڵی خودی شاعیر و رازەکانی ئاشکرا نەبن. دەڵێ: ئەی خاوەن دڵان، ئەی عارفەکان دڵم لە دەستم دەردەچێ و دەسەڵاتم بەسەریدا ناشکێ لەڕای خوا چارەیەکم بکەن ئەگەر نا رازی دڵم ئاشکرا دەبێت و دەبێتە مایەی ریسواییم. مەبەست لەوەیە کە دڵی شاعیر هەوای یەکێکی دەکەوێتە سەر و بەمەش تووشی ریسوایی و نائارامی دەبێت.

**٢-کشتی شکستگانیم ای باد شرطه برخیز**

**باشد که باز بینم دیدار آشنا را**

**کەشتی شکستەگانیم ئەی بادی شورتە بەرخیز، باشەد کە باز بینەم دیداری ئاشنا را.**

کەشتی شکاوم ئەی بای یارمەتیدەر هەڵکە بەڵکو دووبارە رووخساری ئاشناکەم ببینم.

کـــــشتی: کەشـــــتی         شکـــــستگانی: شـــــکاو (گیرخـــــواردو لـــــە دەریـــــادا)
برخیز: هەڵکە، هەستە    باز: دووبارە

باد شرطه: بە گوتەی (دکتر غنی) وشەیەکی هیندییە و سانسکریتی رەسەنە و (باد شرطه) واتە هەوای هاوڕێ، بایەك کە هەمان ئاراستە بێت لەگەڵ کەشتیدا.

لە هەندێ سەرچاوەدا لە جیاتی (کشتی شکستگانیم) (کشتی نشستگانیم) نووسراوە، بەڵام کەشتی نشستگانیم لە دەریادا ناگوترێت و بە کەشتییەك دەگوترێت کە هێشتا لە وشکانیدا بێت{هروی}. پەیوەندی نێوان (باد شرطه) و (کشتی شکستگانی) زۆر نزیکە، چونکە کەشتی شکستە واتە کەشتییەکی بە تەواوەتی تێکشکاو، بەڵام (کشتی شکستگانی) واتە کەشتییەك کە کەمێك شکاوە و پێویستی بە دەستێکی یارمەتی هەیە و ئەو دەستەش لە دەریادا هەوای رزگار کەرە و هاوئاراستەیە.

جگە لەمەش دەکرێ پەیوەندی نێوان (بادشرطه) و (کشتی شکستگانی) پەیوەندی ئەم چیرۆکەی خوارەوە بێت کە لە (قصص الانبیاء) هاتووە کورتەکەی ئەمەیە: رۆژێك پیرەژنێك هاتە خزمەتی حەزرەتی داود و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەندویەك ئاردم هەبوو رەشەبا دای بە زەویدا و درزی تێکرد و هەموو ئاردەکەی ناوی برد، هەقی من لە با بسەنەوە، داود گوتی: من ناتوانم حوکمی با بکەم و کەندویەکی ئاردیدا بە پیرەژنەکە، کاتێ پیرەژنەکە هاتە دەرەوە حەزرەتی سولەیمان لەبەر دەرگا وەستابوو پیرەژنەکەی بینی و لێی پرسی کە حاڵی چییە؟ پرەژنەکەش بۆی گێڕایەوە و سولەیمانیش پێی گوت: حەقی تۆ زیاترە، پیرژنەکە گەڕایەوە بۆ لای داود و ئەویش هەندێکی دیکەی بۆ زیادکرد، بەم شێوەیە تا پێنج جار سولەیمان دەیگێڕایەوە و ئەویش هەندێکی بۆ زیاد دەکرد، داود لێی پرسی کێیە دەتنێرێتەوە؟ پیرەژنەکە گوتی: سولەیمانە، داود سولەیمانی بانگکرد و پرسی بۆچی چەند جار ئەم پیرەژنەت ناردەوە؟ سولەیمان گوتی: چونکە زانیم کە زوڵمی لێکراوە، دۆعا بکە تا با بێتە دادگای شەرعەوە. داود دۆعای کرد سولەیمان ئامینی کرد و با لای داود ئامادە بوو گوتی (لێی بپرسە ئاردی پیرەژنەکەی بۆکوێ بردووە) و داود لە بای پرسی بۆچی ئاردی ئەو پیرەژنەت برد؟ با گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەوەی کردوومە بە فەرمانی خودا بووە، بە سەر دەریادا تێدەپەڕیم کەشتییەك درزی تێ ببوو خەریکبوو سەرنشینەکانی کەشتییەکە نغرۆبن، لەسەرخۆیان نەزریانکردووە کە ئەگەر رزگارمان بێت خێرێکی زۆر بکەین، خودا فەرمانی بە مندا و ئاردی ئەو پیرەژنەم برد و گەیاندمە کەشتییەکە و بە هەویرەکەی درزەکانیان گرت و



نەجاتیان بوو، داود کەسێکی نارد بۆ لای ئەوانەی لە کەشتییەکەدا رزگاریان بووە و پارەی خێرەکەی لێوەرگرتن و دای بە پیرەژنەکە.

گەر خواجە لەم چیرۆکە ئاگادار بێت ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە: من کەشتییەکی نیوەشکاوم لەنێو دەریادا گیرم خواردووە، ئەی بای فریادرەس چارەیەکم بکە و لە تێکشکانی یەکجاری و نغرۆبوون رزگارم بکە، بەڵکو جارێکی دیکە رووخساری یاری ئاشنا ببینمەوە.

**٢- ده روزه مهر گردون افسانه است و افسون**

**نیکی بەجای یاران فرصت شمار یارا**

**دەه روزه میهری گەردون ئەفسانە ئەست و ئەفسون، نیکی بە جای یاران فرسەت شومار یارا.**

میهرەبانی دە رۆژەی گەردوون چیرۆکێکی بێ بناغە و فریودەرە، ئەی یار مۆڵەت بۆ چاکەکردن لەگەڵ دۆستاندا بە غەنیمەت و دەسکەوت بزانە .

دە: دە    روز: رۆژ    مهر: خۆشەویستی، میهرەبانی، خۆر
گردون: گەردوون، چەرخ ، ئاسمان، هێزی دەسەڵاتدار کە ژیانی مرۆڤ هەڵدەسوڕێنی
افسانه: چیرۆکی درۆینە و هەڵبەستراو، ئەفسانە
افسون: سیحر و جادو کە بۆ ماوەیەك کاریگەریی دەبێت، فێڵ
نیکی: چاکی    فرصت شمار: بە دەستکەوتی بژمێرە (بزانە)

شاعیر دەڵێ: میهرەبانی و خۆشەویستیی دیاریکراو و سنوورداری گەردوون و چەرخ و ئاسمان چەند رۆژێکی کەمە و ئەویش وەك ئەفسانە بێ بناغەیە و وەك جادوش وایە کە چاوبەستە و لە ماوەیەکی کەمدا بەتاڵ دەبێتەوە، هەر بۆیە گەر چەند رۆژێکی کەمی ژیانی دونیا خۆشەویستیی بەرامبەر نواندی تووشی خۆبەزلزانین مەبە و لەو کاتی دەسەڵاتداری و بەخت باشییەدا چاکەکردن لەگەڵ دۆستانتدا بە دەسکەوت بزانە و لە چاکەکردن بەرامبەر دۆستان کەمتەرخەمی مەکە، چونکە وەك گوترا میهری گەردوون کاتییە و زوو بەسەر دەچێ.

**٣- در حلقهء گل و مل خوش خواند دوش بلبل**

**هات الصَّبووح هبووا یا أَیُّها السُکارا**

**دەر هەلقەیی گول و مول خوش خاند دوش بوولبوول، هاتی سسەبووهە هوببوو یا ئەیوهەسسوکارا.**

دوێنی شەو لە کۆڕی گوڵ و شەرابدا بوولبوول گۆرانییەکی خۆشی گوت: مەیی بەیانیان بە من بدە و ئەی مەستان لە خەو بێدار ببنەوە.

در: لە    حلقە: کۆڕ    مل: شەراب    دوش: شەوی رابردوو

هات: بە من بدە صبوح: ئەو شتەی کە لە بەیانیاندا دەخورێت یا دەخورێتەوە، لە زاراوەی مەی نۆشیدا مەیی بەیانیانە    هبوا: لەخەوڕابوون، هەستان لەخەو    سکارا: کۆی (سکران)، بە واتای مەستان

پێش شەرحکردنی بەیتەکە روونکردنەوەیەك بە گرنگ دەزانم، لای حافز زاراوەی مەی و بادەنۆشی و مەستی کۆڕی شەراب و هتد زۆر دێتە پێش چاوان و لەڕووی دەرەوەی ئەم بەکارهێنانەوە گومان بۆ ئەوە دەچێت کە حافز کەسێکی مەیخۆری مەست بێت و زۆرینەی شەوانی لەکۆڕی عارەقخۆریدا بەسەر بردبێت، ئەمە سەرباری ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لەسەر راستی ئەم قسەیە لە ئارادا نییە، مەسەلەیەکە لە حافزدا بەزۆری بەرچاو دەکەوێت، ئەویش پێدانی مانای تازەیە بە وشەکان و بێگومان ئەم کارەش باکگراوندێکی رۆشنبیری و کولتووری دەوڵەمەندی پێویستە، گومان لە رۆشنبیری حافز ناکرێت، هەربۆیە ناکرێ بڵێین بەبێ هیچ باکگراوندێك بەکارهێنراون.

هەرچەندە حافز کەسێکە زۆر دژ بە خانەقا و سۆفییەکان قسە دەکات، بەڵام باکگراوندی مانادان بە گشتی و زاراوەکانی مەینۆشی و مەحبووب و مەعشوق و هتد بە تایبەتی باکگراوندێکی پاکی عارفانەیە و بەزۆری مانای خۆیان لەدەست دەدەن و مانای دیکە وەردەگرن کە هەوڵدەدەین لەکاتی خۆیاندا راڤەیان بکەین.

کە لەم بەیتەدا دەڵێت: دوێنی شەو لە کۆڕی بادەنۆشاندا کە بە گوڵ رازێنرابوویەوە بوولبوول بە ئاوازێکی خۆش دەیخوێند و دەیگوت: شەرابی بەیانیان بدەن بە من و ئەی مەستان لە خەو رابێنەوە، چونکە کاتی خواردنەوەی شەرابی بەیانیان لەدەست دەچێت. مەبەست لە کۆڕی مەستان کۆڕی عارفان و مەبەست لە شەرابیش زیکر و عەشقی سەبای ساڵحانە.

**٤- آیینەء سکندر جام می است بنگر**

**تا بر تو عرضه دارد احوال ملك دارا**

**ئاینەیی سکەندەر جامی مەیست بنگەر، تا بەر تو ئەرزە دارەد ئەهوالی مولکی دارا.**

ئاوێنەی ئەسکەندەر پێکی شەرابە، سەیری ئەو پێکە بکە، تا دەنگوباسی مەملەکەتی (دارا)ت بۆ ئاشکرا بێت.



آیینە: ئاوێنە    آیینەء سکندر: ئاوێنەی ئەسکەندەر، (سودی) دەڵێ: "ئەسکەندەر کوڕی دارا بووە کاتێ دارا مرد کوڕێکی دیکەی بەناوی (داراب) بووە پاشا، بەڵام ئەسکەندەر لەسەر تەختی پادشاهی لەگەڵ براکەیدا بووە شەڕی و دەیگوت نیوەی مەملەکەتی باوکم هی منە، هەرکاتێ کە ئەسکەندەر نیازی شەڕی هەبووایە لەگەڵ براکەیدا (داراب) بە هۆی (جام جهان نما) ئاوێنەی جیهان بینەوە دەیزانی و هەموو شتێکی تێیدا دەبینی و ئەسکەندەریش داوای لە زاناکان کرد کە چارەیەکی بکەن و ئەوانیش ئاوێنەکەیان لە شاری ئەسکەندەرییە بۆ دروست کرد بە درێژی یەك میل کە تەواوی حەوت هەرێمەکەی تێیدا ببینێ". بەڵام گەر ئەسکەندەری مەکدۆنی بێت ئەم چیرۆکەی (سودی) دوورە لە راستییەوە. (د.هروی)ش لە بارەی ئاوێنەی ئەسکەندەرەوە دەڵێ: "ئاوێنەیەك بوو بە سەر منارەیەکی شاری ئەسکندەرییەوە چەسپکرابوو تا کەشتییەکانی دوژمنی لە دووربییەکی زۆرەوە پێببینن، بەم پێیەش تایبەتمەندی دووربینی لەم رووەوەیە، کەواتە ئاوێنەی ئەسکەندەر ئاوێنەی دووربینی یاخود جیهانبینییە جام: پێك    جام می: لەم بەیتەدا بەرامبەر (جام جم)ە و لە بری ئەو هاتووە کە هەردووکیان هی جەمشید بوون، جامی جەمیش پێکێ یاخود پەرداخێك بووە کە نادیارەکانی تێیدا دەرکەتووە و بە هۆی دووربینی و نادیاربینییەوە بە ئاوێنەی ئەسکندەر بەراوردکراوە و لە ئەدەبی فارسیدا بەواتای دووربینی و نادیاربین بەکارهێنراون بنگر: سەیرکە

بر تو: لەلات، بۆ تۆ    احوال: دەنگوباس، ئەحواڵ    ملك: مەملەکەت، دەسەڵات دارا: دواهەمین پادشای هەخامەنشییەکانە کە کەوتە ژێر دەستی ئەسکەندەر، مەبەست لە (احوال ملك دارا) پەند وەرگرتنە لە تێکشکاندنی گەورەیی دارا بە دەستی ئەسکەندەر.

کورتەی بەیتەکە: ئەوەی کە دڵی مرۆڤ وەك ئاوێنەی ئەسکەندەر رووناك بکاتەوە و فێری دووربینی و نادیاربینی بکات (کە لێرەدا رازبینی عارفانەیە) پێکی مەی (عەشق)ە و تۆش سەیری ئەو پێکە بکە و چاوت لێیەوە بێت تا رازەکانت بۆ روون و ئاشکرا بێت لە دەنگوباسی دونیای عەشق و عیرفان ئاگادار بی.

**٥- ای صاحب کرامت شکرانەء سلامت**

**روزی تفقدی کن درویش بینوا را**

**ئەی ساهیبی کەرامەت شوکرانەیی سەلامەت، روزی تەفەقودی کون دەرڤیشی بینەڤا را.**

ئەی گەورەی ساحێب کەرامەت بە شوکرانەبژێری ئەوەی، کە بێوەی و سەلامەتی، رۆژێك هەواڵێکی دەروێشی رووت و رەجاڵ و بێ نەوا بپرسە.

کرامت: بە واتای بەخشندەیی دێت و لە زاراوەی عیرفانیدا بە واتای کردنی کاری لە عەقڵ بەدەرە و لێرەدا مەبەست لە کەرامەتی ماددیە و (صاحب کرامت) واتە بەخشندە و جوامێر
سلامت: سەلامەتی، بێوەی    روزی: ڕۆژێك   تفقد: هەواڵپرسی   بینوا: بێنەوا،

ئەی جوامێر و بەخشندە، بە شوکرانەی ئەوەی کە سەلامەتی و بێوەیی ژیانتی داپۆشیوە ڕۆژێك هەواڵێکی دەروێشی ڕووت و ڕەجاڵ و بێنەوا بپرسە و دەستگرۆییان بکە.

**٦- آسایش دو گیتی تفسیر این دو حرفست**

**با دوستان مروت با دشمنان مدارا**

**ئاسایشی دو گیتی تەفسیری ئین دو هەرفەست، با دوستان مروڤەت با دوشمنان مودارا.**

ئاسوودەیی هەردوو جیهان (دونیا و قیامەت) ڕاڤە و تێگەیشتنی مانای ئەم دوو قسەیەیە کە ئەوانیش پیاوەتییە لەگەڵ دۆستان و مدارا و نەرمی نواندنە بەرامبەر دوژمنان.

آسایش: ئاسودەیی، ئاسایش    گیتی: جیهانی، گێتی    حرف: قسە
مروت: پیاوەتی    مدارا: هەڵکردن، نەرمی

واتە: مرۆڤ بۆ ئەوەی لە هەرد جیهانی دونیا و پاشەڕۆژدا بە ئاسوودەیی ژیان بەسەر ببات پێویستە لەگەڵ دۆست و خۆشەویستاندا پیاوانە بژی و خەریکی پیاوەتی کردن بێت و ویژدان بە خەرج بدات لە هاوەڵێکردندا و لەگەڵ دوژمنانیشدا نەرم و نیانی نواندن و مداراکردنیان.

**٧- در کوی نیکنامی ما را گذر ندادند**

**گرتو نمی پسندی تغییرکن قضا را**

**دەر کویی نیکنامی مارا گوزەر نەدادەند، گەر تو نەمی پەسەندی تەغییر کون قەزارا.**

ئێمە لە چارەنووسمان نەنووسراوە کە لە گەڕەکی پیاوچاکییەوە گوزەر بکەین ئەگەر تۆ ئەم چارەنووسە پەسەند ناکەیت ویست و مەشیئەتی ئیلاهی بگۆڕە، کە مەحاڵە!.

کوی: گەڕەك، کۆڵان    نیکنامی: پیاوچاکی، ناوداریی بەچاکی    گذر: تێپەڕین، گوزەرکردن    گر: ئەگەر    نمی پسندی: پەسەندی ناکەیت    تغیرکن: بگۆڕە    قضا: دەستوور و حوکم یان ویستی خودایی (مەشیئەتی ئیلاهی) مەسەلەی گرینگ لەم بەیتەدا مەسەلەی (جەبرییەتە) کە لە چەندین جێگەی دیکەدا دێتە پێش چاومان، حافز بڕوای بە جەبرییەت هەیە لە چارەنووس و بڕیاردانی مرۆڤدا و لای ئەو مرۆڤ هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە لە سەری نووسراوە کە ناودار و پیاوچاك بێت یاخود بە پێچەوانەوە و بە ئارەزووی خۆی چارەنوزسی خۆی هەڵنەبژاردووە و هەر ئەو هەنگاوانە هەڵدەگرێت کە لە بڕیاری خوداییدا بۆی



دیاریکراوە. ئەم بیروڕایەش تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو بڕوایەی کە پێیان وایە مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی چارەنووسی خۆی دیاری دەکات و لە تەواوی ژیانیدا سەر بەستە.

لەم بەیتەشدا دەڵێ: ئێمە هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە بڕیاری ناوداریی ئێمە بە چاکی ڕەتکراوەتەوە و گوناهمان نییە کە ئێستا وانین گەر تۆش ئەمە پەسەند ناکەیت و دەتەوێ ناوداربین ئەوە تەقدیری ئیلاهی بگۆڕە، چونکە هیچ لە دەستی ئێمەدا نییە کە ئەمەش مەحاڵە و هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت.

**٨- آن تلخ وش که صوفی ام الخبائثش خواند**

**اشهی لنا و احلی من قبلة العذارا**

**ئان تەلخوەش کە سوفی ئومولخەبائیسەش خاند، ئەشهی لەنا ڤە ئەهلا مین قوبلەتیلئوزارا.**

ئەو تاڵیی (شەراب)ەی کە سۆفی بە سەرچاوەی کاری ناڕەوا و گوناهی دایە قەڵەم بۆ ئێمە خۆشتر و شیرینترە لە ماچی (پاکیزەکان).

آن: ئامرازی ئاماژەیە بۆ دوور، ئەو    تلخ وش: تاڵی، مەی، شەڕاب    ام الخبائث: دایکی پیسییەکان، شەڕاب    اشهی: خۆشترە، بەلەزەتترە    احلی: شیرینترە    قبلە: ماچ    العذارا: کۆی (عذراء)ە، بە واتای کچی شونەکردووە، پاکیزە (وەك ئاوەڵناوێك بۆ ئەو کچە ئیماندار و داوێنپاکانە دێت کە داوێنی خۆیان پاراستووە و هێشتا کچن وەك دەگوترێ (مەریەمی پاکیزە) یا (عەزرا).

واتە ئەو تاڵییەی کە سۆفی لە کاتی وەسفکردنیدا بە دایکی گشت گوناه و خراپەکارییەکانی دایە قەڵەم لای ئێمە لە ماچی کچە پاکیزەکان شیرینتر و خۆشترە، بێگومان (ام الخبائث) لە حەدیسێکی پێغەمبەر (د.خ) وەرگیراوە کە دەفەرمووێ (الخمر ام الخبائث فمن شربها لم تقبل صلاته اربعین یوماً) {هروی، ج ١، ل٢٩ }.

واتە شەڕاب دایکی خراپەکانە و هەرکەس خواردیەوە چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت. بە ئاماژە بەم فەرموودەیە (سودی) ئەم شەرحە بە ڕووکاری بەیتەکە دەزانێت و پێشی وایە کە لە ئاستی قووڵی بەیتەکەدا مەبەست لە سۆفی خودی پێغەمبەرە (د.خ) چونکە پێغەمبەر شەڕاب بە (ام الخبائث) ناو دەبات و مەبەستی بەیتەکە دەبێتە: ئەو قسەیەی پێغەمبەر (د.خ) کە شەڕابی بە دایکی ناڕەوایی و خراپەکارییەکان داناوە، بۆ ئێمە لە ماچی پاکیزەکان شیرینتر و خۆشترە.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە (د.هەروی) سەرباری ئەوەی کە فەرموودەی (ام الخبائث)ی هێناوەتەوە رای وایە کە مەبەست لە سۆفی (شێخ عەتار)ە و پێش حافز شێخ عەتار مەیی بە (ام الخبائث) داناوە وەك لەم دێڕەدا:

**بسی کسا کز خمر ترك دین کند    بی شك ام الخبائث این کند**

بەهەرحاڵ گەرمەبەست لە سۆفی خودی پێغەمبەر (د.خ) یا شێخ عەتار بێت ئەوا هەردوو شەرحەکە لەڕاستییەوە نزیك دەبێتەوە واتە حافز مەی لە ماچی کچە پاکیزەکان بە خۆشتر و شیرینتر دەزانێت، ئەمەش یەکێکە لە تایبەمەندییەکانی شیعری حافز کە چەندین مانا لە ژێر وشەکانی تاکە بەیتێکیدا هەڵدەهێنجرێ و پێدانی ماناکان پەیوەست دەبێت بە باکگراوندی خوێنەرەوە. لەڕاستیدا حافز بە چاوی رێزەوە سەیری سۆفی ناکات و بە زۆری بە توانجەوە باسی دەکات و لێرەشدا بە هەمان مەبەست هاتووە و لە شەرح و مەبەستەکەی (سودی) دوورە.

**٩- هنگام تنگدستی در عیش کوش و مستی**

**کاین کیمیای هستی قارون کند گدا را**

**هەنگامی تەنگ دەستی دەر ئەیش کوش و مەستی، کین کیمیای هەستی قارون کونەد گەدا را.**

کاتی هەژاری و دەستکورتی هەوڵی سەرگەرمی و بادەنۆشی بدە، چونکە ئەم ئیکسیرەی بوون سواڵکەر دەکاتە قارون یاخود سەروەتی قارون دەداتە سواڵکەری موحتاج.

هنگام: کاتی    تنگدستی: دەستکورتی

درعیش کوش: هەوڵی رابواردن و سەرگەرمی بدە

کیمیا: هونەرێك یاخود زانستێکە کە بە هۆییەوە هەندێ کانزای وەك ئاسن و مس دەکەن بە ئاڵتون . ئەم هونەرە جۆرێك لە فێڵی تێدایە و بە فێڵ دەدرێتە قەڵەم و کیمیاگەر بە خاوەن فێڵ دەدرێتە قەڵەم    کیمیای هستی: ئیکسیری ژیان، کیمیای ژیان

قارون: کوڕەپوری حەزرەتی موسایە و زۆر دەوڵەمەند بووە. لە ئەدەبیاتی فارسیدا رەمز و سومبوولی دەوڵەمەندی و بە توانابییە. لە نێوان کیمیا و قاروندا ئەو پەیوەندییە هەیە کە لە تەفسیری (الکشاف)ی زمخشەریدا هاتووە کە حەزرەتی موسا ئەو هونەرەی زانیوە و خوشکەکەی فێرکردووە و خوشکەکەشی قارونی فێرکردووە، لە هەندێ راڤەی قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە قارون سەروەت و سامانەکەی لە رێگەی کیمیاوە بەدەستهێناوە واتە مس و ئاسنی کردووەتە ئاڵتون.



ژیان و بوون لە بنەڕەتدا ئیکسیرێکی گرانبەها بووە قارون بە هۆی ئەوەوە سەروەت و سامانەکەی بەدەستهێناوە.

کەواتە لە بەیتەکەدا بەرامبەر مرۆڤ قسە دەکات و دەڵێ: کاتی هەژاری و دەستکورتی لە جیاتی ئەوەی غەمگین و پەشێوحاڵ بیت، کاتی خۆت بە خۆشی بەسەر بەرە و بادە بنۆشە چونکە بوونی خۆت کیمیا و ئیکسیرێکی گرانبەهایە و دەتوانێ تۆ بگەیەنێتە سەروەتی قارون هەروەك چۆن ئەوی گەیاند. بەڵام (سودی) تەواو بە پێچەوانەوە ئەم بەیتە مانا دەکات و دەڵێ: کاتێ بادە بنۆشی و مەست بیت ئەم کیمیایەی ژیان (شەراب) قارون دەکات بە سواڵکەر واتە سەرخۆش دەبیت و لە کاتی مەستیشدا خۆت بە پادشا دەزانیت و وا هەست دەکەیت بوویتە قارون و خاوەن سەروەت و سامان.

**١٠- سرکش مشو که چون شمع از غیرتت بسوزد**

**دلبر که در کف او موم است سنگ خارا**

**سەرکەش مەشو کە چون شەمع ئەز غیرەتەت بسوزەد، دولبەر کە دەر کەفی ئو مومست سەنگی خارا.**

سەرکەش مەبە ئەگەر نا دولبەر کە بەردی (خارا) رەق لە بەردەستیدا وەك مۆم نەرمە بە هۆی غیرەتەوە وەك مۆم دەتسووتێنێ.

سرکش: سەرپێچیکردن، سەرکەش    مشو، مەبە    شمع: مۆم    کف: دەست

موم: مۆمی شانەی هەنگ، ماددەیەکی نەرمی زەردە لە درەخت دەچۆڕێت یاخود لە شانەی هەنگدا هەیە    سنگ: بەرد    سنگ خارا: بەردی رەقی ئاگرین، گرانێت

بەدەستهێنانی دولبەر یار سەرپێچی نەکردن و خۆتەسلیمکردنە بە ئەو، چونکە دولبەر دوو سیفەتی هەیە کە یەکەمیان بەدەسەڵاتە و بەردی رەقی گرانێت لە دەستی ئەودا وەك ئەو ماددە نەرمە (مۆم) وایە کە بە ئاسانی دەسەڵات بەسەریدا دەشکێ و لەلایەکی دیکەوە (غیرە) ی زۆرە، چونکە مۆم بە شەوق و تیشکی خۆی لاف و گەزافی جوانی وەك رووخساری یاری لێداوە و یاریش لە (غیرە)دا سووتاندوویەتی تۆش گەر بتەوێ لە بەرامبەر یاری دەسەڵاتدار و خاوەن (غیرە)دا سەرپێچی بکەیت و لافی گەورەیی لێ بدەیت وەك مۆم دەتسووتێنێ و لەناوت دەبات. بەمەش بۆ ئەوەی کە دولبەرت بێت پێویستە خۆت تەسلیم بکەیت ئەگەرنا لێت توڕە دەبێت و عاجز دەبێت، هەر ئەمەیە وێنەی ئەو نەرم و نیانییەی کە لە خۆشەویستیدا پێویستە و لە عەشقدا تەسلیم بوون مەرجە نەوەك سەرپێچی و سەرکەشی.

عارفەکان زۆر لە غیرەتی ئیلاهی سەبارەت بە تێکەڵاوکردنی عەشقی ئەو و شتی دیکە دواون و ڕێبوارەکانی ئەو ڕێگەیەیان بە وردی ئاگادارکردووەتەوە.

**١١- ترکان پارسی گو بخشندگان عمرند**

**ساقی بده بشارت پیران پارسا را**

**تورکانی پارسی گو بەخشەندەگانی ئومرەند ، ساقی بدە بەشارەت پیرانی پارسا را.**

تورکانی فارسیزان ژیان دەبەخشن، ساقی ئەم مژدە خۆشە بگەیەنە بە لەخواترسە پیرەکان.

ترکان: تورکان، جوانان، (بڕوانە شەرحی: ترکی شیرازی) دەکرێ، لێرەدا مەبەست لە (ترکان) هەمان تورکانی ناو (شیراز) بن یاخود سیمبولێك بێت بۆ جوانی   بخشندگان عمرند: ژیانبەخشن بشارت: مژدە       پیر: پیر       پارسا: خۆپارێز، تەقوادار، زاهد، ئیماندار، خواناس

دەڵێ: ساقی مژدە بدە بە پیرە خواناسەکان کە جوانە فارسەکان ژیانیان پێدەبەخشێت، بۆیەش ساقی بۆ گەیاندنی ئەم هەواڵە ڕاسپاردووە تا بە پیرەکان بڵێت گەر ئێوە لەوە دەترسن مەیخواردنەوە تەندروستیتان تێکبدات و تەمەنتان کورت بێتەوە نیگەران مەبن، چونکە هاوڕێیەتی ئەو جوانە فارسی زمانانە تەمەنتان درێژتر دەکاتەوە و دەرەنگتر دەمرن.

حافز پێیوایە کە جیلوەی جەمالی حەق و عەشقی ئەو ژیان دەبەخشێت نەوەك زوهد و خۆپارێزی و بە ساقی (ناوەندی پەیوەندی) دەڵێت ئەم ڕاستییە بەوان بڵێت.

**١٢- حافظ به خود نپوشید این خرقهء می آلود**

**ای شیخ پاك دامن معذور دار ما را**

**هافز بەخود نەپوشید ئین خیرقەیی مەی ئالود ، ئەی شەیخی پاکدامەن مەئزور دار ما را.**

حافز بە ئارەزووی خۆی ئەم خرقە بە مەی ئاوێزانەی لەبەر نەکرد ئەی شێخی داوێنپاك ئێمە ببەخشە و پۆزشی ئێمە قەبووڵ بکە.

بەخود: بەئارەزووی خۆی       نپوشید: نەیپۆشی، لەبەرینەکرد       خرقە: بەرگی سۆفییەکان       می آلود: بە مەی ئالودە، گوناهبار       پاکدامن: داوێنپاك،

دیسانەوە حافز قسە لەسەر جەبرییەت دەکات و ڕووبەڕووی شێخی داوێنپاك (کە ڕەنگە تەشەر بێت) دەڵێت حافز بە ئارەزووی خۆی ئەم خرقەیەی گوناهباری و بە مەی ئاوێزانەی لەبەرنەکرد و لە حوکمی ئەزەلەوە بۆی دانرا کەوا بکات . ئەی شێخی داوێنپاك عوزر و پۆزشی ئەو قەبووڵ بفەرموو گلەیی و گازاندەی ئاراستە مەکە، ڕەنگە لەم بەیتەدا ئاماژەیەکی ناراستەوخۆ بێت بۆ ئەو شێخانەی کە لەڕووی دەرەوەی بە داوێنپاکی بەناوبانگن و لەژێرەوە بەو شێوەیە نین.





یکی از صفحات دیوان حافظ در مجموعهٔ موزهٔ قونیّه
و بزرگنمایی آخرین صفحهٔ همان مجموعه

## غەزەلی شەشەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١-صبا به لطف  بگو آن غزال رعنا را**
**که سر به کوه و بیابان تو دادەای ما را**

**سەبا بە لوتف بگو ئان قەزالی (غەزالی) رەئنا را، کە سەر بە کوە و بیابان تو دادەیی ما را.**

ئەی بای سەبا بە نەرمی بەو ئاسکە جوانە بڵێ: کە ئێمە لەبەر خاتری تۆ سەرگەردانی کێو و بیابان بووین.

لطف: نەرمی و ناسکی، لێرەدا ئاوەڵناوی دەنگە      غزال: ئاسك
رعنا: گوڵێکە کە لایەکی سوورە و لایەکەی دیکەی زەردە، بەڵام لێرەدا ئاوەڵناوە بە مانای جوان و بەژنرێك      کوە: کێو      سردادن: سەرگەردان، بەرەڵابوون، رووکردن

یار و خۆشەویستی خۆی بە ئاسکێکی جوان و بەژنرێك چواندووە و بە بای سەبا دەڵێت: کە ئەم هەواڵە بە نەرمی و ناسکییەوە بەگوێی ئەو یارەدا بدە کە وەك ئاسکێکی جوان وایە و پێی بڵێ: کە ئێمەی عاشقان لە عەشق و خۆشەویستی ئەودا دێوانە بووین و سەرگەردانی کێو و بیابان بووین و لە شار دەرچووین.

خاڵی جوانی ئەم بەیتە لەوەدایە کە ئاسك لە بیاباندایە و شاعیر لە شاردا، بەڵام ئاسکی جوان لە شاردایە و شاعیر لە کێو و بیاباندا.

**٢-شکرفروش که عمرش دراز باد چرا**
**تفقدی نکند طوطی شکرخا را**

**شەکەرفروش کە ئومرەش دراز باد چرا، تەفەققودی نەکونەد توتیی شەکەرخا را.**

نازانم بۆچی شەکر فرۆش ـ یاخوا تەمەنی درێژ بێت ـ ئەحواڵێکی توتی شەکرکرمێن ناپرسێت.

شکرفروش: شەکرفرۆش، بەمەجازی مەبەست لە یاری قسە شیرین یاخود لێوشیرینە
عمرش دراز باد: تەمەنی درێژ بێت      چرا: بۆچی      تفقد: ئەحواڵپرسین، دڵدانەوە
شکرخا: ئاوەڵناوەێکە بۆ توتی واتە شەکرکرمێن، شەکرخۆر



لە رابردوودا شەکر رەق بووە و بۆ شکاندنی، ددان پێویست بووە و کرمێنراوە و شەکرکرماندن سیفەتێکی توتی بووە، لێرەدا مەبەست لە توتی، شاعیر خۆیەتی، چونکە قسەی شیرینی وەك شەکر دەکات.

گلەیی لە یاری قسەشیرین یاخود لێوشیرینی خۆی دەکات و دەڵێ یاخوا تەمەنی درێژبێت کە دەزانێ من وەك توتی حەزم لە شەکری لێوی ئەوە (واتە قسەی شیرینی ئەو)، هەواڵێکم ناپرسێت و قسەی شیرینم لەو لێوە شیرینانەوە لەگەڵ ناکات.

**٣-غرور حسن اجازت مگر نداد ای گل**
**که پرسشی بکنی عندلیب  شیدا را**

**غروری هوسن ئیجازەت مەگەر نەداد ئەی گول، کە پورسشی بکونی ئەندەلیبی شەیدا را.**

ئەی گوڵ دەڵێی نازی جوانیی مۆڵەت نادات، کە ئەحواڵێکی بوولبوولی شەیدا و پەشێوحاڵ بپرسی.

حسن: جوانی      اجازت: مۆڵەت، ئیجازە      مگر: دەڵێی      پرسش: پرسیار
عندلیب: بوولبوول      شیدا: شەیدا، دێوانە، پەشێوحاڵ

لەم دێرەدا گوڵ و بوولبوولی شەیدا، مەعشوقی جوان و عاشقی شێت و شەیدان و شاعیر روو بە یاری دەڵێ: جوانیت لای هەمووان پەسەندە و ئەمەش مەغروری کردوویت و غرور و نازی جوانیت رێگەی ئەوەت نادات کە ئەحواڵێکی عاشقی شێت و شەیدای خۆت بپرسی.

**٤-به خلق و لطف توان کرد صید اهل نظر**
**به دام و دانه نگیرند مرغ دانا را**

**بە خولق و لوتف تەڤان کەرد سەیدی ئەهلی نەزەر، بە دام و دانە نەگیرەند مورغی دانا را.**

دڵی مرۆڤی هۆشیار و دووربین بە رەوشتبەرزی و نەرم و نیانی بەدەست دێت و راو دەکرێت، ناتوانرێت باڵندەی زیرەك و دانا بە داو و دان بگیرێت.

خلق: رەوشتبەرزی      توان کرد: دەتوانرێت بکرێت      صید: راو      اهل نظر: خاوەن را، وشیار و دووربین      دام: داو      دانە: دان      مرغ دانا: یا مرغك دانا: باڵندەی وشیار هەروەها درکەیە لە سیمورغ و توتی هەروەك چۆن باڵندەی دانا بە داو و دان راو ناکرێت هەرواش مرۆڤی هۆشیار و خاوەن را هەرگیز بە فێڵ دڵیان ناکێشرێت و گەر توش دەتەوێت دڵی مرۆڤە هۆشیارەکان بۆ لای خۆت  راکێشیت. رەوشبەرز و نەرم و نیان بە، چونکە ئەم دوو سیفەتە دەبێتە مایەی بەدەستهێنانی دڵی کەسە هۆشیارەکان و دڵی ئەوان تەنیا بەو دووانە راودەکرێت.

**٥-ندانم از چه سبب رنگ آشنایی نیست**

**سهی قدان سیه‌چشم ماه‌سیما را**

**نه‌دانم ئه‌ز چه سه‌به‌ب ره‌نگی ئاشنایی نیست، سه‌هی قه‌دانی سیه‌ه چه‌شمی ماه سیما را.**

نازانم بۆچی له وجودی ئه‌وانه‌ی كه به‌ژنرێك و چاوڕه‌ش و رووخسار وه‌ك مانگن نیشانه‌یه‌كی ئاشنایی نییه.

ندانم: نازانم   از چه سبب: له‌به‌ر چ هۆیه‌ك، بۆچی   رنگ آشنایی: نیشانه‌ی ئاشنایی   سهی قد: به‌ژنرێك   سیه‌چشم: چاوڕه‌ش   ماه سیما: رووخسار وه‌ك مانگ

شكاتێكی دۆستانه‌ی شاراوه‌یه له یاران كه بۆچی له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌مزو جوانییه‌دا كه به‌ژنرێك و چاوڕه‌شن و رووخساریان وه‌ك مانگ گه‌ش و دره‌وشاوه‌یه لایه‌ك به‌لای ئاشناكاندا ناكه‌نه‌وه و نیشانه‌یه‌كی ئاشنایه‌تی ده‌رناكه‌وێت تیایاندا.

**٦-چو با حبیب نشینی و باده پیمایی**

**به یاد دار محبان باد پیما را**

**چو با هه‌بیب نشینی و باده په‌یمایی، به یاد دار موهیبانی باد په‌یما را.**

كاتێ له‌گه‌ڵ خۆشه‌ویستاندا داده‌نیشی و باده‌دابه‌ش ده‌كه‌ن یادێكی دۆستان و عاشقانی بێبه‌ش بكه‌ره‌وه.

نشینی: داده‌نیشی   باده: پێك   باده‌پیمایی: باده‌پێوان و شه‌راب به باده دابه‌شكردن   بادپیما: هه‌وا پێوان كه‌سێ كه كاری بێ هوده ده‌كات و بێبه‌رهه‌مه.

ده‌ڵێ: كاتێ له كۆڕی مه‌ینۆشیدا له‌گه‌ڵ دۆستاندا خه‌ریكی دابه‌شكردن و پێدانی پێكه‌كانن و باده دابه‌ش ده‌كه‌ن، یادێكی دۆسته بێبه‌ش و خه‌یاڵپڵاوه‌كان بكه‌نه‌وه كه به كاری هیچ و پوچه‌وه خه‌ریكن و له تام و چێژ بێ ئاگان.

(سودی) له شه‌رحه‌كه‌ی خۆیدا ئه‌م دێڕه‌ی له بری دێڕی سێیه‌م داناوه.

**٧-جز این قدر نتوان گفت در جمال تو عیب**

**كه خال مهر و وفا نیست روی زیبا را**

**جوز ئین قه‌در نه‌ته‌ڤان گوفت ده‌ر جه‌مالی تو ئه‌یب، كه خالی میهر و ڤه‌فا نیست روی زیبا را.**

ناتوانرێت هیچ ره‌خنه‌یه‌ك له جوانی تۆ بگیرێت ته‌نیا ئه‌وه‌نده نه‌بێ به‌سه‌ر ئه‌و رووخساره جوانه‌وه خاڵێك یاخود نیشانه‌یه‌كی بچووكی میهر و وه‌فا نییه.

جز: جگه   این قدر: ئه‌مه‌نده   نتوان گفت: ناتوانرێت بگوترێت   خال: خاڵ، نیشانه



شاعیر كاتێ له جوانی و دڵڕه‌قی یاری خۆی ورد ده‌بێته‌وه وه‌سفێكی جوانی و دڵڕه‌قی و بێوه‌فاییه‌كه‌ی پێكه‌وه ده‌كات و ده‌ڵێ: رووخساری تۆ هێنده جوانه كه كه‌س ناتوانێت ره‌خنه‌ی لێبگرێت و عه‌یبێكی تێدا بدۆزێته‌وه. به‌ڵام هه‌روه‌ك چۆن خاڵێك رووخسار جوانتر ده‌كات میهر و وه‌فاش ئاوا جوانتری ده‌كردی، به‌ڵام به‌داخه‌وه ئه‌و خاڵ و نیشانه‌یه دیار نییه و میهره‌بان و به وه‌فا نیت، به‌ڵكو جه‌فاكاریت.

**٨-در آسمان نه عجب گر به گفته‌ء حافظ**

**سماع زهره به رقص آورد مسیحا را**

**ده‌ر ئاسمان نه ئه‌جه‌ب گه‌ر به گوفته‌یی هافز، سه‌مائی زوهره به ره‌قس ئاڤه‌ره‌د مه‌سیها را.**

جێگه‌ی سه‌رسوڕمان نییه گه‌ر گۆرانی زوهره كه شیعره‌كانی هی حافز بن عیسا مه‌سیح له ئاسماندا بخاته سه‌ما.

سماع: گۆرانی، سرود، له روانگه‌ی عیرفانییه‌وه سه‌مای ده‌روێشانه‌یه (كه له شوێنی خۆیدا به درێژی باسی ده‌كه‌ین).

زهره: زوهره، نجومگه‌ر و فه‌له‌كناسه‌كان ئه‌م ئه‌ستێره‌یه به ئه‌ستێره‌ی خه‌ڵكی جوانپه‌رست و شایی و له‌هوله‌عب و گۆرانی عه‌شق و گاڵته‌جاڕی و رابواردن و سوێندی درۆ ده‌زانن، ناوێكی دیكه‌ی زوهره (ناهید)ه و له ئه‌فسانه‌ی یۆنانییدا (ئه‌فرۆدیت) و لای رۆمییه‌كان خوداوه‌ندی عه‌شق بووه و ناوێكی دیكه‌شی (بیدخت)ه و به‌گۆرانی بێژی گه‌ردوونیش ناونراوه.

مه‌سیحا: حه‌زره‌تی مه‌سیح، كه هه‌ڵكێشراوه بۆ ئاسمان

شاعیر، حه‌زره‌تی مه‌سیح (سڵاوی خوای لێ بێ) به ره‌مز و سومبوولی پاكی و زوهره‌شی به نیشانه‌ی زه‌وق و گۆرانی داناوه و بۆ شانازی به شیعری خۆیه‌وه ده‌ڵێ: گه‌ر زوهره‌ی ئاسمان گۆرانی بڵێت و وشه‌ی ئه‌و گۆرانییه شیعری حافز بێت ئه‌وا ئه‌وه‌نده هه‌ست بزوێن ده‌بێت كه جێگه‌ی سه‌رسوڕمان نییه حه‌زره‌تی مه‌سیح به كاریگه‌ری ئه‌و گۆرانییانه له ئاسماندا بكه‌وێته سه‌ماكردن.





## غەزەلی حەوتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١-صوفی بیا که آیینهء صافیست جام را**
**تا بنگری صفای می لعل فام را**

**سوفی بیا کە ئاینەیی سافیست جام را، تا بنگەری سەفای مەی ی لەئل فام را.**

سۆفی وەرە کە پێك ئاوێنەی روون و بێ لەکەیە، تا پاکی و ئاڵی شەرابی سور ببینی.

صوفی: سۆفی، لە بارەی بنچینەی وشەی سۆفییەوە چەندین را هەیە کە یەکێك لەوانە لە (صوف)ەوە هاتووە بە واتای خوری، چونکە سۆفییەکان بە زۆری جل و بەرگی خورییان لەبەرکردووە، هەروەها لە فارسیدا لە بری (صوفی) (پشمینە پوش ـ خوری لەبەر)یش بەکاردێت بیا: وەرە آیینە: ئاوێنە، لێرەدا مەبەست لەو شووشەیە کە پێکی لێ دروستکراوە یاخود شووشەی پێك بنگری: ببینی، سەیرکەیت صفا: پاك لعل فام: یاقوتین، سوری ئاڵ

بەرامبەر بە سۆفی دەڵێت، چونکە ئەو شووشەیەی کە پێکی لێ دروستکراوە بێ لەکە و خەوشە پاکی شەرابەکەی ناوی بە جوانی دەردەکەوێت، تۆش وەرە سەیری بکە تا ئەو پاکی و ئاڵییەی ئەو شەرابە ببینی، لە حافزدا خرقەی بەری سۆفی کە لە خوری دروستکراوە داپۆشەری گشت عەیبە و نەنگی و ناتەواوییەکانە، بەڵام بە سۆفی دەڵێ: چونکە بەرگی شەراب یاخود پێك لە شووشەی بێ لەکە دروستکراوە جوانییەکانی شەرابیش لەناویدا دەدرەوشێتەوە. دەکرێ ئەم بەیتە بانگەوازێك بێت بۆ فڕێدانی پەردەی نێوان مرۆڤەکان و هاتنە ئارای شەفافییەت لە پەیوەندییەکاندا، هەروەها دەکرێ بانگکردنی سۆفی بۆ سەیرکردنی شەراب جۆرێك لە تانە بێت لە سۆفی کە داوەتکراوە بۆ ئەوەی لە پاکی و سافی شەراب فێرە پاکی و سافیی دڵ بێت. لە روانگەی عیرفانیشەوە داوەتکردنە بۆ عەشقی حەقیقی حەق.

**٢-راز درون پرده ز رندان مست پرس**
**کاین حال نیست صوفی عالی مقام را**

**رازی دەرونی پەردە ز رەندانی مەست پورس، کین هال نیست سوفیی ئالی مەقام را.**

نهێنییەکانی پەردە لە رەند و مەستان بپرسە چونکە سۆفی پایەبەرز حاڵی وای نییە تا نهێنی بزانێت.

دررون: ناو، بەڵام لەکوردیدا دەگوترێت پشت پەردە نەوەك ناوپەردە     رند: بێ باك، لە حافزدا بۆ عاشقانی راستەقینە بەکاردێ کە گوێ بە بەندوباوی کۆمەڵایەتی نادەن

مست: مەست     پرس: بپرسە

حال: حاڵ، لە سۆفێگەریدا (حاڵ و مەقامات) هەیە، حاڵ شتێکە یاخود مانایەکە لەلایەن خوداوە بخرێتە دڵی مرۆڤەوە بەبێ ئەوەی لە وەرگرتن یاخود رەتکردنەوەیدا هیچی بەدەست بێت، واتە حاڵ فەیزێکی ئیلاهییە و بەمرۆڤ دەدرێت . بۆ نموونە حاڵی وەك خۆشی و خەمباری کە بۆ ماوەیەکە و پاشان کۆتایی دێت، چونکە زۆرێك لە عارفەکان پێیان وایە کە حاڵ بەردەوام نابێت (حال لە بەرامبەر قال) دا دادەنرێت.

عالی مقام: پایەبەرز، بەڵام لێرەدا تانە لە سۆفی دراوە، چونکە سۆفی خۆی، خۆی بە پایەبەرز دەزانێ و لە هەمانکاتیشدا ئەم بۆچوونە لەگەڵ حاڵدا یەکناگرێتەوە چونکە پشتگوێ خستنی ماڵ و پلەوپایە لە پێویستییەکانی حاڵە.

لەم بەیتەشدا حافز هەر لەسەر سۆفی دەڕوات، توانجێکی دیکەیان لێ دەدات و، مەبەستیشی لەو سۆفییانەیە کە بەو ناوەوە لە دوای پلەوپایە و سەروەت و سامان، دەگەڕێن چونکە لە راستیدا حاڵ تایبەتە بە سۆفییەوە، بەڵام لێرەدا رەندە مەستەکان دەکرێ ئەوان بن کە چاویان لە هەموو پلەوپایە و سەروەت و سامانێك پۆشی بێت هەربۆیە دەگەنە حاڵ.

شاعیر دڕکاندن و کەشفکردنی رازی پشت پەردەی بە حاڵێك داناوە کە لەڕووی هەوڵی ماددییەوە نایەتەدی و دەڵێت: سۆفی پایەبەرز ئەو حاڵە نایگرێ ئەگەر دەتەوێ لە نهێنییەکانی عەشق و ئەودیو پەردە شارەزا ببیت لە بێ باکە مەستەکان بپرسە.

سودی لە شەرحەکەی خۆیدا ئەم بەیتەی لە شەشەمدا داناوە و لەبری (صوفی) (زاهد) ی بەکاربردووە و بە پێچەوانەی ئەم شەرحەی سەرەوە مانای بە وشەکان داوە.

ئەو دەڵێت رازی پشت پەردە لە مەست و سەرخۆشەکان بپرسە نەك لە زاهیدی پایەبەرز چونکە زاهیدی پایەبەرز بەراستی عاشق و عەشق ویستە و هەرگیز ئامادە نییە نهێنییەکانی عەشق بخاتەڕوو، ئەوە سەرخۆشەکانن کە لەو حاڵەدا هەرچی بزانن دەیڵێن، لای سودی لەم بەیتەدا(رند) مانایەکی نێگەتیڤی هەیە و (زاهد)یش مانایەکی پۆزەتیڤی.

**٣-عنقا شكار كس نشود دام باز چين**

**كانجا هميشه باد به دست است دام را**

**ئەنقا شكاری كەس نەشەڤەد دام باز چین، كانجا هەمیشە باد بە دەستەست دام را.**



کەس ناتوانێت سیمورغ راو بکات، داوت کۆکەرەوە، چونکە لە جێگەی سیمورغ جگە لە هەوا هیچ بە داوەوە نابێت.

عنقا: سیمورغ، باڵندەیەکی گەورەیە و لە بەیتەکەدا مەبەست لە خۆشەویست و یاری عیرفانییە.(سودی) سەبارەت بە سیمورغ نووسیویەتی: باڵندەیەکی گەورەیە کە ناوی هەیە و خۆی نییە (موجود الاسم و معدوم الجسم). لەو رووەوە کە گوایە کەی سیمورغ دەرکەوتووە جیاوازی هەیە، هەندێك دەڵێن لە سەردەمی حەزرەتی موسادا (سەلامی خوای لێ بێت) خوا لە دەوروبەری (قودس)دا جووتێك باڵندەی سیمورغی دروستکرد و پاش کۆچی دوایی موسا ئەم دوو باڵندەیە بەرەو کێوەکانی نزیك مەککە کۆچیانکرد. دەڵێن سیمورغ لە سەردەمی نەتەوەی (رەس)دا (نەوەی شوعەیب پێغەمبەر — سڵاوی خوای لێ بێ — سورەتی فورقان ئایەتی ١٣٨) دەرکەوتووە و هەندێ دەڵێن ماوەی تەمەنی ئەم باڵندەیە تا سەردەمی حەزرەتی (خالیدی کوڕی سنان) بووە کە پێغەمبەرێك بووە و لە سەردەمی فترەتدا (سەردەمی نێوان حەزرەتی عیسا و محمد ـ د.خ) ژیاوە. نەتەوەکانی پێشوو (سیمورغ — عنقا) یان وەك پەندێك دەهێنایەوە بۆ شتێك کە ناویان دەبیست و هەرگیز نەیاندەبینی لە کوردیشدا دەگوترێت: دەنگی هەیە و رەنگی نییە.     بازچین/برچین: هەڵگرەوە، کۆکەرەوە

باد بە دست است: هەوا بەدەستە، درکەیە لەوەی کە هیچ بەدەست نایەت

دیسان بە سۆفی دەڵێت: گەر دەتەوێت خۆشەویست و یاری عیرفانی دەست بخەیت ئەم دام و دەزگای فێڵ و تەڵەکەیە کە لە کاری جادووبازەکان دەچێت و دەتەوێ خەڵکی پێ فریو بدەی، هەڵگرە و لای بەرە، چونکە بەدەستهێنانی خۆشەویست و یاری عیرفانی هەرگیز بە فێڵ و تەڵەکە و ریا نابێت، چونکە ئەو وەك سیمورغ وایە و کەسێکیش بیەوێت سیمورغ بە داو راو بکات بەدەست بەتاڵی دێتەوە و تۆش هەرگیز ناتوانیت بە لیقای خۆشەویست بگەیت.

**٤-در عيش نقد كوش كه چون آبخور نماند**

**آدم بِهِشت روضهء دارالسلام را**

**دەر ئەیشی نەقد كوش كە چون ئابخور نەماند، ئادەم بیهیشت رەوزەیی داروسەلام را.**

هەوڵبدە چێژ لەو ژیانە ببینی کە ئێستا هەتە، چونکە کاتێ قسمەت و نسیب تەواو بوو ئادەم بەهەشتی بەجێهێشت.

عیش: ژیان، خۆشگوزەرانی     نقد: نەقد، ئێستابەردەست

آبخور: قسمەت و نسیب، شوێنی ئاوخواردنەوە     روضە: باغ

دار السلام: بەهەشت  آدم: ئادەم، وشەیەکە لە بنەڕەتدا عیبرییە بە مانای مرۆڤی یەکەم
بِهِشت: بەجێی هێشت

هەمان بیروڕای (حافز)ە کە بڕوای بە بڕانەوەی چارەنووس هەیە، دەڵێ هەوڵ بدە چێژ و لەزەت لە ژیانی ئێستات ببینی، چونکە هەر کەسێك نسیب و بەشی خۆی لە ژیاندا بۆ دانراوە و چارەنووسەکەی وا نووسراوە و هەر کاتێك بەشەکەی تەواوبوو دەبێت ئێرە بەجێبهێڵێت و بڕوات، هەروەك چۆن ئادەم کە نسیب و بەشەکەی لە بەهەشتدا تەواو بوو بە ناچاری باغی بەهەشتی بەجێهێشت، لێرەدا ئاماژەیەکی جوانە بۆ ئەو کەسانەی کە ترس لە داهاتووی ژیانیان تووشی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی کردوون و لە ترسی داهاتوو ئێستاشیان بە خەم و مەراق بەسەر دەبەن کە ئیدی واز لە خەم بهێنن، چونکە هەریەکە بەشی خۆمان دەخۆین و دەڕۆین.

**٥-در بزم دوور یك دو قدح درکش و برو**

**یعنی طمع مدار وصال دوام را**

**دەر بەزمی دۆور  یەك دو قەدەهـ دەرکیش و برو، یەئنی تەمەئـ مەدار ڤیسالی دەڤام را.**

لە بەزم و کۆڕی زەمانەدا یەك دوو پێك هەڵدە و بڕۆ، واتە تەماعی ئەوەت نەبێ کە ژیانی دنیا هەمیشەیی بێت.

دوور: دەور، زەمانە، سەرە، گێڕانی پێکی شەراب لە کۆڕدا دەست بەدەست
بزم دوور: کۆڕی مەیخواردنەوە کۆڕێك بووە کە بە نۆرە شەرابیان گێڕاوە، لێرەدا مەبەست لە دونیایە لە دونیادا بە نیاز مەبە هەموو شتەکان هەمیشەیی بن، چونکە دونیا وەك کۆڕێکە کە بە نۆرەیە و تۆش نۆرە و سەرەی خۆت دێتە سەر و دەڕوات هەر بۆیە کاتێ لە بەزمی دەور و زەمانەدا نۆرە و سەرە هاتە سەر تۆ یەك دوو پێك هەڵدە و بڕۆ، واتە خەریکی لەزەت و چێژبردنی عیرفانی بە و لەو نۆرەیەی خۆت لە دونیادا دێتە سەرت تەماعی ئەوەت نەبێ لە دنیا هەمیشەیی بێت، چونکە وانییە و تووشی خەم و خەفەتت دەکات، ئەم بەیتە گوتەیەکی دیکەیە بۆ هەمان واتا و مەبەستی بەیتی پێشوو، ئەم مەبەستە لە قسەی (پندار) شاعیری یۆنانی دێرین نزیك دەبێتەوە کە دەڵێ:

(روحی من بەهیوای جاویدانی مەبە، تا بتوانی سوود لەوە ببینی کە لەبەر دەستتدایە) {هەمان ل٣٨} .

**٦-ای دل شباب رفت و نچیدی گلی ز عیش**

**پیرانەسر بکن هنری ننگ و نام را**



**ئەی دل شەباب رەفت و نەچیدی گولی ز ئەیش، پیرانە سەر بکون هونەری نەنگ و نام را.**

ئەی دڵ سەردەمی لاوی ڕۆشت و گوڵێکت لە گوڵزاری ژیان نەچنی، ئێستا کە پیربوویت لە بەرخاتری ناموس و ئابڕوی خۆت هونەرێك پیشان بدە.

شباب: کاتی لاوی    نچیدی: نەتچنی    پیرانەسەر: کاتی پیری
ننگ و نام، نام و ننگ: ناموس و ئابڕو، بە ناوبانگی و ئابڕو، ناو و ناونیشان

لە دوو دێڕی یەکەمدا حافز ئاماژەی بە سوودوەرگرتن لە کات و سەردەم کرد. بەڵام دیارە دڵ ئەم ئامۆژگاییانەی لە گوێ نەگرت و لەسەردەمی لاویدا هیچ گوڵێکی لە گوڵزاری ژیانی عیرفانیدا نەچنیوە، هەر بۆیە پێی دەڵێ: ئەی دڵ لەو گوڵزارەدا هیچ گوڵێکت نەچنی و بە لیقای مەعشوق نەگەیشتی ئێستاش بێ هیوا مەبە و بە پیری هەوڵێك بدە و هونەرێك نیشان بدە تا، بەڵکو ئەم ناوبانگ و ئابڕووە عاشقانەیە بەدەست بهێنی.

بەڵام ئایا ئەوەی لە لاویدا بەدەست نەهاتبێ لە پیریدا بە دەست دێت؟

**٧-ما را بر آستان تو بس حق خدمت است**

**ای خواجە باز بین بە ترحم غلام را**

**ما را بەر ئاستانی تو بەس هەقی خدمەتەست، ئەی خاجە باز بین بە تەرەههوم غولام را.**

ئێمە لەبەر دەرگای تۆدا زۆرمان کردووە و حەقمان هەیە، ئەی سەروەر بە بەزەییەوە سەیری ئەم خزمەتکارە بکە.

آستان: بەردەرگا    بس، بسیار: زۆر    خواجە: گەورە، سەروەر، بەڕێز

دێڕەکە لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە، واتە لە نزم و بێ دەسەڵاتێکەوە بۆ دەسەڵاتدارێك یاخود لە بەندەیەکەوە بۆ خودا، هەمیشە دەسەڵاتدار کاتێ کە سەیری خزمەتکار و غولامەکەی خۆی دەکات و شتێکی دەداتێ بە بەزەیی دەژمێردرێت، حافزیش دەڵێ بە (مەعشوق) سەروەر و گەورە (ئەکرێ خوداش بێت) ئێمە لەبەر دەرگای تۆدا خزمەتی زۆرمان کردووە ڕۆژانە و حقوقمان هەیە، ئەی گەورە و سەروەر تۆش بە چاوی بەزەییەوە سەیری ئەم خزمەتکارەی خۆت بکە.

**٨-حافظ مرید جام است ای صبا برو**

**وز بندە بندگی برسان شیخ جام را**

**هافز موریدی جامەست ئەی سەبا برو، ڤەز بەندە بەندەگی برەسان شەیخی جام را.**

حافز موریدی پێکی مەیە ئەی سەبا برۆ و لە بەندەوە (لەمنەوە) بەندەیی من بگەیەنە بە شێخ جام.

شیخ جام: شێخ جام، (شێخ ئەحمەدی کوڕی ئەبی حوسێنی کوڕی مەحەمەدی کوڕی جەریر)ە و نازناوی (شێخ جام)ە یەکێك بووە لە سۆفییە گەورەکان و لە ساڵی (٥٢٦ یا ٥٣٦) ی کۆچیدا مردووە. ئەو لە گوندی (نامق) لە دایك بووە دەڵێن (١٨) ساڵی لە کێوەکاندا بە هەوڵ و وەرزشی گیانی بەسەر بردووە، بە خزمەتی خدری نەبی گەیشتووە و پاشان فەرمانی پێکراوە بچێتە ناوچەیەك بەناوی (جام) لەوێ دەستی بە بانگەواز کردووە و لەسەر دەستی ئەودا شەش سەد هەزار کەس تۆبەیان کردووە، شێخ جام خۆی بەسەرهاتی تۆبەکردنی دەگێڕێتەوە کە لە شەوێکدا کاتێ خەریکی مەیخواردنەوە بوون و شەرابیان لێبڕاوە ئەمیش بە گوێدرێژێکەوە چووە بۆ عارەق هێنان، کاتێ گەڕاوەتەوە گوێدرێژەکەی نەڕۆشتووە لە کاتی لێدانیدا گوێی لە دەنگێ بووە: کە ئەوە ئێمەین فەرمان بە گوێدرێژەکەت نادەین کە بڕوات تۆ داوای لێبووردن لە پاسەوان (دەسەڵاتداری گوند) دەکەیت تا بتبوورێت، بۆچی داوای لێبووردن لە ئێمە ناکەیت تا بتبوورین، هەرخۆی دەڵێ: ترسێکی گەورە گرتمی و رووم خستە سەر زەوی و تۆبەم کرد و گوتم خوایە فەرمان بە گوێدرێژەکەم بدە بڕوات تا شەرمەزاری لای ئەو کۆمەڵە نەبم، گوێدرێژەکە رۆشت و پاش گەڕانەوەم پێکیان لەبەر دەستدا دانام و نەمخواردەوە ئەوان پێیان دادەگرت کە بیخۆمەوە لە پڕ دەنگێکم بیست کە دەیگوت (ئەحمەد وەریگرە و تامی کە) کاتێ تامم کرد شەرابەکە گۆڕابوو بە هەنگوین و هەمووان لەو هەنگوینەیان تام کرد و یەکسەر تۆبەیان کرد).

دەکرێ حافز ئاگای لەم چیرۆکی تۆبەکردنەی شێخ جام هەبوو بێت، بۆیە دەڵێ بە بای سەبا ئێمە خزمەتکار و بەندەی بچووکی ئێوەین، بەڵام ناتوانین مورید و رێبواری تەریقەتی ئێوە بین، ئێمە موریدی مەستی و پێکی شەرابین (کە لێرەدا مەبەست لە تەریقەتی عاشقانەیە).

لێرەدا حافز لەگەڵ دووبارەکردنەوەی رێزی بۆ خودی شێخ جام دیسانەوە تانە لە مورید و رێبوارانی سۆفیگەری رووخساری دەدات و دەڵێ ئێمە موریدی عەشقی حەقیقین و ناتوانین ببینە موریدی فێڵ و رووخساربازی سۆفی.



## غەزەلی هەشتەم:

**بەحری رەمەلی شەشی مەحزوف**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)**

**١-ساقیا برخیز و درده جام را**

**خاك برسرکن غم ایام را**

**ساقیا بەرخیز و دەردەه جام را، خاك بەر سەر کون غەمی ئەیام را.**

ئەی ساقی هەستە و پێکم بدەرێ و غەمی رۆژگار لەچاڵ نێ و خۆڵی بەسەردا کە.

برخیز: هەستە    درده: بیدە    خاك برسرکن: لەبیری کە، لەگۆڕی نێ، بەبێ نرخ و بەهیچ زانین

کورتەی ماناکەی ئەوەیە کە ئەی ساقی مەیم بدەرێ تا لە بەرچاوم غەمی دنیا بێ نرخ بێت، بەڵام لە زاراوەی عیرفانیدا (جام) بە واتای (حاڵ) دێت و بەمەش مانایەکی گەلێ جیاواز تری دەبێت، چونکە (ساقی)ش واتای (هۆکار) دەگەیەنێ و واتاکەی دەبێتە ئەی ئەوکەسەی کە بە هۆی تۆوە پەیوەندییەکان بەرقەرار دەبن، حاڵمان لێ بهێنە تا لەکاتی حاڵدا غەمی رۆژگار بە بێ نرخ لە بەرچاو دەرکەوێ.

**٢-ساغر می بر کفم نه تا ز سر**

**پرکشم این دلق ازرق فام را**

**ساغەری مەی بەر کەفەم نەه تا ز سەر، بەر کەشەم ئین دەلقی ئەزرەق فام را.**

پێکی مەی بدە بە دەستەمەوە تا ئەم خیرقە شینە لە بەرم داکەم.

ساغر: پێك، پیاڵەی مەی    کف: دەست    نە: بنێ، لەچاوگی (نهادن) وەرگیراوە

زسر: لەسەرمەوە    برکشم: داکەنم

دلق: خرقە، بەرگێك بووە کە سۆفییەکان بەسەر هەموو جل و بەرگەکانیاندا لەبەریان کردووە و لە خوری دروستکراوە و بەزۆری شین باو بووە یاخود شین هەڵگەڕابووە.

ازرق فام: شین رەنگ

لەڕاستیدا یەکێك لەکێشە و گرفتەکانی وەرگێڕان لە جیاوازی کولتووریدا دەردەکەوێت و راستەوخۆ ناتوانرێت هەمان زاراوە یاخود وشە بۆ واتایەك لە زمانەکەدا بدۆزرێتەوە یاخود هەندێ دەربڕین لە زمانێکدا دروست و پەسەند دەبێت و لە زمانەکەی بەرامبەردا نەشیاو و

شاز دەبێت، یاخود هەندێ شت لە زمانێکدا بوونیان هەیە و لە زمانی نەتەوەیەکی دیکەدا بوونیان نییە، لەگەڵ ئەوەی کولتووری ئێمە لەگەڵ فارسدا نزیکییەکی بەرچاوی هەیە، بەڵام هێشتا رووبەڕووی ئەم کێشانە دەبینەوە.

لە کاتی وەرگێڕانی ئەم بەیتەدا رووبەڕووی کێشەیەك دەبینەوە کە بریتییە لە:

ز سر برکشم/ ز سر برکشیدن: لە فارسیدا دەگوترێت و بەمانای لەبەرداکەندنی کراسێك دێت کە دوگمە و قۆپچەی نەبێت و لە پێشەوە نەکرێتەوە وەك فانیلە و بلوس، بەڵام لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرەش هەر داکەندن یاخود لەبەرکردنەوەیە و دانانی زاراوەیەکی لەم شێوەیە ماندوبوونێکی زۆری دەوێت و لە مەحاڵەوە نزیکە .

دیسانەوە (دلق) کە بەرگی سەرەوەی سۆفییەکانە و ئەویش پێشەوەی کراوە نەبووە و لەسەرەوە لەبەرکراوە وەك (دشداشە) ئێمە لە کولتووری کوردیدا جل و بەرگێکی لەم شێوەیەمان نییە و دانانی زاراوەیەك بۆ ئەم چەشنە بەرگە ئەستەمە هەر بۆیە خودی وشەکە کە (دلق ـ خرقە) بەکارهاتووە.

ازرق، کبود: رەنگی شین، یاخود شینهەڵگەڕاو، لەڕاستیدا هەندێ جار ئەم رەنگە بۆ وەسفکردنی دڵ بەکاردێ کە بە مانای شینهەڵگەڕاو، یاخود خوێنتێزاو دێت وەك:

یە قلب تنها وکبوود هلاك یە نگاهتە{مریم حیدرزادە}

(واتە: دڵێکی تەنیا و شینهەڵگەڕاو هیلاکی نیگایەکتە)

بەڵام لەکوردیدا ئەم چواندنە بەکارنایەت و ناچار دەبین بە شینباو بیدەینە قەڵەم وەك گوتیشمان (مەی) لای (حافز) مانایەکی تەواو ئیجابی پێدراوە و عەشقی عیرفانی حەقە لەم بەیتەشدا بە هەمان گوتار و داوا روو لە ساقی دەکات و دەڵێ: پێکی مەی بدە بە دەستمانەوە تا پاش مەستبوون ئەم خیرقە شینباوەی کە رەمزی سۆفی بوونە لە بەرم داکەنم و لە فێڵ و ریا دوورکەومەوە.

هەر لەم بەیتەدا بە سوودوەرگرتن لە مانای عیرفانی وشەکان دەکرێ بڵێین حافز لەو جۆرە سۆفیگەرییە بێزارە کە تەنیا بەرگ و رووخساری دەرەوەیە و وابەستەی جیهانی ماددەیە و بە هۆکاری پەیوەندییەکان (شێخی راستی) دەڵێت کە حاڵمان لێ بهێنە تا لەم خیرقەی ریا و رووخساربازییە رزگارمان ببێت و لەبەر خۆمانی داکەنین.

**٣-گرچە بدنامیست نزد عاقلان**

**ما نمی خواهیم ننگ و نام را**

**گەرچە بەدنامیست نزدی ئاقلان، ما نەمیخاهیم نەنگ و نام را.**



گەرچی لای عاقڵەکان بەدناوییە، بەڵام ئێمە ناوداری و ناوبانگمان ناوێ.

بدنامی: بەدناوی    نمی خواهیم: نامانەوێ

ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشووە کە شاعیر پێکی مەیی دەوێت و خیرقەی سۆفییەتی لەبەر دادەکەنێت و ئەمەش لای عاقڵەکان (کە بە دونیای پڕ لە رەمز و رازی عیرفان ئاشنا نین) بە چاك سەیر ناکرێت و دەڵێت گەرچی ئەم کارە لای هۆشیار و عاقڵەکان بەدناوییە و مایەی ریسواییە، بەڵام ئێمە ناوداری و ناوبانگمان ناوێ و وابەستەی قسەی ئەوان نابین.

**٤-بادە دردە چند ازین باد غرور**

**خاك بر سر نفس نا فرجام را**

**بادە دەردەهـ چەند ئەزین بادی غرور، خاك بەر سەری نەفسی نافەرجام را.**

شەرابم بدەرێ، تاچەند خۆبەزلزانین و غرور، خاك بەسەر جەستە و نەفسی مرۆڤ کە سەرەنجامێکی خۆشی نییە.

بادە: شەراب، مەی، خواردنەوەی سەرخۆشکەر (عەشقی ئیلاهی)

خاك: خۆڵ، خاك    خاك برسر: قوڕبەسەر، خاکبەسەر، لە هەمانکاتدا واتای زمانیشی لە گۆڕنانە (بۆ سووککردنە)

نفس: جەستە، کەس، مرۆڤ، خود

نافرجام: بێ سەرەنجام، یاخود سەرەنجامی ناخۆش، چونکە فرجام بە واتای ئەنجام دێت.

شاعیر دەڵێ: شەراب بهێنە و غرور و خۆبەزلزانین بخەلاوە، یاخوا ئەم بوونە بە سەرەنجامی بەدی خۆی زەلیل و ریسوا بێت، بەڵام (سودی) دەڵێ: ئەی ساقی شەراب بێنە تا کەی بە غرورەوە تەمەن بەفیڕۆ بدەین و تاکەی خاك بەسەر نەفسی بێ سەرەنجامدا بکەین، واتە نەفسێك کە هەرگیز چاکەکار نەبووە و نییە واتە جگە لە (عەشقی ئیلاهی) بەگوێکردنی داواکارییەکانی نەفس و بەفیڕۆدانی تەمەنە.

**٥- دود آە سینەء نالان من**

**سوخت این افسردگان خام را**

**دودی ئاهی سینەیی نالانی مەن، سوخت ئین ئەفسوردەگانی خام را.**

دوکەڵی ئاهی سینەی ناڵەناڵکەری منەوە دێتەدەرێ ئەم کۆمەڵە پەژموردە بێ ئەزموونەی سووتاند.

دود: دوکەڵ    سینە: سنگ، سینە

نالان: ناڵەناڵکەر لە (ناڵین ـ ناڵاندن)ەوە هاتووە سیفەتی بکەری واتە دڵێك كە ناڵەناڵ دەكات، بەڵام وەك باسمانکرد لەکوردیدا ئەم سیفەتە لە ناڵاندن دروستنەکراوە و لێرەدا (ناڵەناڵکەر) یاخود (ناڵێنەر) کە هیچ کامیان وەك زاراوە شیاوی بەکارهێنان نین.

سوخت: سووتاندی، (سوخت) یەکێکە لەو کارانەی کە لە فارسیدا (ذو وجهین)ە واتە بەپێی رستە بە تێپەر و تێنەپەڕ دەردەکەوێ و بە واتای (سووتان و سووتاندن)یش دێت.

افسردگان: کۆی (افسردە) یە بە واتای پەژموردە      خام: ناکامڵ، بێ ئەزموون

مەبەست لەم دێڕە ئەوەیە کە قسەی سۆزاوی دڵی من بە شێوەیەکی تەواو کاریگەری لەسەر دڵی پەژموردەی بێ ئەزموونەکان کردووە.

(سودی) لە شەرحەکەی خۆیدا (افسردگان خام) بە مرۆڤی نەشیاو دەداتە قەڵەم و بەشمینپۆشەکان (خیرقە پۆشەکان) یان دەزانێت کە ئەوانیش کۆمەڵێ سۆفی بوون کە خەلیفە و موریدی (حسن شینپۆش) بوون، ئەم شینپۆشانە سۆفی خەڵوەت بوون بە هۆی ئەوەی کە جل و بەرگی شینیان لەبەر کردووە بە شینپۆشەکان ناسراون، چونکە حافز لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیەدا کۆك نەبووە . دەڵێ: دوکەڵی ئاهی سینەی من دڵی ئەم شیپۆشە پەژموردە و بێ ئەزموونانەی سووتاند.

**٦- محرم راز دل شیدای خود**

**کس نمی بینم ز خاص و عام را**

**مەهرەمی رازی دڵی شەیدای خود ، کەس نەمی بینەم ز خاس و عام را.**

لە خەڵکی تایبەتی و عەوام کەسێ نابینم کە مەحرەمی رازی دڵی شەیدای خۆم بێت.

محرم راز: کەسێك کە شیاوی ئەوە بێت نهێنییەکانی کەسێکی دیکە بزانێت پێی دەگوترێت مەحرەمی راز.

ئەم بەیتە ئەسەفە لە پەیوەندی نێوان کەسەکان، چونکە حافز بە ئەسەفەوە دەڵێ: کە لە خەڵکی عەوام و رەمەکی و خەڵکی تایبەتی و خاسیشدا کەسێك نابینم مەحرەمی رازی دڵی شێت و شەیدای خۆم بێت و کەس نییە کە بێتە جێگەی راز و نیازم و نهێنییەکانی دڵی خۆمی لا باس بکەم و ترسی ئەوەم نەبێت کە لە شوێنی دیکە بڵاوی بکاتەوە.

**٧- با دلارامی مرا خاطر خوش است**

**کز دلم یکباره برد آرام را**

**با دلارامی مەرا خاتر خوشەست، کز دلەم یەکبارە بوورد ئارام را.**

بە بوونی ئارامبەخشی دڵ دڵم شادە، مەعشوقێك کە یەکسەر ئارامی لە دڵم رفاند.



دلارام: ئارامبەخشی دڵان، مەبەست لە مەعشوقە      خاطر: دل، هزر

یکبارە: یەکسەر، بە یەکجار

شاعیر مەعشوق بە ئارامبەخشی دڵان دەزانێت و بە بوونی ئەو دڵشاد دەبێت، بەڵام سەیر لەوەدایە ئەو یارە ئارامبەخشە کاتێ هاتووەتە لای حافز بە پێچەوانەی سروشتی خۆیەوە کاری کردووە و لە بری ئەوەی ئارامی پێ ببەخشێ، بە یەکجار و یەکسەر ئارامی دڵی حافزی بردووە و ئارامی لێبڕاوە و دەڵێ ئەوەی ئارامی بەخشی دڵانە ئارامی دڵی منی رفاندووە.

**٨- ننگرد دیگر به سرو اندر چمن**

**هرکه دید آن سرو سیم اندام را**

**نەنگەرەد دیگەر بە سەرڤ ئەندەر چەمەن، هەر کە دید ئان سەرڤی سیم ئەندام را.**

هەرکەس ئەو بەژنرێك و سپی ئەندامەی بینی ئیتر سەیری دارسەروی ناو باغان ناکات.

ننگرد: سەیر ناکات      دیگر: ئیتر      سرو: دارسەرو      چمن: باغ

سیم: زیو، نوقرەیە کە ماددەیەکی سپییە لە رەگەزی ئاڵتونە      سیم اندام: سپیئەندام

ئەم بەیتە لە وەسفی یاردا نووسراوە لە قاڵبی موبالەغەدا و دەڵێ: هەرکەس سەیری بەژن و باڵای بەرزی یار کە بە سەرو چوێنراوە و ئەندام و جەستەی وەکو زیوی یار بکات دارسەروی ناو باغ بێ نرخ دەبێت لای، واتە رێك و جوانی بەژنی یار لە رێك و جوانی دارسەروی نێو چەمەنزار جوانترە.

**٩- صبرکن حافظ به سختی روز و شب**

**عاقبت روزی بیابی کام را**

**سەبر کون هافز بە سەختیی روز و شەب، ئاقیبەت روزی بیابی کام را.**

حافز لەسەر سەختی و ناڕەحەتییەکانی رۆژ و شەو ئارام بگرە سەرەنجام رۆژێك بە ئارەزووەکانی خۆت دەگەیت.

سختی: ناڕەحەتی      بیابی: بەدەست دەهێنیت      کام: ئارەزوو، ئاوات

لێرە و چەندین جێگەی دیکەشدا حافز ئارام گرتن و سەبر بە دەرگای گەیشتن بە ئارەزووەکانی دەزانێت و هەر ئەو بیرەشە کە دونیای لای بێ نرخ دەکات و ترسی لە دونیا و ژیانی دنیا نییە و بە هەمان شێوە داوای ئارامگرتن لەسەر سەختییەکانی رۆژگار یاخود ئارامگرتن بە چاکی لە ژیاندا دەکات، چونکە دڵنیایە رۆژێك دادێ کە بە ئومێد و ئاواتەکانی خۆت دەگەیت.





## غەزەلی نۆیەم:

بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەم

(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)

**١- رونق عهد شبابست دگر بستان را**

**می رسد مژدهء گل بلبل خوش الحان را**

**رۆنەقی ئەهدی شەبابەست دگەر بووستان را، می رەسەد مـوژدەیی گـول بوولبـوولی خوش ئەلهان را.**

جارێکی دیکە باغ رەونەقی سـەردەمی لاوی بەدەسـتهێنایەوە و مـژدەی هـاتنی گـوڵ بـە بوولبوولی خۆش ئاواز دەگات.

عهد شباب: سەردەمی لاوی، مەبەست لە بەهار و چرۆکردنی درەختە

بستان: بووستان، باغ  خوش الحان: خۆش ئاواز، دەنگخۆش

دەڵێ: سەردەمی لاوی باغ دەستی پێکردەوە و درەخت کەوتەوە چرۆ، پاش گەڵاڕێزانی پایز و سەرما و بەستەڵەکی زستان بەمەش مژدە بە بوولبوولی دەنگخۆش دەگات کە گوڵ دەکەوێتە باغان و ئەم مژدەیەش بە بۆنی خۆشی گوڵەکە بڵاودەبێتەوە، مەبەستی بەیتەکە هاتنی وەرزی بەهار و بەهاری عەشقە.

**٢- ای صبا گر به جوانان چمن بازرسی**

**خدمت ما برسان سرو و گل و ريحان را**

**ئەی سەبا گەر بە جەڤانانی چەمەن باز رەسی، خدمەتی ما برسان سەرڤو گول و رەیهان را.**

ئەی بای سەبا گەر گەیشتییەوە بە لاوەکانی چیمەن سەلام و بەردەستی ئێمە بە دارسـەرو و گوڵ و رێحانە بگەیەنە.

جوانان: مەبەست لە لق و خەڵفی تازەی سەرو و گوڵ و رێحانەیە کە لە میسراعی دووەمـدا ناویان هاتووە یاخود پەلکی تازەی خودی باغە.

بە بای سەبادا پەیام دەنێرێت کە ئەگەر چویتە ناو باغ و مێرگوزار شەوق و بەردەستی ئێمە بە لق و خەڵفە تازەکانی سەرو و گوڵ و رێحانە بۆنخۆشەکان بگەیەنە کە ئێمە ئارەزووی دیـدەنی باغ و چیمەنمان هەیە.

**٣- گر چنين جلوەكند مغبچهء بادەفروش**

**خاكروب در ميخانه كنم مژگان را**

**گەر چونین جیلڤەکونەد موغبەچەیی بادەفروش، خاکروبی دەری مەیخانە کونەم موژگان را.**

ئەگەر موغبچەی مەیفرۆش بەم شێوەیە دەرکەوێ خاکی بەردەرگای مەیخانە بە برژانگی چاو دەماڵم.

جلوەکنند: دەرکەوێ، جیلوە بکات، خۆی نمایش بکات

مغبچە: منداڵی موغ، ئەو مێردمنداڵانەی کە لە مەیخانەکاندا خزمەت دەکەن.

بادەفروش: مەیفرۆش  خاکروب: گسکدەر  میخانە: مەیخانە  مژگان: برژانگ

دەڵێ: ئەگەر مێردمنداڵی مەیفرۆش بەم شێوە دڵگیریی و جوانییەوە دەرکەوێ لە شێوەیەك لەبەر دەرگای مەیخانەدا سەر دادەنەوێنم کە برژانگم ببێتە گسکی بەردەرگای مەیخانە یاخود دەبمە خزمەتکار لە مەیخانە و بەبرژانگی چاو خاکی بەردەرگای مەیخانە گسك دەدەم.

لە راڤەی عیرفانیشدا بەهەمان شێوە کە گەر جیلوەی جوانییەکان بەم شێوە جوان و سەرنجراکێشە خۆیان نمایش بکەن دەبمە گسکدەر و خزمەتکاری رێگەی تەریقەت و عەشق.

**٤- ای کە بر مە کشی از عنبر سارا چوگان**

**مضطرب حال مگردان من سرگردان را**

**ئەی کە بەر مەه کەشی ئەز ئەنبەری سارا چەوگان، موزتەریب هال مەگەردان مەنی سەرگەردان را.**

ئەی ئەو کەسەی کە بەسەر رووخساری وەك مانگتەوە لە عەنبەری بێخەوش هێڵی گۆچانی (خوار) دەکێشی منی سەرگەردان و بێ سامان پەشێوحاڵ مەکە.

مە/ ماە: مانگ  کشی: دەکێشی  عنبر: عەنبەر، ماددەیەکی چەور و بۆنخۆشە کە لە گەدە و سورێنچکی ماسی دەردەهێنرێ و بەزۆری خۆڵەمێشییە، بەڵام جۆری چاکی رەشە.

سارا: بێخەوش، خالص  چوگان: گۆچان

مضطرب حال: پەشێوحال، پەرێشان  مگردان: مەکە

سرگردان: سەرلێشێواو، سەرگەردان

شاعیر رووخساری یاری بە مانگ چواندووە و دەڵێ: تۆ کە بەسەر رووخساری وەك مانگتەوە لە عەنبەری پاك و بێ خەوش برۆی هیلالی و خواری وەك سەری گۆچان دەکێشی، ئێمە وەك گۆیەك لە بەرامبەر ئەم گۆچانەدا سەرلێشێواو و بێ قەرار مەکە بە وتەیەکی دیکە هەرچییەك دەخرێتە سەر جوانییەکەت بێقەراری و سەرلێشێواوی منیش زیاتر دەکات.



دەکرێ گۆچان درکە بێت لە پرچی یار و لەم کاتەشدا کێشان مەبەست لە جوڵانی پرچ بێ لەسەر رووخسار و لایەکی دیکەوە شەرحی ئەم بەیتە پەیوەندی بە یاری (گۆ و مەیدان)ەوە هەیە و بەو بنەمایەش دەتوانرێ شەرح بکرێت.

**٥- ترسم آن قوم کە بر دردکشان می خندند**

**در سرکار خرابات کنند ایمان را**

**تەرسەم ئان قۆوم کە بەر دووردکەشان می خەندەند، دەر سەری کاری خەرابات کونەند ئیمان را.**

دەترسم ئەو کەسانەی کە بە بادەنۆشانی هەژار پێدەکەنن سەرەنجام بە جۆرێك بکەونە نێوکاری خەراباتەوە کە ئیمانەکەیانی لەسەر دابنێن.

درد: شەرابی بنی کوپەڵە، خڵتەدار  دردکشان: ئەو کەسانەی کە لە هەژاریدا شەرابی بنی کوپەڵە دەخۆنەوە، مانایەکی نێگەتیڤی هەیە، چونکە دەوڵەمەندەکان شەرابی بێ خەوش دەخۆنەوە، بەڵام دردکش هەژارە و شەرابی خڵتەدار بە هەرزانتر دەکڕێ لە زاراوەی کوردیدا (شەرابی فەل) نزیکە لەم مانایەوە.حافز ئەم زاراوەیە بۆ عارفە هەژارەکان بەکاردەهێنێت و بە چاوی رێزەوە سەیریان دەکات.

می خندند: پێ دەکەنن  خرابات: خەرابات، مەیخانە، بە واتای شوێنی خراپەکاری و رەندان و دەرکراوەکان لە کۆمەڵگە دێت، لە (فرهنگ اشعار حافز) دا بەم شێوە پێناسەکراوە: (لە زماندا بەمانای مەیخانە و قومارخانە و جێگەی ژنی بەدڕەوشت — قەحپەخانە — هاتووە، عەلامە قەزوینی ئەم وشەیەی بەکۆی (خراپە) داناوە و نووسیویەتی: بە واتای راستی ئەو کۆی (خراپە) یە و بە واتای مەیخانە و فاحیشەخانەی شاعیرەکانە بە ئاماژەیەکی دی واتای مەجازی ئەم چەمکە واتە شوێنی رابواردن و گۆڕانی روحانی پیاوانی حەقیقەت.. بەمەش مانای (کار خرابات) لەم بەیتەدا هەڵهاتنە لە قەید و بەند و نەریتە باڵاکان و سەرپێچی لە بەرامبەر یاسا دانراوەکاندا. لە زاراوەی عیرفانیشدا خەرابات و ناوەکانی دیکەی مەیخانە خەڵوەتگە و خەڵوەتسەرای عارفە راستەقینەکانە و زۆر رێزی لێدەگیرێت.

دەڵێ: دەترسم ئەوانەی (زاهید و رووکارییەکان) گاڵتە بە عارفە پاك و هەژارەکانی نێو خەڵوەتخانەی عەشقی حەق دەکەن، سەرەنجام خۆشیان بە شێوەیەك بکەونە ناو ئەو جۆرە ژیانەوە کە ئیمانەکەیان لەدەست بدەن.

**٦- یار مردان خدا باش که درکشتی نوح**

**هست خاکی که به آبی نخرد طوفان را**

**یاری مەردانی خودا باش کە دەر کەشتیی نوە، هەست خاکی کە بە ئابی نەخەرەد توفان را.**

دۆستی پیاوانی خودا بە چونکە لە کەشتییەکەی نوحدا، تۆزێك خۆڵ هەیە کە تۆفانەکە لە بەرامبەر ئەودا ئەوەندەی ئاوێکی کەم بێ نرخە.

مردان خدا: دۆستانی خودا، پیاوچاکان، پیاوانی خودا          باش: ببە (بە)

هست: هەیە

بە آبی نخرد طوفان را: (تۆفان بە چۆڕە ئاوێ ناکرێت) تۆفان لە چاویدا وەك چۆڕە ئاوێك یان دلۆپە ئاوێکە          خاکی: خاکێك، خۆڵێك، تۆزێ خاك

ئەم بەیتە ئاماژە بە چیرۆکی حەزرەتی نوح دەکات کە زۆرینەی نەتەوە و هۆزەکەی بە تۆفان لە ناوچوون تەنیا کەسانێکی کەم نەبێت کە لەگەڵ ئەودا بوون و سواری کەشتی بوون و لە زیانی رزگاریان بوو.

لە میسراعی یەکەمدا ئاشکرایە مەبەست لە (مردخدا) حەزرەتی نوحە کە بە هۆی پلەی بەرزی پێغەمبەرایەتییەوە بووە مایەی رزگارکردنی هاوڕێ و دۆستەکانی و دەڵێ: تۆش لە کاتی نارەحەتی و کێشەکاندا نزیکی دۆستانی خودا بە چونکە لە کەشتییەکەی نوحیشدا خاکێك هەیە کە بە دۆستایەتی کردنی پیاوانی خودا و خۆشەویستانی خودا رزگاری بوو لە نغرۆبوون.

لە بارەی ئەو (خاکە)ی کە لە کەشتی نوحدا بووە و رزگاری بووە چەندین راو و بۆچوون هەیە (سودی) پێیوایە کە مەبەست لە خاك خودی حەزرەتی نوحە، چونکە نوح لە بنەڕەتدا لە خاك (خۆڵ) دروست بووە، حەزرەت خۆیەتی کە لە بەرامبەریدا تۆفان هێندەی دلۆپە ئاوێك بەهای نییە و هاوڕێکانی بە هۆی ئەوەوە رزگاریان بوو. لە (بانگ جرس) پەرتوی علویشدا هاتووە کە مەبەستی (خواجە حافز) لە خاك جەستەی حەزرەتی ئادەمە کە لە کەشتییەکەیدا هەڵگیراوە و (عەلامە قەزوینی)ش لە شەرحی ئەم بەیتەدا ئاماژەی داوە بە هەڵگرتنی جەستەی حەزرەتی ئادەم لە کەشتی نوحدا و خاکی بە ئێسقانی پوکاوەی ئەو زانیوە کە نوح لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتووە، لە پەراوێزی (قدسی)دا هاتووە کە مەبەست لە خاك جەستەی حەزرەتی ئادەمە، کە بە پێی سەرچاوەکان نوح ئەوی لەگەڵ خۆیدا بردووەتە کەشتییەکەوە هەروەها گوتووشییەتی مەبەست لە (خاکێك) ئەو خاکەیە کە نوح لەگەڵ خۆیدا بردییە کەشتییەکەوە بۆ تەیەموم.



هەروەها (محەمەدی کوڕی محەمەدی دارابی) لە (لطیفە غیبی)دا ئاماژە بەوە دەکات کە بە فەرمانی جوبرەئیل نوح هەندێ خاك لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ تەیەموم.

لەگەڵ ئەمانەدا (د.هروی) دەڵێ: " بە پاڵپشتی پێرستی ناوەکانی تەفسیری (طبری) سەیری زیاتر لە (٩٠) شوێنم کردووە کە ناوی نوح هاتووە، لە هیچ جێگایەکیاندا باسی خاکێ نەکراوە لە کەشتی نوحدا هەبووبێت و تۆفان ئەوەندەی دلۆپە ئاوێك لە چاویدا بەهای نەبووبێت، بەڵام لە نێو ئەو سێ مانایەی سەرەوە کە خاك خودی نوح یان جەستەی ئادەم یان خۆڵی تەیەموم بێت سێیەم بە راستتر دەزانێت و بەم شێوەیە شەرحی دەکات:

خاکێك کە نوح لەگەڵ خۆیدا بۆ تەیەموم بردییە کەشتییەکەوە بە هۆی هاوڕێیەتی ئەوەوە لە بەڵای تۆفان رزگاری بوو، وەك خاکی دیکە زەوی دوچاری نغرۆبوون نەبوو، تۆفانی نوح بۆ ئەو خاکە بەهای چۆڕە ئاوێکی نەبوو.

**٧- هرکرا خوابگه آخر مشتی خاك است**

**گو چه حاجت که به افلاك کشی ایوان را**

**هەر کە را خابگەه ئاخەر موشتی خاکەست، گو چە هاجەت کە بە ئەفلاك کەشی ئەیوان را.**

لە کۆتاییدا ئارامگەی هەرکەس مشتێ خاکە، بڵێ چ پێویست دەکات کە کۆشك و باڵەخانەی بەرز دروست بکەیت.

هرکرا: هەرکەس          خوابگە: جێگەخەو، ئارامگا          افلاك: ئاسمان

ایوان: باڵەخانە، کۆشك، سەقفی بەرز

باس لە حەقیقەتی دنیایە کە سەرەنجام هەموومان دەمرین و ئەوەی هەمانە بەجێی دەهێڵین هەر بۆیە دەڵێ: بڵێن بەوانەی کۆشك و باڵەخانەکانیان سەریان لە ئاسمانە و کۆشکە هەوربڕەکان دروست دەکەن چ پێویست دەکات، مەگەر ئارامگە و شوێنی خەوی ئاخری و سەرەنجاممان مشتێ خاك نییە و هیچی تر.

**٨- برو از خانهء گردون بدر و نان مطلب**

**که این سیەکاسه در آخر بکشد مهمان را**

**برو ئەز خانەیی گەردون بەدەر و نان مەتەڵەب، کە ئین سیەهکاسە دەر ئاخەر بکوشەد میهمان را.**

لەماڵی دونیا (گەردوون) برۆ دەرەوە و داوای نان مەکە، چونکە ئەم خانەخوێ کاسەڕەشە سەرەنجام میوانەکەی خۆی دەکوژێت.

خانە: ماڵ   مطلب/ طلب مکن: داوامەکە   سیەکاسە/ سیاه کاسە: کاسە رەش بەڵام مەبەست لە کاسە رەش چروك و رەزیلە کە لە بەرامبەر ئەمدا (سفیدکاسە) دێت واتە کاسەسپی کە بەمانای نانبدەیی و بەخشندەییە   مهمان: میوان

دەڵێ: لێرە خانەخوێیەکەت دونیای رەزیل و چروکە و چاوەڕێی بەخشندەیی لێ مەکە و تا زووە لە ماڵەکەی دەرچۆ، چونکە ئەم خانەخوێ رەزیلەی کە دنیایە دواجار میوانی خۆی دەکوژێت، ئەم بەیتە ئاگاداركردنەوەیەکە کە مرۆڤ نابێ چاوەڕێی وەفا و بەخشندەیی بێت، بەڵکو دنیا جێگەی زەحمەت و رەنجە.

**٩- ماه کنعانی من مسند مصر آن تو شد**

**وقت آنست که بدرود کنی زندان را**

**ماهی کەنئانی مەن مەسنەدی میسر ئانی تو شود، ڤەقتی ئانەست کە بدرود کونی زیندان را.**

مانگی کەنعانی من، پلەی دەسەڵاتی میسر بوو بە هی تۆ، ئێستا کاتی ئەوەیە کە ماڵاوایی لە زیندان بکەی.

ماه کنعانی: مانگی کەنعانی، درکەیە لە حەزرەتی یوسف، کە بە رەمز و هێمای جوانی دادەنرێت   مسند: شوێنی وەستان و دانیشتنی پادشایان   زندان: زیندان، بەندیخانە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە تەخت و پلەی دەسەڵاتە   مسند مصر: واتە عەزیزی میسر

دەڵێ: خۆشەویستی جوانی وەك یوسفی من تەختی پادشایەتی و دەسەڵاتی میسر کەوتە دەست تۆ لەزیندان وەرە دەرەوە.

**١٠- حافظ می خور و رندی کن و خوش باش ولی**

**دام تزویر مکن چون دگران قرآن را**

**هافز مەی خور و رەندی کون و خوش باش ڤەلی، دامی تەزڤیر مەکون چون دیگەران قورئان را.**

حافز مەی بخۆرەوە و گوێ بە هیچ مەدە و خۆش رابووێرە لە ژیاندا، بەڵام وەك خەڵکی تر قورئان مەکە بە داو بۆ فریودانی خەڵکی.

می خور: مەی بخۆرەوە   رندی کن: رندی بکە، (لا ابالی) بە خوش باش: رابواردنی ژیان بەخۆشی   دگران: خەڵکی تر، ئەوانی تر

لای حافز خراپترین کارێك خەڵك خەڵەتاندنە بە هۆی کاروبارە ئایینییەکانەوە بە تایبەتی قورئانی پیرۆز وەك فاڵگرتنەوە و کۆمەڵێ کاری جادوگەری و فریودانی دیکە بە قورئان (وەك



کاری شێخە درۆینە و وشکە سۆفییەکان) جا بۆیە دەڵێ: هەر کارێکی خراپی وەك مەیخواردنەوە و گوێ نەدان بە هیچ داب و نەریت و رێسایەك و رابواردنی ژیان دەکەی بیکە، بەڵام بە قورئان خەڵکی فریومەدە و مەیکە داوێك بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی.

(سودی) ئەم فریودانە بە ریا دەزانێت و دەڵێ ریاکاری کوفرە، لێرەدا مەبەستی خواجە رەواجدان بە فەساد و خراپەکاری نییە، بەڵکو دەڵێ هەر جۆرە خراپەکارییەك لە دنیادا خراپە، بەڵام ریاکاری لە هەموویان خراپترە. {هروی، ج١، ل٧٩} هەروەها لای سودی پێش ئەم بەیتە بە یتێکی دیکە هەیە، بەڵام چونکە لە نوسخەکانی دیکەدا نەبوو نەماننووسیوە.

بە بڕوای (دکتۆر غنی) ئەم غەزەلە بە بۆنەی رزگاربوونی (جلال الدین تورانشا) کە وەزیرێکی خۆشەویست بووە لای شاعیر لە زیندان دانراوە و بۆنی ئومێد و هیوای لێ دێت واتای درکەی بەیتی نۆیەم (ماه کنعانی من) و (بدرود کردن زندان) بەڵگەیەکی دیاری راستی ئەم ئاماژەیەیە.

## غەزەلی دەیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەحزوف**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)**

**١-  دوش از مسجد سوی میخانه آمد پیر ما**

**چیست یاران طریقت بعد ازین تدبیر ما**

**دوش ئەز مەسجد سوی مەیخانە ئامەد پیری ما، چیست یارانی تەریقەت بەئد ئەزین تەدبیری ما.**

دوێنی شەو پیری ئێمە لە مزگەوتەوە بەرەو مەیخانە هات، ئەی هاوڕێیانی تەریقەت لەمەو پاش چارەی ئێمە چییە.

دوش: شەوی رابردوو    سوی/بەسوی: بەرەو، رووبە

بعد ازین: لەمەوپاش، لەپاش ئەمە   تدبیر: چارە

پیرما: پیری ئێمە، لە رووی زمانییەوە (پیر) هیچ لێڵییەکی نییە، بەڵام ئایا حافز مەبەستی لە پیری ئێمە کێیە، چونکە لە زۆر شوێنی دیکە قسە لە (پیر) دەکات.

چ (سودی) یاخود (د.مرتضوی) کە پێیوایە ئەم غەزەلە و (بلبلی برگ گلی خوش در منقار داشت) راستەوخۆ پەیوەندییان بە چیرۆکی (شێخی سەنعان)ەوە هەیە بڕوایان وایە کە (پیرما) لای حافز شێخی سەنعانە. ئەو پیرەی کە لە رواڵەتدا خراپەکار و لە رێی لادەر و لە دڵدا چاك و پاك بوو، هەر ئەوە کە لای حافز بووەتە رەمز و نیشانەی عەشقی پاك و خۆشەویستی.

سەبارەت بە چیرۆکی شێخی سەنعان کە (فریدالدین عطار) بە شیعر باسی کردووە، هەروەها (اقبال یغمائی) لە (داستانهای عاشقانەء ادبیات فارسی)دا بە پەخشان و بەسوود وەرگرتن لە دەقە رەسەنە شیعرییەکە بەم شێوەیە باسی کردووە:

(شێخی سەنعان رابەرێکی خواناس بوو لە مەککەدا و هەمیشە خەریکی خوداپەرستی بوو، چەند سەد موریدێکیشی هەبوو، شەوێك لە خەویدا بینی کە شەیدای کچێکی مەسیحی بووە، کە خەبەری بوویەوە زۆر لە خەوەکەی ترسا، بەڵام رۆژ بە رۆژ خەوەکەی کاریگەری لەسەری دەبوو، تا ئەوە بوو بڕیاریدا بەرەو وڵاتی رۆم بکەوێتە رێ بۆ دیتنی کچە گاورەکە، موریدەکانیشی لەگەڵیدا رۆشتن و کە گەیشتنە شارەکە لە باڵەخانەیەکی گەورەدا کچەکەیان بینی و کچەش روبەندی لادا و رووخساری وەك مانگ دەرکەوت، شێخی سەنعان تەواو



کوشتەی بوو، بڕیاری وازهێنانی لە عیبادەت و خەڵوەتیدا و کەوتە داوی کچە، موریدەکانی زۆر ئامۆژگارییان کرد، بەڵام بێ سوود بوو، بۆیە رۆمیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە بۆ مەککە، شێخیش بەردەوام لەگەڵ سەگ و منداڵانی گەڕەکی کچەکەدا دەژیا و وەك دێوانە بەو ناوەدا دەسوڕایەوە تا پاش چل رۆژ سەرنجی کچەکەی راکێشا و عەشقی خۆی بۆ دەربڕی، کچەش پێی گوت تۆ سەرت لە گوێی گۆڕ دەلەرزێ و چاکتر وایە لە بری عەشق و دڵداری بچیت کفنی مردنت ئامادە بکەیت، بەڵام شێخ پێداگیری کرد و کچەش گوتی من چوار مەرجم هەیە، ئەگەر هێناتنە جێ ئەوا رازی دەبم، چوار مەرجەکەش ئەمەیە کە دەبێ شەراب بنۆشیت، قورئان بسووتێنی، واز لە ئیسلام بهێنی و ببیتە گاور، هەروەها زونار (پشتوێنی مەسیحی) ببەستی.

شێخی سەنعان بە مەرجی یەکەم رازی بوو، بەڵام ئەوانی دیکەی رەتکردەوە، بەڵام کاتێ پێکێ شەرابی خواردەوە ئیدی بە تەواوی دەستبەرداری ئایینی خۆی بوو، قورئانیشی سووتاند و زوناریشی بەست، بەڵام کچە بەم سێیە رازی نەبوو گوتی مەرجێکی کەش هەیە ئەگەر نا لەکوێوە هاتووی بگەڕێوە بۆ شوێنی خۆت، مەرجەکەشم ئەوەیە ببیتە شوانی بەرازەکانم، شێخی سەنعان بەئەمەش رازی بوو و بووە شوانی بەراز.

لەلایەکی دیکەوە ئەو موریدانەی کە گەڕابوونەوە بۆ مەککە بە موریدێکی عاقڵ گەیشتن و ئەویش رەخنەی لێگرتن کە بۆچی شێخیان بەجێهێشتووە و ئەوانیش گوتیان ئێمە ئامۆژگاری زۆرمان کرد، بەڵام سوودی نەبوو بۆیە بەجێمان هێشت، موریدە عاقڵەکە زۆر گلەیی لێکردن و گوتی: بێوەفایتان بەرامبەر کردووە و پێویستە ئێمە بۆ خاتری ئەو بگەڕێینەوە بۆ رۆم و دەست بکەین بە ناڵین و زاری لە بەردەم دەرگای خودادا تا، بەڵکو دڵی شێخ بگۆڕێت و لەسەر کافری نەمرێت، بۆیە گەڕانەوە بۆ وڵاتی رۆم و ماوەیەکی زۆر نزایان کرد و لە دواجاردا نزاکەیان گیرابوو و شێخی سەنعان هۆشی هاتەوە بەخۆیدا و جارێکی دیکە زونارەکەی فڕێدایەوە و تۆبەیەکی راستی کرد و لەگەڵ یارانیدا وڵاتی رۆمیان بە جێ هێشت و پاش رۆشتنی ئەوان کچەش بە خەوبینین موسوڵمان بوو. بەدوای شێخ و یارانی کەوت و لە کاتی گەیشتنی بەواندا گیانی دەرچوو. {اقبال یغمائی، داستانهای عاشقانەءادبیات فارسی، چیرۆکی شێخی سەنعان}

یاران طریقت: رەفیقانی رێگە، هاوڕێیانی تەریقەت، لە زاراوەی عیرفانیدا تەریقەت رێگەی گەیشتنە بە حەق یاخود حەقیقەت، چونکە حەقیقەت دوا مەنزڵی تەریقەتە و رێبواری رێگەی تەریقەت بە تەی کردنی مەنزڵ و پایەکانی تەریقەت دواجار بەدەستکەوتێکی روحانی دەگات کە حەقیقەتە، لە سۆفیگەری و عیرفاندا سێ قۆناغ هەیە کە شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەتن

له گوتەی (خواجە عبداللەی ئەنصاری)دا هاتووە (شەریعەت بە جەستە و تەریقەت بە دڵ و حەقیقەت بە گیان بدە قەڵەم).

ئەم بەیتە گوتەی موریدەکانە کە دەڵێن شەوی رابردوو پیری ئێمە رێگەی مزگەوتی تەرك کرد و رووی لە مەیخانە کرد ئەی یارانی تەریقەت چارەی حاڵمان چییە.

یاخود وەك (سودی) دەڵێ: دوێنێ شەو پیری ئێمە لە مەککەوە (مزگەوت) هات بۆ شاری قەیسەرییە (مەیخانە) کە تەواوی خەڵکی شاری قەیسەرییە کافرن، پاش ئەوەی پیری ئێمە هاتە ناو کافران ئەی یارانی تەریقەت چارەی حاڵی ئێمە چییە.

**٢- در خرابات مغان ما نیز هم منزل شویم**

**کاین چنین رفتست در روز ازل تقدیرما**

**دەر خەراباتی موغان ما نیز هەم مەنزل شەڤیم، کین چونین رەفتەست دەر روزی ئەزەل تەقدیری ما.**

لە مەیخانەی موغەکاندا ئێمەش هاورێی و هاومەنزڵی پیری خۆمان دەبین، چونکە لە رۆژی ئەزەڵەوە تەقدیر و بەشی ئێمە هەروا بووە.

خرابات: مەیخانە     مغان: مەیفرۆشان، خاوەن مەیخانە، کافر

واتای ئەم بەیتە لە بەیتی یەکەمەوە دێت کە پیری ئێمە دوێنێ شەو مزگەوتی بەجێهێشت و بەرە و مەیخانە هات ئێمەش لە مەیخانەی موغەکاندا یاخود کافرەکاندا هاورێ و هاومەنزڵی پیری خۆمان دەبین و بە دوایدا دەڕۆین، چونکە ئەمە لە چارەمان نووسراوە و تەقدیری ئێمە هەر لە رۆژی ئەزەل و سەرەتاوە ئەمە بووە کە بە دوای پیری خۆماندا تەرکی مزگەوت بکەین و روو لە مەیخانە بنێین.

**٣- ما مریدان روی سوی کعبە چون آریم چون**

**روی سوی خانەء خمار دارد پیر ما**

**ما موریدان روی سوی کەئبە چون ئاریم چون، روی سوی خانەیی خەمار دارەد پیری ما.**

کاتێ پیری ئێمە روو دەکاتە ماڵی مەیفرۆش ئێمەی موریدان چۆن روو بکەینە کەعبە

مرید: مورید، شوێنکەوتە     خمار: مەیفرۆش

ئەم بەیتە دوو جۆر شەرح کردن هەڵدەگرێت یەکێکیان شاعیر لەسەر زاری مورید و شوێنکەوتەکانی شێخی سەنعانەوەیە کە دەڵێن ئێمە چۆن روو بکەینەوە مەککە و بڕۆینەوە بۆ مەککە لە کاتێکدا پیری مەککە بەرەو رۆم دەڕوات، بە گوتەی (سودی) کاتێ شێخی سەنعان عاشقی کچی گاور دەبێت لە نێو موریداندا دەبێتە مقۆمقۆ کە بەجێی بهێڵن و بڕۆنەوە بۆ



مەککە، بەڵام هەندێکی دیکەیان گوتوویانە کە چاوەڕێ بکەن، چونکە ئەم کارەی کە شێخ کردوویەتی حیکمەتێکی تێدایە و ناکرێ بەجێی بهێڵین و رووە و مەککە بڕۆینەوە.

لە هەمانکاتدا رووکردنە کەعبە مانای نوێژکردنیش دەگەیەنێت و بەم مانایەش واتای دێڕەکە دەبێتە: کاتێ پیری ئێمە تەرکی نوێژی کردووە و رووی کردووەتە ماڵی مەیفرۆش ئێمە چۆن روو بکەینە کەعبە و نوێژ دابەستین، بەڵام بە ئاماژە بە رووداوەکانی نێو چیرۆکی شێخی سەنعان مانای یەکەمیان نزیکترە.

**٤- با دل سنگینت آیا هیچ درگیرد شبی**

**آە آتشناک و سوز نالەء شبگیر ما**

**با دلی سەنگینەت ئایا هیچ دەرگیرەد شەبی، ئاهی ئاتەشناك و سوزی نالەیی شەبگیری ما**

ئایا ئاهی سوتێنەر و ئاگراوی و سووتان و ناڵەی بەرەبەیانی ئێمە، شەوێك کاریگەری لەسەر دڵی رەقی وەك بەردی تۆ دەبێت.

دل سنگین: دڵی رەق، سنگین وەك بەرد، بەردین

درگیر: کاریگەری دەبێت یان کاری لێ دەکات، تەئسیر دەکات   آه: ئاه     آتشناك: ئاگرین، سووتێنەر وەك ئاگر   سوز: سوتان، گەرمیشبگیر: کاتی بەرەبەیان، کۆتاییەکانی شەو (سودی) دەڵێ رووداوێك یان کارەساتێك کە لە شەودا رووبدات وەك ئاهی شەبیگر و ناڵەی شەبگیر

شاعیر مەعشوق وەك بەرد دەبینێ و هەروەك چۆن بەرد ئاگر ناگرێت دڵی رەقی یاریش بە سووتان و ناڵە و ئاهی ئاگری دڵی شاعیر هیچ کاریگەر نابێت و بەزەیی پێیدا نایەتەوە.

**٥- عقل اگر داند کە دل در بند زلفش چون خوشست**

**عاقلان دیوانە گردند از پی زنجیر ما**

**ئەقل ئەگەر دانەد کە دل دەر بەندی زولفەش چون خوشەست، ئاقلان دیڤانە گەردەند ئەز پەیی زەنجیری ما.**

عەقڵ ئەگەر بزانێت دڵ لە بەندی زوڵف و عەشقی ئەودا چەند بە خۆشی رادەبوێرێ، عاقڵەکان بۆ ئەوەی بکەونە نێو زنجیری ئێمەوە شێت دەبوون.

داند: بزانێت     بند: بەند

زلف: زوڵف، لێرەدا بەمانای عەشق بە شێوەیەکی گشتی دێت     دیوانە گردند: شێت دەبن

ازپی: لەڕێی، بۆ

لای حافز هەمیشە ناکۆکی لە نێوان عەقڵ و عەشقدا هەیە و هەمیشە عەقڵ، عەشق بەشێت و ریسوا و دۆڕاو.. دەزانێت، بەڵام لێرەدا شاعیر باس لەو لەزەت و چێژە دەکات کە لەو

عەشقەدا هەیە و عەقڵ لێی بێبەشە و دەڵێ گەر عەقڵ بزانێت لە نێو داو و بەندی عەشقدا دڵ بە چ شێوەیەکی خۆش ژیان بەسەر دەبات و رادەبووێرێ ئەوا عاقڵان بۆ ئەوەی ئەو زنجیری عەشقەیان دەستکەوێت و وەك ئێمەیان لێ بێ واتە عاشق بن شێت دەبوون.

٦- **باد بر زلف تو آمد شد جهان بر من سیاه**

**نیست از سودای زلفت بیش از این توفیر ما**

**باد بەر زولفی تو ئامەد شود جەهان بەر مەن سیاه، نیست ئەز سۆدای زولفەت بیش ئەزین تۆوفیری ما.**

با زوڵفی تۆی پەرێشان کرد و دنیا لە بەر چاوم رەش بوو، لە سەودا و مامەڵەی عەشقی تۆدا جگە لەمە هیچ قازانجێکم دەستگیر نەبووە.شد جهان بر من: دنیا لای من، دنیا لە من سیاە: رەش، تاریك سودا: مامەڵە و سەودا بیش: زیاتر توفیر: سوود، قازانج

دەتوانرێت ئەم دێڕەش بە دوو شێوە شەرح بکرێت ئەویش بە گۆڕانی مانای (سیاە)، چونکە لە کاتێکدا (سیاە) بە رەش وەك رەنگێك لێکبدرێتەوە مانایەکی واقیعی بە بەیتەکە دەدرێت، واتە: کاتێ با هەڵی کرد و قژی تۆی پەرێشان کرد کە لە بەرامبەر چاومدا بوو بەرچاوم بە پرچی رەشی تۆ رەشبوو، ئێمە لە مامەڵەمان لەگەڵ عەشقی تۆدا جگە لەم پەرێشانی و پەشێوحاڵییە هیچی دیکەمان بە نسیب نەبووە، یاخود هیچی دیکەمان قازانج نەکردووە.

بەڵام گەر (سیاە) بە تاریك و دڵتەنگی لێکدرێتەوە مانایەکی جیاواز بە دێڕەکە دەدرێت، واتە: کاتێ بام بینی زولڤی تۆی پەرێشان کرد وەك غەریبەیەك یاری بە پرچت دەکات لە داخاندا دنیا لەبەر چاوم تاریك بوو، ئێمەش لە مامەڵەمان لەگەڵ عەشقی تۆدا جگە لەم دنیا لەبەر چاو تاریکی بوون و خەم و خەفەت خواردنەی کە غەریبە دەست لە زوڵفت دەدات و هاوڕێیەتیت دەکات هیچ قازانجێکمان نەکردووە و سوودی ئێمە لە عەشقی تۆ تەنیا خەم بووە.

٧- **مرغ دل را صید جمعیت به دام افتاده بوود**

**زلف بگشادی ز شست ما بشد نخچیر ما**

**مورغی دل را سەیدی جەمئیەت بە دام ئوفتادە بوود، زولف بگوشادی ز شەستی ما بشود نەخچیری ما.**

باڵندەی دڵ، خاترجەمی هێنابووە نێو داوەوە، بەڵام کاتێ تۆ قژت کردەوە نێچیرەکەمان لە داوەکە هەڵهات.



مرغ: باڵندە صید: نێچیر، شکار، راو

جمعیت: خاتر جەمی، ئارام و قەرار

بگشادی: کردتەوە، پەخشانت کرد شست: دەست، تۆڕی ماسیگرتن

دەڵێ: دڵی من بە خاتر گەیشتبوو، بەڵام کاتێ تۆ قژت پەخشانکرد و کردتەوە نێچیرەکە واتە خاترجەمی و ئارامی دڵم، باڵیان گرتەوە و هەڵهاتن. مەبەستی ئەوەیە کە دڵی من ئارام و قەراری گرتبوو، بەڵام کاتێ تۆ پرچت پەخشان کردەوە سەرنجی دڵی منی راکێشا و قەرار و خاترجەمی خۆی لەدەستدا. بە دەربڕینێکی دیکە بە بینینی پرچی تۆ خاترجەمی ئێمە لە ناوچوو.

٨- **روی خوبت آیتی از لطف بر ما کشف کرد**

**زان سبب جز لطف و خوبی نسیت در تفسیر ما**

**روی خوبەت ئایەتی ئەز لوتف بەر ما کەشف کەرد، زان سەبەب جوز لوتف و خوبی نیست دەر تەفسیری ما.**

رووخساری جوانت نیشانەیەکی میهرەبانی بۆ ئێمە کەشف کرد، بەو هۆیەشەوە جگە لە چاکی و میهرەبانی هیچی دیکە لە تەفسیری ئێمەدا نییە.

خوب: باش، چاك، لێرەدا بە مانای جوانە، چونکە ئاوەڵناوی رووخسارە آیت: بەڵگە، نیشانە، ئایەت (آیتی از لطف) ئاماژەیە بە ئایەتی رەحمەت و میهرەبانی خودا لە قورئاندا لە بەرامبەر ئایەتەکانی سزا و تۆڵە لطف: میهرەبانی جز: جگە

دەڵێ: جوانی تۆ کە خۆی لە خۆیدا بەڵگە و ئایەتێکە لە میهرەبانی و بەخشندەیی خودا بە شێوەیەك کاریگەریی لەسەر ئێمە هەبوو کە هەموو ئایەتەکانی دیکە لەڕووی میهرەبانی و بەخشندەییەوە تەفسیر دەکەین نەوەك لەڕووی ترسەوە و بەمەش تەفسیری ئێمە جگە لە بەخشندەیی و میهرەبانی هیچی دیکەی تێدا بەرچاو ناکەوێ.

٩- **تیر آه ما ز گردون بگذرد حافظ خموش**

**رحم کن بر جان خود پرهیز کن از تیر ما**

**تیری ئاهی ما ز گەردون بگوزەرەد هافز خەموش، رەهم کون بەر جانی خود پەرهیز کون ئەز تیری ما.**

تیری ئاهی ئێمە لە گەردوونیش تێدەپەڕێت، حافز بێدەنگ بە رەحم بە گیانی خۆت بکە و لە تیری ئێمە خۆت بپارێزە.

تیر آه ما: تیری ئاهی ئێمەی عارفانی خاوەن دڵ    خموش/خاموش/خامش/خمش: خامۆش، بێدەنگ یاخود کوژاوە    پرهیز کن: خۆت لادە، خۆت بپارێزە

لەسەر زاری عاشقان و عارفانی ئەهلی دڵەوە بە حافز دەڵێت: بێدەنگ بە و نهێنی و رازی عیرفانی بڵاومەکەرەوە و لای هەموو کەسێ باسیان مەکە، تیری ئێمەی عارف ئەوەندە کاریگەرە کە لە ئاسمان تێپەڕ دەبێت و کاریگەری لە جیهانی باڵاش دەکات، چونکە گەر نهێنییەکان بڵاوکەیتەوە نەفرەتت لێ دەکەین و لە ناوت دەبەین، هەربۆیە بەزەییت بە گیانی خۆتدا بێتەوە و لە تیری ئێمە بترسە و خۆتی لێ لادە.



نخستین صفحۀ دیوان حافظ در مجموعۀ کتابخانۀ آصفیۀ حیدرآباد هند
و آخرین صفحۀ همان مجموعۀ



## غەزەلی یازدەهەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەحزوف**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)**

**١- ای فروغ  ماه حسن از روی  رخشان  شما**
**آب روی خوبی از چاه زنخدان شما**

**ئەی فروغی ماهی هوسن ئەز رووی رەخشانی شوما، ئابی رووی خوبی ئەز چاهی زەنەخدانی شوما.**

ئەی ئەو کەسەی رووناکی مانگی جوانی لەڕووی درەخشانی تۆوە و پاراوی رووی جوانی لە چاڵی چەناکەی تۆوە.

فروغ: رووناکی، رۆشنایی، پەرتەو    حسن: جوانی    رخشان: درەخشان، درەوشاوە
شما: ئێوە لە فارسیدا بۆ رێزنان لە کەسی بەرامبەر لە جیاتی (تۆ) (شما) بەکاردەهێنرێت.

خوبی: بە مانای جوانی رەها هاتووە و (آب روی خوبی) واتە ئاوێك پاراوی بە رووی جوانی دەبەخشێت.

دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی مانگ — کە لە جوانیدا بێ هاوتایە — رووناکی و درەوشاوەیی خۆی لە رووخساری تۆوە وەردەگرێت و جوانی و پاکی ئاو  پاراوی خۆی لە چاڵی چەناکەی تۆوە بە دەست دەهێنێت.

بە تێبینیکردنی ئەوەی کە مانگ رووناکی خۆی لە خۆر وەردەگرێت ئەم خاڵە لە بەیتەکەدا بە شاراوەیی دەردەکەوێت کە رووخساری درەوشاوەی تۆ خۆرە و مانگ جوانی و رووناکی خۆی لەم وەردەگرێت.

(آب رو) بە واتای شەرەف و ئابڕوش دێت و لەم کاتەشدا واتاکەی دەبێتە: چاڵی چەناکەی تۆ ئەوەندە جوانە کە مایەی ئابڕومەندی و شەرەفی جوانییە، بەڵام بە هاتنی چاڵ واتای راستی ئاو نزیکترە چونکە ئاو لە چاڵ دەردەهێنرێت و دەبێتە مایەی پاراوی.

**٢-کی دهد دست این غرض یا رب که همدستان شوند**
**خاطر مجموع ما زلف پریشان شما**

**کەی دەهەد دەست ئین غەرەز یا رەب کە هەمدەستان شەڤەند، خاتری مەجموئی ما زولفی پەریشانی شوما.**

کەی ئەم مەبەستە بێتە دی کە خاترجەمی و ئارامی ئێمە لەگەڵ پرچی  پرێشانی تۆدا پێکەوە بگونجێن.

غرض: مەبەست، مەقصود    همدستان: هەمداستان، هاوچیرۆك، هاوڕا و موافق، پێکەوە گونجان    خاطر مجموع: خاتر جەم، ئارامی

هەمیشە پرچی یار مایەی خاترپەرێشانی و نائارامی حافز بووە و هەمیشە لەکاتی بینینی پەخشان و پەرێشانی یاردا حافز نائارام بووە و هیچ کاتێ پرچی پەرێشانی یار لەگەڵ خاتر جەمی و ئارامی حافزدا پێکەوە نەهاتوون، هەرچەندە (د.هروی) پێیوایە کە مەبەستی بەیتەکە ئەوەیە کە کەی بێت یا پرچی پەرێشانی تۆ وەك بیری ئێمە کۆبێتەوە یاخود خاتر و بیری ئێمە وەك پرچی پەرێشانی ئێوە پەرێشان بێت نائارام بین.

بەڵام ئەم بەندەیە پێیوایە کە حافز لە دەست خاتر و بیری خۆی دادیەتی کە هەرکاتێ پرچی پەرێشانی یار دەبینێ نائارام دەبێ و خۆزگە دەخوازێت رۆژێك بێت ئەو دووانە پێکەوە بگونجێن واتە پرچی یار پەخشان و بڵاوبێتەوە و حافز خاترجەمی و ئارامی خۆی لە دەست نەدات (کە پەخشان بوونی پرچی یار لادانی پەردەکانی سەر رووی مەعشوقی حەقە)، بە پێچەوانەی ئەوەی کە یەکێکیان وەك ئەوی دیکەیانی لێ بێت شاعیر دەیەوێ هەردووکیان پرچی پەرێشان و خاترجەمی پێکەوە بێن، چونکە لە بەیتەکانی پێشوودا چەند جارێك ئەم دووانە پێکەوە هاتوون.

**٣-عزم دیدار تو دارد جان بر لب آمده**

**بازگردد یا برآید چیست فرمان شما**

**ئەزمی دیداری تو دارەد جان بەر لەب ئامەدە، بازگەردەد یا بەرئایەد چیست فەرمانی شوما.**

گیان کە هاتووەتە سەر لێو نیازی دیداری تۆی هەیە چ فەرمانێك دەفەرمووی بگەڕێتەوە یا دەرچێت.

عزم: نیاز، نییەت    لب: لێو    بازگردد: بگەڕێتەوە    برآید: بێتە دەرەوە، دەرچێت    چیست/ چەاست: چییە

بە ئاماژە بەوەی کە لەکاتی روح دەرچووندا روح لە دەمەوە دەردەچێت و دوایین جێگە لەسەر لێوەکانە، دەڵێ: بۆ دیداری تۆ گیانم هاتووەتە سەرلێوم بفەرمووبژیم بۆ خاتری تۆ یا بمرم بۆ خاتری تۆ.

مەعشوق لێرەدا عیرفانییە و دیدار دیدارێکی روحی و گیانییە و بەرامبەر بە مەعشوقی عیرفانی دەڵێ گیانم هاتووەتە سەر لێوم تا بۆ دیداری تۆ لە جەستەم جودابێتەوە بێتە دیدارتان چاوەڕێی فەرمان و مۆڵەتی تۆ دەکات بگەڕێتەوە یاخود لە جەستەم بێتە دەرەوە و دەرچێت.

**٤-دوور دار از خاك و خون دامن چو بر ما بگذری**

**کاندرین ره کُشته بسیارند قربان شما**

**دوور دار ئەز خاك و خون دامەن چو بەر ما بووگزەری، کەندەرین رەه کوشتە بسیارەند قوربانی شوما.**

کاتێ بە لاماندا تێدەپەڕێ داوێنت لە خاك و خوێن بپارێزە، چونکە لەم رێگایەدا زۆرکەس هەن کە کوشتە و قوربانی تۆن.

دوور: دوور    دامن: داوێن، پالێم    بگذری: تێپەڕی    کاندرین: لە ناو، لەم    رە: راه: رێگە    بسیار: زۆر

واتە: ئێمە وەك زۆر کەسی تر کە لە رێگەی عەشقی تۆدا بووینەتە قوربانی و کوشتەی تۆ بووین کاتێ کە بە لاماندا گوزەردەکەیت و تێدەپەڕی داوێنی جلەکانت کۆکەرەوە تا بە خاك و خوێنی ئێمە کە کوشتەی رێگەی عەشقی تۆین پیس و لەکەدار نەبێت.

**٥-دل خرابی من کند دلدار را آگه کنید**

**زینهار ای دوستان جان من و جان شما**

**دل خەرابی می کونەد دلدار را ئاگەه کونید، زینهار ئەی دوستان جانی مەن و جانی شوما.**

دڵ بێ قەراری دەکات دڵدار ئاگادارکەنەوە ئامان دۆستان گیانی من و گیانی ئێوە.خرابی: مەست و بێ پەروا، گوێ پێ نادات    آگەکنید/ آگاەکنید: ئاگادار بکەنەوە    دلدار: مەعشوق، دڵدار    زنهار: بۆ جەختکردنەوەیە، ئامان    جان من و جان شما: دەربڕینێکە لە زمانی خەڵکیدا بە واتای ئەوەی کە گیانی منیشتان وەك گیانی خۆتان خۆش بووێت و بیپارێزن.

ترسی حافز لە دڵی بێقەراری کە راز و نهێنییەکانی عەشق بڵاوبکاتەوە و دەهۆڵیان بۆ بکوتێ و تووشی زیان و زەرەر بێت ئەم داوایەی پێ بەرزکردووەتەوە بە دۆستان دەڵێ: مەعشوق و خۆشەویستی من ئاگادار بکەنەوە تا میهرەبانی و رەحمێکم پێ بکات گیانی خۆم بە دەستی گیانی ئێوە دەسپێرم ئێوەش وەك گیانی خۆتان بیپارێزن.

یاخود وەك سودی دەڵێ: دڵم بێ قەرار بووە بە ئاهی ئاگراوی جیهان دەسووتێنێ لە حاڵێکدا ئێوەش و دڵداریش لە جیهاندا زیانتان بەردەکەوێ کە وایە دڵدار ئاگادار کەنەوە کە رەحمێك بە حاڵم بکات.

**٦-کس به دوور نرگست طرفی نبست از عافیت**
**به که نفروشند مستوری به مستان شما**

**کەس بە دۆوری نەرگسەت تەرفی نەبەست ئەز ئافییەت، بیە کە نەفروشەند مەستوری بە مەستانی شوما.**

لە دەوران و زەمانی چاوانی وەك نێرگسی تۆدا کەس سوودی لە خۆپارێزی و سەلامەتی نەبینی، باشتر وایە لە بەرامبەر چاوانی مەستی تۆدا نەجیبی و نەجابەت لە خۆیان پیشان نەدەن. نرگس: گوڵی نێرگز، درکەیە لە چاوی مەست.

گرف: سوود، فایدە    عافیت: خۆپارێزی، سەلامەتی    دوور: زەمان، دەوران
بە: بهتر: چاکترە    نفروشد: نەفرۆشێ، لاف و گەزاف لێنەدا
مستوری: نەجابەت، چاکی، خۆپارێزی، پێچەوانەی مەستییە. مستان: مەبەست لە چاوی مەستە.

لە دەوران و زەمانێکدا کە چاوانی مەستی تۆ لە جیلوەدا بوو کەس سوودی لە خۆپارێزی و تەقوا نەبرد و هەمووان مەستی چاوانی مەستی تۆ بوون، هەر بۆیە ناکرێ لە بەرامبەر مەستی چاوانتدا کەس لاف و گەزافی خۆپارێزی لێ بدات، چونکە چاوانی مەستی تۆ هەمووانی بۆ خۆی راکێشاوە و خۆپارێزییەك نەماوە کە مەستی چاوانی مەستت نەبێ.



**٧-بخت خواب آلود ما بیدار خواهد شد مگر**
**زآن که زد بر دیده آب روی رخشان شما**

**بەختی خاب ئالودی ما بیدار خاهەد شود مەگەر، زانکە زەد بەر دیدە ئابی روی رەخشانی شوما.**

بەختی خەواڵوی ئێمە بێدار دەبێتەوە، چونکە لەڕووی پاراوی تۆوە ئاوی پێدا پرژێنراوە.
بخت: بەخت، شانس    خواب آلود: خەواڵو    بیدار خواهد شد: بێدار دەبێتەوە، لە خەو هەڵدەستێ ئەم سیفەیە بۆکاتی داهاتووە    زد بردیده: لە رووخسار پرژێنرا    آب روی: ئاوی رووی    رخشان: درەوشان، درەوشاوە

کاتێ کەسێك خەواڵو بێت و خەو بەری نەدات ئاو لە رووخساری دەپرژێنن تا خەو بەری بدات، لە خەیاڵی شاعیردا رووخساری خۆشەویست و یار هێندە تەڕ و پاراوە کە دەڵێی ئاوی رەوانە و بە دیتنی ئەو بەختی خەواڵوی شاعیر لە خەو بێداربۆتەوە.

کورتەی واتا بە دڵنیاییەوە بەختی ئێمە لە خەو بێدار دەبێتەوە، چونکە لە پاراوی رووی یارەوە ئاوی لێپرژێنراوە و یاری بینیوە، واتە لەگەڵ بینینی رووخساری تۆدا بەختم یار دەبێت و بەختم لە خەو هەڵدەستێ.

**٨- با صبا همراه بفرست از رخت گلدستەیی**
**بوو که بوویی بشنویم از خاك بُستان شما**

**با سەبا هەمراه بفرەست ئەز روخەت گولدەستەیی، بوو کە بوویی بشنەڤییم ئەز خاکی بووستانی شوما.**

لەگەڵ بای سەبادا چەپکە گوڵێك لە گوڵی رووخسارتم بۆ بنێرە، بەڵکو لە خاکی باغ و بووستانی ئێوەوە بۆنێکم پێ بگات.

بفرست: بنێرە    رخت: رووخسارت    گلدستە: چەپکە گوڵ دەستە گوڵ
بوو: لەوانەیە، بەڵکو    بووی: بۆنێك    بوویی بشنویم: بۆنێکمان پێ بگات لە راستیدا لە کوردیدا بەم شێوە ناگوترێت، چونکە وەرگێڕانی وشە بە وشەی ئەم دەربڕینە دەبێتە (بۆنێکمان گوێ لێ بێت) ئەمەش یەکێکە لەوگرفتانەی کە لە بەردەم وەرگێڕاندایە، چونکە بیستن لە کوردیدا تەنیا بۆدەنگە نەك بۆن.

مەعشوقی بە گوڵ چواندووە کە باغ و باغات شوێنی تێگەیشتن و نەش و نمایەتی و رووخساریشی بە چەپکەگوڵ، دەڵێ کاتێ سەبا لەوێوە تێدەپەڕێ چەپکە گوڵێکمان لەگوڵی

رووخسارت بۆ بنێرە، تا بەڵكو بە بۆنی گوڵەكەدا بۆنی خاكی باغ و باغاتەكەش بگاتە لوتمان، واتە، بەڵكو بە بۆنی گوڵدا بزانین لە چ جۆرە ژینگەیەكدا دەژیت و لەوانەیە بەو بۆنەدا كەمێك لە ژیان و گوزەرانی ئەو شوێنەی ئێوە تێ بگەین كە گوڵی وا پەروەردە دەكات (لە لێكدانەوەی عیرفانیدا واتە: نیشانەیەكمان لە جیهانی باڵای خۆت بۆ بنێرە كە گەورەیی و جوانی ئەو جیهانەمان بۆ دەربخات).

**٩-عمرتان باد و مراد ای ساقیان بزم جم**

**گرچه جام ما نشد پر می به دووران شما**

**ئومرتان باد و موراد ئەی ساقییانی بەزمی جەم، گەرچە جامی ما نەشود پور مەی بە دۆورانی شوما.**

ئەی ساقییانی كۆڕگەرم تەمەنتان درێژبێت و بە ئاوات بگەن گەرچی لە زەمانی ژیانی ئێوەدا پێكی ئێمە پڕ مەی نەبوو.

نشدپر/پرنشد: پڕ نەبوو          عمرتان باد: تەمەنتان درێژ بێت

جەم: لێرەدا بە مانای جەمشید یاخود حەزرەتی سولەیمان دێت. (د.هەروی) پێیوایە كە مەبەست لە (جم) جەمشیدە كە یەكێكە لە گەورە پادشاكانی ئێرانی بەر لە ئیسلام كە درەختی میوەی چاندووە و لە بەرەكەی شەرابی دروستكردووە و بە رابواردن و خۆشگوزەرانی ناوبانگی هەبووە، (بزم جم)یش ئاماژەیە بە سەردەمی ئێرانییەكانی پێش ئیسلام و حەڵاڵبوونی شەراب لەو سەردەمەدا كە هیچی بە شاعیر نەگەیشتووە، بەڵام لای (سودی) مەبەست لە (جم) سولەیمانە وەك پادشایەك مەبەست لە (بزم جم) كۆڕ و بەزمی پاشایانە و ـ وردتر ـ مەبەست لە كۆڕی گەرمی پادشای (یەزد)ە هەرچەندە نەیدیوە.

لە هەرحاڵێكدا شاعیر هیوای تەمەن درێژی و بە ئاوات گەیشتنی كۆمەڵێ ساقی دەكات كە لەو زەمانە یاخود لەو شوێنەی حافزدا نەبوون و جام و پێكەكەی لە مەیی ئەوان پڕ نەبووە. واتە بەشداری لەگەڵدا نەكردوون، جگە لەمەش (جم) بە مانای كۆمەڵ و كۆڕیش دێت كە رەنگە هەركۆڕێكی گەرمی ساقییان بێت بە بێ ئاماژە بە كات و شوێنێكی دیار.

**١٠- می كند حافظ دعایی بشنو آمینی بگو**

**روزی ما باد لعل شکّر افشان شما**

**می كونەد هافز دوئایی بشنەڤ ئامینی بگو، روزیی ما باد لەئلی شەككەر ئەفشانی شوما.**



حافز نزایەك دەكات، ببیستە و ئامینێ بڵێ ـ نزاكەش ئەمەیە كە ـ لێوی سوور و شەكر پرژێنی تۆ رۆزی و بەشی ئێمە بێت.

دعا: نزا، دۆعا          بشنو: ببیستە، گوێت لێ بێ          آمینی بگو: بڵێ ئامین

روزی: رۆزی، بەش          شكرافشان: شەكرپرژێن، قسەشیرین، گفتار شیرین

حافز روو بە یار دەڵێ: من دۆعادەكەم كە لێوی سوور و گفت شیرینی تۆ بەش و رۆزی ئێمە بێت تۆش بڵێ ئامین و رازی بە.

**١١- ای صبا با سكانان شهر یزد از ما بگو**

**كای سر حق ناشناسان گوی چوگان شما**

**ئەی سەبا با ساكنانی شەهری یەزد ئەز ما بگو، كەی سەری هەق ناشناسان گوی چۆوگانی شوما.**

ئەی سەبا لای ئێمەوە بە دانیشتوانی شاری (یەزد) بڵێ ئەی سەری كەسانی ناسوپاسگوزار گۆی گۆچانی ئێوە بێت.

ساكنان: دانیشتوان          ازما: لە ئێمەوە، لەلایەن ئێمەوە

حق ناشناس: ناسوپاسگوزار، كەسێ كە بەچاكی نازانێت

گوی چوگان: گۆی گۆچان، گۆ وگۆچان یارییەكە كە گۆیەك لە گۆڕەپاندایە و سوارچاكان بە گۆچان (دارێك كە وەك گۆچان وایە و بە پێچەوانەوە دەگیرێت) هەوڵی رفاندنی دەدەن و هەركەس گۆیەكە بخاتە یاخود بباتە شوێنی دیاریكراو براوەیە.

لێرەدا ئاماژەیە كە بە راستی مانای (جم) لە دێڕی (نۆ)دا كە پاشای (یەزد)بێت و دەڵێ: ئەی بای سەبا لە لای ئێمەوە ئەم گوتەیە یاخود نزایە بەرە بۆ خەڵكی شاری یەزد و پێیان بڵێ یاخوا سەری مرۆڤە ناسوپاسگوزارەكان لە بەرامبەر چاكەی ئێوەدا گۆی گۆچانتان بێت، چونكە لەلایەكەوە گۆ لە مەیداندا گۆچانی زۆری لێدەدرێت و زەلیلە، لە لایەكی تر هەركەس گۆی دەستكەوت براوەیە لە هەردوو حاڵەتدا واتە ئەو كەسانە نزم و زەلیلی دەست ئێوە و ئێوە براوە بن.

**١٢- گرچه دووریم از بساط قرب همّت دوور نسیت**

**بندهء شاه شماییم و ثناخوان شما**

**گەرچە دووریم ئەز بسات قوربی هیممەت دوور نیست، بەندەیی شاهی شوماییم و سەناخانی شوما.**

گەرچی ئێمە دوورین لە مەجلیسی پادشا، بەڵام هیممەتمان دوور نییە و بەندەی پادشای ئێوە و نزاخوێنی ئێوەین.

بساط: کۆڕ و مەجلیس، میوانداری، سفرە و داوەت قرب: نزیك همت: هیممەت
بندە: خزمەتکار، بەندە شاە: پادشا، شا ثناخوان: ستایشکەر، وەسفکەر، نزاخوێن

دیسان روو بە شاری (یەزد)ە و دەڵێ: گەرچی بەجەستە دوورین لە کۆڕ و میوانداری پادشا، بەڵام هیممەت و ئیرادە لێمان دوور نییە و دڵمان لە لاتانە و لە یادمانن و خزمەتکار و بەندەی پادشای ئێوەین و باسی چاکی ئێوە دەکەین و دۆعا و ستایشتان بۆ دەکەین.

**١٣- ای شهنشاه بلند اختر خدا را همّتی**

**تا ببووسم همچو گردون خاك ایوان شما**

**ئەی شەهەنشاهی بوولەند ئەختەر خودا را هیممەتی، تا ببووسەم هەمچو گەردون خاکی ئەیڤانی شوما.**

ئەی پادشای ئەستێرەی بەخت بەرز، بۆ خاتری خودا لوتفێ بکە تا وەك ئاسمان خاکی کۆشکە بەرزەکەت ماچ کەم.

شهنشاە: پادشا بلند: بەرز اختر: ئەستێرە بلند اختر: بەخت چاك، بەخت باش خدارا همتی: بۆ خاتری خوا هیمەتێ بووسە: ماچ ببووسم: ماچ کەم گردون: ئاسمان

قسە هەر لەگەڵ پادشای (یەزد)دایە و دەڵێ: ئەی ئەو پاشایەی کە بەختت وەك ئەستێرە دەدرەوشێتەوە، بۆ خاتری خودا لوتف و میهرێکت هەبێ تا وەك چۆن ئاسمان خاکی سەربانی کۆشکەکەت ماچ دەکات منیش ماچی کەم یاخود تا خاکی کۆشکە بەرزەکەت کە وەك ئاسمان بەرزە ماچ کەم.

(د. هروی) لە کۆتایی غەزەلەکەدا نووسیویەتی: گەرچی لە غەزەلەکەدا ناو نەبراوە، بەڵام بە گوتەی (د. غنی) و ئاماژەی دڵنیاکەر و بە ئەگەری زۆر بەهێز ئەم غەزەلە لە ستایشی (شا یەحیا)دا نووسراوە، پادشای بەخت درەوشاوە هەر ئەوە کاتێ لە یەزد و چواردەوری بووە و حافز لە شیرازەوە ئارەزووی دیداری ئەو دەکات. سوودیش بەبێ ناوبردنی (شا یەحیا) ئاماژە بە ستایشی پادشای یەزد دەکا.





## غەزەلی دوازدەیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- ساقی به نور باده بر افروز جام ما**
**مطرب بگو که کار جهان شد به کام ما**

**ساقی بە نوری بادە بەرئەفروز جام ما، موتریب بگو کە کاری جەهان شود بە کامی ما.**

ساقی پێکی ئێمە بە نوری شەراب رووناککەرەوە و گۆرانیبێژ گۆرانی بڵێ، چونکە کاری دنیا بە ویستی ئێمەیە.

نور: نور، تیشك برافروز: رووناککەرەوە
مطرب: گۆرانیبێژ، کەسێ ساز بژەنێت و گۆرانیش بڵێ
بگو: بڵێ، بە گۆرانی گوتنیش دێت کارجهان: کاروباری دونیا کام: ویست، ئارەزوو

روو بە ساقی و گۆرانیبێژ دەڵێ: ساقی تۆ شەرابمان بۆ تێکە و گۆرانیبێژ تۆش گۆرانیمان بۆ بڵێ چونکە رێکەوت و کاروباری جیهان و دونیا هاورێکە لەگەڵ ویست و ئارەزووەکانی ئێمەدا، با ئێمەش بە بۆنەی ئەم خۆشییەوە شادی بگێڕین. هەروەها گەر (بگو) بە واتای (بڵێ)ی قسە بێت بە گۆرانیبێژ دەڵێ بە هەمووان بڵێ کە کار و رێڕەوی کاری دونیا هاورێکە لەگەڵ ویست و ئارەزووەکانی ئێمەدا.

**٢- ما در پیاله عکس رخ یار دیدەایم**
**ای بی خبر ز لذت شرب مدام ما**

**ما دەر پیالە ئەکسی روخی یار دیدەئیم، ئەی بی خەبەر ز لەزەتی شوربی مودامی ما**

ئێمە لە پێکی شەرابدا وێنەی رووخساری یارمان بینیوە، ئەی ئەو کەسەی کە لە چێژی بادەنۆشی بەردەوامی ئێمە بێ ئاگای

عکس: وێنە رخ: رووخسار شرب مدام: بادەنۆشی دایمی، بەردەوام

بەوکەسانەی کە بێئاگان لە چێژی بادەنۆشی دەڵێت: ئێمە لە پێکی شەرابدا یاخود لە شووشەی شەرابدا وێنەی رووخساری یارمان بینیوە.

بێگومان ئەم وێنەسازییە مانایەکی عیرفانی قووڵی تێدایە، بەو چەمکەی کە (پیالە) لای شاعیر وێنەیەکە وەك ئاوێنەی (جهان نما)ی جەمشید، نهێنییەکانی گەردوونی تێدا دەردەکەوێت، یار یا ساقی هەمان وێنەی خودای عیرفانین کە لە ئاوێنەی مەستی بە



خۆشەویستی خوداوە دەردەکەون و ئەم مانایەی تێدایە کە عارف یاخود رێبواری رێگەی تەریقەت لە ئەنجامی مەستی و بێئاگابوونی لە چێژ و لەزەتە دونیاییەکانەوە بە دیداری یار دەگات نەك لە خۆ خەریککردن بە دونیا و شتە دنیاییەکانەوە بەم بارەشدا کەسی سەرقاڵ بە دونیاوە بەم پلەیە ناگات و ئاگاداری چێژی بینین و دیداری یاری عیرفانی نابێت.

**٢- چندان بوود کرشمه و ناز سهی قدان**
**کاید به جلوه سرو صنوبر خرام ما**

**چەندان بووڤەد کریشمەڤو نازی سەهی قەدان، کایەد بە جیلڤە سەرڤی سنۆوبەر خەرامی ما.**

ناز و عیشوەی جوانە بەژنرێکەکان تا کاتێکە کە یاری بەنازی باڵاسنۆبەری ئێمە دەردەکەوێت.

چندان بوود: ئەوەندە دەبێ، تا ئەوکاتە دەبێ کرشمە: ناز، عیشوە سهی قدان: بەژنرێکان سهی: رێك، تازە قد: باڵا، بەژن کاید بە جلوە: دەرکەوێ، جیلوە بکات سرو: سەرو صنوبر: سنۆبەر خرام: بەناز رۆشتن صنوبر خرام: واتە کەسێ کە وەك سنۆبەر بە ناز دەڕوات، هەڵبەتە سنۆبەر چەسپاوە و ناڕوات، بەڵام بە هۆی هەواوە لق و گەڵاکانی بە شێوە نازێکەوە و بە ئارامی دەلەرێنەوە، کەسێك کە رێك و ئارام و بە ناز بڕوات بە رێگادا پێیدەگوترێ (صنوبر خرام).

ئەم بەیتە بۆ دەرخستنی بەنازرۆشتن و جوانی قەد و باڵای یارە و دەڵێ: جوان و قەشەنگانی بەژن رێك تا کاتێك دەتوانن ناز بکەن و خۆیان دەرخەن کە یاری من دەرنەکەوتبێ، بەڵام هەرکە یاری ئێمە بە نازەوە رۆشت و وەك لق و گەڵاکانی سنۆبەر بە ئارامی هاتە بەرچاوان و خۆی دەرخست لە تاو نەرمی رەوت و ناز و ئارامی و بەژن رێکی ئەو شۆخانی بەناز دەست لە نازی خۆیان هەڵدەگرن.

**٣- هرگز نمیرد آنکه دلش زنده شد به عشق**
**ثبت است بر جریدهء عالم دوام ما**

**هەرگیز نەمیرەد ئانکە دلەش زیندە شود بە ئیشق، سەبتەست بەر جەریدەیی ئالەم دەڤامی ما.**

هەرکەسێك دڵی بە عەشق زیندووبوویەوە ـ عاشق بوو ـ هەرگیز نامرێت، مانەوە و جاویدبوونی ئێمەش لەسەر دەفتەری رۆژگار نووسراوە.

نمیرد: نامرێت        زندەشد: زیندووبوویەوە

زندەشد بە عشق: زیندووبوویەوە بە عشق، واتە عەشق چووە نێودڵی

ثبت است: جێگیرە، تۆمارکراوە، نووسراوە        جریدە: دەفتەر        دوام: مانەوە

مەسەلەی نەمربوون و جاویدبوون بە عەشق مەسەلەیەکی گرینگی نێو عەشقە ئیدی مەجازی یاخود حەقیقی بێت، چ عەشقی مەجازی بێت لە نێو دەفتەری رۆژگاردا ناوی عاشقەکان زیندوو رادەگیرێت چ عەشقی حەقیقی بێت کە بە تەواوی لەگەڵ جاویدبووندا یەکدەگرێتەوە.

لە هزری ئایینیدا مرۆڤ مردنی بەسەردا نایەت و پاش دەرچوونیشی لە دنیا بەردەوامی بە ژیان دەدات ئەوەی دەبێتە مایەی ئارامی عەشقی خودا و عەشقی ئەو کەسەیە و بە نەمری دەمێنێتەوە ئێمەش کە ئەم عەشقە چووەتە دڵمانەوە نەمریمان لەسەر لاپەڕەکانی رۆژگار تۆمارکراوە و بە نەمری دەمێنینەوە.

**٤- ترسم کە صرفەیی نبرد روز بازخواست**

**نان حلال شیخ ز آب حرام ما**

**تەرسەم کە سەرفەیی نەبەرەد روزی بازخاست، نانی هەلالی شەیخ ز ئابی هەرامی ما.**

دەترسم لە رۆژی قیامەتدا هەقدەستی نانی حەڵاڵی شێخ لە ئاوی حەرامی ئێمە باشتر نەبێ.

ترسم: دەترسم، گومان دەبەم، لەوانەیە        صرفە: هەقدەست، ئەو بڕە پارەیەی کە لەسەر ئاڵتون دادەنرێت لە کاتی فرۆشتندا        روز بازخواست: رۆژی لێپرسینەوە، رۆژی قیامەت

نان حلال شیخ: نانی وەقفی شێخ، ئەو نانەی کە بە شێخ دەدرێت
آب حرام: ئاوی حەرام، مەبەست لە شەراب یاخود مەیە.

دەڵێ لەوە دەچێ لە رۆژی لێپرسینەوەدا کە سەبارەت بە کرداری چاك و خراپ پرسیارمان لێدەکەن شێخ لە ئێمە باشتر نەبێت و نانی حەڵاڵی ئەو و مەی و شەرابەکەی ئێمە وەك یەك بێت و فەزڵی شێخ بەسەر ئێمەدا نەبێ.

لێرەدا هەرچەندە بە (دەترسم) هاتووە، بەڵام دەیەوێ ئەوە بڵێ کە شێخ بەو ریا و فێڵبازییەوە هەرچەندە بە حیساب نانی حەڵاڵ دەخوات لە مەیخۆری و رەندی ئێمە باشتر نییە بگرە ئەم عەشق و مەستی و رەندییەی ئێمە لەو باشترە و لە رۆژی قیامەت و لێپرسینەوەدا هەقدەستی نانی حەڵاڵی ئەو لە ئاوی حەرامی ئێمە زیاتر نابێت.



**٥- مستی به چشم شاهد دلبند ما خوش است**

**زآن رو سپردەاند به مستی زمام ما**

**مەستی بە چەشمی شاهدی دلبەندی ما خوشەست، زانڕو سەپوردەئەند بە مەستی زیمامی ما.**

لە چاوانی یاری خۆشەویستی ئێمەدا حاڵەتی مەستی جوانە، هەر لەو رووەوەیە کە هەوسار و زەمامی ئارەزووی ئێمەشیان بە دەستی مەستی (یاخود بە دەسی مەستێك) سپاردووە.

چشم: چاو        شاهد: لە زماندا بە مانای بینەر و شایەد دێت، بەڵام لە زاراوەی سۆفیگەریدا بە واتای جوانی ڕەها و قەشەنگ دێت، بەو واتایەی کە ئەو (جوان) شایەد و گەواهی جوانی دروستکردنی خودایە، ناوێك (سیفەتێك)ی یارە

دلبند: دڵبەند، دڵدار، سەرنجڕاکێش        زانرو: لەو رووەوە        سپردەاند: سپاردوویانە

مستی: مەستی، مەستێ، لە راستیدا ئەم وشەیە بە دوو جۆری جیاواز دەخوێنرێتەوە و هەر خوێندنەوەیەکیشیان مانای جیاواز دەگەیەنێ:

١- مەستی کە ناوی مەعنەوییە

٢- مەستێك واتە کسێکی مەست        زمام: زەمام، هەوسار، ئیختیار

دەڵێ: لە چاوانی یاری سەرنجڕاکێش و جوانی ئێمەدا مەستی حاڵەتێکی جوانە بۆ ئەوەی ئێمەش لە پێش چاوی یاردا بە جوانی دەرکەوین خۆمان داوەتە دەست مەستی و مەست بووین (یا خۆمان داوەتە دەست مەستێ). هەروەها بە هۆی هاتنی (سپردەاند) سپاردوویانە دەتوانرێت ئەم لێکدانەوەی خوارەوەی بۆ بکرێت کە راستتر دێتە بەرچاو:

حاڵەتی مەستی چاوی یاری جوان و سەرنجڕاکێشی ئێمە زۆر جوانە و چاوانی مەستی لێدێ، هەر ئەم چاومەستییەی یارە کە ئێمەشی مەست کردووە و داوێنییە دەست مەستی. واتە لە تاو جوانی مەستی چاوی یار ئێمەش ئیختیاری خۆمان داوەتە دەست مەستی (یا مەستێ) و شوێن ئەوکەوتووین.

**٦- ای باد اگر به گلشن احباب بگذری**

**زنهار عرضه ده بر جانان پیام ما**

**ئەی باد ئەگەر بە گولشەنی ئەهباب بگوزەری، زینهار ئەرزە دەه بەری جانان پەیامی ما.**

ئەی با (سەبا) ئەگەر بە گوڵزاری خۆشەویستاندا گوزەرت کرد ئامان لە بیرت بێ پەیامی ئێمە بگەیەنی بە مەحبووب.

گلشن: گوڵشەن، گوڵزار          گلشن احباب: کۆڕی یاران، کۆڕی خۆشەویستان

عرضه ده: عەرزکە، بگەیەنە          پیام: پەیام

دەڵێ: ئەی با ئەگەر ڕێت کەوتە لای کۆڕی یاران و خۆشەویستان، ئامان لە بیرت بێ کە پەیامی ئێمەیان لا عەرزکە. کە (سودی) دەڵێ پەیامەکە بەیتی پاش ئەمەیە کە ئێستا دێت.

**٧- گو نام ما ز یاد به عمدا چه می بری**

**خود آید آن که یاد نباشد ز نام ما**

**گو نامی ما ز یاد بە ئەمدا چە می بەری، خود ئایەد ئان کە یاد نەباشەد ز نامی ما.**

بڵێ بۆچی لە دەست ئەنقەست ناوی ئێمە لە بیرخۆت دەبەیتەوە ئەو ڕۆژە خۆی دێ کە ناوی ئێمە لەبیر بچێتەوە.

گو: بگو، بڵێ          ز یاد بردن: لە یاد بردنەوە

عمدا: لەدەست ئەنقەست، بەدەستی ئەنقەست          خود آید: خۆی دێت          ز/ از: لە

پەیامەکەی شاعیر کە بە (با)دا بۆ خزمەتی خۆشەویستی دەنێرێ ئەمەیە کە بۆچی بەدەستی ئەنقەست ناوی من لە بیر دەبەیتەوە تا لە ژیاندام ئەی نازانی ئەو ڕۆژە خۆی دێ کە ناوی من لە بیر بچێتەوە و بمرم، چونکە کە مردم ناوم لە بیر دەچێتەوە، واتە ئەم چەند ڕۆژەی لە ژیاندام تا مەرگم نەگەیشتووە بێ میهری و بێ ڕەحمیم دەرهەق مەکە و من لە بیر خۆت مەبەرەوە.

**٨- حافظ ز دیده دانهء اشکی همی فشان**

**باشد که مرغ وصل کند قصد دام را**

**هافز ز دیده دانەیی ئەشکی هەمی فەشان، باشەد کە مورغی ڤەسل کونەد قەسدی دامی ما.**

حافز لە چاوانتەوە دانەی فرمێسکێك بڕێژە، بەڵکو باڵندەی وەسڵ بە خۆشی ئەم دانەوە بکەوێتە ناوداوەوە.

دیده: چاو          دانه: دان          اشك: فرمێسك          همی فشان: بڕژێنە، بپرژێنە

مرغ وصل: باڵندەی وەسڵ مەبەستی دیداری ئازیزە          قصد: نیاز، قەسد، ئارەزوو

دام: داو

بێگومان لە کاتی داو نانەوەدا دان دەڕێژن تا باڵندە بەخۆشی دانەکەوە بێت و بکەوێتە نێو داوەکەوە. شاعیریش بە حافز (خۆی) دەڵێ تۆ ئەگەر دەتەوێ وەسڵی یار بەدەست بێنیت و بەدیداری بگەی، ناگەی. چونکە وەسڵی یار وەك باڵندەیەك وایە و نایەتە بەردەستت بۆیە دەبێ



داوی بۆ بنێیتەوە و باشترین دانێکیش کە بەسەر داوەکەدا بپرژێت فرمێسکە، هەربۆیە فرمێسك بڕێژە تا بە هۆی ئەم دانە و گەوهەری فرمێسکی شەوانەوە باڵندەی وەسڵ و دیداری یار ڕاو بکەیت.

واتە تۆ ئەگەر دەتەوێ بە دیداری یار بگەیت جگە لە گریە و فرمێسکڕشتن هیچی دیکە چارەت ناکات. فرمێسك بڕێژە تا بە هۆی فرمێسکەکەوە دڵی نەرم بێت و بەزەیی پێتدا بێتەوە و بیخەیتە نێو داوی وەسڵەوە.

**٩- دریای اخضر فلك وكشتی هلال**

**هستند غرق نعمت حاجی قوام ما**

**دەریای ئەخزەری فەلەك و کەشتیی هیلال، هەستەند غەرقی نیئمەتی هاجی قیڤامی ما.**

دەریای سەوزی ئاسمان و کەشتی مانگی تازە، نغرۆی نیعمەتی حاجی قەوامی ئێمەن.

دەریای اخضر: دەریای سەوز، درکەیە لە ئاسمان لە شەودا یاخود لە ڕۆژدا

کشتی هلال: کەشتی مانگی تازە (یەکشەوە) (کەشتی و دەریا) لە ئەدەبی فارسیدا زۆری نیعمەت و بەخشندەیی دەخەنەڕوو، هەروەها (اخضر)یش کە سەوزییە خۆشی بەخش و فەرەح بەخشی دەخاتەڕوو.

حاجی قوام: بە حاجی (قوام الدین حسن) مەشهور بووە کە لە ساڵی (٧٥٤) هجریدا کۆچی دوایی کردووە، لە پیاوە گەورە و بە دەسەڵاتەکانی ئێران و وەزیران بووە لە سەدەی هەشتەمی هجریدا کە بە شێوەیەك لە (شێخ ابوو اسحاق پادشا) نزیك بە راوێژکاری دەدرایە قەڵەم بوو بە وەزیری ئەو، ئەم بەیتە وەسفی گەورەیی و بەخشندەیی ئەم حاجی قەوامەیە واتای بەیتەکەش، حاجی قەوامی ئێمە ئەوەندە بەخشندە و چاکەکارە نیعمەت و خۆشی دەریای سەوزی ئاسمان و کەشتی مانگی یەکشەوە نغرۆی نیعمەتی ئەون.

## غەزەلی سێزدەهەم:

**بەحری خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- می دمد صبح و کلَه بست سحاب**

**الصبووح الصبووح یا اصحاب**

**می دەمەد سوبح و کیللە بەست سەهاب، ئەسسبووح و ئەسسبووح یا ئەسهاب.**

کاتی بەیانییە و هەور گەواڵەی بەست (چادری هەڵدا)، ئەی یاران شەرابی بەیانیان، شەرابی بەیانیان.

می دمد صبح: کاتی بەیانییە، بەیانی سەری دەرهێنا، کلە: چادر، خێمە، پەردە، بە مانای گەواڵەی هەوردێت کە لە ئاسماندا دەردەکەوێ الصبووح: ئەو شتەی کە لە بەیانیاندا دەخورێت یاخود دەخورێتەوە و لە زاراوەی مەینۆشیدا شەرابە اصحاب: یاران

(سودی) دەڵێ: لە سەلیقەی بادەنۆش و مەیخۆراندا لە رۆژێکی هەوریدا کە ترسی بارانی نەبێت شەراب خواردنەوە پەسەندە بە تایبەتی گەر لە باغ و گوڵزاردا بێت، بەم سەلیقەوە شاعیر وێنەیەکی وای کێشاوە و دەڵێ بەیانی رۆژێکی هەورە و ئەی یاران مەیی بەیانیان بهێنن با بیخۆینەوە. لە زارەوەی عیرفانیدا مەبەست لە حاڵ و زیکری عارفانە.

**٢- میچکد ژاله بر رخ لاله**

**المدام المدام یا احباب**

**میچەکەد ژالە بەر روخی لالە، ئەلمودام ئەلمودام یا ئەهباب.**

دڵۆپەی باران دەتکێتە سەر رووخساری گوڵی لالەوە، شەراب، شەراب ئەی خۆشەویستان.

میچکد: دەتکێت المدام: مەی، شەراب احباب: خۆشەویستان

ژالە: شەونم، باران، لە راستیدا بۆ شەونم زیاتر بەکاردەهێنرێت، بەڵام لێرەدا (ژالە) دەتکێتە سەر پەڕەی گوڵ لالە: جۆرە گوڵێکە لە تیرەی سەوسەن، گوڵی زەرد و سوور دەردەکات، بەڵام کاتێ بە تەنیا بێت مەبەست لێی گوڵی سوورە.

هەر وەسفی ئەو رۆژە دڵگیرە دەکات کە بۆ سەفا و خۆشی پەسەندە بەوەی کە شەونم دەتکێتە سەر پەڕەی گوڵی لالە، دیسان داوای شەراب لە خۆشەویستان دەکات.



**٣- می وزد از چمن نسیم بهشت**

**هان بنوشید دم به دم می ناب**

**می ڤەزەد ئەز چەمەن نەسیمی بیهیشت، هان بنوشید دەم بە دەم مەیی ناب.**

لە باغەوە شەماڵی بەهەشت هەڵدەکات، خێرا سات نا ساتێ مەیی بێخەوش بنۆشن.

می وزد: هەڵدەکات نسیم: شەماڵ نسیم بهشت: شەماڵێ کە وەك هی بەهەشتە

هان: وشەی ئاگادارکردنەوەیە بە واتای بجوڵێ، خێراکە بنوشید: بنۆشن

دم بەدم: سات نا ساتێ، بەردەوام می ناب: شەرابی خالص، بێخەوش

شەماڵی بەهەشتی لە باغەوە هەڵدەکات ئاگاداربن، بەردەوام شەرابی بێخەوش بخۆنەوە.

**٤- تخت زمرد ز دست گل به چمن**

**راح چون لعل آتشین دریاب**

**تەختی زومرود ز دەست گول بە چەمەن، راهی چون لەئلی ئاتەشین دەریاب.**

گوڵ لە باغدا زمڕوتی داناوە، شەرابی سووری وەك ئاگر بە دەست بهێنە.

تخت: تەخت، کورسی زمرد: زمڕوت، گەوهەرێکی سەوزە، (سودی) دەربارەی زمڕوت نووسیویەتی: مار و دوپشك بە بینینی زمڕوت هەڵدێن و هەرکەس زمڕوتی پێ بێت مار و دوپشك لە بەری هەڵدێن، بەتایبەتی مار کە بە بینینی زمڕوت کوێردەبێ{سودی، ج١، ل١٢٠} راح: شەراب لعل آتشین: لێوی سووری ئاگرین دریاب: بەدەست بێنە.

شاعیر لێرەدا باغ و گوڵزاری بە زمڕوت چوواندووە لە رەنگدا واتە چیمەن وەك زمڕوت سەوزە لە کاتێکدا گوڵی سوور لەسەر ئەم سەوزاییە دانیشتووە، ئەم وێنەیەی دروست کردووە کە گوڵ لە چیمەن تەخت و کورسی سەوزی زمڕوتی داناوە تۆش لەم حاڵ و شوێنە جوانەدا کە گوڵ لە نێو چیمەندایە شەرابی سووری ئاگرین بەدەست بهێنە.

**٥- در میخانه بسته‌اند دگر**

**افتتح یا مفتح الابوواب**

**دەری مەیخانە بەستەئەند دیگەر، ئیفتەتیه یا موفەتیهەل ئەبوواب.**

دووبارە دەرگای مەیخانەیان داخستووەتەوە، ئەی ئەو کەسەی دەرگاکان دەکەیتەوە بۆمان بکەرەوە.

دگر: واتە ئیتر، هەمتر، بەڵام لێرەدا بەمانای (باز)ە واتە دووبارە

افتت دوبارە ح: بیکەرەوە

مفتح الابوواب: ئەوکەسەی دەرگا دەکاتەوە، دەکرێ ئەم رستەیە داوا و دۆعایەك بێت بۆ خودا، چونکە خودا رزگارکەرە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

دەڵێ: دیسانەوە دووبارە دەرگای مەیخانەکان (خەڵوەتخانەکانی عەشق) داخرایەوە و قەدەغەکرا ئەی ئەو کەسەی کە دەسەڵاتت بەسەر کردنەوەی دەرگاکاندا هەیە بۆمان بجە سەرپشت.

**٦- در چنین موسمی عجب باشد**

**که ببندند میکده به شتاب**

**دەر چونین مۆوسمی ئەجەب باشەد ، کە ببەندەند مەیکەدە بە شتاب.**

سەیرە کە لە وەرزێکی لەم شێوەیەدا وا بە پەلە دەرگای مەیخانە داخەن.

چنین: لەم شێوەیەدا، بەم شێوەیە، ئاوا عجب باشد: سەرسوڕهێنەرە

ببندند: داخەن، بگرن میکدە: مەیخانە شتاب: بەپەلە، بەعەجەلە

سەیرە کە لە وەرزی ئاوادا واتە لە وەرزی بەهاردا کە ئەو هەموو وەسفەی کرا وا بە پەلە مەیخانە قەدەغە بکرێت و دەرگاکانی داخرێت.

**٦- بر رخ ساقی پری پیکر**

**همچو حافظ بنوش بادهٔ ناب**

**بەر روخی ساقی پەری پەیکەر، هەمچو حافز بنوش بادەیی ناب.**

بە رووی ساقیدا کە وەك پەری وایە وەك حافز شەرابی بێخەوش بنۆشە.

بررخ: بە رووی، لە رووی پری پیکر: ئەندام وەك پەری، جوان

لە ئامادەیی ساقی جواندا، سەیری جوانی ئەو بکە و وەك حافز شەرابی بێخەوش بنۆشە.



## غەزەلی چواردەیەم:

بەحری رەمەلی هەشتی مەحزوف

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

**١-صبح دولت می دمد کو جام همچون آفتاب**

**فرصتی زین به کجا باشد بده جام شراب**

**سوبهی دۆوڵەت می دەمەد کو جامی هەمچون ئافتاب، فورسەتی زین بیە کوجا باشەد بدە جامی شەراب.**

کازیوەی بەخت و ئیقبال دەردەکەوێ کوا پێکی درەوشاوە وەك رۆژ فرسەتی لەمە باشتر لە کوێ دەبێت، پێکی شەرابم بدەرێ.

صبح دولت: کازیوەی بەخت، سەرەتای بەخت، آفتاب: خۆر، هەتاو، رۆژ

بە: باش، چاك زین بە: لەمە چاکتر، لەمە باشتر

کازیوە و بەیانی کە کۆتایی شەو و سەرەتای هەڵهاتنی خۆرە بە بەختباشی و ئیقبال چوێنراوە و پێکیش بە هۆی سووری و درەوشاوەیی شەرابی نێوی بە خۆر چوێنراوە و دەڵێ: لە بەیانییەکی وادا کە بەخت یارمانە و کازیوەی ئیقبال دەردەکەوێ پێکی وەك خۆر درەخشان لەکوێیە، ئەم حاڵەتەش بۆ پێدانی جامی شەراب باشترین فرسەتە و شەرابمان بدەرێ با لە کیسی نەدەین.

**٢-خانه بی تشویش و ساقی یار و مطرب نکته‌گوی**

**موسم عیش است و دوور ساغر و عهد شباب**

**خانە بی تەشڤیش و ساقی یار و موتریب نوکتەگوی، مۆوسمی ئەیشەست و دۆوری ساغەر و ئەهدی شەباب.**

ماڵ ئارام و بێ نیگەرانی و ساقی یار و گۆرانیبێژی نوکتەبێژ، کاتی چێژ و رابواردن و بادەنۆشی سەردەمی لاوییە.

خانە: ماڵ بی تشویش: ئارام و ئاسایش نکتەگوی: نوکتەبێژ، نوکتە باز، لە (سودی)دا ـ بذلە گوی ـ هاتووە کە هەمان مانا دەگەیەنێت دوور: دەور، دەوران، گێڕان

ساغر: پیاڵەی شەراب، پێك عهد: سەردەم

شباب: جوانی، لاوی

دەکرێ ئەم بەیتەش تەواوکەری (صبح دولت)ی دێڕی یەکەم بێت کە بەخت یاریانە، چونکە مەبەست لە (خانە بی تشویش) بوون ئەوەیە کە ماڵەکان لە گەڕان و پشکنینی پیاوانی دەوڵەت بە دوور بووە و دەڵێ: ئێستا ماڵەکان لەو ترسە دوورکەوتوونەتەوە و یار و خۆشەویستمان ساقییە و گۆرانیبێژیش قسەخۆش و نوکتەبازە، ئەم دەورە کات و زەمانی رابووردن و ژیان و دەورانی گێڕانی پێکی شەراب و سەردەمی لاوییە.

**٣-از پی تفریح طبع و زیور حسن و طرب**

**خوش بوود ترکیب زرین جام با لعل مذاب**

**ئەز پەیی تەفریهی تەبع و زیڤەری هوسن و تەرەب، خوش بووڤەد تەرکیبی زەرین جام با لەئلی مەزاب.**

بۆ ئەوەی خۆشی و چالاکیمان هەبێت و جوانی و خۆشی برازێنینەوە، چەند چاکە کە پێکی ئاڵتون و لەعلی تواوە تێکەڵاو کەین.

(سودی) دەڵێ: ئەم غەزەلە لە کاتی هاتنە سەر تەختی (شوجاع پادشا)دا گوتراوە، چونکە ئەو پادشایە بە زەوق و سەلیقە بادەنۆش بووە و لە سەردەمی ئەودا کەس ئازاری بادەنۆشانی نەداوە {ج ١، ل١٢٩} بەیتەکانی سەرەتاییش ئاماژەیەکیان بۆ ئەم ئازادییە تێیدایە

زیور: رازاندنەوە، رازێنەرەوە

زرین: زێڕین، ئاڵتونی

لعل: هەرچەندە زۆرجار بە مانای سوور دێت، بەڵام خۆی لە ئەسڵدا گەوهەرێکی سوورە

مذاب: تواوە یاخود بە ئاوبوو

لعل مذاب: گەوهەری سووری تواوە، لەعلی بە ئاو بوو، کە مەبەست پێی شەرابە

لە (سودی)دا دەڵێ چەند خۆشە بۆ رابواردن و خۆشی، چونکە چاکە پێکی ئاڵتون بە شەرابی وەك لەعل سوور ئارایشت بکەین و لەم جوانی و تێکەڵاوبوونەشی چێژ و چالاکی دەست بخەین (بێگومان چێژ و چالاکی عیرفانییە).

**٤-از خیال لطف می مشاطەء چالاك طبع**

**در خمیر برگ گل خوش می کند پنهان گلاب**

**ئەز خیالی لوتفی مەی مەشاتەیی چالاکی تەبع، دەر خەمیری بەرگی گول خوش مێ کونەد پەنهان گولاب.**

ئارایشتگەی چاپووکی سروشت لە خەیاڵی میهر و سەرنجڕاکێشی مەیەوە چەندە وەستایانە گوڵاوی لە نێو گەڵای گوڵدا شاردووەتەوە.



خیال: خەیاڵ، تەسەور   مشاطە: ئارایشتگەر   چالاك: چالاك، چاپووك، چوست

خمیر: ناو، نێو   پنهان: شاراوە   گلاب: گوڵاو

گوڵاو لە سەرەتادا بۆنی گەڵای گوڵە و تێیدا حەشاردراوە، ئارایشتگەری چوست و چالاکی سروشت گوڵاوی لەگەڵ شەرابدا بەراورد کردووە و شەراب و مەیی پێ جوانتر و سەرنجڕاکێشتربووە و ناچار گوڵاوی وەك بۆن لە گەڵای گوڵدا پەنهان کردووە.

**٥-شاهد و مطرب بە دست افشان و مستان پای کوب**

**غمزەء ساقی ز چشم می پرستان بردە خواب**

**شاهید و موتریب بە دەست ئەفشلن و پای کوب، غەمزەیی ساقی ز چەشمی مەی پەرستان بوردە خاب.**

یاری جوان و گۆرانیبێژ بە چەپڵەلێدان و مەستان بە رەقس و سەماوە سەرقاڵن، غەمزە و ئاماژەکانی چاو و برۆی ساقیش خەوی لە چاوی مەیپەرستان تۆراندووە.

ئەو حاڵەتە خۆشی و بەشارەتەی کە یاری نازدار و ساقی بە چەپڵە و مەستان بە سەما و ساقی بە خەمزەکانییەوە خەویان لە چاوی مەی پەرستان تۆراندووە.

**٦-باشد آن مە مشتری دُرهای حافظ اگر**

**می رسد هردم بە گوش زهرە گلبانگ رباب**

**باشەد ئان مەه موشتەری دوورهای هافز ئەگەر، می رەسەد هەردەم بە گوشی زوهرە گولبانگی روباب.**

ئەگەر ئەو مانگە ببێتە کڕیاری گەوهەرەکانی حافز هەردەم ئاوازی خۆش روباب بە گوێی ئەستێرەی زوهرە دەگات.

مە: مانگ   مشتری: کڕیار، مشتەری   در: دوور، گەوهەر، مرواری، مەبەست لە شیعرەکانی خۆیەتی   گلبانگ: ئاوازی خۆش   رباب: روباب

دەڵێ: ئەگەر ئەو شۆخە ببێتە مشتەری شیعرەکانی من کە وەك گەوهەر و مروارین هەر ساتە بە ئاوازی خۆشی روبابەوە دەیانڵێ بە شێوەیەك کە ئەم دەنگە خۆشە بەگوێی ئەستێرەی زوهرە دەگات.






## غەزەلی پانزەیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات)**

**١-گفتم ای سلطان خوبان رحم کن بر این غریب**

**گفت در دنبال دل ره گم کند مسکین غریب**

**گوفتەم ئەی سولتانی خوبان رەهم کون بەر ئین غەریب، گوفت دەر دونبالی دل رەه گوم کونەد مسکین غەریب.**

وتم ئەی سوڵتانی جوانان رەحم بەم غەریبە بکە، وتی غەریبێکی هەژار گەر بە دوای دڵی خۆیدا بڕوات رێگە ون دەکات (سەری لێدەشێوێت).

خوب و خوبان: باش، چاك، جوان، جوانان — دنبال: بە دوای

رە گم کند: رێگە ون دەکات — مسکین غریب: غەریبی هەژار، غەریبی داماو

شاعیر غەریب و رێبوار بووە و ویستویەتی ئەو غەریبایەتییە بکاتە هۆیەك بۆ ئەوەی یار بەزەیی پێدابێتەوە و گوتوویەتی ئەی پادشای جوانان رەحم و بەزەییەکت بەم غەریبەدا بێتەوە، بەڵام یاری شای جوانان زۆر لەوە عەیار و زیرەکتربووە کە بکەوێتە ئەم داوە و بەم غەریبەی وتووە گەر غەریبێکی بێ نەوا بە دوای دڵی خۆیدا بڕوات رێگەی لێ بزر دەبێت و سەرگەردان دەبێ، واتە تۆ لە بری ئەوەی لە بیری پەناگە و مەنزڵێکدا بیت و ژیانێك بۆ خۆت دروست بکەیت بە دوای دڵتدا رۆشتۆی بێگومان بەمەش سەرگەردان و سەرلێشێواو دەبیت.

**٢-گفتمش مگذر زمانی گفت معذورم بدار**

**خانه پروردی چه تاب آرد غم چندین غریب**

**گوفتەمەش مەگوزەر زەمانی گوفت مەئزورەم بدار، خانە پەروەردی چە تاب ئارەد غەمی چەندین غەریب.**

پێم گوت تاوێ بووەستە وتی لێم مەگرە، چونکە ئەوەی لەماڵی خۆیدا گەورە بووە(بەنازپەروەردە) توانای هەڵگرتنی خەمی ئەم هەموو غەریبەی نییە.

گفتمش: پێم گوت — مگذر زمانی: زەمانێ مەڕۆ، تاوێ بووەستە

معذورم بدار: لێم مەگرە، بیانوم هەیە، مەعزورم

خانە پروردی: نازپەروەر، (پەروەردەکراوی ماڵەوە) بە کەسێك دەڵێن کە تەنیا لە ماڵەوە بووە و هەرگیز لە دەرەوەی ماڵەوە تێکەڵاوی بێگانە نەبووە. وەك شازادە و بەگزادەکان یاخود

منداڵی فەرمانڕوا و کاربەدەستەکان (بەناز پەروەردە) ئەم دەربڕینە مانایەکی دووری (نازپەروەر) دەگەیەنێت، یاخود کوڕی سێبەر منداڵی بەرسێبەر سوێری و تاڵی نەچەشتوو.

چە تاب آرد: چ توانایەکی هەڵگرتنی هەبێت.

دیارە شاعیر وەك غەریبێك ڕێی کەوتووەتە ماڵی مەحبووب و لە کاتی تێپەڕینی، مەحبووبدا ویستوویەتی دەردەدڵێکی لابکات یاخود خەمێکی لابدا بەبا، دەڵێ: پێم گوت تاوێ لە ڕۆشتن بسرەوە و بووەستە و تێ مەپەڕە، گوتی لێم مەگرە منێك کە هەرگیز تاڵی و سوێریم نەچەشتووە و لە ماڵی خۆمدا پەروەردەبووم و نازانم غوربەت چییە توانای تەحەمولکردنی غەم و خەفەتی غەریبانی وەك تۆم نییە و لە لاتدا ناوەستم.

(سودی) لە سەرەتای ئەم غەزەلەدا دەڵێ: ئەو غەزەلانەی کە قافییەکەیان بە (ب، پ، ج، ح، خ) کۆتایی هاتووە زۆر لاوازان، بەڵام ئەو غەزلانەی کە بە (ع، ق، ك، ل) کۆتاییان هاتووە زۆر زۆر باڵا و بەرزن و غەزەلەکانی دیکەشی بەرزن، بە کورتی هەموو غەزلەکانی حافز وەك یەك نین، بە ڕێکوپێکی و بەرزی غەزەل گوتن لە هەموو پیتەکاندا تایبەمەندی (مەولانا حەزرەتی جامی)یە.

**۲-خفته بر سنجاب شاهی نازنینی را چه غم**

**گر ز خار و خاره سازد بستر و بالین غریب**

**خوفتە بەر سنجابی شاهی نازەنینی را چە خەم، گەر ز خار و خارە سازەد بەستەر و بالین غەریب.**

نازەنین و نازدارێك کە لە پێستی سنجابی پادشایانەدا خەوتووە، چە غەمێکی هەیە گەر غەریبێك لە دڕك و داڵ و بەردی ڕەق دۆشەك و پشتییەکەی دروستبکات.

خفتە: بە ئارامی خەوتووە، ئارامی گرتووە.

سنجاب: گیاندارێکی خۆڵەمێشییە و وەك سمۆرە وایە، پێستەکەی زۆر گرانبەهایە، لێرەشدا مەبەست لە فەروی سنجابە (سنجابی شاهی)ش: واتە فەرو و پێستەیەکی سنجاب کە لایق و شیاوی پادشایە یاخود بە تایبەت هی پادشایە، دەڵێن جاران پاشاکانی ئێران لە زستاندا سوودیان لە فەروی سنجاب وەرگرتووە.

نازنین: نازەنین، نازدار     خار: دڕك و داڵ و پووش و پەڵاش.

خارە: خارا: بەردی خارا، بەردێکی ڕەشی ڕەقە، لێرەدا مەبەست لە بەردی ڕەقە

بستر: دۆشەك     بالین: پشتی، بالیف



ئەم بەیتە وەسفی ئەو شۆخەیە کە لە بەیتی یەکەم دووەمدایە و هیچ لە حاڵی غەریبان نازانێت و لێرەدا ئەو جیاوازییە لە لایەن شاعیرەوە بەیان دەکرێت و دەڵێ: نازدارێك کە لە فەروی سنجابدا ئارام دەگرێ یاخود نازدارێك کە لەسەر دۆشەکی سنجابی پادشایانەدا دەخەوێت و ئارام دەگرێ ناحەقی نییە کە بۆ ساتێك لامان نەوەستێ، چونکە ئەو چ غەمێکی هەیە کە غەریبی بەدبەخت لە جیاتی دۆشەك لەسەر دڕك و داڵ دەخەوێت و لە جیاتی پشتی و بالیفیش بەردێکی ڕەق دەخاتە ژێر سەری.

لە نێوان (خار و خارە) و (بستر و بالین)دا پێچان و کردنەوەی ڕێك (لف و نشر مرتب) هەیە، واتە (لە دڕك و داڵ دۆشەك و لە بەردی ڕەق پشتی دروست دەکات).

**۳-ای که در زنجیر زلفت جان چندین آشناست**

**خوش فتاد آن خال مشکین بر رخ رنگین غریب**

**ئەی کە دەر زەنجیری زولفەت جانی چەندین ئاشناست، خوش فوتاد ئان خالی موشکین بەر روخی ڕەنگین غەریب.**

ئەی ئەو کەسەی کە گیانی چەندین ئاشنا لە زنجیری زوڵفتدا دیلن، ئەو خاڵە ڕەشەی سەر ڕومەتی ڕەنگینت عەجەب بەجوانی دەرکەوتووە.

زنجیر: زنجیر     خوش فتاد: جوان دەرکەوتووە، بە چاکی دەرکەتووە.

خاڵ مشکین: خاڵی ڕەش خۆی لە ئەسڵدا (خاڵی مسکی)یە، چونکە (مسك) ڕەشە و لە ڕەنگدا خاڵ بەو چوێنراوە، لێرەشدا مەبەست لە ڕەنگەکەیە.

رنگین: ڕەنگین، سوور و سپی.

غریب: لێرەدا بەمانای عەجیب، سەیر، بە شێوەیەکی سەیر هێنراوە.

دەڵێ: ئەی ئەو شۆخەی لە زنجیری زوڵفت و پرچتدا گیانی چەندین ئاشنا ئەسیر و دیل بووە و لولی پرچت بووەتە مایەی ڕاکێشانی دڵی چەندین ئاشنا. ئەو خاڵە ڕەشەی سەر ڕوومەتی ڕەنگینت بە شێوەیەکی زۆر چاك دەرکەوتووە (لە زاراوەی عیرفانیدا پرچی لول مانای زۆری پەردەکانی سەر لیقا و ڕووخساری مەعشوقی ئەزەلییە.)

بەڵام گەر (غەریب) بە مانای (غەریب)ی زمانی لێکبدەینەوە ئەوا واتاکە دەبێتە: ئەی ئەو کەسەی کە چەندین ئاشنا لە زنجیری پرچتدا دیلن، خاڵی ڕەشی سەر ڕوومەتی ڕەنگینت زۆر چاك غەریب و تەنیا ماوەتەوە واتە ڕوومەتت تەنیا ئەو خاڵە ڕەشەی پێوەیە و غەریب کەتووە.

**٤-می نماید عکس می در رنگ روی مهوشت**
**همچو برگ ارغوان بر صفحهء نسرین غریب**

**می نمایەد ئەکسی مەی دەر رەنگی روی مەهڤەشت، هەمچو بەرگی ئەرغەڤان بەر سەفەهەی نەسرین غەریب.**

وێنەی مەی بەسەر رەنگی روومەتی مانگ ئاساتەوە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش دەردەکەوێ، هەروەك گەڵای ئەرغەوان کە دەکەوێتە سەر پەڕەی نەسرین.

می نماید: دەردەکەوێ    عکس: وێنە    رنگ: رەنگ    مهوش/ماەوش: مانگ ئاسا
ارغوان: درەختێکی بەرزی جوانە و گەڵای سووری مەیلەوشینە یاخود سووری شەرابی
برگ: گەڵا    برگ ارغوان: گەڵای ئەرغەوان
صفحە: لاپەڕە، (روو، سەر)
نسرین: گوڵە نەسرین کە گەڵا و گوڵی سپییە یا گوڵی زەرد دەردەکات.

لێرەدا مەبەست لە گوڵی سپی لە سروشتدا کاتێ گەڵای سووری شەرابی دار ئەرغەوان دەکەوێتە سەر رووپەڕی گوڵە سپییەکانی نەسرین حاڵەتێکی زۆر جوانی سەرنجڕاکێش دروست دەکات، گەڵای نەسرین سپییە و روومەتی وەك مانگی یار بەو چوێنراوە و گەڵای ئەرغەوانی سووریش شەرابی سووری پێ چوێنراوە. دەڵێ: وەك ئەم دیمەنە کاتێ سووری شەرابیش لە رووی سپی وەك مانگی یاردا رەنگ دەداتەوە وەك ئەرغەوان و نەسرین شێوەیەکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێش دروست دەبێت، یاخود لە ئەنجامی مەیخواردنەوە رووخساری سپی سوور هەڵدەگەڕێت و سوورییەکەی تۆختر خۆی دەنوێنی و دیمەنێکی جوان لەسەر سپێتی رووخساری دەردەکەوێ.

**٥-بس غریب افتاده است آن مور خط گرد رخت**
**گرچه نبوود در نگارستان خط مشکین غریب**

**بەس غەریب ئوفتادەئەست ئان موری خەتی گەردی روخەت، گەرچە نەبوود دەر نیگارستان خەتی موشکین غەریب.**

ئەو هێڵە رەشەی دەوری رووت کە وەك مێرووڵە وایە دەوری رووتی گرتووە حاڵەتێکی زۆر سەیری هەیە، هەرچەندە لە جێگای خۆشنووسیدا هێڵی رەش سەیر نییە.

بس: بسیار: زۆر    مور: مێروولە    خط: هێڵ    مورخط: هێڵی رەش
گرد: دەور    گرچە: گەرچی، هەرچەندە    نگارستان: جێگای خۆشنووسی، رووخساری یار



(سودی) لە شەرحەکەی خۆیدا دەڵێ: (نگارستان و نگارخانە) ناوی ماڵێکە لە چین کە (مانی) خۆشنووس تێیدا بووە و نەخش و وێنە سەیر و سەمەرەکانی خۆی تێدا رەسم کردووە جگە لەمانیش هەر وێنە و رەسم و نەخشێکی بێ وێنە بهێنرێتە ئارا لەوێ دادەنرێت، کەواتە (نگارستان) مۆزەخانەیەکی پڕ لە خەت و نەخشی نایاب و نامۆیە {ج١، ل١٢٦}، بەڵام لەهەمان لاپەڕەدا (خط مور)ی بە (ریش) چواندووە کە تازە روابێت، بەڵام لە راستیدا ئەمە دوورە لە حافز کە وێنەی پیاوێك بۆ جوانی و غەریبی بکێشێ، چونکە لە ئەدەبیاتی دێریندا گەر وەسفی پیاوێکیش کرابێت سیمای ژنانەی پێدراوە و هەرگیز پێچەوانەی ئەمە بەرچاو نەکەوتووە.

دەڵێ: ئەو مووە رەشەی کە چوار دەوری رووخسارتی گرتووە کە دەکرێ چەند تاڵە موویەکی پرچ بێت و بەهەردوو لای رووخساردا شۆڕ بکرێتەوە زۆر سەرنجڕاکێش و جوان دەرکەوتووە هەرچەندە لە نێو رووخساری جوانی خۆتدا (نگارستان) بوونی خاڵی مشکین و رەش سەیر و سەرسوڕهێنەر نییە، بەڵام ئەو پرچەی دەوری رووخسارت کە غەریب دەرکەوتووە سەیر و سەرسوڕهێنەرە.

لێرەدا بە پێی رێبازی فینۆمینۆلۆجی هەمان قسە دەسەلمێنرێت، چونکە شاعیر ئاشنایی بە خەت و خاڵی سەر رووخساری یار هەبووە وەك شتێکی سەیر نییە و هەمیشە لەبەر چاویدا دووبارە دەبێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی رەشی پرچی یاخود چەند تاڵە مویەکی رەشی یار لە دەوری رووخساریدا دووبارە نابێتەوە سەرنجڕاکێشە و بە لایەوە سەیر بووە.

**٦-گفتم ای شام غریبان طرهء شبرنگ تو**
**در سحرگاهان حذرکن چون بنالد این غریب**

**گوفتەم ئەی شامی غەریبان توڕڕەیی شەبڕەنگی تو، دەر سەهەرگاهان هەزەرکون چون بنالەد ئین غەریب.**

گوتم ئەی پەرچەمی رەشت وەك شەوی غەریبان تاریکە لە بەرەبەیانیاندا کاتێ ئەم غەریبە ناڵەناڵییەتی، لەکاریگەری ناڵەم حەزەر بکە و ئاگاداربە.

شام غریبان: شەوی غەریبان    شبرنگ: رەنگی تاریك وەك شەو، رەش
بنالد: بناڵێنێ، ئاە و زاری بکات.

بە یاری خۆی دەڵێت: ئەی ئەو کەسەی پەرچەمی رەشت لە تاریکی و تێریدا لە تاریکی و لێڵی شەوی غەریبان دەچێت بەرەبەیانیان لەم غەریبە بترسە کە خەریکی ئاهو زاری و ناڵە

ناڵە، چونکە ناڵینی بەرەبەیانیان گیرا دەبێت لای خودا، واتە دڵم مەشکێنە بە بەرەبەیانیان گریە و ناڵە نەکەم و کاریگەری خراپی لەسەرت نەبێ.

**۷-گفت حافظ آشنایان در مقام حیرتند**

**دوور نبوود گر نشیند خسته و غمگین غریب**

**گوفت هافز ئاشنایان دەر مەقامی هیرەتەند، دوور نەبووڤەد گەر نشینەد خەستەڤو غەمگین غەریب.**

گوتی حافز ئاشناکانمان دوچاری سەرگەردانی و حیرەت بوون، دوور نییە (سەیر نییە) کە غەریبێکی وەك خۆت بە ماندو و غەمگینی دانیشێ.

حیرت: حیرەت، سەرگەردانی، سەرلێشێواوی، ئەبڵەق بوون لە زاراوەی عیرفانیدا بریتییە لە: کاتێ ڕێبوار نەگەیشتۆتە دەریای زانستی گشتی (بە هۆی کەم و کورتی زانستی جوزئی خۆیەوە) واهەست دەکات کە زانست و مەعریفەتی هەیە، بەڵام کاتێ گەیشتە دەریای زانستی گشتی و گەیشتە قووڵایی، زانستە جوزئییەکان خۆبەخۆ لەناو دەچن و دوچاری سەرگەردانی و حیرەت دەبێت، هەندێ لە عارفەکان عیرفان بە حیرت لە ناو حیرەت دەدەنە قەڵەم.

دوور نبوود: دوور نییە، سەیر نییە.

خستە و غمگین نشستن: بەهیلاك و خەمباری دانیشتن، دوچاربوون بەهیلاکی و خەمباری.

دەڵێ: یار و خۆشەویستی عیرفانی گوتی: حافز ئاشناکانی ڕێگەی تەریقەت کاتێ کە بە قووڵایی زانستی گشتی گەیشتوون تووشی سەرگەردانی و حیرەت هاتوون، هەربۆیە تۆیەکی غەریب کە هێشتا بە قووڵایی نەگەیشتوویت و هەوڵی بۆ دەدەیت سەیر نییە کە لە ڕێگەی گەیشتن بە مندا دوچاری هیلاکی و خەمباری ببیت.



## غەزەلی شانزەیەم

**بەحری هەزەجی هەشتی مەکفوفی مەحزوف**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)**

**۱- ای شاهد قدسی کە کشد بند نقابت**

**وی مرغ بهشتی کە دهد دانە و آبت**

**ئەی شاهدی قودسی کە کەشەد بەندی نیقابەت، ڤەی مورغی بیهیشتی کە دەهەد دانە ڤو ئابەت.**

ئەی خۆشەویستی پاك و بەهەشتی چ کەسێ بەندی نقابت رادەکێشی وەی باڵندەی بەهەشتی چ کەسێ ئاو و دانت دەداتێ.

شاهد: خۆشەویست      قدسی: پاك، بەهەشتی، جهانی باڵا

بند: داو، پەت      نقاب: ڕووبەند

بندنقاب: پەتی ڕووبەند، ڕووبەند بە داوێك بە نێوچەوانەوە دەبەسترێت بۆ لادانی پەچەکە و لابردنی دەبێ پەتەکە رابکێشرێت تا بکرێتەوە   وی: وەی   مرغ بهشتی: تاوس، لێرەدا مەبەست لە مەعشوقە.   دهد: بیدات   دانە و آب: دان و ئاو مەبەست لە خۆراك و ئاوە.

دەڵێ: ئەی خۆشەویستی پاك و بەهەشتی من وەك حۆرییەکانی بەهەشت پاکداوێن و پاکیزەیت ئاخۆ چ کەسێ بەندی ڕووبەندەکەت راکێشی تا لە سەرتی لابدات و ڕووخسارت ببینێ یاخود چ کەسێ داوی ڕووبەندەکەت رادەکێشێ و ڕووخسارت دەبینێ. وەی یار کە تۆ وەك تاوسی بەهەشتی وای ئاخۆ چ کەسێ خواردن و ئاوت بداتێ و پێشوازیت لێ بکات، یاخود چ کەسێ ئاو و خواردنت دەداتێ. بەیتەکە بە هەردوو ڕێژەی هەواڵی و ئیلتیزامی شەرح دەکرێت، چونکە نیشانەی سەر (کشد و دهد) کە دەکرێ(ب)ەکە، (می) بێت کە سواوە.

(سودی) دەڵێ:" خۆشەویستی شاعیر لە سەفەر بووە و خواجە ئەم غەزەلەی بۆ ناردووە" {ج۱، ل۱٤۱}، بەڵام ئەم رایە تەخمینە و لە مانای غەزەلەکەوە هەڵنەهێنجراوە.

**۲-خوابم بشد از دیده درین فکر جگر سوز**

**کاغوش کە شد منزل آسایش و خوابت**

**خابەم بشود ئەز دیدە دەرین فکری جگەر سوز، کاغوشی کە شود مەنزلی ئاسایش و خابەت.**

بیری ئەوەی کە لە باوەشی چ کەسێکدا دەخەویت و ئارام دەگریت، ئاگر لە گیانم بەردەدات و جگەرم دەسوتێنێ و خەو لە چاوانم دەتۆرێنێ.

خوابم بشد از دیده: خەو لەچاوانم تۆراوە.

جگر سوز: جگەرسوێنەر     آغوش: باوەش

دەڵێ: ئەو بیر و خەیاڵەی کە ئارامی لەبەر هەڵگرتووم و خەوی لە چاوان تۆراندوم و جگەرم دەسووتێنێ و ئازارم دەدات ئەوەیە کە ئەبێ ئێستا لە باوەشی چ کەسێکدا خەوت لێکەوتبێ و ئارام بگری.

لەڕاستیدا ئەم غەزەلە وەك ئەو بۆچوونە نییە کە (سودی) لە بارەیەوە هەیەتی کە یار و خۆشەویستی مەجازی حافز لەسەفەردا بووبێت و ئەم قسانە گومانی حافز بێت لە یار و نازدارەکەی، بەڵکو هەر خەیاڵێکی شاعیرانە و تەسەورێکی خودی شاعیرە سەبارەت بە مەعشوقی عیرفانی.

**٣-درویش نمی پرسی و ترسم که نباشد**

**اندیشهء آمرزش و پروای ثوابت**

**دەرڤیش نەمی پورسی و تەرسەم کە نەباشەد ، ئەندیشەیی ئامرزش و پەروای سەوابەت.**

لە حاڵی دەروێش ناپرسیتەوە، دەترسم کە بیر لە پاداشتی کاری خێر و لێخۆشبوون و عەفوی خۆت نەکەیتەوە.

درویش: دەروێش   اندیشه: بیر   آمرزش: عەفو، لێخۆشبوون، مەرحەمەت

ثواب: پاداشت

دەروێش، هەژار و بێ نەوایە و پرسینی حاڵی دەروێشیش کارێکی چاکە و پاداشتی ڕۆژی دوایی هەیە و دەڵێ: دەڵێی تۆ لە بیری کاری خێر و رزگارکردنی روحی خۆتدا نیت وا حاڵی دەروێشان ناپرسیت و لێیان ناپرسیتەوە.

**٤-راه دل عشاق زد آن چشم خمارین**

**پیداست ازین شیوه که مست است شرابت**

**راهی دلی ئوشاق زەد ئان چەشمی خومارین، پەیداست ئەزین شیڤە کە مەستەست شەرابەت.**

ئەو چاوە خومارەی تۆ ڕێگەی دڵی عاشقانی بڕی، بەم شێوە کارەشدا دیارە کە شەرابت مەستە.

راه زدن: ڕێگەگرتن یان ڕێگەبڕین بە مەبەستی دزی



راه دل عشاق زدن: ڕێگەبڕین لە دڵی عاشقان و نەهێشتنی جوڵەی ئاسایی دڵی عاشقان، سەرنجراکێشانی عاشقان بۆ لای خۆ، تاڵانکردنی دڵ   چشم خمارین: چاوی خومار، چاوی مەست

پیداست: دیارە، پیشان دەدات

شرابت: شەرابی تۆ لەم بەیتەدا درکەیە لە چاوی یار و لە بری چاوی خومار هاتووە.

مست است شرابت: واتە چاوانت مەستە، خومار و مەست دو ئاوەڵناون بۆ چاوی جوان.

دەڵێ: چاوی خوماری تۆ دەستی داوەتە تاڵانی دڵی عاشقان بەم کارەشدا دەردەکەوێ کە چاوانت لە حاڵی مەستیدا بووە و بۆیە دەستی داوەتە تاڵانی یاخود بەم حاڵەتی تاڵانییەدا دەردەکەوێ کە چاوانت زۆر مەست و جوانن بۆیە توانای تاڵانی دڵی عاشقانیان هەیە.

**٥-تیری که زدی بر دلم از غمزه خطا رفت**

**تا باز چه اندیشه کند رای صوابت**

**تیری کە زەدی بەر دلەم ئەز غەمزە خەتا رەفت، تا باز چە ئەندیشە کونەد رای سەوابەت.**

تیرێك کە بە خەمزەی چاو گرتە دڵم ئامانجی نەپێکا، تا رای راستی تۆ بۆ شکاری دڵی من چ بیرێك بکاتەوە.

تیر: تیر     غمزه: ئیشارەتی چاو و برۆ     خطارفت: لار رۆشت، بەهەڵە رۆشت، نەیپێکا

اندیشه: فکر، بیر

رای صواب: رای راست، بۆچوونی راست.

دەڵێ: بە خەمزە و ئیشارەتی چاوت ویستت دڵم ئەسیر بکەیت و بیکەیتە نێچیر، هەربۆیە تیرێکی خەمزەت تێگرت، بەڵام تیرەکەت دڵمی نەپێکا و کاریگەریی لەسەرم نەبوو، تا ئاخۆ پاش ئەمە بۆچوونی راست و دروستی تۆ دووبارە چ بیرێك بکاتەوە بۆ شکارکردن و ئەسیرکردنی دڵم.

**٦-هر ناله و فریاد که کردم نشنیدی**

**پیداست نگارا که بلند است جنابت**

**هەر نالەڤو فەریاد کە کەردەم نەشەنیدی، پەیداست نیگارا کە بوولەند ئەست جەنابەت.**

نیگاری من هەرناڵە و هاوارێکم کرد نەتبیست (گوێت لێ نەبوو) بەمەشدا دیارە کە بەردەرگای ماڵەکەت بەرزە و دەنگی ئێمە بە گوێت ناگات.

ناله و فریاد: ناڵە و هاوار     نشنیدی: نەتبیست، گوێت لێ نەبوو

بلند: بەرز      جناب: بەردەگا

ئەی یار و خۆشەویستی من ناڵە و هاوارێکی زۆرم کرد، بەڵام گوێت لێ نەبوو بەمەشدا دیارە کە ئاستانە و بەردەرگای ماڵەکەت زۆر بەرزە یاخود بەمەدا دیارە کە پلە و پایەی تۆ هێندە بڵندە ناڵە و هاواری کەست پێ ناگات.

**٧-دوورست سر آب درین بادیه هش دار**

**تا غول بیابان نفریبد به سرابت**

**دوورەست سەری ئاب دەرین بادیە هوش دار، تا غولی بیابان نەفەریبەد بە سەرابەت.**

سەرچاوەی ئاو لەم بیابانە وشکەدا دوورە هۆشیار بە، کە خێوی بیابان بە سەراب فریوت نەدات.

سرِ آب: سەرچاوەی ئاو      بادیە: بیابان      هش دار: هۆشیار بە، ئاگاداربە
غول: خێو، دێو

سراب: تراویلکە، لە دوورەوە شتێك وەك ئاو دەردەکەوێت، بەڵام هیچ نییە و لە ئەنجامی تینی گەرماوە دروست دەبێ و کە لێی نزیك دەبیتەوە هیچ نییە.

کاتێ مرۆڤی تینو لە بیاباندا بەدوی ئاودا دەگەڕێت فریوی سەراب و تراویلکەکان دەخوات و هێندەی دیکە ڕێگەی لێ ون دەبێت و سەری لێ دەشێوێت، دەڵێن گوایە کە ئەمە خێوی بیابانە کە ونبووەکان فریو دەدات و لەبەرچاویاندا وێنەی ئاو دەکێشێت، لەم دێڕەشدا ئاماژە بەم ئەفسانەیە کراوە.

شاعیر دەڵێت لە بیاباندا ئاو نییە و گەر ئاو لە پێش چاوت دەرکەوت، فریو مەخۆ، چونکە ئەوە خێوی بیابانە دەیەوێ بە سەراب فریوت بدات تا ڕێگە ون بکەیت.

(سودی) لە شەرحەکەی خۆیدا دەڵێ: لەم بیابانی عەشقەدا سەرچاوەی ویساڵ و بەیەکگەیشتن دوورە و ئاگادار بە کە ڕەقیب بە درۆ فریوت نەدات، واتە بە بەڵێنی ئەوەی بە دیداری یارت بگەیەنێ، چونکە درۆ دەکات و لەناوت دەبات {ج ١، ل١٣٥} هەروەها (هرویش) دەڵێ: لەم حاڵەدا کە سەرچاوەکانی حەقیقەت لە بەردەستدا نییە فریوی زوهدی درۆینە مەخۆ{ج١، ل٨٠}.

**٨-تا در ره پیری به چه آیین روی ای دل**

**باری به غلط صرف شد ایام شبابت**

**تا دەر رەهی پیری بە چە ئایین رەڤی ئەی دل، باری بە غەلەت سەرف شود ئەیامی شەبابەت.**



ئەی دڵ ڕۆژانی لاویت بە شێوەیەکی نادروست بەڕێ کرد، تا بزانین ڕێگەی پیری چۆن تەی دەکەی.

آیین: شێواز، یاسا و دەستوور      روی: دەڕۆی، دەگوزەرێنی، تەی دەکەی
باری: هەرچۆن بێ، بەکورتی، بەلای کەمی      غلط: نادروست
صرف شد: سەرف بوو، بەڕێ کرا، گوزەرا

سەرزەنشتی دڵی خۆی دەکات و دەڵێ تەمەنی لاویت بە هەڵە سەرف کرد و بە باتدا بە هەرحاڵ بزانین لە ڕێگەی پیریدا بە چ شێوەیەك دەڕۆیت، واتە لە پیریدا چ دەکەیت و چۆن تەمەنت بەسەر دەبەی.

**٩-ای قصر دل افروز که منزلگهء انسی**

**یا رب مکناد آفت ایام خرابت**

**ئەی قەسری دلەفروز کە مەنزلگەهی ئونسی، یارەب مەکوناد ئافەتی ئەیام خەرابەت.**

ئەی کۆشکێك کە جێگەی دۆستی و خۆشەویستیت و دڵی مرۆڤ بە بینینت ڕووناك دەبێتەوە، لە خوا داوا دەکەم کە ئافاتی (بەڵا)ی ڕۆژگار وێرانت نەکات.

دل افروز: دڵ ڕووناککەرەوە      انس: دۆستی، خوگرتن، هاوڕێیەتی
مکناد: نەکات      یارب مکناد: خوایە وانەبێ، دۆعایە بۆ ڕوونەدان یاخود نەبوون
آفت: بەڵا، ئافات، زیان      ایام: لێرەدا بە مانای ڕۆژگار و زەمان دێت      خراب: وێران

نزا بۆ ماڵێك یاخود کۆشکێك دەکات کە بووەتە شوێنی دۆستی و خۆشەویستی و بەمەش بە بینینی دڵی عاشقان ڕووناك دەبێتەوە و دەڵێ خوایە ئافات و بەڵای ڕۆژگار زیانت پێ نەگەیەنێ و نەتکاتە وێرانە.

**١٠- حافظ نه غلامیست که از خواجه گریزد**

**لطفی‌کن و بازآ که خرابم ز عتابت**

**هافز نە غولامیست کە ئەز خاجە گوریزەد، لوتفی کون و بازئا کە خەرابەم ز ئیتابەت.**

حافز غوڵامێك نییە کە لە گەورەی هەڵبێت، لوتفێ بکە و بگەڕێوە چوون لە عیتاب و خەشمت دڵم وێران دەبێ.

غلام: غوڵام، خزمەتکار      خواجه: گەورە      گریزد: لە (گریختن)ەوە هاتووە: هەڵاتن، هەڵهاتن      بازا: بگەڕێوە      خرابم ز عتابت: لە سەرزەنشت و خەشمت دڵم دەبێتە وێرانە و بەرگە ناگرێ.

دەڵێ: خۆ حافز لەو جۆرە خزمەتکارانە نییە کە لە گەورە و ئاغای خۆی هەڵبێت و رابکات، منیش لە تورەیی و سەرزەنشتی تۆ دڵم ئێشاوە ئێستاش میهر و لوتفێ بکە و نەرمییەك بنوێنە و لەو عیتاب و سەرزەنشتە بگەڕێوە و وازبێنە تادڵم ئارام ببێتەوە، واتە حافز بە هۆی جەور و جەفای تۆوە وازت لێ ناهێنێت و لەبەرت هەڵنایەت، بەڵام بە تورەییت دڵی وێران دەبێ ئێستا نەرمییەك بنوێنە و واز لەو تورەیی و سەرزەنشتە بێنە.



## غەزەلی حەڤدەیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی ئەسلەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١-خمی کە ابروی شوخ تو در کمان انداخت**

**بە قصد جان من زار ناتوان انداخت**

**خەمی کە ئەبروی شوخی تو دەر کەمان ئەنداخت، بە قەسدی جانی مەنی زاری ناتەڤان ئەنداخت**

لارییەك کە کەوتە کەوانی برۆی جەسور و جوانی تۆوە، بە نیازی گیانی لاواز و بێ دەسەڵاتی من نیشانەی گرتووە.

خم: لار شوخ: جەسور، بێشەرم، بێ حەیا کمان: کەوان، قەوسی تیر و کەوان
زار: بێ هێز، لاواز ناتوان: بێ دەسەڵات

برۆی لەگەڵ کەواندا بەراورد کردووە دەڵێ: برۆی وەك کەوانێك وایە کە لە کاتی نیشانە گرتندا بێت و لاربۆتەوە و ئامانجەکەشی گیانی لاواز و بێهێزی منە، واتە لاری و جوانی برۆی تۆ بۆ لە بن هێنانی منی جوان پەرستی عاشقە. یاخود دەتوانرێت لاربوونی برۆ بە برۆ تێکنان و برۆ هێنانەوەیەك لێکبدرێتەوە و لەم کاتەشدا واتای بەیتەکە دەبێتە: حاڵەتی برۆهێنانەوەیەك و تورەیی تۆ بە نیازی لە ناوبردنی منەوەیە، چونکە من لە تورەیی تۆدا لەناودەچم.

**٢- شراب خوردە و خوی کردە کی شدی بەچمن**

**کە آب روی تو آتش در ارغوان انداخت**

**شەراب خوردەڤو خەی کەردە کەی شودی بە چەمەن، کە ئابی روی تو ئاتەش دەر ئەرغەڤان ئەنداخت.**

چ کاتێ شەرابت خواردەوە و عارەقت کرد و چویتە ناو باغ، کە پاراوی رووی تۆ ئاگری حەسودی بەردایە دڵی ئەرغەوان

خوی: عارەق شدی: لێرەدا بە مانای رۆشتن، چۆن هاتووە آتش: ئاگر

یاری رووخسار جوان شەرابی خواردووەتەوە و مەست بووە و دلۆپەی عارەق بەسەر رومەتی سوور و مەستییەوە بووە، شاعیر ئەم سوورییەی رومەتی یاری بە ئەرغەوان چواندووە، بەڵام رووخساری یاری پێ سوورتر و جوانترە لە ئەرغەوان، بە یار دەڵێ بە مەستی و

ئارەق لەسەرگۆنا کەی چویتە نێو باغان کە لە داغی پاراوی و جوانی رووخساری تۆ ئەرغەوان بەم شێوەیە ئاگری تێ بەربووە، لێرەدا سووری گوڵە ئەرغەوانی بە ئاگر گرتن دەربڕیوە.

واتە نازانرێ چ کاتێ مەست و ئارەق بەسەر گۆناوە رۆشتووەتە نێو باغ و چیمەن کە ئەرغەوان بە بینینی رووخساری ئەو وا سوور و ئاڵ بووە.

**٢-بە بزمگاە چمن دوش مست بگذشتم**

**چو از دهان توام غنچە در گمان انداخت**

**بە بەزمگاهی چەمەن دوش مەست بگوزەشتەم، چو ئەز دەهانی توەم غونچە دەر گومان ئەنداخت.**

دوێنێ شەو لە کۆڕی بەزمی باغدا کاتێ خونچە منی خستەوە سەرخەیاڵی دەمی تۆ مەست بووم و رۆشتم.

بزمگاە: شوێنی بەزم و خۆشی   دوش: شەوی رابردوو   بگذشتم: تێپەڕیم   دهان: دەم   غنچە: خونچە   گمان: گومان   درگمان انداخت: خستمییە گومانەوە، لە بەیتەکەدا واتە: گومانم کرد خونچەیە یا دەمی تۆیە.

دەڵێ: دوێنێ شەو لە کۆڕی بەزم و خۆشیدا کە گوڵ و چیمەن بەرپایان کردبوو، کاتێ خونچەم بینی گومانم کرد و وام زانی دەمی تۆیە، چونکە دەمی تۆ هێندە بچووکە لە خونچەی نەکراوە دەچێت، بەم گومان و خەیاڵەش حاڵەتی مەستی گرتمی و بە هەمان مەستییەوە لە باغ تێپەڕیم و رۆشتم.

**٣-بە یک کرشمە کە نرگس بە خود فروشی کرد**

**فریب چشم تو صد فتنە در جهان انداخت**

**بە یەك کریشمە کە نێرگس بە خودفروشی کەرد، فەریبی چەشمی تو سەد فیتنە دەر جەهان ئەنداخت.**

بەهۆی ناز و عیشوەیەکەوە کە نێرگز بۆخۆدەرخستن کردی، فریوی چاوی تۆ سەد فیتنەی خستە جیهانەوە.

بەخود فروشی: بەخۆفرۆشتن، بەڵام لێرەدا بەمانای: بۆ خۆدەرخستن، غرور، دێت.

لێرەدا بەراوردی نێوان نێرگز و چاوی مرۆڤ کراوە، یاخود بەراوردی جوانییەکانی مرۆڤ لەگەڵ جوانییەکانی سروشتدا هەروەك لە بەیتەکانی دیکەشدا بەهەمان شێوەیە و هەمیشە جوانی مرۆیی لە جوانی سروشت بە سەرنجڕاکێشتر دەزانێت، چونکە سروشت گیانی تێدانییە و بەڵام مرۆڤ بە جوڵە سۆزدارییەکانی دەتوانێت سەرنجڕاکێشتر خۆی بنوێنێ، دەڵێ: چاوی تۆ بە



هۆی دژایەتی کردنی جوانی نێرگزەوە سەد فیتنە و ئاشوبی لە جیهاندا بەرپاکردووە، چونکە نێرگز تەنیا دەتوانێ سەرنجی مرۆڤ راکێشی، بەڵام جوانی فریودەری چاوی مەعشوق و حاڵەتی سۆزداری جۆراوجۆر دەبێتە مایەی ئەوەی ئاشوبی عاشقانە بەرپا بکات.

**٤-زشرم آنکە بە روی تو نسبتش کردند**

**سمن بە دست صبا خاك در دهان انداخت**

**ز شەرمی ئانکە بە روی تو نسبەتەش کەردەند، سەمەن بە دەستی سەبا خاك دەر دەهان ئەنداخت.**

گوڵی یاسەمین لە شەرمی ئەوەی کە بە رووی تۆیان چواند، بە دەستی سەبا خۆڵی خستە دەمی خۆیەوە. نسبت: لێکچوون، چواندن   سمن: یاسەمین، گوڵێکی سپیی نەرمە کە بە جەستە یاخود رووی یار دەچوێنرێت.

خاك دردهان انداختن: دەربڕینێکە بەواتای (پەشیمان بوونەوە، تۆبەکردن، حاشا) دێت.

لێرەشدا شاعیر لە نێوان رووخساری یار و گوڵی سپی و نەرمی یاسەمیندا پەیوەندیی دروست کردووە و دیسانەوە جوانی رووی یار بە شیاوتر دەزانێت و دیسانەوە گوڵی پشکوتووی یاسەمەن کە بە هۆی هەواوە خاك و خۆڵ دەچێتە نێو پەڕەکانی چواندووە بە دەمی مرۆڤ کە بە دەستی با خۆڵ بکرێتە دەمییەوە دەڵێ: کاتێ گوڵی یاسەمینیان بە رووخساری تۆ چواند شەرمەزاربوو تۆبەی لە جوانی کرد یاخود حاشای کرد.

**٥-بنفشە طرەء مفتول خود گرە می زد**

**صبا حکایت زلف تو در میان انداخت**

**بەنەفشە توڕڕەیی مەفتولی خود گرەه می زەد، سەبا هیکایەتی زولفی تو دەر میان ئەنداخت.**

کە سەبا باسی پرچی تۆی هێنایە ناوەوە وەنەوشە پەرچەمی لولی خۆی گرێ لێ دەدا.

بنفشە: وەنەوشە   مفتول: لول، پێچ پێچ   گرەمی زد: گرێی لێدەدا، کۆی دەکردەوە   حکایت: باس   درمیان انداخت: هێنانە ناوەوە، باسیکرد

پێچ و گرێی وەنەوشەی بەوە هێناوەتەوە کە هەروەکو چۆن یاسەمین لە شەرمدا حاشای کرد، ئەویش کاتێ سەبا باسی پرچی مەعشوقی هێنایە ناوەوە وەنەوشە لە شەرمدا پەرچەمی لولی خۆی کۆکردەوە و گرێیدا.

**٦-من از ورع  می و مطرب ندیدمی زین  پیش**

**هوای مغبچگانم  دراین و آن انداخت**

**مەن ئەز ڤەرەع مەی و موتریب نەدیدەمی زین پیش، هەڤای موغبەچەگانەم دەرین و ئان ئەنداخت.**

من لەمەوپێش لە خۆپارێزی و تەقواوە مەی و گۆرانیبێژم نەدەدی، بەڵام هەوای موغبەچەکان منی بەرەو لای هەردووکیان راکێشا .

ورع: خۆپارێزی، تەقوا    ندیدمی: نمی دیدم: نەم دەبینی    هوا: هەوا، حەز، ئارەزوو
مغبچە: منداڵە موغ: ئەو منداڵانەی کە لە مەیخانەکاندا مەی دەگێڕن، شاگردی مەیخانە کە بەجوانی بەناوبانگن.

من لەمەوپێش بە هۆی تەقوا و زوهدی خۆمەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ مەی و مەیخانە و گۆرانیبێژدا نەبوو، هەرگیز بەلایاندا نەدەچووم، بەڵام حەز و ئارەزووم بۆ منداڵە شاگردەکانی مەیخانە وایلێکردم بڕۆمە نێو هەردووکیانەوە واتە هەم مەی ببینم و هەم گۆرانیبێژیش یاخود هەم حەز لە مەی بکەم  و ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیداکەم و هەم گۆرانی و گۆرانبێژیش (ئەم وشانە لە واتای عیرفانییاندا بەکارهاتوون).

**٧-کنون به آب می لعل خرقه می شویم**

**نصیبهء ازل از خود نمی توان انداخت**

**کنون بە ئابی مەیی لەئل خیرقە می شویەم، نەسیبەیی ئەزەل ئەز خود نەمی تەڤان ئەنداخت.**

ئێستا بە ئاوی سووری مەی خرقەی زوهدی خۆم دەشۆم،  ناتوانرێ نسیبی ئەزەلی لە خۆ داماڵرێت.

کنون: ئێستا   می شویم: دەشۆم   نصیبه ازل: قسمەت و نسیبی رۆژی ئەزەل   از خود نمی توان انداخت: ناتوانرێت لەسەرخۆ لابردرێت، ناتوانرێت لێ راکرێت.

ئەم بەیتە یەکێکی دیکەیە لە بەیتە جەبرییەکانی حافز بە دوای بەیتی پێشوودا دێت کە سەرەتا زوهد و تەقوا دووری خستبوومەوە لە مەی و گۆرانیبێژ (عەشقی حەقیقی)، بەڵام ئەمێستا بە شەرابی سوور خرقە دەشۆم و بە تەواوی تێکەڵاوی و مەی و مەیخانە و مەیخۆری بووم، بەڵام ئەمە هەمووی قسمەت و نسیبی رۆژی ئەزەل بووە و لە رۆژی ئەزەلدا بەشمان ئەمە بووە کە دواجار رووبکەینە مەی و مەیخانە و مرۆڤیش ناتوانێت قەڵەمی قەدەر لەسەرخۆی لابەرێت و لە دەست قسمەت و نسیب هەڵبێت.



**٨-نبوود رنگ دو عالم که نقش الفت بوود**

**زمانه طرح محبت نه این زمان انداخت**

**نەبوود رەنگی دو ئالەم کە نەقشی ئولفەت بوود ، زەمانە تەرهی موهیبەت نە ئین زەمان ئەنداخت**

هێشتا رەنگی دوو جیهان لە ئارادا نەبوو کە وێنەی ئولفەت و وەفا هەبوو، تازە رۆژگار بوونیادی خۆشەویستی لەم سەردەمەدا دانەناوە.

رنگ: رەنگ    دۆعالم: دوو جیهان، دونیا و رۆژی دوایی    الفت: ئولفەت، وەفا، دۆستی    زمانه: رۆژگار، زەمانە    طرح: بوونیاد

دەڵێ بەرلەوەی دونیا و رۆژی دوایی خەلق بکرێن خۆشەویستی و وەفا و ئولفەت وجودی هەبوو، ئەمەش ئاماژەیە بە پەیوەندی روحانی نێوان مرۆڤ و خودا بەر لە بە مرۆڤ بوونی مرۆڤ و هاتنە ئارای بوون و گەردوون روحی مرۆڤ بەشێك بووە لە خودا و بەرلەوەی بێتە سەرزەوی و بچێتە جەستەی مرۆڤەوە لە جیهانی باڵادا بوونی هەبووە و وەفا و خۆشەویستی و ئولفەتیان هەبووە، لە بیری ئەفلاتوونیشدا ئەوە دەربڕاوە کە روح و گیان لە جیهانی باڵادا یاخود لە جیهانی موجەڕەددا و بەر لە هاتنی بۆ دنیا حەقیقەتی جوان و جوانی رەهای بینیوە.

ئەم بیرەیە کە شاعیر دەڵێ هەر لە جیهانی باڵاوە خۆشەویستی و ئولفەت وجودی هەبووە و رۆژگار ئەم بوونیادەی لەم سەردەمەدا دانەناوە، لە واتای نیوەدێڕی دووەمدا دەکرێ ئاماژە بە کۆنی و دێرینی عەشق و ئولفەتی نێوان مرۆڤ  بکات کە هەر لە جیهانی باڵاوە وجودی هەبووە، دەکرێ گلەیی بێت لەوەی کە لە کاتێکدا هەر لە جیهانی باڵاوە ئولفەت و خۆشەویستی هەبووە کەچی زەمانە لەم سەردەمەدا بوونیادی بۆ دانەناوە و ئێستا ئولفەت نییە، بەمەش دەبێتە رەخنەیەکی کۆمەڵایەتی و دەروونی لەسەردەمەکەی خۆی.

**٩- مگر گشایش حافظ درین خرابی بوود**

**که بخشش ازلش در می مغان انداخت**

**مەگەر گوشایشی هافز دەرین خەرابی بوود ، کە بەخششی ئەزەلەش دەر مەیی موغان ئەنداخت**

لەوانەیە حەلکردنی مەسەلەی نارەحەت کە حافز توانای بە سەریدا هەیە، لەمەوە بێ کە مەستە و زوهد و تەقوای نەماوە، لەم رووەشەوە گوناهەکانی هەر لە رۆژی ئەزەلەوە بەخشراوەو بەرەو مەیی موغان نێردراوە.

دیسانەوە بەیتەکە ئاماژە بە رۆژی ئەزەل دەکات و مەرجی بەخشینی حافز لـەوەدا دەبینـێ کە هەر لە رۆژی ئەزەلەوە بەرەو مەیی موغان نێردراوە و هەر ئەمەش وایکردووە ئەم حـافزەی ئێستا بێت  و توانای حەلکردن و کردنەوەی مەسەلە ئالۆز و نارِەحەتەکانی هـەبێت، دیـسانەوە ئاماژەیە بە بوونی دەستێکی دیکە لە پشت مرۆڤەوە کە زۆرجار بە قـەدەر یـاخود قـسمەت و نسیب دەیدەینە قەڵەم.

**١٠- جهان به كام من اكنون شود كه دوور زمان**

**مرا به بندگی خواجهء جهان انداخت**

**جەهان بە کامی مەن  ئەکنون شەڤەد کە دوڤری(دۆوری) زەمان، مـەرا بـە بەنـدەگی خاجەیە جەهان ئەنداخت.**

ئێستا رۆژگار بە ئارەزووی من دەبێت، چونکە دەورانی زەمانـە منـی کـردە خزمـەتکار و بەندەی گەورەی جیهان.

لەم بەیتەدا حافز مەدحی کەسێك دەکات کە بە (خواجە) یان (سەروەر) هێناویـەتی و ئـەو سەروەرەش گەورەی هەموو جیهانە، دەکرێ بە (خواجە جهان)دا و دیسان هێنانی (بندگی) کـە بە واتای خزمەتکار و بەندایەتیش دێت، مەبەستی حافز لـە (خواجـەی جیهـان) خـودا بێـت و شاعیر شانازی بەوەوە بکات کە یەکێکە لە بەندەکانی خودا و بەمەش وادەزانێ کە جیهـان بـە ئارەزووی ئەو دەبێت.

بەو واتایانەی کە لەم غەزەلەدا هەیە، مەسەلەی قسمەت و نسیب و رۆژی دوایی و بەخشـشی خودایی گومانی نزیك بۆ ئەوە دەچێت کە (خواجە) خودا بێت و ئەم شانازییە هەر بۆ ئەو بێت.

جگە لەوەش ئەو بەرِێزانەی شەرحی حافزیان کردووە کۆك و تەبا نین لەسەر کەسـێکی دیـار بۆ نموونە (سودی) بە (خواجه قوام الدين حسن)ی دەزانێت {ج١، ل١٥٣} هەروەها لە (حـافظ خراباتی)دا (جلال الدين تورانشاه) هاتووە یـاخود (قـوام الـدين محمـد صـاحب عيـار)، بـەڵام (د.هروی) دەڵێ دیار نییە کە (خواجە) مەبەست لە کـام لـەو کەسـانەیە کـە حـافز ستایـشی کردوون.{ج١، ل٨٥} . هەروەها (د. محمد استعلامی)ش لە (درس حافظ)دا نوسیویەتی: " بـە تەواوی نازانین کێیە ؟ حاجی قوام تمغاچی یا قوام الدين صاحب عيار؟ یا کەسـێکی تـرە ؟ بـە هەر حاڵ دەزانین کە حافز پیاهەڵدەر نـەبووە و...."{د. محمـد اسـتعلامی، درس حـافظ، ج١، تهران، ١٣٨٢ك.هـ، ل ١١٣}





# غەزەلی هەژدەیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١- سینەام از آتش دل در غم جانانە بسوخت**
**آتشی بوود درین خانە کە کاشانە بسوخت**

**سینەئەم ئەز ئاتەشی دل دەر غەمی جانانە بسوخت، ئاتەشی بوود دەرین خانە کە کاشانە بسوخت.**

لەتاو ئاگری دڵم کە لە غەمی مەعشوقدا هەڵگیرساوە سنگم سووتا، ئاگرێك لەم ماڵە بەر بوو کە ماڵۆچکەشی سووتاند.

بسوخت: سووتا    آتش: ئاگر    خانە: ماڵ    کاشانە: ماڵۆچکە، خانوی بچووك

لێرەدا مەبەست لە ماڵ، دڵ و لەخانۆچکە یاخود ماڵۆچکەش سنگە، دەڵێ لە غەمی دووری یار ئەو ئاگرەی لە دڵم بەر بوو سنگیشی سووتاندم و بووە مایەی سووتانی سینەشم، ئاگرێ بەربوویە ماڵی دڵم و خانۆچکەی سنگیشی سووتاندم.

بەڵام لێرەدا ئاڵۆزییەك لە ئارادایە، چونکە ماڵ گەورەتر و خانۆچکەش لە نێو ماڵدایە، بەڵام بە پێچەوانەوە سنگ لە دڵ گەورەترە و ناکرێ دڵ ماڵی ماڵۆچکەی سنگ بێت، گەر مەبەست لەم لێکچوونە یاخود پێچان و کردنەوەیە لەڕووی گرنگییەوە نەبێت کە خانۆ لە خانۆچکە گرنگترە و لە عەشقیشدا دڵ لە سنگ گرنگترە ئەوا نەنگییەك لە چواندنەکەدا هەیە، چونکە دەڵێ ئاگری دڵم سنگمی سووتاند، ئەم ئاگرەی کە لەماڵی دڵمدابوو ماڵۆچکەی سنگمی سووتاند.

**٢- تنم از واسطەء دووری دلبر بگداخت**
**جانم از آتش مهر رخ جانانە بسوخت**

**تەنەم ئەز ڤاسیتەیە دووریی دولبەر بگوداخت، جانەم ئەز ئاتەشی میهری روخی جانانە بسوخت.**

جەستەم بە هۆی دووری لە دولبەرەوە توایەوە (لاوازبوو) گیانم لە ئاگری خۆشەویستی رووخساری مەحبووبدا سووتا.

تن: جەستە    واسطە: هۆ، بە هۆی    گداختن: توانەوە، لاواز و زەعیفبوون لێرەشدا مەبەست لە لاواز و هەژاربوونە    مهر: خۆشەویستی و شەوق



واتە: بە هۆی دووری یارەوە لە تاو خەم و خەفەت جەستەم زەعیف و لاواز بووە هەروەك بڵێی دەتوێتەوە و دەبێ بە ئاو و ئاگری شەوق و خۆشەویستی مەحبووبی لە گیان خۆشەویستتریش گیانی سووتانم دەکرێ مەبەست لە (مهر) شەوق و خۆشەویستی بێت، یاخود هەتاو یان خۆر بێت، لەم حاڵەتەدا مانای دێڕەکە دەبێتە: گیانم لە تاو ئاگری رووخساری وەك هەتاوی یاری لە گیان خۆشەویستتر سووتا.

**٣- هر کە زنجیر سر زلف پری روی تو دید**
**دل سودازدەاش بر من دیوانە بسوخت**

**هەر کە زەنجیری سەری زولفی پەری روی تو دید، دلی سوڤدا(سۆودا)زەدەئەش بەر مەنی دیڤانە بسوخت.**

هەرکەس کە لولی سەری زولفی رووخساری بینی دڵی سەودازدەی بۆ منی دێوانە سووتا.

پری روی: پەری رووخسار، رووخسار وەکو رووخساری پەری    سودازدە: شەیدا، سەودازەدە، پەشێوحاڵ

دەڵێ: دڵی من وەك شێت و دێوانە لە زنجیردا گیری خواردووە و گرفتار بووە و من لە زنجیری زوڵفی تۆدا گیرم خواردووە و بەندبووم، هەر بۆیەش هەر کەسێك کە قەفی زنجیری زوڵفی تۆ واتە لولی زوڵفی تۆی بینی، منی بیر دەکەوێتەوە کە شێت و دیلم و دڵی بۆ من و حاڵی من دەسووتێ، بەو واتایەی زوڵفی تۆ وەك زنجیر مەحکەمە بۆ راو و دیلکردنی عاشقان منیش عاشق و دیلی پرچی تۆم، هەرکەس کە ئەو پرچە لولەی بینی زانی من دیلێکی گرفتارم و دڵی پێم سووتا.

**٣- سوز دل بین کە ز بس آتش اشکم دل شمع**
**دوش بر من ز سر مهر چو پروانە بسوخت**

**سوزی دل بین کە ز بەس ئاتەشی ئەشکەم دلی شەمع، دوش بەر مەن ز سەری میهر چو پەرڤانە بسوخت.**

سەیری ئاگری دڵی من کە، کە دوێنێ شەو لەگەرمی فرمێسکی منەوە دڵی مۆم لەڕووی سۆزەوە وەك پەروانە بۆمن سووتا.

سوز: ئاگر، سووتان    زبس آتش اشکم: لەتاو زۆر گەرمی فرمێسکی منەوە، لەگەرمی فرمێسکی منەوە    دل شمع: دڵی مۆم، مەبەست لە دڵی مۆم ئەو فتیلە یاخود تاڵە دەزوویە کە لە ناوەڕاستی مۆمدا دەسووتێت    زسرمهر: لەڕووی میهرەبانی، خۆشەویستی، سۆز و بەزەییەوە    پەروانە: پەروانەی دەوری مۆم.

ببینە دڵی من چ ئاگرێکی هەیە کە فرمێسکم بە هۆی کاریگەری ئەو ئاگرەوە ئەوەندە گەرم بوو دوێنی شەو فتیلە و دەزوی مۆم کە دڵی مۆمە لەڕووی سۆز و بەزەییەوە بۆم سووتا، سووتانێکی هێندە سەخت وەك سوتانی پەروانە. بە هەندێ وردبوونەوە دەتوانین ئەوە دەربخەین کە شاعیر لە نێوان فرمێسکی خۆیی و فرمێسکی مۆمدا لێکچواندنی کردووە، بەم واتایەی کە مۆم هەمیشە خۆی فرمێسك دەڕێژێت و ئەم فرمێسك ڕژاندنەش لەبەر ئاگری دڵی مۆم (فتیلە)یە و گەرمیشە، بەڵام شاعیر دەڵێ ببینە فرمێسکی من چەندە گەرمە (یاخود لە فرمێسکی مۆم گەرمترە) بەمەشدا دەبێ ئاگری دڵی من زۆر لە ئاگری دڵی مۆم گەرمتر بێت، هەر ئەمە بوو کە دڵی مۆم هەستی بە گەرمی فرمێسکی مندا ڕادەی ئاگری دڵمی زانی و سەرباری ناڕەحەتی سوتانی خۆی دڵی بە سووتانەکەی من سووتا.

**٤- آشنایی نه غریب است که دلسوز من است**

**چون من از خویش برفتم دل بیگانه بسوخت**

**ئاشنایی نە غەریبەست کە دلسوزی مەنەست، چون مەن ئەز خیش بەرەفتەم دلی بیگانە بسوخت.**

سەیر نییە کە ئاشنایەك دڵسۆزی بۆ من دەردەخا، چونکە کاتێ من لەخۆچووم دڵی بێگانە بۆم سووتا.

نەغریب است: سەیر نییە، سەرسوڕهێنەر نییە   از خویش برفتم: لەخۆچووم   دل بیگانە: دڵی خەڵکی بێگانە دڵێ کە لە عەشق بێگانەیە.

دەڵێ: لە کاتی مەینەتی دڵی مندا هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە ئاشنا و ناسیارێك دڵسۆزی بۆ من پیشان بدات و بەزەیی پێمدا بێتەوە و دڵم بۆ سووتێنێ، چونکە من لە کاتی لە خۆچوون و نائارامیمدا تەنانەت دڵی بێگانە بۆمن دەسووتێ ئیدی دڵسوتانی ئاشنا غەریب نییە، واتە نائارامییەکەی من هێندە ناڕەحەت بوو بێگانەکان دڵیان بەمن سووتا چ جای ئاشناکان.

**٥- خرقهء زهد مرا آب خرابات ببرد**

**خانهء عقل مرا آتش خُمخانه بسوخت**

**خیرقەیی زوهدی مەرا ئابی خەرابات ببورد، خانەیە ئەقلی مەرا ئاتەشی خومخانە بسوخت.**

ئاوی خەرابات خرقەی زوهدی منی برد و ئاگری مەیخانەش ماڵی عەقڵی منی سووتاند.



خرقەء زهد: خرقەیەك کە نیشانەی زوهدە   آتش خمخانە: ئاگری خومخانە، شەرابی (ڕەنگ سوور)   آب خرابات: ئاوی خەرابات، شەراب، مەی(عەشقی حەقیقی).

دەڵێ: کەڵکەڵەی مەی و مەستی وایلێکردم کە هەرچیم هەبوو لە ڕێگەی مەیخانەدا دامناو لە دەستمدا، تەنانەت خرقەی زوهد و تەقوا و ماڵی دڵم — کە وەك دوو ڕەمزی سەرمایەی مرۆڤ هاتوون — لە ڕێگەی شەرابدا دانا، لە ڕێگەی بەدەستهێنانی شەرابدا خرقەکەم لەدەستدا و پاشانیش هەمان شەراب بە هۆی مەستییەوە ئاگری بەردایە عەقڵم و هەرچی عەقڵ و ژیرییەکەم هەبوو هەمووی سووتاند. لە ڕوانگەی عیرفانییەوە (خیرقە و عەقڵ) دوو نامەحرەمی دونیای عەشقن و لێرەدا کارێکی پۆزەتیڤی ئەنجام دراوە.

**٦- چون پیاله دلم از توبه که کردم بشکست**

**همچو لاله جگرم بی می و پیمانه بسوخت**

**چون پیالە دلەم ئەز توبە کە کەردەم بشکەست، هەمچو لالە جگەرەم بی مەی وپەیمانە بسوخت.**

دڵم وەك پیاڵە لەو تۆبەیەی کە کردم شکا و بە هۆی نەبوونی مەی و پێکیشەوە دڵم وەك گوڵی لالە سووتا.

پیالە: پێك، پێکی شەراب، پیاڵە   بشکست: شکا   لالە: گوڵاڵە، گوڵی سوورە   پیمانە: پێك   چون پیالە بشکست: ئاماژەیە بەوەی کە کاتی تۆبەکردن ئامێری ڕابوواردن و گۆرانی گوتن وەك پیالە و پێك و ئامێرەکانی مۆسیقا دەشکێنن.

شاعیر پەشیمانە لەو تۆبەیەی کە کردوویەتی بۆ ئەوەی مەی نەخواتەوە و دەڵێ: هەروەك ئەو پیاڵەیەی کە لەکاتی تۆبەدا دەشکێت دڵم لەو تۆبەیەی کە کردوومە شکاوە و بە هۆی کاریگەری مەییەوە دڵم شکاوە و وەك بەرگی گوڵی لالەش کە سوورە و هێڵی ڕەشی تێیدایە لە بێ مەیی و شەرابیدا جگەرم سووتاوە واتە لە دووری مەی و پێکدا جگەرم سووتا.

**٧- ماجرا کم کن و بازآ که مرا مردم چشم**

**خرقه از سر بدر آورد و به شکرانه بسوخت**

**ماجەرا کەم کون و بازئا کە مەرا مەردومی چەشم، خیرقە ئەز سەر بەدەر ئاڤەرد و بە شوکرانە بسوخت.**

ڕووداو و کێبەرکێ کەم کەرەوە و بگەڕێوە بۆ لای من، چونکە گلێنەی چاوم خرقەی لەبەرداماڵی و بۆ شوکرانە و سوپاسگوزاری سووتاندی.

ماجرا: رووداو و بەزم و شەڕ، تۆران، بە زۆری بۆ رووداوێکە کە دڵ پێی ناخۆش بێ، نزاع و کێبەرکێ  مردم چشم: گلێنەی چاو، بیلبیلەی چاو، سۆمای چاو  خرقه از سربدر آورد: خرقەی لەبەرداکەند، پێشتر ئەم دەربڕینەم روونکردەوە و ئەوەندە گرنگە بزانرێت کە (خرقە) لە پێشەوە ناکرێتەوە و وەك (دشداشە) لە سەرەوە دادەکەنرێت و بەمەش دەڵێن: از سربدر آوردن به شکرانه: بۆ سوپاسگوزاری.

بۆ شەرحکردنی بەیتەکە پێویستە (خرقه به شکرانه سوزاندن — سوختن) (خرقە سووتاندن بۆ سوپاسگوزاری) روونبکەینەوە، سوودی لە شەرحەکەیدا دەڵێ: "لە داب و نەریتی بادەنۆشیدا کاتێ دوو دۆست لە یەکتری دەرەنجێ و ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئەوەیان کە حەزی لە ئاشتبوونەوەیە کراسەکەی خۆی دادەکەنێت و بۆ سوپاگوزاری ئاشتی و ئاشتبوونەوە دەیسووتێنێ.{ ج ١، ل٢٥٨} ئەم کراس سووتاندنە مانای حەزی ئاشتبوونەوەیە کە لە دەربڕینی منداڵانەی کوردیدا پێی دەڵێن (مەجبوور). هەروەها لە هەمان جێگەدا سودی دەڵێ، بەڵام هەژارەکان لەبەر کەم دەستی لە بری کراس خرقەیان لەبەر دەکرد و حافزیش بەم هۆیەوە یاخود لەبەر کێشی شیعر یان هەرهۆیەکی دیکە بێت (خرقە)ی هێناوە.

(د. هرویش) بە  وەرگرتن لە (ئوستاد همایی)یەوە نووسیویەتی: لە نێوان هەژارانی سۆفێگەریدا وەك خێر و سەدەقە ئەمە باو بووە، واتە ئەگەر لە بەلا و نارەحەتییەك رزگاریان بووایە یاخود هەواڵی خۆشی زۆر گرنگیان پێ گەیشتبێ یەکێك لە یاران یاخود خودی شێخ خرقەکەی خۆی بە ناوی خێر و سەدەقەوە دەسووتێنێ یاخود بۆ جیهانی زوهد و تەقوا و رووکردنە جیهانی عیرفانی خرقەی زوهد دەسووتێنرێ بە نیشانەی تەرکی یەکجاری و سڕینەوەی بەرهەمەکانی رابردوو.

بەهەرحاڵ حافز بەرامبەر بە یار و خۆشەویستی خۆی راستگۆ نەبووە و هەر خەریکی ریا و فێڵ بووە و خرقەی ریای پۆشیووە، لەبەر ئەم هۆیەش یار لێی تۆراوە و نزاع و دەعوایان کەوتووەتە نێوانەوە و ئەم تۆرانەش مایەی نارەحەتی شاعیر بووە و حافز لەم کارەی پەشیمان بووەتەوە و نیازی ئاشت بوونەوەی لەگەڵ یاردا هەیە و بەم مەبەستە و بۆ دەربڕینی ئەو نیازە خرقەکەی دەسووتێنێ و ئامادەیی خۆی بۆ سولّح و ئاشتی لەگەڵ یاردا دەردەبڕێت، یاخود حافز پاش زانینی ریاکاری خۆی خرقەی ریاکاری دەسووتێنێ و بۆ یەکجاری تەرکی ئەو فێڵ و فریوکارییە دەکات، بۆیە بەرامبەر بە یار دەڵێ: تۆران و نزاع کەمکردەوە و وازی لێ بێنە و بگەڕێوە بۆ لای من، چونکە لە چاوەڕوانی تۆدا چاولەڕێ مامەوە و گلێنەی چاوم لە تاو تۆ بە شێوەیەك سووتا یاخود واز لە تۆڕان و تورەیی بهێنە و بگەڕێوە پێش گلێنەی چاوم، چونکە ئەم



ئامادەیی خۆی بۆ سولّح پیشان داوە و لە سوپاسگوزاریدا خرقەکەی بەری سووتاندووە واتە چاوم تەمەنای گەڕانەوەی تۆیەتی و لە دووری تۆ دەسووتێ و توانای بەرگەگرتنی نییە.

**٨-   تَرکـ افسانه بگو حافظ و می نوش دمی**

**که نخفتیم شب و شمع به افسانه بسوخت**

**تەرکی ئەفسانە بگو هافز و مەی نوش دەمی، کە نەخوفتیم شەب و شەمئ بە ئەفسانە بسوخت.**

حافز، واز لە ئەفسانە بهێنە و ساتێك مەی بنۆشە، چونکە شەو تا بەیانی نەخەوتیم و مۆم لە کەنار ئەفسانە گوتندا سووتا (یان مۆم هەوانتە سووتا).

افسانە: قسەی دوور لە راستی و لە زاراوەی عیرفانیدا دەتوانرێ بە شەتەحات و قسەی پوچ بدرێتە قەڵەم.

ترك افسانه بگو:بڵێ ئەفسانەم تەرك کرد، واز لە ئەفسانە بهێنە.

دمی: ساتێك، دەمێك      نخفتیم: نەخەوتین

به افسانه: لە بەرامبەر ئەفسانەدا، لە کاتێکدا ئەفسانە دەوترا، بەهەوانتە، لەخۆڕایی

شاعیر رووبە خۆی دەڵێ: حافز واز لە قسەی پڕوپوچ و ئەفسانە بهێنە و کەمێك بیر لە ژیان و چێژەکانی ژیان بکەرەوە و بژی، چونکە مۆمی تەمەنت لە ئەفسانەدا و لەبەر ئەفسانە گوتندا وردە وردە سووتا و بەسەرچوو کەچی شەوان نەخەوتین و ئەم تەمەنەمان لە ئەفسانەدا بردەسەر یاخود شەوان نەخەوتین و مۆمی تەمەنمان بە هەدەر سووتان و بەبێ کەڵك بەسەرمان برد لە کاتێکدا لە خۆشی و چێژەکانی ژیان بەهرەمەند بووین.

لێرەدا شاعیر تەمەنی خۆی بە مۆم و مەسەلە خەیاڵی و وەهمییەکانی ژیانیشی بە ئەفسانە و چێژ و ئارامی ژیانیشی بە خەو چواندووە. بەمەش واتە: حافز تۆ تەمەنی خۆت لە مەسەلە خەیاڵی و وەهمییەکانی ژیاندا سەرفکرد و لەبیری چێژ و ئارامی ژیاندا نەبووی ئێستا واز لە خەیاڵ و وەهم بێنە و چێژ لە ژیانی عیرفانی و حەقیقی ببینە.





## غەزەلی نۆزدەیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١-ساقـیـا آمـدن عـید مـبارک بادت**

**وآن مواعید که کردی مرواد از یادت**

**ساقییا ئامەدەنی ئید موبارەك بادەت، ڤان مەڤائید کە کەردی مەرەڤاد ئەز یادەت.**

ساقی هاتنی جەژنت لیٚ پیرۆز بیٚت، ئەو بەڵیٚن و گفتانەی کە دابووت لە بیرت نەچنەوە.

عیـــد: جـــەژنی رەمـــەزان مبـــارك بـــادت: پـــیرۆزت بـــیٚ، موبارەکـــت بـــیٚ

مواعد: کۆی مەوعیـد، بـەڵیٚن، گفـت مـرواد: نـەڕوات، نەچـیٚت یـاد: بـیر

مرواد از یادت: لەبیرت نەچێتەوە

دیارە ساقی لە مانگی رەمەزاندا کۆمـەڵیٚ گفتـی بـە شـاعیر داوە و ئیٚـستا کـە مـانگی رەمەزان کۆتایی هـاتووە پیرۆزبـایی جـەژن لـە سـاقی دەکـات و دەڵـیٚ: ئومیٚـدەوارم گفـت و بەڵیٚنەکانت بیر نەچنەوە.

**٢-در شگفتم که درین مدّت ایّام فراق**

**برگرفتی ز حریفان دل و دل می دادت**

**دەر شگیفتەم کە دەرین موددەتی ئەییامی فیراق، بەرگرفتی ز هـەریفان دل و دل مـی دادەت.**

پیٚم سەیرە کە لەم ماوەیەی رۆژانی دووریدا، چۆن وازت لە حەریفان هیٚنا و دڵت بـەم کـارە رازی بوو.

در شگفتم: پیٚم سەیرە، لە سەرسوڕماندام فراق: دووریی

برگرفتی: لیٚت سەندنەوە حریفان: هاوکاران، هاوڕییان، هاوپیٚك و هاوجام

برگرفتی ز حریفان دل: دڵت لە حەریفان سەندەوە، بەڵام بە واتای (وازت لە حەریفان هیٚنا) دیٚت

دل می دادت: دڵت رازی دەبوو، دڵت هیٚنای.

وەك لە بەیتی یەکەمدا ئاماژەی پیٚداوە ئەم غەزەلە باس لە هاتنی جەژنی رەمەزان و مـانگی رەمەزان دەکات کە چۆن لەو مانگەدا مرۆڤ لە تام و چـیٚژەکان دووردەکەویٚتـەوە و لەگـەڵ هـاتنی جەژندا دووبارە دەگەڕیٚتەوە سەریان و لە بەیتی یەکەمدا شاعیر پیرۆزبایی لە ساقی کرد بە بۆنـەی

تەواوبوونی مانگی رۆژوگرتنەوە، لەم بەیتەشدا دیسانەوە دەکرێ گوتار رووبەڕووی ساقی بێت هەرچەندە سودی پێیوایە کە بەرامبەر (دختر رز ـ شەراب)ەو باس لە فیراقی سێ مانگەی ئەو دەکات {سودی، ج١، ل١٦٢}، دەکرێ شەرحەکەی سودی بۆ خۆی راستی هەڵبگرێت، چونکە جێگەی بەیتەکە گۆڕاوە و لای سودی بەیتی چوارەمە، بەڵام سەیرە کە چۆن دڵت رازی بوو — دڵت هێنای لەم ماوەیەی رۆژانی دووریدا — واتە رۆژانی مانگی رەمەزان کە مەیخانەکان داخرابوون و ساقیش دووربووە لە یاران کە لە یارانی بادە و هاوپێکیان دووركەویتەوە (لەم بەیتەدا مەی و ساقی لایەنی عەشقی حەقیقی ئاپیینن و رۆژوش لایەنی رووکاری).

**٣-برسان بندگی دختر رز گو بدر آی**

**که دم و همّت ما کرد ز بند آزادت**

**برەسان بەندەگیی دوختەری رەز گو بەدەر ئای، کە دەم و هیممەتی ما کەرد ز بەند ئازادەت.**

خزمەتی ئێمە بە کچی مێو بگەیەنە و بڵێ وەرە دەرەوە، چونکە دۆعا و کۆششی ئێمە تۆی لە بەند ئازاد کرد.

برسان: بگەیەنە بندگی: خزمەت، بەندەیی دختر رەز: کچی مێو: درکەیە لە مەی، بە شەراب دەگوترێت کچی مێو رەزیش درەختی مێوە هەرچەندە بۆ باخە تریش هەر رەز بەکاردەهێنرێت.

بدرآی: وەرە دەرەوە، وەدەرکەوە دم: هەناسە، بەڵام لێرەدا درکەیە لە نزا و دۆعا همت: هەوڵ، کۆشش.

شەراب لە ژێرزەمین یاخود لە ژوورە داخراوەکاندا هەڵدەگیرێت بە تایبەتی لە کاتێکی وەك مانگی رەمەزاندا ئێستاکە جەژنە و مانگی رەمەزان تەواو بووە شاعیر بە ساقی دەڵێت: ئەی ساقی خزمەتی ئێمە بەکچی مێو (شەراب) بگەیەنە و پێی بڵێ زیندان و بەند کۆتایی هات و مانگی رەمەزان تەواو بووە بە دۆعا و کۆششی ئێمە لە کۆتاییدا لە بەند رزگاری بوو با بێتە دەرەوە و ئێمە دیسانەوە بینۆشین.

**٤-شادی مجلسیان در قدم و مقدم توست**

**جای غم باد هرآن دل که نخواهد شادت**

**شادیی مەجلسییان دەر قەدەم ومەقدەمی توست، جای غەم باد هەران دل کە نەخاهەد شادەت.**



شادی ئەهلی مەجلس لەمەدایە کە تۆ هەنگاو هەڵگریت و بێیتەوە مەجلیس، ئەو دڵەی کە شادی تۆی نایەوێت جێگەی غەم بێت.

مەجلسیان: ئەوانەی لە مەجلیسدا دانیشتون قدم: هاتن، هەرچەندە بە مانای پێ دێ مقدم: جێگەی پێدانان و هاتنەوەیە لە سەفەر، کاتی هاتن جای غم باد: جێگەی غەم بێ، غەمگین بێت نخواهد شادت: شادی تۆی ناوێت.

لێرەدا بەرامبەر بە خودی شەراب و کچی مێو قسە دەکات و دەڵێ: دڵی ئەوانەی لە مەجلیسدا دانیشتوون هەر بە هاتنەوەی تۆ شاد و خۆشحاڵ دەبێت و ئەگەر کەسێکیش لە هاتنەوەی تۆ و دەرکەوتنت خۆشحاڵ نەبێ و حەز بە کۆت و بەندی تۆ و نادیاریت بکات یاخوا هەر غەمگین و پەشێو حاڵ بێت.

**٥-شکر ایزد که ز تاراج خزان رخنه نیافت**

**بووستان سمن و سرو و گل شمشادت**

**شوکری ئەیزەد کە ز تاراجی خەزان رەخنە نەیافت، بووستانی سەمەن و سەرڤو گولی شەمشادەت.**

سوپاس بۆ خودا کە باخی یاسەمەن و سەرو و گوڵی شمشادت زیانی لە دەست تالانیی پایز نەدی.

ایزد: یەکێکە لە ناوەکانی خودا کە پاشماوەی زمانی کۆنی ئێرانییە. تاراج: تالانکردن خزان: خەزان رەخنە نیافت: زیانی نەبینی، کەم نەبووەوە، نوقسان نەبوو، کورتی نەهێنا

بە کچی مێو دەڵێ: سوپاس بۆ خودا کە لەم ماوەی زیندانی و ونبوونەدا کە خەزان خەریکی تالانی و تێکدانی جوانییەکان بووە باغی یاسەمەن و سەرو و گوڵی شمشادت هیچ زەرەرێکی نەبینووە و بە سەلامەتی دەرچووە. واتە ئەی کچی مێو ئەم ماوەیەی کە لە ترسی چاودێرەکان هەڵگیرابوویت هیچ نوقسانییەك رووی تێ نەکردوویت و کاریگەریی لە سەرت نەبووە.

**٦-چشم بد دوور کزان تفرقه خوش باز آورد**

**طالع نامور و دولت مادرزادت**

**چەشمی بەد دوور کزان تەفرەقە خوش باز ئاڤەرد، تالعی نامڤەر و دۆولەتی مادەرزادەت.**

چاوی بەدت لێ دووربێت کە بەختی چاك و خۆشبەختی زگماکی لە تەفرەقە و جیاوازی بە چاکی نەجاتی دایت و رزگاری کردی.

چشم بد: چاوی بەد، چاوی حەسود، چاوی پیس تفرقە: تەفرەقە، جیاوازی باز آورد: هێنایەوە، بەڵام لێرەدا بە مانای رزگاربوون، نەجات بوونە طالع: بەخت نامور:

ناودار، چاك، لێرەشدا بەواتای بەختی چاك هاتووە          دولت: بەخت، بەخت هەبوون

مادرزاد: زگماك، واتە هەر لەگەڵ لە داکیبوونیدا لەگەڵیدا لە دایکبووە، بۆ نموونە بە زگماك کوێرە، لێرەدا بەختی چاکی ئەو زگماکییە.

بە کچی مێو دەڵێت: ئێستا کە بە هۆی بەختی چاکی زگماکییەوە لە خەزان و تەفرەقە و دووری رزگارت بووە چاوی بەدت لێ دوور بێت و جارێکی دیکە نەکەویتەوە نێو نارەحەتی و ناخۆشییەوە، واتە سەردەمی ناخۆشی شاردنەوەی شەراب نەیەتەوە.

**٧-حافظ از دست مده صحبت این کشتی نوح**

**ورنه طوفان حوادث ببرد بنیادت**

**هافز ئەز دەست مەدە سوهبەتی ئین کەشتیی نوه، ڤەرنە توفانی هەڤادیس ببەرەد بوونیادەت.**

حافز هاودەمی ئەم کەشتیی نوحە لەدەست مەدە، ئەگەرنا تۆفانی رووداوەکان لە رەگ و ریشەت دەبات.

ازدست مده: لەدەست مەدە        بنیاد: رەگ و ریشە، بوونیاد، بنچینە

ئەم بەیتە ئاماژەیە بە کەشتی نوح کە تەنیا هاوڕێیانی کەشتی نوح لە تۆفان رزگاریان بوو جگە لەو هەرچی لەسەر زەویدا هەبوو لە رەگ و ریشە هات و هاتنی تۆفانیش بوونیادی هەموو شتەکان لە رەگەوە هەڵدەکێشێت، هەر بۆیە بۆ رزگاری دەبێ هاودەمی کەشتی نوح بین تا لە تۆفان رزگاربین.

لێرەدا مەبەست لە کەشتی هەمان پێکی شەراب یاخود جامی شەرابە کە لە شێوەی بەلەمی بچووکدا دروستکراون  وەك جامی کوردەواری کە  وەك سودی دەڵێ:" هەندێ جار لە (زیو) نوقرە یاخود شاخی مانگا یان دار دروستکراوە (سودی، ج١، ل١٦٤)، هەروەها تۆفانی رووداوەکانیش لە بری تۆفانی راستەقینە دانراوە و دەڵێ: حافز ئەوەی کە تۆ لە بای دەرد و مەینەتی رووداو و بەسەرهاتەکانی رۆژگار رزگار بکات وەك چۆن کەشتی نوح بووە مایەی رزگاری لە تۆفان بادەیە و لەدەستی خۆتی مەدە.

چ سودی و چ د. هرویش (کە د. هروی لە د.غنی وەرگرتووە) ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم غەزەلە لە سەردەمی هاتنی (شوجاع پادشا)دا نووسراوە کە پاشایەکی بە زەوق و سەلیقە بووە و لە سەردەمی ئەودا مەی قەدەغە نەکراوە. بەڵام راڤەی عیرفانی لەم مەسەلە مێژوویەی دوور دەخاتەوە.





## غەزەلی بیستەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**
**(مفعول مفاعیلن مفاعیلن فاعلات)**

**١-ما را ز خیال تو چه پروای شراب است**
**خم گو سر خود گیر که خُمخانه خراب است**

**ما را ز خیالی تو چە پەرڤای شەرابەست، خوم گو سەری خود گیر کە خومخانە خەرابەست.**

ئێمە لە خەیاڵی تۆدا پەرۆشی شەراب نین بە کوپەڵەی شەراب بڵێ لە بیری خۆیدا بێت کە مەیخانە چۆڵەوانییە.

پروا: پەرۆش، رەغبەت  خم: کوپەڵەیەك کە شەرابی تێیدا هەڵدەگیرێت، هەرچەندە جاروبار درکەیە لە خودی شەراب  سرخودگیر: سەری خۆی بگرێت یا لە بیری خۆیدا بێ  خمخانە: شوێنی هەڵگرتنی خوم، مەیخانە  خراب: لێرەدا بە واتای چۆڵی و بێ موشتەری بوونە، چۆڵەوانی

ئەم غەزەلە بە تەواوی پێچەوانەی غەزەلی پێشووە کە خزمەتی بە شەراب دەگەیاند و لە خودای دەویست و دەخواست ئازاد بێت و چاوی بەدی لێ دوور دەخستەوە کە ئازاد بووە، بەڵام لێرەدا ئیدی پێویستی بەو مەیە نییە ئەمەش تا ئەو رادەیەی کە سەرگرتنی گۆزەکان بە پێویست دەزانێت و دەڵێ سەری خۆیان بگرن، گەر غەزەلی پێشو لە بارودۆخێکی وەك هاتنی (شوجاع پادشا)دا لەرووی مێژووییەوە نووسرابێت کە یەکێکە لە خۆشەویستانی شاعیر و بەوشێوەیە ئەو شادییە دەربڕابێت ئەوە ئەم غەزەلە نزیکترە لە بیر و بۆچوونی هەمیشەیی حافزەوە کە یار لە هەموو شتەکانی سروشت بە سەرنجڕاکێشتر و جوانتر و تەنانەت مایەی مەستی زیاتریش دەزانێت هەر بۆیە لە هاتنی یار و خەیاڵ و هزری ئەمدا تەنانەت شەرابیش دەبێتە سفر.

جاران شەراب لە (خم) دا هەڵگیراوە و تەنانەت کاتی خۆشکردنی مەیش هەر لەودا سەری گیراوە، لێرەدا ئەم حاڵەتەی هێناوەتەوە و دەڵێ ئێمە کاتێ خەیاڵی یار کەوتە سەرمان بە شێوەیەك مەست دەبین ئیدی پێویستیمان بە شەراب نابێت و پەرۆشی نابین هەر بۆیە بە کوپەڵە بڵێ سەری خۆی داپۆشێ و سەری بگرێت، چونکە لە خەیاڵی تۆ (یار)دا هەمووومان مەست بووین و مەیخانە بێ کڕیار ماوەتەوە و لە چۆڵەوانی دەچێت و کەس حەزی لە شەراب نییە تا بیکڕێت.



**٢-گر خمر بهشت است بریزید که بی دوست**
**هر شربت عذبم که دهی عین عذاب است**

**گەر خەمری بهیشت ئەست بریزید کە بی دوست، هەر شەربەتی ئەزبەم کە دەهی ئەینی ئەزاب ئەست.**

ئەگەر مەی و شەرابی بەهەشتیشە بیڕێژن، چونکە بە بێ دۆست هەر شەرابێکی شیرینم بدەیتێ بۆ من وەك عەزابی واقیعی وایە.

خمر: شەراب، مەی  بریزید: بیڕێژن  شربت: شەراب، خواردنەوە
عذب: شیرین  عین عذاب: خودی عەزاب، عەزابی واقیعی.

لێرەدا گرنگی دۆست لای شاعیر دەردەکەوێ کە بێ ئەو نایەوێ بچێتە بەهەشت و بادەی بەهەشتی بە عەزاب دەزانێت، ئاشکرایە کە شەراب تاڵە، بەڵام شەرابی بەهەشت شیرینە و شاعیر بە بێ دۆست ئەم شەرابە شیرینەش بە خودی عەزاب دەزانێ هەر وەك چۆن لە بەیتی یەکەمدا گوتی بە خەیاڵی دۆست مەستین، لێرەشدا دەڵێ بە بێ دۆست هیچ شتێ لام چێژی نییە و تەنانەت نەك شەرابی تاڵی دونیا گەر شەرابی بەهەشتیشە بیڕێژن، چونکە بە بێ دۆست و خۆشەویست گەر شەرابی شیرینی بەهەشتم بدەنێ من بە عەزابی واقیعی دەزانم، واتە بە بێ دۆستی حەق(خودا) بەهەشتم لا ناخۆشە.

**٣-افسوس که شد دلبر و در دیدهء گریان**
**تحریر خیال خط او نقش بر آب است**

**ئەفسوس کە شود دولبەر و دەر دیدەیی گریان، تەهریری خیالی خەتی ئو نەقش بەر ئابەست.**

ئەفسووس (بەداخەوە) کە دولبەر رۆشت و ئیتر کێشانی وێنەی خەیاڵی خەتی رووخساری ئەو لە چاوانی گریاودا وێنەکێشانە لەسەر رووی ئاو.

تحریر: رەسم کرد، وێنەکێشان  نقش بر آب زدن: وێنە لە ئاودا کردن، بە واتای ئەنجامدانی کاری بێهودە و بێ کەڵك.

دولبەری شاعیر رۆشتووە و بۆ ئەم رۆیشتنە ئەفسووس و ئەسەف دەخوات و دەڵێ: بەداخەوە کە دولبەر رۆشت و ئیدی بیرکردنەووە و وێنەکێشانی رووخساری ئەو لە فرمێسك کارێکی بێهودەیە، واتە کە دولبەر رۆشت هەرچەندە بگریم و وێنەی خەیاڵی رووخساری ئەو لە فرمێسکی باریومدا بکێشم کارێکی بێهودەیە و هیچ بەهیچ ناکەم وەك چۆن رەسم لە سەر رووی ئاو بکەیت کە هیچ بەرهەمێکی نابێ.

**٤-بیدار شو ای دیده که ایمن نتوان بوود**
**زین سیل دمادم که درین منزل خواب است**

**بیدار شو ئەی دیدە کە ئەیمەن نەتەڤان بوود، زین سەیلی دەمادەم کە دەرین مەنزلی خابەست.**

ئەی چاو لە خەو بێداربەوە، چونکە بەم لافاوەی کە سات بە سات دێتە ئەم مەنزڵگایەی خەوەوە پارێزراو نابیت.

بیدارشو: بێداربەوە، زوهەستە    ایمن: مەحفوز، پارێزراو، ئەمان    سیل: لافاو

دمادم: سات بەسات، لەحزە بە لەحزە، بەردەوام    خواب: خەو

شاعیر چاوی بە مەنزڵ و ماڵی خەو و فرمێسکیشی بە لافاو داناوە و وەك مرۆڤێکیش مامەڵەی لەگەڵ گلێنە و خودی چاو کردووە و دەڵێ: ئەی دیدە لە خەو بێداربەوە، چونکە بە وجودی ئەم فرمێسکە بەردەوامە کە سات بە سات وەك لافاوێك دێت و کاسەی چاو پڕ دەکات جێگایەکی پارێزراو بۆ خەو نەماوەتەوە و ئەگەر لە خەودا بمێنینەوە من دەبات، یاخود تۆ دەبات و کوێر دەبی.

**٥-معشوقه عیان می گذرد بر تو و لیکن**
**اغیار همی بیند ازآن بسته نقاب است**

**مەئشوقە ئەیان می گوزەرەد بەر تو ڤە لیکەن، ئەغیار هەمی بینەد ئەزان بەستە نەقابەست.**

مەعشوق لە بەرامبەری تۆدا بە ئاشکرا (دانەپۆشراو) تێدەپەڕێت، بەڵام چونکە بێگانەگان دەبینێ رووبەند و نیقابی لە رووخساری لانابات.

معشوقە: یار، مەعشوق    عیان: دەرکەوتوو، ئاشکرا (بە رووخسار دانەپۆشراوی)

برتو: بەرامبەر تۆ، رووبەڕووی تۆ    اغیار: بێگانە، ئەوان، نامۆ

ئەم بەیتە ئاماژەی عیرفانی تێدایە و دەڵێ: مەعشوق لە بەرامبەر ئەوانەدا کە بە پلە و پایەی عیرفانی گەیشتوون تەجەلی دەکات و خۆی دەردەخات و لە بەرامبەر نائەهل و ئەوانەدا کە بەو پلە و پایەیە نەگەیشتوون لە پشت پەردەوەیە و خۆی دەرناخات، بە ئەهلبوونی ئەو دەرکەوتنەش پێویستی بە ئامادەیی خودییە و بڕین و تەیکردنی قۆناغەکانە لە سلوك و عیرفاندا، دەکرێ لێرەدا (ئەغیار) بەو پەردانە یان ئەو رێگرانە بدەینە قەڵەم کە لە بەردەم دڵی مرۆڤدایە و رێگەی بینینی مەعشوقی لێدەگرێت. دیارە خودی شاعیر گەیشتووەتە پلە و پایەی



دەرکەوتن و تەجەلی کردنی مەعشوق، بەڵام هێشتا لە خەوش پاك نەبووەتەوە هەر بۆیە لەبەر ئەو بێگانەیانە مەعشوق رووبەند دەبەستێ و تەجەلی ناکات.

**٦-گل بر رخ رنگین تو تا لطف عرق دید**
**در آتش رشك از غم دل غرق گلاب است**

**گول بەر روخی رەنگینی تو تا لوتفی ئەرەق دید، دەر ئاتەشی رەشك ئەز غەم غەرقی گولابەست.**

هەر کە گوڵ بە سەر رووخساری نەرمەوە دڵۆپەی عارەقی بینی، لە خەفەتدا کەوتە نێو ئاگری حەسودی و لە گوڵاودا نغرۆ بوو.

عرق: عارەق    رشك: حەسودی    گلاب: گوڵاو.

چەمکی بەیتەکە پەیوەندی بە گرتنی گوڵاوەوە هەیە، بۆ دروستکردنی گوڵاو، کە عارەق و ئاوی گوڵە، پەڕەکانی گوڵی سوور دەکەنە نێو مەنجەڵێك کە هەندێ ئاوی تێدایە و ئاگری لە ژێردا دەکەنەوە تا ببێ بە هەڵم و بە هۆی شتێکەوە و بەساردکردنەوە (بە دڵۆپاندن) گوڵاوەکە دەگیرێت، بەڵام لای شاعیر گوڵ لەکاتی بینینی دڵۆپەی بە هەڵم بوون و عارەق بە سەر گۆنا و رووخساری سوور و سپی یارەوە لە تاو جوانی یار بەم شێوەیە عارەقی کردوە و ئاگری حەسودی داگیرساوە و، ئاگری ئەم حەسودییش بووەتە هۆی دڵۆپاندن و کردوویەتی بەگوڵاو (لەگوڵاودا نغرۆی کردووە).

لەم بەیتەدا گوڵاو بە دڵۆپەی عارەقی مەعشوق و ئاگری ژێر مەنجەڵیش بە ئاگری حەسودی گوڵ چوێنراوە.

**٧-سبز است در و دشت بیا تا نگذاریم**
**دست از سر آبی که جهان جمله سراب است**

**سەبزەست دەرو دەشت بیا تا نەگوزاریم، دەست ئەز سەری ئابی کە جەهان جوملە سەرابەست.**

کێو و دەشت سەوزە، وەرە با دەست لە کەنار ئاو هەڵنەگرین، چونکە جیهان سەراسەر سەرابی فریودەرە.

سبز: سەوز    دشت: دەشت

سر آب: کەنار ئاو، سەرکانی    جملە: سەراسەر، بە تەواوی

دەڵێ: کێو و دەشت سەوزە و بەهارە، وەرە با کەنار جۆگەکان و ئاوەکان لە دەست خۆمان دەرنەکەین و نەهێڵین لە دەستمان دەرچێت، واتە: وەرە با وردبینەوە لە جۆگە و ئاوەکان، چونکە دنیا وەك سەراب وایە و جگە لە فریودان هیچی بۆ مرۆڤ پێ نییە.

**٨-در کنج دماغم مطلب جای نصیحت**

**کاین حجره پر از زمزمهء چنگ و رباب است**

**دەر کونجی دیماغەم مەتەلەب جای نەسیهەت، کین هوجرە پور ئەز زەمزەمەیی چەنگ و روبابەست.**

لە کونجی دەماغمدا داوای جێگەی پەسەند و ئامۆژگاری مەکە، چونکە ئەم حوجرە (ژوورە) پڕ لە ئاوازی چەنگ و روبابە.

کنج: کونج، گۆشە، سوچ   نصیحت: نەسیحەت، پەند و ئامۆژگاری   حجرە: ژووری بچووك، حوجرە

زمزمە: گۆرانی گوتن لە ژێر لێوەوە، گۆرانی، ئاواز  چنگ: جۆرە سازێکە، کە حەوت تەلی هەیە و بە دەست دەژەنرێت.

شاعیر دەڵێ بە هیوا مەبە لە کونجی مێشکمدا پەند و نسیحەت پەیدا کەیت، چونکە پڕە لە ئاوازی چەنگ و روباب، واتە سەرقاڵی رابواردن و خۆشیم و لە سەرمدا جگە لە ئاوازی مۆسیقا هیچی دیکە نییە و سەرم بە مۆسیقا پڕ بووە بە شێوەیەك جێگایەکی بەتاڵ بۆ پەند و نەسیحەت نەماوە.

**٩- حافظ چه شد ار عاشق و رند است و نظرباز**

**بس طور عجب لازم ایّام شباب است**

**هافز چە شود ئەر ئاشق و رەندەست و نەزەرباز، بەس تەوری ئەجەب لازمی ئەییامی شەبابەست.**

چ گرنگییەکی هەیە کە حافز عاشق و گوێینەدەر و جوانپەرست بێ، حاڵەتی سەیر و سەرسوڕهێنەری زۆر پێویستی رۆژگاری لاوییە.

ار: ئەگەر   نظرباز: جوانپەرست، کەسانێ کە مەیل و ئارەزووی تەماشای جوان و قەشەنگیان هەیە   بس/بیسار: زۆر  لازم: پێویستی، زەروری   طور عجب: شێوەی سەیر، حالاًتی سەرسوڕهێنەر

واتە: هەر ئەوەندەی کە حافز عاشق و رەند و جوانپەرستە بەس نییە بۆ ئەوەی خۆی بە لاو بزانێت، بەڵکو لاوی چەندەها حالاًتی سەرسوڕهێنەری هەیە کە حافز نییەتی. یاخود ئەو



حاڵەتانەی لە جوانی و لاویدا دەبنە بزوێنەری ژیان حالاًتی جۆراوجۆر دروست دەکەن کە لە سەردەمی پیریدا بە سەیر و سەرسوڕهێنەر دێنە بەرچاو، ئەم غەزەلە لە (حافز سودی) و (عەلامە قزوینی و د.غنی)دا نییە.

## غەزەلی بیست و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات)**

**١- آن شب قدری که گویند اهل خلوت امشب است**

**یا رب این تأثیر دولت در کدامین کوکب است**

**ئان شەبی قەدری کە گویەند ئەهلی خەلڤەت ئیمشەبەست، یا رەب ئین تەئسیری دولەت دەر کودامین کەوکەبەست.**

ئەو شەوی قەدرەی کە زاهدانی خەلوّتنشین باسی گرنگی دەکەن ئەمشەوە، خوایە ئەم خۆشبەختییەی کە رووی لێ کردووین لەکام کەوکەبەوەیە.

شب قدر: شەوی قەدر، شەوی قەدر یەکێکە لە شەوە پیرۆزەکانی رەمەزان، بە تەواوی نازانرێت چ شەوێکی ساڵە، بەڵام لە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزاندایە و بە کۆمەڵێ خەملاندن بە (٢٧)ی مانگی رەمەزانی هەموو ساڵێك دانراوە، لە قورئاندا سورەتێك بە ناوی ئەم شەوەوە ناونراوە و تیایدا باس لەم شەوە کراوە و دەفەرمووێ: (انا انزلناه فی لیلة القدر، لیلة القدر خیر من الف شهر) (القدر/٢-٣). قەدر ئەو شەوەیە کە قورئانی تێدا دابەزیوە بۆ ئاسمانی یەکەم، دەگوترێ کە بەندایەتی و عیبادەتی ئەم شەوە لە بەندایەتی هەزار مانگ چاکترە، وەك عەلامە (تەباتەبائی) لە تەفسیری (المیزان)دا دەڵێ:" شەوێکە کە تیایدا خودا پێشهاتەکانی یەك ساڵی مرۆڤ دیاری دەکات و هەندێك پێیان وایە کە قەدر بە مانای پلە و پایە و پێگە بێت چونکە قورئان لەم شەوەدا دابەزیوە و ئەم شەوە بە قەدر و رێزە و بە شەوی رێز ناونراوە) {هروی، ج١ ل١٠١}.

گویند: کە لە بارەیەوە دەڵێن، کە بەگرنگی باسی دەکەن   اهل خلوت: خەلوەتنشینان

تأثیر دولت: نیشانەی خۆشبەختی

کدامین: کام   کوکب: ئەستێرە

لە بەیتەکەدا مەبەست لە کاریگەریی چاك و خراپە ئەستێرەیە لە چارەنووسی مرۆڤدا، شاعیر وەسفی شەوێك دەکات کە بە ئارەزووی دڵی خۆیەتی و تیایدا بە ئامانج گەیشتووە و دەڵێ: ئەو شەوی قەدرەی کە ئەو هەموو وەسف و سەنایەی لە لایەن خەلوەتنشینانەوە بۆ کراوە و چارەنووسی چاك دیاری دەکات ئەمشەوە، خوایە ئەمە کاریگەریی کام ئەستێرەی بەختە لە سەرمان کە خۆشبەختی و کامەرانییەکی لەم شێوەیە رووی تێکردووین.



**٢- تا به گیسوی تو دست ناسزایان کم رسد**

**هر دلی در حلقەیی در ذکر یارب یارب است**

**تا بە گیسوی تو دەستی ناسزایان کەم رەسەد، هەر دلی دەر هەلقەیی دەر زکری یارەب یارەبەست.**

بۆ ئەوەی کەمتر دەستی نانەجیبان بە زوڵفت بگات، هەردڵێك لە ئەڵقەیەکدا خەریکی وتنی زیکری (یارب یارب)ە.

گیسو: پەلکە، پرچ (قژی درێژ)  ناسزایان: نانەجیبان، نالایقان، نەشیاوان  هردلی: هەر دڵێ

حلقە: ئەڵقە: ئەڵقە ئاماژەیە بە ئەڵقەی زیکر، دۆعا کە کۆمەڵێ کەس وەك بازنەیەك کۆدەبنەوە و دۆعا دەکەن، یاخود ئاماژەیە بە ئەڵقەی پەلکەی یار کە لە میسراعی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە   یارب یارب: مەبەست لە دۆعا و پاڕانەوەیە، خودا خودا

لە بابەت و مانادا بە رووی بەیتی پێشوودا هاتووە و ئاماژە بە شەوی قەدر دەکات کە لەو شەوەدا ئەهلی دڵ دەپاڕێنەوە، دەڵێ: پاڕانەوە و دۆعاکان لە ئەڵقەی زیکری ئەم شەوەدا بۆ ئەوەیە کە دەستی کەسانی نانەجیب و نەشیاو و ناکەس کەمتر بگاتە زوڵف و پەلکەی تۆ.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە ئەڵقە، ئەڵقەی سەری زوڵفی یار بێت واتاکەی دەبێتە: دڵانێك کە لە ئەڵقەی سەری پەلکە و زوڵفیدا بەندن دەپاڕێنەوە و مەشغوڵی نزا و پاڕانەوەن تا دەستی خەڵکی تر نەگاتە زوڵفی تۆ. بە هۆی ئەم پاڕانەوەشەوە دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێ، لە لایەکەوە لە غیرەتدایە بەرامبەر بە مەعشوق، تا دەستی کەسی دیکە نەگاتە زوڵفی مەعشوق و ئەو نیعمەتە هەر بۆ خۆیان بێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە لەڕووی میهر و پاکییەوە، چونکە بەندی ئەڵقەی زوڵفی مەعشوق هێندە گران و ناڕەحەتە دۆعا دەکەن کەسی دیکە گیرۆدەی نەبێ، بەڵام هێنانی (ناسزایان) لە میسراعی یەکەمدا ئەم ئەگەرەی دووەم لە راستی دوور دەخاتەوە. لەڕووی عیرفانییەوە واتە: تا دەستی نەشیاوان نەگاتە پەردەی وەسڵی تۆ.

**٣- کشتەء چاه زنخدان توام کز هر طرف**

**صد هزارش گردن جان زیر طوق غبغب است**

**کوشتەیی چاهی زەنەخدانی توەم کز هەر تەرەف، سەد هەزارەش گەردەنی جان زیری تۆوقی غەبغەبەست.**

کوشتەی چاڵی چەناگەی تۆم، کە لە هەر لایەکەوە، سەد هەزار گیان لە بەندی غەبغەبیدا ئەسیرن.

کشتە: کوشتە، موشتاق، ئارەزوومەند، عاشق   طرف: لا، تەرەف   جان: گیان

زیر: ژێر

طوق: گەردن بەند، ملوانکەیەکە لەمل دەکرێت و گەوهەر و لیرەی پێوە دەکرێت.

غبغب: غەبغەبە          طوق غبغب: مەبەست لە خەتی هلالی غەبغەبەیە.

خەتی هیلالی غەبغەبەی یاری بە گەردنبەندێك چواندووە کە ئەم ملوانکەیە کراوەتە ملی جوانپەرستان، ملوانکە لەملکردنەکەش درکەیە لە ژێردەست بوون و بەگوێکردن واتە جوانپەرستان ئەڵقە لەگوێی ئەون، دەڵێ: کوژراو و مەفتونی چاڵی چەناگەی تۆم، چەناگەیەك کە لە هەر لایەکەوە سەدان هەزار گیان بەگەردنبەندی غەبغەبەیەوە ئەسیر و گرفتارن و ئەڵقەی ئەون، هەرچەندە ئەڵقەلەگوێ لە کوردیدا مانایەکی نێگەتیڤی هەیە، بەڵام لێرەدا ئەو مانایە ناگەیەنێت.

**٤- شهسوار من که مه آیینه‌دار روی اوست**

**تاج خورشید بلندش خاك نعل مرکب است**

**شەهسەڤاری مەن کە مەه ئایینەداری روی ئوست، تاجی خورشیدی بوولەندەش خاکی نەئلی مەرکەبەست.**

شاسواری من کە مانگ ئاوێنەهەڵگری رووی ئەوە و تاجی خۆری بەرز و باڵا خاکی ناڵی ئەسپەکەیەتی.

شهسوار: شاسوار، دلێر     مە: ماە: مانگ     آیینە: ئاوێنە

آیینە دار: ئاوێنەهەڵگر، کەسێکە کە لە پێش پادشا یاخود بووکەوە ئاوێنە هەڵدەگرێ تا خۆی تیا ببینێ.

(مە آیینە دار روی اوست) واتە مانگ کە خۆی رەمز و سومبوولی جوانییە (لە بەرامبەر شاسواری مندا) وەك خزمەتکار و بەردەستێك ئاوێنە هەڵگرە و هیچی دیکە، تا رووی تێدا ببینێت. بە دەربڕینێکی دیکە واتە مانگ رەنگدانەوەی رووی جوانی و رازاوەی ئەوە.

تاج: تاج     خورشید: خۆر     بلند: بەرز، پایەبەرز     نعل: ناڵ     مرکب: ئەسپ، هەر ئاژەڵێك یاخود هەر شتێ کە مرۆڤ سواری بێت، بەڵام جاران تەنێ بۆ چوارپێ بەکاردەهات و بە زۆریش بە واتای (ئەسپ)بەکاردێ.

ئەم بەیتە ستایشی کەسێکە کە لای حافز بەڕێز بووە و دەڵێ: شاسواری پایەبەرزی من هێندە پایەبەرزە کە مانگ وەك ئاوێنەهەڵگرێکە لە بەرامبەریدا و تاجی هەتاویش لە بەرامبەریدا وەك خاکی ژێر پێی ئەسپەکەیەتی هێندە کەم نرخە، یاخود بە شێوەیەکی دیکە ئەسپەکەی لە بری ئەوەی هەنگاو بخاتە سەر زەوی پێ دەخاتە سەر تاجی خۆر.



بە گوتەی (د. غنی) شاسوار وەرگێڕدراوی (ابوو الفوارس)ە کە (شا شوجاع)ی پێ بانگکراوە و بە رای ئەو ئەم غەزەلە لە ستایشی ئەودا نووسراوە، چونکە مێژوونووسەکانیش گوتوویانە شوجاع پادشا جوان و قۆزبووە.

**٥- تاب خوی بر عارضش بین کافتاب گرم رَو**

**در هوای آن عرق تا هست هر روزش تب است**

**تابی خوی بەر ئارزەش بین کافتابی گەرم رەڤ، دەر هەڤایی ئان ئەرەق تا هەست هەر روزەش شەبەست.**

دەرەوشاوەیی عارەق بەسەر روویەوە ببینە کە هەتاوی بێ ئارام و خێرا لە حەزی ئەوەوە هەموو رۆژێ تادار و گەرمە.

تاب: دەرەوشاوە، رووناکی، گەرمی     خوی: عارەق     تاب خوی: دەرەوشاوەیی عارق، بریسکەی عارەق     عارض: رووخسار     گرم رَو: خێرا، عاشقی نائارام

آفتاب گرم رَو: هەتاوێك کە بە گەرما و ئارەزوومەندییەوە بە ئاسماندا دەڕوات

تب: تا.

دەڵێ: عارەق بەسەر رووخساری مەعشوقەوە هێندە دەرەوشاوە و سەرنجڕاکێشە کە هەتاوی دەرەوشاوە عاشقی بووە و لەوکاتەشەوە کە عاشقی بووە هەموو رۆژی کە لە ئارەزوو و حەز و گەرمییەوە کە لە ناخیدا هەستی پێدەکات تا دایدەگرێت مەبەست لەوەیە کە گۆنا و رووخساری یار عارەقی گەرمی کردووە و ئەوەندە سەرنجڕاکێش و ئارەزوو بزوێنە کە خۆر لەتاو گەیشتنی بە ئەو دوچاری سووتان و تا بووەتەوە و ئەگەر هەموو رۆژەش گەرمە و گەرمایی بە دنیا دەبەخشێ بە هۆی ئاگری ئەم شەوق و ئارەزووەوەیە. واتە خۆر لەتاو ئارەزووی گەیشتن بە یار و خۆشەویستی هەیەجان دایگرتووە و تووشی تا هاتووە.

**٦- من نخواهم کرد ترك لعل یار و جام می**

**زاهدان معذور داریدم که اینم مذهب است**

**مەن نەخاهەم کەرد تەرکی لەئلی یار و جامی مەی، زاهدان مەئزور داریدەم کە ئینەم مەزهەبەست.**

من دەست لە لێوی یار و پێکی مەی هەڵناگرم، زاهدان بە مەعزورم بزانن کە من ئەمە دین و رێڕەومە.

مذهب: ئایین، رێرەو، شێواز     لعل: لێو، جەوهەرێکی گرانبەها

معذورداریدم: لێم مەگرن، حەقم بدەنێ، بە مەعزورم بزانن.

داوای ئەوە لە زاهیدەکان دەکات کە رەخنەی لێ نەگرن بە هۆی ئەوەی کە ناتوانێ دەست لە لێوی سووری یار هەڵگرێت و تەرکی پێکی شەراب بکات، چونکە دەڵێ من ئەمە دین و رێڕەومە، گەر (مذهب) بە رێڕەو بدەینە قەڵەم کە یەکێکە لە ماناکانی (مذهب) ئەوا لەگەڵ بەیتە جەبرییەکانی حافزدا یەکدەگرێتەوە، چونکە دەکرێ بگوترێ زاهدان من بە خاوەن بیانو بزانن کەوا دەکەم، چونکە ئەمە رێڕەومە و بەدەست خۆم نییە، بەڵام بەدەر لەم واتایە ئەوە دەگەیەنێ کەوا من خۆم ئەمەم هەڵبژاردوە و ئیدی پێویست بە رەخنەگرتن ناکات، ئەم رێڕەوەش رێڕەوی عارفە عاشقەکانە.

**۷-اندر آن موکب که بر پشت صبا بندند زین**

**با سلیمان چون برانم من که مورم مرکب است**

**ئەندەر ئان مۆکیب(موڤکیب) کە بەر پوشتی سەبا بەندەند زین با سولەیمان چون برانەم مەن کە مورەم مەرکەبەست.**

لە کۆمەڵی ئەو سوارانەی کە پشتی سەبایان زینکردووە (زین دەخەنە سەر پشتی سەبا) من چۆن دەتوانم لەگەڵ سولەیماندا دەرچم کە سواری مێروولە بووم (کە مێروولەم لە ژێردایە).

اندر: لەناو    موکب: دەستەیەك سوار، دەستەیەك لە سوار و پیادە
کە لەگەڵ گەورە و پادشادان (حمایە)    پشت: پشت

برپشت صبا بندند زین: بە سەرپشتی بادی سەباوە زینیان توندکردۆتەوە، بادی سەبایان زینکردووە، واتە سواری با بوون، ئەم دەربڕینەش لەگەڵ قاڵیچەکەی حەزرەتی سولەیماندا هەماهەنگە. چونکە دەڵێن حەزرەتی سولەیمان لەکاتی فڕیندا قاڵیچەیەکی داخستووە و لەسەری دانیشتووە، دەکرێ مەبەست لە زین ئەم قاڵیچەیە بێت.

سلیمان: حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەرە (د.خ) کە خودا کۆمەڵێ موعجیزەی زۆری پێدابوو لەوانەش دەسەڵاتی بە سەر بادا هەبوو، هەروەها زمانی گیانەورانی دەزانی.

برانم: لێخوڕم، دەرچم، بجوڵێم    مور: مێروولە    مورم مرکب است: سواری مێروولە بووم.

وەك ئاشکرایە کە سولەیمان سواری با بووە و ئەو و یارانی (سەربازەکانی) لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دیکە بردووە، باش رەمز و نیشانەی خێراییە و لە بەرامبەر ئەمەشدا مێروولە هاتووە کە نیشانەی هێواشی و خاوییە، دەڵێ: کاتێ سوارانی حەزرەتی سولەیمان بەو لێزانی و تواناییەوە بای سەبا زین دەکەن و سواری با دەبن من کە سواری مێروولە بووم چۆن دەتوانم کێبڕکێیان لەگەڵدا بکەم و چۆن لەگەڵیان دەرچم.



**۸- آنکه ناوک بر دل من زیر چشمی می زند**

**قوت جان حافظش در خندهء زیر لب است**

**ئانکە ناڤەك بەر دلی مەن زیری چەشمی می زەنەد، قوتی جانی هافزەش دەر خەندەیی زیری لەبەست.**

ئەو کەسەی کە لەژێرەوە تیری برژانگ دەگرێتە دڵم، قوت و خۆراکی گیانی حافز لە خەندەی ژێر لێویی ئەوەوەیە.

ناوك: تیر    زیرچمشی: لەژێرچاوەوە، بەڵام لە کوردیدا واناگوترێت و لە بری ئەمە تەنیا دەگوترێت لە ژێرەوە بۆ نموونە، لەژێرەوە سەیرم دەکات
می زند: لێم دەدات، تێم دەگرێ    قوت: قوت، خۆراك
زیرلب: لەژێر لێوەوە    خندەء زیرلب: لە ژێر لێوەوە پێکەنین

واتە: یار لە ژێرەوە بە تیری برژانگ حافز دەکوژێ، بەڵام کاتێ یار لە ژێر لێوەوە پێدەکەنێ ئەم پێکەنینە ژێرلێوییە دەبێتە خۆراك بۆ گیانی حافز و زیندووی دەکاتەوە.

گەر مەبەست لە (حافظش) پارێزەر و پاسەوانەکانی یاربن نەوەك ئەوا دەڵێ: لە کاتێکدا کە بە تەواوی سەیری حافز ناکات و لە ژێرەوە سەیری دەکات و بەمەش تیر ئەگرێتە دڵی، بە پێکەنینی ژێرلێوی دڵی پاسەوان و پارێزەرەکانی خۆش دەکات.

**۹- آب حیوانش ز منقار بلاغت می چکد**

**زاغ کلك من بنام ایزد چە عالی مشرب است**

**ئابی هەیوانەش ز مینقاری بەلاغەت می چەکەد، زاغی کلکی مەن بنامیزەد چە ئالی مەشرەبەست.**

ئاوی ژیان (نەمری) لە نوکی قەڵەمی من ئەتکێ، ماشەڵا قەلەڕەشی قەڵەمی من چ پایەبەرزە.

آب حیوان: ئاوی نەمری، ئاوی ژیان، ئاوێك کە ببێتە مایەی نەمری یاخود زیندوو مانەوە
منقار: دەنوك، لێرەدا مەبەست لە نوکی قەڵەمە    می چکد: دەتکێ، دەچکێ
زاغ: قەلەڕەش، جۆرە باڵندەیەکە کە دەنوکی بە هێز و درێژی هەیە و رەنگی رەشە
کلك: قەڵەم    عالی مشرب: بەرز و بەڕێز    بنامیزد، بنام ایزد: بە ناوی خودا، ماشەڵا، لەکاتی دەستکەوتی چاکدا بۆ دوورکەوتنەوە لە چاوی پیس دەگوترێ.

شاعیر بە هۆی رەشییەوە قەڵەمەکەی خۆی بە قەلەڕەش و نوکەکەشی بە دەنوکی قەلەڕەش چواندووە و مرەکەبێکیش کە لەوەوە دەتکێ ئاوی حەیاتە.

دەڵێ: ئەم قەڵەمەی من کە لە چاوی بەد بە دوور بێ، ماشەڵڵا وەکو باڵندەی قەلەڕەش وایە کە ئاوی حەیات لە دەنوکی ئەتکێ، کەواتە چ هزرێکی بەرز و بڵندە.

چکانی یاخود تکانی ئاوی حەیات پەیوەندی پتەوی بەم چیرۆکەوە هەیە، لە چیرۆکە ئێرانییەکاندا هاتووە کە کاتێ ئەسکەندەر بە هاوکاری خدری زیندە گەشتە سەرچاوەی ئاوی حەیات کوندەیەکی لێ پڕکرد و لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە لەڕێگەدا زۆر ماندو بوو کوندەکەی بە دەرەختێکدا هەڵواسی و بە خزمەتکارە رەشەکەی خۆی گوت ئاگای لێ بێت و خەوی لێکەوت. پاشان پاسەوانەکەش بە هۆی هیلاکییەوە خەوی لێکەوت، قەلەڕەشێك کە لەو ناوەدا دەسوڕایەوە چاوی بە کوندەکە کەوت بە دەنوکی کردییەوە و ئاوەکەی خواردەوە و لەوەشەوە قەلەڕەش تەمەنی زۆر درێژ بوو ئەسکەندەر بە دەستی بەتاڵ هاتەوە.

بەمەش ئەوەی کە قەڵەمەکەی من دەینووسێ وەك ئاوی حەیات وایە، چونکە لە دەنوکی زاغ دەچێت و تەنیا ئەویش لە ئاوی حەیاتی خواردووەتەوە مەبەست لەوەش واتە قسەی من وەك ئاوی نەمریی ژیان بەخشە، چونکە لە جێگەیەکی هزری بڵندەوە دەتکێت و سەرچاوە دەگرێت.





## غەزەلی بیست و دووەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- خلوت گزیدەرا به تماشا چه حاجت است**
**چون کوی دوست هست به صحرا چه حاجت است**

**خەلڤەت گوزیده را به تەماشا چه هاجەتەست، چون کوی دوست هەست به سەهرا چه هاجەتەست.**

کەسێ کە کونجی خەڵوەتی هەڵبژاردووە چ پێویستی بە گەڕان و سەیرکردن هەیە، کاتێ کۆڵانی دۆست هەیە ئیتر چ پێویست بە بیابان دەکات.

خلوت گزیده: گۆشەنشین، دوورکەوتنەوە لە خەڵکی، تەنیا مانەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە مەبەستی عیبادەت و وەرزشی گیانی   تماشا: تەماشا، گەڕان، سەیرکردن   کوی: کۆڵان   چه حاجت: چ پێویست دەکا.

ئەم بەیتە مانایەکی تەواو قووڵی عیرفانیی هەیە کە بوونی دۆست لە ژیانی گۆشەنشیندا وای لێدەکات پێویستی بە هیچ شتێکی دیکەی دنیایی نەبێت، دەڵێ: کەسێ گۆشەنشینی هەڵبژاردووە و بە هۆی ئەو گۆشەنشینییەوە دۆست جلوەی بۆ دەکات چ پێویستی بە گەڕان و تەماشا دەمێنێ، کاتێ ئەم کۆڵانە هەبێ کە ماڵی دۆستی لێیە بۆ گەڕان و تەماشاکردن چوونە بیابان و دەشت و سەحرا چ پێویست دەکات.

**٢- جانا به حاجتی که ترا هست با خدای**
**کآخر دمی بپرس که مارا چه حاجت است**

**جانا به هاجەتی کە تورا هەست با خودای، کاخەر دەمی بپورس کە مارا چه هاجەتەست.**

گیانەکەم، سوێندت دەدەم بە پێویستییەك کە تۆ بە خودا هەتە، ساتێ بپرسە بزانە ئێمە چ پێویستییەکمان هەیە.

حاجت: پێویستی   ترا: تۆ (لە دۆخی بەکاریدا)

بەرامبەر بە خۆشەویستە کە هەموانی پشتگوێ خستووە و پرسیاری ئەوەیان لێناکات کە ئایا پێویستییان چییە، دەڵێ: تۆ هەمیشە پێویستیت بە خودا هەیە، دەی گیانەکەم بەو پێویستییە سوێندت دەدەم یاخود تو ئەو پێویستییانەی کە تۆ بە خودا هەتە ساتێ بپرسە بزانە



ئێمە چ پێویستییەکمان هەیە. واتە پێویستیمان بە تۆ زۆرە و ساتێ نەرمی لەگەڵماندا بنوێنە و ئاوڕمان لێبدەرەوە و وەڵامان بدەوە.

**٣- ای پادشاه حسن خدا را بسوختیم**
**آخر سؤال کن که گدارا چه حاجت است**

**ئەی پادشاهی هوسن خودا را بسوختیم، ئاخەر سوئال کون کە گەدارا چه هاجەتەست.**

ئەی پادشای جوانی سووتاین، بۆ خاتری خودا ـ توخوا ـ دواجار پرسیار کە بزانە ئێمەی گەدا چ پێویستییەکمان هەیە.

بسوختیم: سووتاین

گدا: لەم دێڕەدا گەدا  هەژار و فەقیر نییە، بەڵکو عارفە کە پێوستی بە جوانی مەحبووب هەیە، بەم واتایە گەداش هەمیشە عارفەکان تامەزرۆی جوانی بوون و لە ئارەزووی دیداری رووخساری جوانی یاردا بوون کە رۆژێ جیلوە بگرێت و خۆی نمایش بکات، لێرەشدا بە یار دەڵێت: ئەی پادشای جوانی، ئەی تۆ جوانی تەواو لە دووری تۆ و لە تاو جیلوەنەکردنی تۆ سووتاین. توخوا پرسیارێکم لێبکە بزانە منی هەژار و عارف چ پێویستییەکم هەیە، تۆ کە لە پلەی پادشایەتی جوانیدایت و منیش موشتاق و موحتاجی ئەو جوانییەم دەڵێم بپرسەوە.

**٤- ارباب حاجتیم و زبان سؤال نیست**
**در حضرت کریم تمنّا چه حاجت است**

**ئەربابی هاجەتیم و زەبانی سوئال نیست، دەر هەزرەتی کەریم تەمەننا چه هاجەتەست.**

(خاوەن پێویستین) پێویستیمان زۆرە و زمانی سوئال و داواکردنمان نییە، لە خزمەتی حزوری کەریمدا پاڕانەوە چ پێویستە.

زبان: زمان   سؤال: پرسیار، داواکردن، سواڵکردن   حضرت: ئامادەیی، ئامادەبوون
کریم: بەخشندە، یەکێکە لە ناو و سیفاتەکانی خودا   تمنا: پاڕانەوە، داواکردن

لە بەیتەکانی پێشوودا ئاماژەیەکی لێڵیان بۆ خودا تێدایە، لەم بەیتەدا ئەو ئاماژەیە روونتر دەردەکەوێت کە مرۆڤەکان هەموویان پێویستییان پێیەتی و ئەویش بەخشندە و کەریمە و دەست بە رووی داواکەرانەوە نانێت.

شاعیر دەڵێ:

ئێمە پێویستیمان زۆرە و بووینەتە خاوەن پێویستی، بەڵام روو و زمانی داواکردن و سواڵکردنمان نییە و ناتوانین پرسیار بکەین، بەڵام ئەمەش هیچ گرنگ نییە، چونکە لە خزمەت

خودای کەریم و بەخشندەدا کە لە دڵی هەموان ئاگادارە و دەزانێت کێ پێویستی هەیە یان نا، پێویست بە داواکردن ناکات، چونکە بۆخۆی چاکتر دەزانێ.

گەر (کریم) مەبەست لە مرۆڤی بەخشندە بێ، ئەوا مانای دێڕی دووەم دەبێتە:

لە ئامادەیی پیاوی بەخشندەدا پێویست ناکات داوای لێ بکەیت خۆی پێویستییەکانت دابین دەکات.

**٥ ـ محتاج قصه نیست گرت قصد جان ماست**

**چون رخت از آن تست به یغما چه حاجت است**

**موهتاجی قیسە نیست گەرەت قەسدی جانی ماست، چون رەخت ئەزئانی توست بە یەغما چە هاجەتەست.**

ئەگەر نیازی گیانی ئێمەت هەیە پێویست بەوە ناکات چیرۆکێك بۆ گوناهباری ئێمە دروست بکەیت و بیانوویەك داتاشی، کاتێ هەرچی هەیە هی تۆیە چ پێویست بە تالآنکردن دەکات.

محتاج: پێویست    قصه: چیرۆك یاخود عەریزە، شکات

قصد: نیاز    رخت: کەلوپەل

بە یار دەڵێ: ئەگەر نیازی گیانی ئێمەت هەیە دەتەوێ گیانمان دەرکەیت و بمان کوژی پێویست بەوە ناکات بیانوویەك بتاشی و عەریزە و شکاتێك ئامادە بکەیت تا بە تۆمەتێك کوشتنی ئێمە بسەپێنێ، چونکە هەرچی هەیە هی خۆتە و پەیوەستە بە خۆتەوە لەم حاڵەشدا ئیتر پێویست بە تالآنکردنی ناکات.

**٦- جام جهان نماست ضمیر منیر دوست**

**اظهار احتیاج خود آنجا چه حاجت است**

**جامی جەهان نوماست زەمیری مونیری دوست، ئیزهاری ئیهتیاجی خود ئانجا چە هاجەتەست.**

دەروونی رووناکی دۆست وەك ئاوێنەی جیهان نمایە، لەوێشدا پێویست ناکات پێویستییەکانت بخەیتەڕوو.

جام جیهان نما: ئاوێنەکەی جەمشیدە کە نهێنییەکانی غەیبی تێیدا دەردەکەوت

ضمیر: ویژدان، دەروون    منیر: رۆشن، رووناك

اظهار: دەربڕین، ئاشکراکردن، خستنەڕوو    آنجا: لەوێدا



لە حزوری دۆستێکدا کە ویژدان و دەروونی وەك ئاوێنەکەی جەمیشد وایە و هەموو نهێنییەکانی غەیبی تێیدا دەردەکەوێ و ئاگاداری هەموانە و ویژدانیشی رووناك و رۆشنە، پێویست ناکات کەس باس لە پێویستی و حاجیاتەکانی خۆی بکات و بیانخاتەڕوو، دۆست بۆخۆی پێویستی هەموان دەبینێ.

**٧ ـ آن شد که بار منّت ملاّح بردمی**

**گوهر چو دست داد به دریا چه حاجت است**

**ئان شود کە باری مننەتی مەللاه بووردەمی، گۆوهەر چو دەست داد بە دەریا چە هاجەتەست.**

تێپەڕی ئەو رۆژگارەی کە باری منەتی کەشتییەوانم هەڵدەگرت، کاتێ گەوهەر بەدەست هات ئیدی چ پێویست بە دەریا دەکات (دەبێ).

آن شد: ئەوە تێپەڕی    بار: بار

منت: منەت    ملاح: کەشتیوان

بردمی: ببەم، هەڵگرم    دریا: دەریا

من ئێستا مرواری و گەوهەری دەریام لە دەستدایە و بەدەستم هێناوە، ئەگەر جاران باری منەتی کەشتیوانم هەڵدەگرت و دەچوومە دەریا تا مرواری دەست بخەم ئیدی ئەوە تێپەڕی کە منەتی کەشتیوان هەڵگرم، چونکە مرواریەکەم بە دەستهێناوە، بەمەش ئیدی پێویستم بە دەریا نابێت و منەتی کەشتیوانیش هەڵناگرم.

**٨-ای عاشق گدا چو لب روح بخش یار**

**می داندت وظیفه تقاضا چه حاجت است**

**ئەی ئاشقی گەدا چو لەبی روهبەخشی یار، می دانەدەت ڤەزیفە تەقازا چە هاجەتەست.**

ئەی عاشقی هەژار، کاتێ لێوی گیانبەخشی یار دەزانێ هەقدەستت چییە چ پێویست بە داواکردن دەکات.

چو/چون: کاتێ، چونکە    روح بخش: گیانبەخش، مایەی گیان بەخشین

وظیفه: هەقدەست    تقاضا: داواکردن

یار دەزانێت کە عاشقی هەژار و مسکین کوژراوی ماچێکی لێوی یارە و ئەمەش وەك هەقدەستی ئەو عاشقی و هەژارییەی لە یاری وەردەگرێت، شاعیر لە وەسفی یاردا کە دەروون و ویژدانی وەك ئاوێنەی جیهان نمایە و هەموو نهێنییەکانی تێدایە، لێویشی کە مایەی بەخشینی

گیانه و روح به خەڵکی دەبەخشێ چاك دەزانێ هەقدەست و هەقی عاشقی هەژار چییە، ئیدی پێویست بەوە ناکات داوای بکرێت، ئەو هەقدەستەی کە لێوی روح بەخشی یار بۆ عاشق هەیەتی موژدەی ویساڵ و ژوانە.

**٩-ای مدّعی برو که مرا با تو کار نیست**

**احباب حاضرند به اعدا چه حاجت است**

**ئەی موددەئی برو کە مەرا با تو کار نیست، ئەهباب هازرەند بە ئەئدا چە هاجەتەست.**

ئەی مودەعی مایەپوچ برۆ کە من کارێکم بە تۆ نییە، خۆشەویستان ئامادەن چ پێویست بە دوژمنان دەکات.

مدعی: ئیدیعاکەر، مرۆڤێك کە بانگەشە بکات و ئەوەش نەبێ کە بانگەشەی بۆ دەکات، لای حافز بە واتای ئیدیعاکەر، مایەپوچ، جەنجاڵ، لادەر (رەتکەرەوە) دێت.

احباب: خۆشەویستیان کۆی (حبیب)ە　　اعدا: دوژمنان، کۆی (عدو)ە

کۆڕ و مەجلیسی حافز پڕە لە خۆشەویستان و لەم کاتەشدا مودەعی لەوێدایە، حافز پێی دەڵێ: ئەی مودەعی برۆ من هیچ کارێکم بە تۆ نییە واتە حەز ناکەم لێرە بیت، ئەم کۆڕ و مەجلیسەی کە خۆشەویستیان تیایدا ئامادەن پێویستی بە دوژمنان نییە.

**١٠- حافظ تو ختم کن که هنر خود عیان شود**

**با مدعی نزاع و محاکا چه حاجت است**

**هافز تو خەتم کون کە هونەر خود ئەیان شەڤەد، با موددەئی نیزاع و موهاکا چە هاجەتەست.**

حافز، تۆ کۆتایی بە قسە بهێنە کە بەها و ئەرزش خۆی پیشان دەدات، چ پێویستە لەگەڵ مرۆڤی ئیدیعاکەردا کێبەرکێ و دەمەقاڵە بکەیت.

ختم کن: کۆتایی پێ بهێنە　　هنر: بەها، فەزیلەت

عیان: دەردەکەوێ　نزاع: کێبەرکێ، نیزاع　محاکا: قسەکردن، بەڵام لە بەیتەکەدا بە واتای دەمەقاڵە دێت

دەڵێ: حافز قسەکانت کۆتایی پێ بهێنە و پێویست ناکات لەگەڵ مرۆڤی ئیدیعاکەردا کێبەرکێ و دەمەقاڵە بکەیت، چونکە بەها و فەزیلەت خۆی دەردەکەوێت و پێویست بەگوتن ناکات.



## غەزەلی بیست و سێیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١-ای نسیم سحر آرامگه یار کجاست**

**منزل آن مه عاشق کش عیار کجاست**

**ئەی نەسیمی سەحەر ئارامگەهی یار کوجاست، مەنزلی ئان مەهی ئاشقکوشی ئەییار کوجاست.**

ئەی شەماڵی بەرەبەیان ئارامگای یار لە کوێیە، ماڵی ئەو مانگە عاشق کوژە عەیارە لەکوێیە.

سحر: بەرەبەیان　　آرامگە: ئارامگا، جێگەی ئارامی، ماڵ، گوند، ئاوایی

کجاست: لەکوێیە　　مە/ماە: مانگ، درکەیە لە یار　　عاشق کش: عاشق کوژ

عیار: بە واتای خێرا، سەرگەردان، زیرەك و جوامێر دێت و لە حافزدا بەزۆری بە واتای زیرەك و جوامێر دێت کە بێ باکی و کوشتنی نەیارانی لەگەڵدا دێت و یەکێك لە سیفەتەکانی یارە، یەکێکی دیکە لە ماناکانی (عەیار) سەرگەردانییە کە دەکرێ لە بەیتەکەدا واتا بدات

شاعیر روو لە شەماڵی بەرەبەیان دەکات کە ماڵ و شوێنی حەوانەوەی یاری پیشان بدات ئەو یارەی کە وەك مانگ جوانە و بەڵام عەیار و عاشق کوژە.

یاخود بە مانای دووەم بە نەسیمی سەحەر دەڵێ: ئارامگەی یار لە کوێیە، چونکە یاری عەیاری من بێ جێگە و خێرایە و هەر ساتە و لە شوێنێکە و نازانم ئارامگە و شوێنی حەوانەوەی کوێیە، ئەی شەماڵ کە تۆش هەر ساتە و لە جێگەیەکی مەنزڵی یارم پێ پیشان بدە.

**٢-شب تار است و ره وادی ایمن در پیش**

**آتش طورکجا موعد دیدار کجاست**

**شەبی تارەست و رەهی ڤادیی ئەیمەن دەر پیش، ئاتەشی تور کوجا مەوئیدی دیدار کوجا.**

شەوی تاریکە و رێگەی بیابانی ئەیمەن لە پێشدایە، ئاگری تور لە کوێیە و ژوانگەی دیدار لە کوێ.

تار: تاریك　　رە: راە: رێگە　　وادی: دەشت، بیابان　　ایمن: لای راست

وادی ایمن: دەشتی لای راست، بەڵام (وادی ایمن) ناوی ئەو شوێنەیە کە حەزرەتی موسا بۆ

یەکەم جار لەوێوە چووە کێوی تور و لیقای لەگەڵ خوادا کرد بە هێنانی ئاگری تور و بەڵێنی دیدار و بەیەك گەیشتندا دەردەکەوێ کە مەبەست لە (وادی ایمن) هەمان بیابان بێت کە موسا(د.خ) تێیدا بەتەنیابوو {سورەتی۲۸/۳۰ }هەروەها {سورەتی ۲۰ /۱۲ ـ ۱٦/۷۹}

آتش طور: ئاگری کێوی تور    موعد: بەڵێن، ژوانگە    دیدار: بەیەکگەیشتن، ژوان

لە شەرحکردنی ئەم بەیتەدا باسکردنی چیرۆکی حەزرەتی موسا و پەیوەندی ئەو بە ئاگر و وادی ئەیمەن و ئاگری تور و ژوانگەوە خۆی دەسەپێنێت، بەیتەکە بە شێوەیەکی تیژپەڕ ئاماژە بە چیرۆکی حەزرەتی موسا — علیه السلام — دەکات کە یەکێکە لەو چیرۆکانەی لە قورئاندا و لە شێوەی جیاوازدا زۆر لەسەری گوتراوە، کورتەی چیرۆکی ئاگرهێنانی حەزرەتی موسا بریتییە لە:" کاتێ موسا لە ترسی فیرعەون و دارودەستەکەی لە میسر هەڵهات و ڕێگەی هات و نەهاتی گرتەبەر لە جێگەیەکدا دوو کچی بینی کە رانەکەیان ئاودەدا و لەبەر ئەوەی بیری ئاوەکەش قەرەباڵغ بوو ناچار بوون تا دوا کەس راوەستن، موساش یارمەتییدان و پاش ئەمە باوکی کچەکان (شعیب) رازی بوو کە کچێکی خۆی بداتێ بە مەرجی ئەوەی شوانی بۆ بکات پاش ئەوەی ماوەی شوانییەکەی کە هەشتساڵ یاخود دە ساڵ بوو کۆتایی هات و گەیشتە تەمەنی چل ساڵی بۆ دیدەنی خزم و کەسانی بەرەو میسر کەوتەڕێ و ژنەکەشی لەگەڵ خۆیدا بردەوە، لە شەوێکی سارد و تاریکدا ڕێگەی هەڵە بوو رووی لە بیابان کرد، لەم کاتەشدا نیشانەکانی منداڵبوون لە ژنەکەیدا سەریان هەڵدا توانای ئاگرکردنەوەشی نەبوو، لەناکاو لە لای کێوی (طور)ەوە ئاگرێکی بەرچاوکەوت، بە خێزانەکەی گوت: ـ ئێوە لێرە بن من دەچم ئاگر دەهێنم. کاتێ نزیکی ئاگرەکە بوویەوە لە دەشتێکەوە کە لە لای راستییەوە بوو دەنگێك هات: ـ کە من پەروەردگاری جیهانیم. بەمەش موسا شەوق و حەزی بینینی خودای کەوتە سەر، هەرچەندە ئەو مەرامەی لە دونیادا بۆ مەیسەر نەبوو.

شاعیر دەڵێ: ئێمە کە بەهیوای ژوان و دیداری دۆستین ئێستا لە شەوێکی تاریکی وەك ئەو شەوەی موسا داین و بیابان و دەشتێکی کاکی بەکاکی وەك ئەو دەشتەمان لە پێشە، ئاگری تور لەکوێیە و دیدار و ژوان لەکوێیە.

دەکرێ شەوی تاریك ئاماژە بە (فیراق) و دووری عارفانە بێت و مانای بەیتەکە: ئێمە ڕێبواری ڕێگەی تەریقەتین و بە ئومێد و ئاواتی جیلوەکردنی مەعشوقین و ژوانی یارمان دەوێت. ئێمەی ڕێبوار گەرچی شەوێکی تاریکی دووریش بێت و بیابانان لە پێش بێت واز ناهێنین، هەروەك چۆن موسا دەستی هەڵنەگرت، ژوانگە و دیداری یار لە کوێیە و نیشانەکەی کە ئاگری تورە کوا؟ یاخود دەکرێ بگوترێ شاعیر حیرەت و سەرگەردانی خۆی لە هەوڵدان بۆ



کەشفکردنی نهێنییەکانی ئەودیو سروشتی بە شەوی تاریك داوەتە قەڵەم و لەو شەوە تاریکەشدا بەرەو بیابان دەڕوات تا بەڵکو وەك موسا نورێکی لێ دەرکەوێت بە هۆی ئەویشەوە بە دیدار و ژوانی یاران و بە مەرام بگات.

**٣-هرکه آمد به جهان نقش خرابی دارد**

**در خرابات مپرسید که هشیار کجاست**

**هەرکە ئامەد بە جەهان نەقشی خەرابی دارەد، دەر خەرابات مەپورسید کە هوشیار کوجاست.**

هەرکەس هاتە ئەم جیهانەوە نیشانەیەکی لەناوچوونی تێدایە، لە مەیخانەدا پرسیار لە جێگەی مرۆڤی وشیار مەکەن.

نقش: نیشانە، وێنە    خرابی: مەستی و بێخودی، لەناوچوون و تێکچوون

نقش خرابی: گەر بە واتای مەستی و بێخودی بێت ئەوا هەر مرۆڤە و نیشانەی مەستی و عەشقی تێدا حەشاردراوە، بەڵام ئەگەر مەبەست لە (خرابی) لەناوچوون و تێکچوون بێت ئەوا (نقش خرابی) واتە نیشانەی لەناوچوون و مردن، بەڵام بە هێنانی (خرابات) واتای یەکەم نزیکترە، بە جیاوازی ئەم دوو مانایەش بەیتەکە دوو جۆر لێکدانەوەی دەبێت:

یەکەم: مەسەلەی گۆڕاو و نەگۆڕ کێشەیەکی فەلسەفەییە و هەر گۆڕاوێك کە هەیە ئەوا (فەنا) ی بەسەردا دێت و دیسان دەگۆڕێت، بەم بڕوایەش هەرچی سەرەتای هەبوو کۆتاییشی دەبێت و هەرچییەکیش لە جیهاندا هەیە سەرەتای هەبووە کەواتە کۆتاییشی دەبێت و بە نیسبەت مرۆڤیشەوە کۆتایی مردن و لەناوچوونە، لەسەر ئەم رایە شاعیر دەڵێ: هەرکەسێك کە دێتە ئەم جیهانەوە نیشانەیەکی لەناوچوونی لەخۆدا هەڵگرتووە. واتە هەر بەوەی کە هاتووەتە جیهانەوە نیشانەیە کە لەناودەچێت و فەنای بەسەردا دێت، لەم خراباتەی دونیادا لەکەس مەپرسە هۆشیار لەکوێیە یاخود لەم مەیخانەیەی جیهاندا کە هەمووان شەرابی ئەجەل دەنۆشن و بە مەرگ سەرخۆش دەبن بە دوای هۆشیاردا مەگەڕێ، چونکە ئەم جیهانە گۆڕاوە هەموو کەسەکانی ناوی گۆڕاون و بادەی ئەجەل نۆش دەکەن.

دووەم: گەر مەبەست لە (خرابی) مەستی و عاشقی بێت، ئەوا مانای بەیتەکە: لە بری فەنا و لەناوچوون ببێتە پشکی تەواوی مرۆڤەکان عەشق دەبێتە پشکی تەواوی مرۆڤەکان لەم بۆچوونەدا شاعیر دەڵێ: هەرکەس هاتە ئەم جیهانەوە نیشانەیەکی لە مەستی و عەشقی ئیلاهی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، بۆیە جیهان وەك مەیخانە وایە و جێگەی مەست و رەندانە

و به دوای مرۆڤی هۆشیاردا مەگەڕێ، چونکە هەر لە هاتنیانەوە مەست و عاشقی لە ناخیاندا رسکاوە.

له بری (میپرسید) لای سودی (بپرسید) لای قزوینی، غەنی (بگوئید) هاتووە کە لە هەردوو بارەکەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بوونی هۆشیار رەتدەکاتەوە، لە مەیخانەدا بپرسن هۆشیار لەوێیە یاخود (لە مەیخانەدا بڵێن هۆشیار لەکوێیە) واتە: هۆشیار لە مەیخانەدا بەرچاو ناکەوێت. {سودی، ج١، ل١٣٧ }هەروەها {قزوینی ل٢٤}.

**٤-آن کس است اهل بشارت که اشارت داند**

**نکتەها هست بسی محرم اسرار کجاست**

**ئان کەسەست ئەهلی بەشارەت کە ئیشارەت دانەد، نوکتەها هەست بەسی مەحرەمی ئەسرار کوجاست.**

مژدە بە کەسێ دەدرێ کە بە ئاماژەیەك لە قسە تێبگات، قسەی گرنگی زۆر هەیە مەحرەمی ئەسرار لە کوێیە.

بشارت: مژدە اهل بشارت: شایستەی مژدە

اشارت: ئاماژە نکتە: قسەی ورد و رێك و پێك و گرنگ

محرم اسرار، محرم راز: کەسێ کە ئاگاداری نهێنییەکانی کەسێکی دیکە بێت و بڵاویان نەکاتەوە پێی دەگوترێ (محرم اسرار) یان مەحرەمی راز، نهێنی پارێز.

دەڵێ: کەسێك شایستەی ئەوەیە مژدەی پێ بدرێت کە بە ئاماژە و ئیشارەت لە قسە تێ بگات یاخود کەسێ شایستەی ئەوەیە کە مژدەی دیدار و وەسڵی یاری پێ بدرێت کە لە رەمز و ئیشارەتەکانی دونیای عەشق تێ بگات، چونکە عالەمی عەشق قسەی زۆر ورد و گرنگی تێیدایە، لە کۆمەڵگەدا شاعیر لە دوای کەسێ دەگەڕێ کە لە قسە تێ بگات و نهێنییەکانی بپارێزێ، بۆیە دەڵێ: قسەی ورد و گرنگی عەشق زۆرە کوا کەسێك کە نهێنی پارێزبێت و خاوەن تێگەیشتن و دەرك بێت تا لەگەڵیدا باس بکرێت و ئەو قسانەی لا بدرکێنرێت، یاخود عالەمی عەشق قسەی وردی زۆرە کوا مەحرەمی رازێك کە لای باس بکەم و بڵاویان نەکاتەوە.

**٥-هر سر موی مرا با تو هزاران کاراست**

**ما کجاییم و ملامتگر بی کار کجاست**

**هەر سەری موی مەرا با تو هەزاران کارەست، ما کوجاییم و مەلامەتگەری بی کار کوجا.**



هەر سەری تاڵە مویەکی من هەزاران کاری بە تۆ هەیە، ئێمە لە کوێین و سەرزەنشتکەری بەتاڵ لەکوێ.

موی: مو، بەڵام رەمزی زۆرییە. بۆ نموونە (ئەوەندەی توکە سەرم کارم هەیە) هەزاران ئیش پێ بوونی هەر تاڵە مویەکیش واتە بێ ژمارە کارم هەیە، واتە من لە حەدبەدەر کارم بە تۆیە.

ملامتگر: سەرزەنشتکەر

دەڵێ: من هەزاران جاری توکی سەرم کارم بە تۆیە، بەڵام کەسێك کە سەرزەنشتی من دەکات بێ کار و بەتاڵە، سەیرکە من چۆنم و ئەو چۆنە، واتە من ئەم هەمووە ئیشەم هەیە، بەڵام ئەو بۆیە سەرزەنشتی من دەکات، چونکە بەتاڵە و لە دوو جیهانی جیاوازدا دەژین و جیاوازیمان لە یەکتری زۆرە.

**٦-باز پرسید ز گسیوی شکن در شکنش**

**کاین دل غمزده سرگشته گرفتار کجاست**

**باز پورسید ز گیسوی شیکەن دەر شیکەنەش، کین دلی غەمزەدە، سەرگەشتە، گرفتار کوجاست.**

لە پرچی چین چین و لولی بپرسن کە ئەم دڵە غەمگینە، سەرگەردانە، گرفتارە لەکوێیە.

شکن: چین چین، لول غمزده: خەمگین، خەمبار سرگشته: سەرگەردان

دەڵێ: دڵی من ئەسیر و دیلی پرچی چین چین و لوول (نهێنی پەردەی سەر رازەکان)ی مەعشوقە و دیار نییە کە لە چ شوێنێکی پرچی لولی ئەودا سەرگەردان و گرفتارە و لە پرچی یار خۆی بپرسن تا پێتان بڵێ.

**٧- عقل دیوانه شد آن سلسلهء مشکین کو**

**دل ز ما گوشه گرفت ابروی دلدار کجا**

**ئەقل دیڤانە شود ئان سیلسیلەیی مشکین کو، دل ز ما گوشە گرفت ئەبروی دلدار کوجا.**

عەقڵ شێت بوو، ئەو زنجیرە رەشەی پرچ لە کوێیە، دڵ کەناری لێ گرتوین کوا برۆی دڵدار.

دیوانه شد: شێت بوو سلسله: زنجیر

مشکین: رەش وەك میسك، مەبەست لە پرچی لولی یارە کە وەك میسك رەش و بۆنخۆشە دل ز ما گوشەگرفت: دل کونجی لێ گرتین، بە واتای رەنجان و جیابوونەوە دێت، کەنارگرتن، وازهێنان.

دەڵێ: عەقڵ نەیتوانی لە شیکردنەوەی راز و نهێنییەکانی مەعشوقی حەق و مەسەلەکانی گەردووندا بگاتە هیچ، بۆیە شێت بووە و پێویستە ئێستا زیندانی بکرێت و ببەسترێتەوە، زنجیری رەشی پرچی یار کوا تا بە هۆی ئەوەوە عەقڵی شێتمان ببەستینەوە. واتە پێویستە عەقڵ بە رێگەی عەشقدا بڕوات و بکەوێتە داوی زنجیری مەعشوقەوە، هەروەها دڵیش گۆشەگیربووە لێمان و کەناری لێگرتووین و زەوق و شەوقی جارانی نەماوە بڕۆی یار(مەقامی نزیکی و نزیککەوتنەوە لە یاری حەق) کوا تا بە بینینی ئەو شەوق و زەوقەکەی جارانی بگەڕێتەوە، یاخود گۆشەی چاوی یار کوانێ کە دڵ تیایدا ئەسیر بووە لەو گۆشەیەدایە.

**٨- بادە و مطرب و گل جملە مهیاست ولی**

**عیش بی یار مهیا نشود یار کجاست**

**بادەڤو موتریب و گول جوملە موهەییاست ڤەلی، ئەیش بی یار موهەییا نەشەڤەد یار کوجاست.**

شەراب و موتریب و گوڵ هەمموویان ئامادەن، بەڵام کۆڕی بەزم بە بێ بوونی یار ئامادە نابێت یار لە کوێیە.

مهیا: ئامادە، حازر   ولی: بەڵام   عیش: رابواردن، کۆڕی بەزم و خۆشی (مەقاماتی عیرفانی)

مەبەست لەوەیە کە هەموو هۆکارەکانی کۆڕی بەزم و خۆشی و رابواردن (چوونە نێو مەقاماتی عیرفانی) ئامادەیە، بەڵام هەرچی بێت تا یار ئامادە نەبێت کۆڕی بەزم ناتەواو و نوقسانە، یار کوا یاخود لە کوێیە تا بەزمی عارفانەمان خۆش بکەین.

**٩- حافظ از باد خزان در چمن دهر مرنج**

**فکر معقول بفرما گل بی خار کجاست**

**هافز ئەز بادی خەزان دەر چەمەنی دەهر مەرەنج، فکری مەئقول بفەرما گولی بی خار کوجاست.**

حافز لە هەڵکردنی بای خەزان لە باغی رۆژگاردا دڵگران مەبە، عاقڵانە بیر بکەرەوە گوڵی بێ دڕك لە کوێیە(کوا هەیە).

بادخزان: بای خەزان، مەرگ و لەناوچوون   دهر: جیهان، رۆژگار

مرنج: مەڕەنجێ، دڵگران مەبە   بفرما: بفەرموە   خار: دڕك و داڵ

ئەم بەیتە بیرکردنەوەیەکی عاقڵانەیە سەبارەت بە مەرگ و تەواوبوونی تەمەنی مرۆڤ و تەواوی بوونەوەرەکانی نێوگەردوون، تا هەنووکەش ترس لە مەرگ هەیە و لە نەستی مرۆڤدا لە



بری قەبووڵکردنی ئەم بیری مەرگە هەوڵی سڕینەوەی یاخود لای کەم خۆگێلکردن لە مەرگ ئامادەیی هەیە، بەڵام حافز دەڵێ: بە عەقڵ بیر بکەرەوە و عاقڵانە سەیرکە هەرگوڵێك دڕك و داڵی هەیە و هەرگیز گوڵی بێ دڕك دەست ناکەوێ، بەم بەڵگەیەش ژیان کە خۆشە بە بێ مەرگ نییە و کۆتایی گشت ژیانێك مەرگە و هەموو بەهارێك پایز بەدوای خۆیدا دەهێنێ، بۆیە کاتێ بای خەزان و هەڵوەرین، لەناوچوون و مەرگ بە نێو ژیاندا هەڵدەکات و دەبێتە مایەی مردن و وەرینی چەندین گوڵ و گەڵا دڵگران مەبە، چونکە ئەمە یاسا و رێسای ژیانە و کاتێ مرۆڤیش بە عەقڵ بیربکاتەوە حەق وایە لە رێسا و یاساکانی ژیان خۆشحاڵ بێت نەوەك دڵگران، چونکە هەرچی بێت هەر روودەدات و چاوەڕێی دڵخۆشی یاخود دڵگرانی ئێمە ناکات. عارف و شاعیرەکان زۆر لە مەرگ دواون، لای عارفەکان مەرگ دەرگایەکە بۆ گەورەبوون دەروازەی گەیشتنەوەی یەکجارییە بە یاری حەق کە خودایە.

(مولانا جلال الدین رومی) مردن بە گەورەبوون ئەداتە قەڵەم و پێیوایە مرۆڤ لە هەر مردنێکدا گەورە دەبێت و چەند قۆناغێکی گەورەبوونی مرۆڤی دیاری کردووە لە وانەش: بوون بە ناو(نامی) لە سکی دایکدا و پاشان روح بە بەرداکران و دواجار لە دایکبوون، ئەم مردنەی ئێستاش هەر گەورە بوونە و ئیدی پێویست بە ترس ناکات. شاعیری گەورەی سەردەمیش (سوهرابی سیپەهری) لەو بڕوایەدایە ژیان و مەرگ تەواوکەری یەکترن و ئەسڵەن سییەکانی لەزەت پڕن لە ئۆکسجینی مەرگ (کە دەڵێ: و بدانیم ریەهای لذت پر اکسیژن مرگ است){سهراب سپهری، صدای پای آب، هەروەها بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتی مەرگ و گەورەبوونە بڕوانە باسی: مەرگ دەرگایەك بە رووی گەورەبووندا، ئەکرەم عەنەبی، گۆڤاری هەژان...}





## غەزەلی بیست و چوارەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- چو بشنوی سخن اهل دل مگو که خطاست**

**سخن شناس نەای دلبرا خطا اینجاست**

**چو بشنەڤی سوخەنی ئەهلی دل مەگو کە خەتاست، سوخەن شناس نەئی دولبەرا خەتا ئینجاست.**

کاتێ گوێت لە قسەی ئەهلی دڵ دەبێت مەڵێ هەڵەیە، عـەزیزم هەڵەکـە لێرەدایـە کـە تـۆ قسەناس نیت.

بشنوی: ببیستی، گوێت لێ بێ        مگو: مەڵێ

خطـا: هەڵە، نادروست        سخن: قسە        سخن شناس: قـسە نـاس

نەای: نیت، لە فارسی (قوتابخانەیی) دا (نیستی) بەکاردێت.

لێرەدا مەبەست لە ئەهلی دڵ، یارانی عەشق و عیرفانە. مانای بەیتەکە ئاماژە دەکات بـە جیاوازی بۆچوونی نێوان ئەهلی شەریعەت و ئەهلی تەریقەت کە شیعرەکە رووبەڕووی ئەوانەیـە قسەی ئەهلی تەریقەت بە هەڵە و شەتەحات و وڕێنـە دەزانـن، بـە ئـەهلی شـەریعەت دەڵـێ: گیانەکەم رێباز و رێچکەی تۆ جیاوازە لە ئەهلی تەریقەت و لێیان تێناگەیت، چونکە ئەوان لـە عالەمێکی دیکەوە قسە دەکەن هەرکاتێکیش کە گوێت لێیـان بـوو یەکـسەر مـەڵێ هەڵەیـە، چونکە هەڵە نییە، بەڵکو کێشە و هەڵەکە لێرەدایە کـە تـۆ قـسەناس نیـت و بـە پلـەی ئـەوە نەگەشتویت لە قسەی ئەهلی تەریقەت تێ بگەیت ئەگەرنا قسەکان دروستن.

**٣- سرم به دنیی و عقبـی فرو نمی آید**

**تبارک الله ازین فتنەها که در سر ماست**

**سەرەم بە دونیی و ئوقبی فرو نەمی ئایەد، تەبارەکەلەه ئەزین فیتنەها کە دەر سـەری ماست.**

سەرم ملکەچی دەسەڵاتی دنیایی و هەرەشەی دوارۆژیی نابێت، سوبحانەڵڵا لەم فیتنانە کـە لە سەرم دایە.

دنیی: نزم، دنیا، مەبەست لە دەسەڵاتی دنیاییە.

عقبی: دوارۆژ، مەبەست هەڕەشە و ترساندنەکانن بە جەهەنەم و سزا.

فرونمی آید: دانانەوێ، ملکەچ نابێت

تبارك الله: لە کاتی سەیر و سەرسوڕمانی مەسەلەیەکدا دەگوترێ، لە کوردیدا لە بەرامبەر ئەمەدا (سوبحانەڵڵا) بەکار دێت      فتنەها: فیتنە و ئاشوب

دەڵێ: من نە لە بەرامبەر فەرمانەکانی شەرعدا و نە لە بەرامبەر فەرمانەکانی دەوڵەتدا ملکەچ نیم و سەرم سەرەڕۆیی دەکات و ئەمەش دەبێتە مایەی بەرپابوونی فیتنە و ئاشوب و دەسەڵاتدارانی حکوومەت و پیاوە ئایینییەکان چیم بەسەردا دەهێنن، دێڕی دووەم بە تەنز دەڵێ: ئافەرین بۆ ئەو خودایەی کە بەندەی وەك منی خەڵقکردووە کە ملکەچی دنیا و دوارۆژیش نابێت.

**٤- در اندرون من خستەدل ندانم کسیت**

**کە من خموشم و او در فغان و در غوغاست**

**دەر ئەندەرونی مەنی خەستەدل نەدانەم کیست، کە مەن خەموشەم و ئو دەر فەغان و دەر غۆوغاست.**

نازانم لە نێو وجودی منی ڕەنجدیدەدا کێیە کە من بێدەنگم و ئەو خەریکی ناڵە و داد و هاوارە.

اندرون: ناو، نێو      خستەدل: ڕەنج دیدە، دڵ ماندوو      ندانم: نازانم

خموش/خاموش: بێدەنگ      فغان: ناڵەو زاری، داد و فریاد و هاوار

مەبەست لەوەیە کە لە کاتێکدا منی ماندوو و ڕەنجدیدە بێدەنگم و داوای مەسڵەحەت و پێویستییەکان ناکەم لە ناخی ماندوومدا کەسێك هەیە کە بێدەنگ نابێت و ڕەخنەی لە بێ پەروایی و نارێك و پێکی هەیە و هەمیشە لە ناڵە و هاوار دایە.

ئەو دەنگە بێدارەی ناخی مرۆڤیش ویژدانی بێداری مرۆڤە، بەم دەربڕینەش مرۆڤ کۆمەڵێ داواکاری ناخی خۆی هەیە، بەڵام کۆمەڵگە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم فەراهەم کردنی ویستەکاندا. شاعیر دەڵێ: سەرباری ئەوەی کە ویستم هەیە، بەڵام لەبەر کۆمەڵگە ناچارم بە چەوتی و خوارییەکانی ڕازی ببم، بەڵام ئەو دەنگە بێدارەی ناخ وازناهێنێت و هەمیشە لە زاری و فەریاد و هاواردایە.

**٥- دلم ز پردە برون شد کجایی ای مطرب**

**بنال هان کە ازین پردە کارما بە نواست**

**دلەم ز پەردە برون شود کوجایی ئەی موتریب، بنال هان کە ئەزین پەردە کاری ما بە نەڤاست.**

دڵم پەردەی داب و نەریتی لادا، ئەی موتریب لە کوێی بناڵێنە، چونکە لەم پەردەیەوە کاری ئێمە ڕاست و ساماندارە.



ز پردە بیرون شد: پەردەی لادا، بێ پەروا و ئازابوو.

بنال: بناڵێنە، گۆرانی خەمبارانە بڵێ، گەرمی کە.

پردە: پەردەی مۆسیقایە، ئاوازی مۆسیقی      بە نواست: ساماندارە، ڕاست و دروستە

شاعیر دەڵێ: دڵم مات و مەلول بوو ئیتر ڕەچاوی داب و نەریت ناکات و پەردەی دڕاندووە ئەی گۆرانیبێژ لە کوێت وەرە و گۆرانییەکی حەزین بڵێ، یاخود بناڵێنە و گەرمی بکە، چونکە کاری ئێمە بەم مۆسیقا و ئاهەنگە سامانێکی دەبێت، یاخود کاری ئێمە بەم شێوەیە و لەم مۆسیقا و پەردەیەوە ڕاست و دروستە. گەر (پردە)ی یەکەمیش بە هەمان مانای دووەم بێت واتە نۆتە و ئاواز ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە: دڵم نارەحەتە و لێدان و ئاوازەکەی لە پەردە لای داوە و ڕێك و پێك لێ نادات و ئاوازەکەی تێکچووە ئەی گۆرانیبێژ کە هەر تۆ دەزانی ئاوازەکان ڕێکخەیتەوە وەرە و ئاوازێکی خەمناك بڵێ تا لێدانەکانی دڵم چاك بێتەوە هەر بەمەش کاری ئێمە ڕێك و پێك و دروست دەبێتەوە. لێرەدا لێدانی دڵی خۆیی بە نۆتەی مۆسیقا چواندووە.

**٦- مرا بە کار جهان هرگز التفات نبوود**

**رخ تو در نظر من چنین خوشش آراست**

**مەرا بە کاری جەهان هەرگز ئیلتیفات نەبوود، روخی تو دەر نەزەری مەن چونین خوشەش ئاراست.**

من هەرگیز تێبینی کاری دونیام نەدەکرد، بەڵام ڕووخساری تۆ ئەوی لەبەر چاوم هێندە جوان ڕازاندەوە کە منی بە ژیان دڵخۆشکردووە.

التفات: سەرنجدان بە میهرەبانی، تێبینی کردن، وردبوونەوە، ئاوڕدانەوە.

آراست: ڕازاندییەوە

لەم بەیتەدا حەزی شاعیر بۆ ئاوڕدانەوە لە دونیا و ژیانی دونیا و جوانییەکانی بە هۆی جوانی ڕووخساری یارەوەیە و دەڵێ: بەرلەوەی کە لەڕووی تۆ ڕابمێنم من دونیا و کاری دونیام پشتگوێ خستبوو و هەرگیز تێبینی کاری دنیام نەدەکرد و ئاوڕم لێ نەدەدایەوە، بەڵام کە ڕووخساری جوانی تۆم لە دونیادا بینی دونیاش لە بەرچاوم ڕازاوە بوو، چونکە ڕووخساری تۆ زۆر بە جوانی دونیای ڕازاندۆتەوە و بە بینینی جوانیی تۆ مەیلم بۆ دونیا و ژیان پەیدابوو.

عارفەکان دونیا بە جیلوەی ئیلاهی دەزانن و پێیان وایە جوانییەکانی دونیا لە جوانییەکانی یارەوە سەرچاوە دەگرێت و دەستەیەکیان هەر بەم هۆیەوە سەیری جوانییەکانی دونیا دەکەن و لە رامان لە دونیا جوانییەکانی یار دەبینن، خواجە لێرەدا ئاماژەیەك بەم بیرە دەکات.

**٧- نخفته‌ام ز خیالی که می پزد دل من**

**خمار صد شبه دارم شرابخانه کجاست**

**نه‌خوفته‌ئه‌م ز خیالی که می په‌زه‌د دلی مه‌ن، خوماری سه‌د شه‌به داره‌م شه‌رابخانه کوجاست.**

له‌تاو خه‌یاڵێك كه به‌رده‌وام له سه‌رمدایه سه‌رانسه‌ری شه‌و نه‌خه‌وتووم، سه‌دشه‌وه له مه‌ی دوورم مه‌یخانه له‌كوێیه.

نخفته‌ام: نه‌خه‌وتووم مى پزد: پێی ده‌گه‌یه‌نێ، ده‌یكات صد شبه: سه‌د شه‌وه

شاعیر خه‌یاڵێك له سه‌ریدا گه‌شه ده‌كات و ئه‌و خه‌یاڵه‌ی شه‌وان خه‌وی له چاوان ده‌تۆرێنی، ئه‌و خه‌یاڵه‌ش گه‌یشتنه به رێبازی عه‌شق هه‌ر بۆیه ده‌ڵێ: خومار و گێژیی سه‌دشه‌وه‌م هه‌یه و سه‌د شه‌وه له شه‌راب و مه‌ی دوورم و حه‌زم له مه‌ستی و عه‌شقه، رێگه‌ی مه‌یخانه‌م پیشان ده‌ن، واته له تاو خه‌یاڵی مه‌یخانه شه‌وانه خه‌وم لێ ناكه‌وێ و سه‌د شه‌وه له مه‌ی دوورم، مه‌یخانه‌م پیشان ده‌ن.

**٨- چنین که صومعه آلوده شد ز خون دلم**

**گرم به باده بشویید حق به دست شماست**

**چونین كه سۆومه‌ئه ئالوده شود ز خونی دله‌م، گه‌ره‌م به باده بشویید هه‌ق به ده‌ستی شوماست.**

ئاوا كه عیباده‌تگا به خوێنی دڵی من پیسبوو، گه‌ر من به مه‌ی بشۆن حه‌ق به ده‌ستی ئێوه‌یه.

صومعه: دێری مه‌سیحییه، به‌ڵام به واتای عیباده‌تگا یان خانه‌قا دێت، لێره‌شدا مه‌به‌ست له مانای دووه‌مه.

آلوده شد: پیس بوو، تێكه‌ڵاوبوو بشویید: بشۆن

ده‌ڵێ: له بینینی ریا و ته‌ڵه‌كه‌بازی و زمانلوسی سۆفییه‌كانی خانه‌قا به شێوه‌یه‌ك دڵم بووه‌ته خوێن و بێزاربووم كه خانه‌قا به خوێنی من پیس بوو، یاخود ماڵراو خوێناوی بوو، بۆیه ئه‌گه‌ر من به مه‌ی بشۆن حه‌قی خۆتانه تا له‌و پیسییه‌ی خوێنه رزگارم بێت.

هه‌روه‌ك له پێشه‌وه ئاماژه‌مان پێدا (مه‌ی) لای حافز واتای عیرفانی هه‌یه و لێره‌شدا به هه‌مان شێوه‌یه و ده‌ڵێ: من له ته‌ڵه‌كه و فێڵی ریاكارانی خانه‌قاكان بێزاربووم و ته‌نیا عه‌شق و دووركه‌وتنه‌وه‌یه له ته‌زویر و ته‌ڵه‌كه ده‌توانێ كاریگه‌ری ئه‌و حاڵه‌ته له‌سه‌رم لابدات، بۆیه ئه‌گه‌ر من به عه‌شق بشۆن حه‌قی خۆتانه تا له بێزاری ئه‌و ریایه رزگارم ببێ.



**٨- از آن به دیر مغانم عزیز می دارند**

**که آتشی که نمیرد همیشه در دل ماست**

**ئه‌زان به ده‌یری موغانه‌م ئه‌زیز می داره‌ند، كه ئاته‌شی كه نه‌میره‌د هه‌میشه ده‌ر دلی ماست.**

بۆیه له عیباده‌تگای زه‌رده‌شتییه‌كاندا خۆشه‌ویستم، چونكه ئه‌و ئاگره‌ی كه ناكوژێته‌وه، هه‌میشه له دڵی من دایه.

دیرمغان: عیباده‌تگای زه‌رده‌شتی نمیرد: نامرێت، لێره‌دا به واتای ناكوژێته‌وه به‌كارهاتووه

به تێبینی كردنی ئه‌وه‌ی كه له ئاگردانی عیباده‌تگای زه‌رده‌شتییه‌كاندا هه‌میشه ئاگر هه‌یه و هه‌رگیز ناهێڵن بكوژێته‌وه و ئاگایان لێی ده‌بێت، شاعیر دڵی خۆی به ئاگردان چواندووه و ده‌ڵێ: ئاگری عه‌شق و تامه‌زرۆیی هه‌میشه له دڵی مندا هه‌ڵكراوه و هه‌رگیز ناكوژێته‌وه و من وه‌ك ماگه زه‌رده‌شتییه‌كان هه‌میشه هه‌وڵی نه‌كوژانه‌وه‌ی ئه‌و ئاگره ده‌ده‌م، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م هۆیه‌یه كه من لای زه‌رده‌شتییه‌كان خۆشه‌ویستم كه منیان خۆش ده‌وێ.

**٩- چه ساز بوود که در پرده می زد آن مطرب**

**که رفت عمر و هنوزم دماغ پر ز هواست**

**چه ساز بوود كه ده‌ر په‌رده می زه‌د ئان موتریب، كه ره‌فت ئومر و هه‌نوزه‌م دیماغ پور ز هه‌ڤاست.**

چ سازێك بوو ئه‌و گۆرانیبێژه له پشت په‌رده‌وه لێ ده‌دا، كه ته‌مه‌نیشم رۆشت و هێشتا ده‌ماغم پڕه له شه‌وق و ئاره‌زوو.

ساز: ساز در پرده: له‌ودیو په‌رده‌وه

مى زد: لێ ده‌دا، ده‌یژه‌ند دماغ: ده‌ماغ، مێشك

جاران ره‌سم وابوو كه له كۆڕی گه‌وره‌كاندا گۆرانیبێژه‌كان له پشت په‌رده‌وه سازیان لێ ده‌دا و ده‌رنه‌ده‌كه‌وتن. دیاره شاعیریش له یه‌كێك له‌و كۆڕانه‌دا بووه و كاریگه‌ریی ئاوازی سازژه‌نه‌كه تا درەنگێ له سه‌ریدا ماوه‌ته‌وه، بۆیه به شێوه‌یه‌كی سه‌رسوڕهێنه‌رانه ده‌ڵێ: ئه‌وه چ سازێك بوو- واته له خۆشی و به‌سۆزیدا وێنه‌ی نه‌بوو - كه ئه‌و سازژه‌نه له‌پشتپه‌رده‌وه له نێو ئه‌و كۆڕه‌دا ده‌یژه‌ند، كه هێنده كاریگه‌ریی له‌سه‌رم هه‌بوو ئێستا پاش تێپه‌ڕینی ته‌مه‌ن هێشتا مێشكم پڕه له تامه‌زرۆیی و ئاره‌زوو. ده‌كرێ (پرده) به مۆسیقاش لێكدرێته‌وه ئه‌وكاته مانای دێڕه‌كه ده‌بێته چ سازێك بوو كه له ئاوازی مۆسیقادا لێ ده‌دا.

**١٠- ندای عشق تو دوشم در اندرون دادند**

**فضای سینهء حافظ هنوز پر ز صداست**

**نیدای ئیشقی تو دوشەم دەر ئەنـدەرون دادەنـد، فـەزای سـینەی هـافز هـەنوز پـور ز سەداست.**

دوێنێ شەو لە ناخمدا بانگی عەشقی تۆیان بڵاوکردەوە، هێشتا بۆشایی سنگی حافز پڕە لـە دەنگدانەوە.

ندا: بانگ، دەنگ و هاوار دوش: شەوی رابردوو اندرون: نـاخ، نـاوەوە

فضای سینە: بۆشایی سنگ، ناخی مرۆڤ صدا: دەنگدانەوە، سەدا

دەڵێ: کاتێ شەوی رابردوو لە ناخمدا بانگی عەشقی تۆیان بڵاوکردەوە هێنـدە کاریگـەریی هەبوو لە سەرم تا ئێستاش ناخ و بۆشایی سینەم پڕە لە دەنگدانەوە و سەدای ئەو عەشقە و تـا ئێستاش ئەو دەنگە لە ناخمدا دەنگدەداتەوە.






## غەزەلی بیست و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- روزه یکسو شد و عید آمد و دلها برخاست**

**می ز خمخانه به جوش آمد و می باید خواست**

**روزە یکسو شود و ئید ئامەد و دلها بەرخاست، مەی ز خومخانە بە جوش ئامەد و مـی بایەد خاست.**

مانگی رەمـەزان تێپـەڕی و جـەژن هـات و دڵـەکان کەوتنـە جـۆش و خـرۆش، مـەی لـە کوپەڵەکاندا هاتە کەفکردن، دەبێ داوا بکرێت.

روزە: رۆژوو، لێرەدا مەبەست لە مانگی رەمەزانە

عید: جەژن برخاستن: جۆش و خرۆش کردن

می زخمخانە بە جوش آمـد: مەی لەکوپەڵەکاندا کەوتە جۆش، واتە شـەرابی سـەرگیراو لـە کوپەڵـەدا کەوتۆتـە کـەفکردن و نزیـك بـە خۆشـبوون و گەیـشتنە و ئامـادەی نۆشـینە

خواستن: داواکردن

لە هاتنی مانگی رەمەزاندا خەڵکی لە مەی دووردەکەونەوە، هەربۆیەش کاتێکی چاکە بـۆ خۆشکردنی شەرابی تازە و سەری کوپەڵەگرتن کە لەوماوەیـەدا بـەرەو خۆشـبوون و پێگەیـشتن دەڕوات، شاعیر لە کۆتایی مانگی رەمەزاندا گوتوویەتی: مانگی رەمـەزان تێپـەڕی و کۆتـایی پێهات و جەژن هات لەم کاتەشدا دڵەکان کەوتنە جۆش و خرۆش یـاخود کەوتنـەوە سەرپێـچی کردن، بەم حاڵەتەش کە دڵەکان کەوتنە جۆش و خرۆش شەرابی نێو کوپەڵەکانیش کەوتنە کەف و کوڵ و گەیشتنی، هەر بۆیەش کۆتایی هاتنی رەمەزان و هاتنی جەژن و گەیشتن و خۆشبوونی شەراب، پێویستە مەی بنۆشرێت.

٢- نوبەء **زهدفروشان گرانجان بگذشت**

**وقت رندی و طرب کردن رندان برجاست**

**نۆوبەیی زوهدفروشـانی گرانجـان بگوزەشـت، ڤـەقتی رەنـدی و تەرەبکـەردەنی رەنـدان بەرجاست.**

نۆرەی زوهد فرۆشانی ئێسکگران تێپەڕی و کاتی رەندی و شادی رەندان لەجێی خۆیەتی و ماوەتەوە.

نوبه/ نوبت: سەرە، نۆرە، بووار                    زهدفرۆشان: زوهدفرۆشان

گرانجان: ئیسکگران، روحگران، لە بەرامبەر روح سووك یاخود ئێسك سووکدا دێت، هەرچەندە لە فارسی نوێدا (گرانجان) بەم مانایە دێت، بەڵام لە کوردیدا بە واتای کەسێکە کە شت بە گران بفرۆشێت، ئاشکرا نییە کە ئەو وشەیە لە سەردەمی کۆنەوە تا ئێستا چۆن گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەڵام لەوە دڵنیایین کە کوردی و فارسی یەك ریشەیان هەیە، جا دەکرێ (گرانجان) هەمان واتای هەبووبێت، چونکە ئاشکرایە زمانی فارسی زیاتر گۆڕانی بەسەردا هاتووە  تا زمانی کوردی کە ئەمەش کۆمەڵێ هۆکاری هەیە و لێرەدا شوێنی باسکردنیان نییە، بەڵام بە هێنانی (زهدفروشان) کە مانای (زوهد فرۆشان) دەگەیەنێ دەکرێ (گرانجان) یش هەمان گرانجانی کوردی بێت، چونکە زۆرێك لە وشە و دەربڕین و ئیدیەمەکانی حافز کە ئێستا لە فارسیدا لێك دەدرێتەوە لە شێوەزاری (جاف)ی کرمانجی خوارودا بە کاردەهێنرێ، هەربۆیە دەکرێ ئەم مانایەشی هەبێت، بەڵام بەپێی زمانی فارسی بێت بە ئێسکگران دێت

بگذشت/ گذشت: تێپەڕی                    برجاست: لە جێی خۆیەتی، واتە تێنەپەڕیوە

دەڵێ: بەتێپەڕینی مانگی رەمەزان سەرە و نۆرە یاخود بوواری ئەو زاهیدە ئێسکگرانانە تێپەڕی کە زوهدیان بە خەڵکی سادە دەفرۆشت — یاخود گەر دروست بێت — سەرەی ئەو زوهدفرۆشە گرانجانانە تێپەڕی کە زوهدیان بە گران دەفرۆشت. واتە سەرباری ئەوەی هیچیان لەباردا نەبوو خۆیان بەگرنگ دەردەخست و خۆیان گران دەکرد.

ئێستا ئیدی تەنیا کاتی رابواردن و مەست بوونی رەندان و عارفان لە ئارادا ماوە و تێنەپەڕیوە.

**٣- چە ملامت بوود آن را کە چنین بادە خورد**

**این چە عیب است بدین بی خردی وین چە خطا است**

**چە مەلامەت بووڤەد ئانرا کە چونین بادە خورەد ، ئین چە ئەیبەست  بەدین بی خیرەدی ڤین چە خەتاست.**

چ جێگەی سەرزەنشتە کە کەسێك بەم شێوەیە مەی بخواتەوە ئەمە چ نەنگییە بەم بێ عەقڵییە و ئەمە چ هەڵەیەکە!.

آنرا کە چنین بادە خورد: ئەو کەسەی کە بەم شێوە بخواتەوە، واتە بەم شێوەیە: بێ فێڵ و ریا یاخود بەبێ ئەوەی ببێتە مایەی ئازاردانی خەڵك بخواتەوە.

خطا: هەڵە، گوناه



لای حافز ئەم بۆچوونە زۆرجاری دیکە دەردەکەوێت کە مەی نۆشی بێ زیان لە زوهد فرۆشی ریاکار و فێڵبازانە و ئازاردانی خەڵکی بە باشتر دەزانێت و لێرەشدا دەڵێ: مەیخواردنەوەیەك کە نەبێتە مایەی ئەوەی خەڵکی ئازار بدات وەك فێڵ و ریا، پێویست بەوە ناکات سەرزەنشتی بکرێت ئەم جۆرە مەیخواردنەوەیەش کە لە عاشقێکی گوێ پێنەدەر بە ئاداب و نەریتدا هەیە نە عەیبە و نە هەڵە و گوناهێکە لێی بگیرێت واتە، مەیخۆری بێ زیان هیچ کات هەڵەیەك یاخود عەیبێك نییە و پێویست ناکات سەرزەنشت بکرێت.

**٣-بادەنوشی کە درو روی و ریایی نبوود**

**بتهر از زهدفروشی کە در او روی و ریاست**

**بادە نوشی کە دەرو روی و ریایی نەبووڤەد ، بیهتەر ئەز زوهدفروشی کە دەر ئو روی و ریاست.**

مەینۆشێك کە ریاکار و ساختەکار نەبێت چاکترە لە زوهد فرۆشێك کە خەریکی ریاکاری و رووکار بازییە.

بادەنوشی: بادەنوشێك، مەیخۆرێك                    دراو: تیایدا

رووی و ریا: ریکاری، ساختەکاری، دووڕوویی                    بهتر: چاکتر

وەك لە بەیتی پێشوودا ئاماژەمان پێدا دەتوانین بڵێین مەسەلەی ریاکاری لای حافز رەتکراوەترین و ناشیرینترین مەسەلەیە و زۆربەی شتە بەناشیرین زانراوەکان لەو بە چاکتر دەزانێ، بۆیە دەڵێ: گەر مەیخۆرێك -کابرایەکی عارەق خۆر- دووڕوو و ریاکار نەبێ چاکترە لە کابرایەکی زاهد کە لە رووکاردا زوهد بفرۆشێ، بەڵام ریاکار و دووڕوو بێت- هەرچەندە لێرەدا مەینۆش بە واتای عارفی راستەقینە و زوهدفرۆشیش زاهیدی سەرزارییە-"چونکە گوناهی مەیخۆری گوناهێکە کە بە تۆبە پاکایی دێت، بەڵام ریا کوفرە و بە تۆبە ناسڕێتەوە {سودی، ج١، ل١٧٣}.

**٥- ما نە مردان ریاییم و حریفان نفاق**

**آنکە او عالم سرّست برین حال گواست**

**ما نە مەردانی ریاییم و هەریفانی نیفاق، ئانکە ئو ئالیمی سیرەست بەرین هال گەڤاست.**

ئێمە پیاوی ریاکاری و هاوڕێی دووڕوویی نین، ئەو کەسەی کە ئاگاداری نهێنییە شاراوەکانە گەواهی ئەم حاڵەتەیە.

عالم سر:  ئاگاداری نهێنی، خودا                    برین/ براین: لەسەر ئەم حاڵە، بەم حاڵە

واتە خودای گەورە کە زانستی بەسەر هەموو شاراوەکانەوە هەیە، ئاگاداری نهێنییەکانی ناخی ئێمەیە و چاك دەزانێ و گەواهە لەسەر ئەوەی کە ئێمە خەریکی ریاکاری نین و تەنانەت دۆستی دووڕوویش نین، واتە ئێمە ریاکار و دووڕو و نین و خودا خۆی شاهێدە.

**٦- فرض ایزد بگزاریم و به کس بد نکینم**

**و آنچه گویند روا نیست نگوییم رواست**

**فەرزی ئەیزەد بگوزاریم و بە کەس بەد نەکونیم، ڤانچە گویەند رەڤا نیست نەگوییم رەڤاست.**

فەرزەکانی خودا بەجێ دەهێنین (و بهێنین) و خراپە لەگەڵ کەسدا ناکەین و، هەرچیی کە دەڵێن رەوا نییە ئێمە نەڵێین جایز و رەوایە.

فرض: فەرز، واجب، ئەوەی خودا فەرزی کردووە لەسەر بەندە.

ایزد: یەکێکە لەناوەکانی خودا لە فارسیدا　　بگزاریم: بەجێ بهێنین

بد: خراپە　　گویند: دەڵێن　　روا: رەوا، جایز

دەتوانرێت بەیتەکە بە رێژەی هەواڵدان و یاخود بە رێژەی ئینشائی (فەرماندان و نەهی کردن) لێکدرێتەوە. لە یەکەمیاندا دەبێتە:

فەرزەکانی خودا بەجێ دەهێنین و خراپە لەگەڵ کەسدا ناکەین و هەرچییەکیش کە شەرع قەدەغەی کردووە ئێمە حەڵاڵ و رەوای ناکەین. هەروەها لە دووەمیاندا: فەرزەکانی خودا بەجێ بهێنین و خراپە لەگەڵ کەسدا نەکەین و هەرچییەکیش کە شەرع قەدەغەی کردووە ئێمە حەڵاڵ و رەوای نەکەین.

هەرچەندە (هروی و سودی)ش تەنیا لێکدانەوەی یەکەمیان بۆ بەیتەکە کردووە، بەڵام بە بۆچوونی بەندە دەکرێ خوێندنەوەی دووەم راستتر بێتە بەرچاو، هەرچەندە ئەو سەروەرانە زۆر لە ئێمە وردتر بوون. بە هەرحاڵ بەیتەکە ئاماژە بەو کەسانە دەکات کە حەرامکراوەکانی خودا بۆ خۆیان یان بۆ خەڵکانی دیکە حەڵاڵ دەکەن و فتوای نادروستیان بۆ دەدەن و بەپێی بەرژەوەندی تەئویلی نادروستی بڕیارەکانی شەرع دەکەن، شاعیر دەڵێ: ئێمە دووکاری جەوهەری و گرنگی ئایین ئەنجام دەدەین کە فەرزەکانە و خراپەنەکردنە لەگەڵ تەواوی خەڵکیدا واتە چاکە لەگەڵ خەڵکیدا دەکەین و هەرگیز فتوای درۆ و بەرژەوەندی خوازی نادەین و حەرام حەڵاڵ ناکەین، یاخود با بەم شێوەیە بژین و فەرزەکان بکەین و خراپە لەگەڵ کەسدا نەکەین و حەرام حەڵاڵ نەکەین کە ئەمەی دوایی دەبێتە مایەی ئاژاوەنانەوە و تەنانەت خوێنڕێژیش کە لە بەیتی دواییدا ئاماژەیەکی لێڵ بەم کارەساتە دەدات.



**٧- چە شود گر من و تو چند قدح بادە خوریم**

**بادە از خون رزانست　نە از خون شماست**

**چە شەڤەد گەر مەن و تو چەند قەدەھ بادە خوریم، بادە ئەز خونی رەزانەست نە ئەز خونی شوماست.**

چی دەبێت گەر من و تۆ چەند پێك شەراب بخۆینەوە، شەراب لە خوێنی رەزانە　نە لە خوێنی ئێوەی مرۆڤ.

چەشود: چی دەبێت　　قدح: پێك، جام، پیاڵە　　خون: خوێن

رزان: رەزان، کۆی رەزە کە بە واتای مێو دێت　　خون رزان: خوێنی رەزان کە مەبەست لە شەرابە　　شما: ئێوە، مەبەست لە مرۆڤە

مانای ئەم بەیتە لە کۆتایی بەیتی پێشەوە دەست پێدەکات کە تیایدا فەرزەکانی بەجێ دەهێنا و خراپەی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد و حەلاڵی حەرام نەدەکرد کە دەبووە مایەی ئاژاوە و ئازاردانی خەڵکی. لێرەدا دەڵێ چی دەبێ　مەی بنۆشین دەرهەق بە خودی خۆمان دەیکەن و خوێنی کەس نارێژین، کاری دژوار و پڕ لە نارەحەتی ئەوەیە کە خوێنی خەڵکی بڕێژین.

ئەم بەیتە دەکرێ بەرامبەر بەو کەسانە بێت کە خوێنخۆرن و ئەم خوێنڕشتنەش حەڵاڵ دەکەن و بەدرکە پێیان دەڵێ ئێمە خوێنخۆرنین لە خوێنی رەگەزی ئێوە — مرۆڤ — بخۆینەوە، ئێمە خوێنی رەز دەخۆینەوە ئەگەر چەند پێکیکیش مەی بخۆینەوە گوناهی خوێنڕشتنمان لەسەر نییە.

**٨- این چە عیبست کز آن عیب خلل خواهد بوود**

**ور بوود نیز چە شد مردم بی عیب کجاست**

**ئین چە ئەیبەست کزان ئەیب خەلەل خاهەد بوود ، ڤەر بووڤەد چە شود مەردومی بی ئەیب کوجاست.**

ئەمە ـ مەینۆشی ـ چ عەیبێکە ببێتە هۆی فەساد و خراپەکاری، ئەگەر بووە هۆی فەسادیش چ گرنگییەکی هەیە، مرۆڤی بێ عەیب لە کوێیە ـ ئێمە هەمووان عەیبمان هەیە ـ.

این: ئەمە، ئاماژە بە عارەقخۆرییە　　خلل: فەساد وتێکدان یاخود تەفرەقە

ور/واگر: (ر) کورتکراوەی ئەگەرە　　نیز: هەروەها　　مردم: خەڵك، مرۆڤ　　بی عیب: بێ کەم وکوڕی

دێڕی یەکەم لە شێوەی پرسیاردا هاتووە و مەبەست لێی کە ئەم عارەقخۆری و مەینۆشییە کەم وکورتی و عەیبێ نییە کە ببێتە هۆی فەساد و تەفرەقە یاخود کە ببێتە

هۆی ئازاردانی خەڵكانی دیكـە، ئەگـەر ئـەم عەیبـەش هـەبێت و ببێتـە مایـەی فەسـاد و خراپەكاری نێوان خەڵكان ئەوا چ گرنگییەكی نییە و هەرشتە و هەركەسە عەیبێكی هەیە با ئەمەش عەیبـی مەینۆشی بێت.

لەم غەزلەدا چەندین كاری مرۆڤ بە مەیخۆری بەراوردكراوە كە هەر هەموویان لـە مـەیخۆری خراپترن و مەیخۆری بە چاكە باسكراوە، ناكرێ كەسێكی وەك حافز مەدح و ستایشی دیاردەیەك بكات كە حەرامكراوە و خودی خۆشی لە بەیتێكدا دەڵێ نابێ حەرام حەڵاڵ بكەین، بەڵكو ئەم جۆرە باسكردنە بۆ سووككردنی دیاردەكـەی دیكەیـە كـە لـە نێـو كۆمەڵگـەدا هـەبووە و لـە مەیخۆری ناشیرین و خراپتر بووە، شاعیر دەیەوێ بڵێ ئەو مەیخۆرییەی كە هەمووان بە عـەیب و فەسادی نێو كۆمەڵگەی دەبینن زۆر لە دیاردەكانی دیكەی وەك خراپەكردن لەگەڵ خەڵكی، ریـا و فێڵ و فریو، خوێنرێژی و حەرام و حەڵاڵكردن و نیفاق و دووڕوویی بێ زیانترە و ئەوانی دیكـە خراپترن و زیانیان لە نێو كۆمەڵگەدا دەبێت و دەبنە مایەی خراپەكاری.

وەك دەردەكەوێ لە نوسخەی (د. عیوضی، عەلامـە قزوینـی و د. غنـی) و هـەروەها (د. هروی)شدا (بیت تخلص) نەهاتووە كە دیاردەیەكی نایابـە و زۆر بەكـەمی لـە غەزەلـدا بـەدیار دەكەوێت هەروەها لە خودی حافزیشدا ئەم دیاردەیە كەم بەرچـاو دەكـەوێت، بـەڵام سـودی لـە شەرحەكەی خۆیدا بەیتی تەخەلوسی هێناوە هەروەها لە نوسخەی (فریدون میرزای تیموری)شدا ئەم بەیتی تەخەلوسە هەیە، كە بریتی یە لە:

حافظ از چون و چرا بگـذر و می نوش دمـی - نـزد حكمـش چـه مجـال سـخن و چـون و چراست

واتە: حافز واز لە چۆن و بۆچی بهێنە و ساتێك مەی بنۆشە كە لە بەرامبەر حوكمی ئـەودا - خودا - بوواری قسەی چۆن و بۆچی نییە.

بەڵام لە بەر ئەوەی ئێمە لێرەدا پەیڕەوی لە نوسخە ساغكراوە و رەسەنەكان دەكـەین ئـەم بەیتەمان لەگەڵ غەزەلەكەدا نەهێنا، چونكە نوسخەی (سودی) و (تیموری) لە سـاغكردنەوەی غەزەلەكاندا نابنە سەرچاوەی رەسەن، لەم غەزەلەدا نوسـخەی(د. هـروی)یـش جیـاوازی زۆری لەگەڵ نوسخە رەسەنە كۆنەكاندا هەیە بۆیە زیاتر پـشتمان بـە نوسـخەی (د.رشـید عیوضـی) بەستووە{د. رشید عیوضی، دیوان حافظ، تهران، ١٣٧٩}.





## غەزەلی بیست و شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- دل و دینم شد دلبر به ملامت برخاست**
**گفت با ما منشین کز تو سلامت برخاست**

**دل و دینەم شود دولبەر بە مەلامەت بەرخاست، گفت با ما مەنشین کز تو سەلامەت بەرخاست.**

دڵ و دینم لەدەستدا و دولبەر دەستیکرد بە سەرزەنشتم، گوتی لەگەڵ ئێمەدا دامەنیشە کە سەلامەتیت لەدەستداوە.

برخاستن: هەستان، وەستان، بێداربوونەوە، هەڵهاتن، بەڵام بە چەندین واتای جیاواز بەکارهاتووە، لە میسراعی یەکەمدا بە واتای دەستپێکردن دێت و لە میسراعی دووەمدا بە مانای لەدەستدانە    با ما: لەگەڵ ئێمە    منشین: دامەنیشە، لێرەدا واتە: لەگەڵمان مەژی، هاوژیانمان مەبە

سلامت: ژیانی ئارام و بێ کەڵکەڵە لە بەرامبەر عەشق و وێرانییەکانی عەشقدا بەکاردێ

دەڵێ: لە ئەنجامی عەشقدا دڵ و دینم لەدەستداوە، دڵم لەدەستدا واتە لە رووی سۆز و عاتیفەوە دیلی جوانییەکان بووم، دینم لەدەستدا، واتە لە لایەنی تەقوا و خۆپارێزی و دوارۆژ و بەهەشت و دۆزەخەوە سزاکانی دۆزەخم قەبووڵ کرد، لەگەڵ ئەمەدا یاری دولبەر، کە خۆی بووە مایەی لەدەستدانی دڵ و دینم و خۆی ئەو دووانەی لێ سەندم، وتی لەگەڵ مندا مەژی، چونکە کەسێ کە دڵ و دینی خۆی لەدەستدابێت مرۆڤێکی تەواو و سالم نییە و توانای ژیانێکی ئارامی نابێت، مەسەلەی (ملامت و سلامت) ئاماژەیەکی تێدایە بۆ دروشمی دیاری (ملامەتییە)کان کە رەفتار و دەرەوەیان مایەی سەرزەنشت بوو و دڵیان پاك و خاوێن کە گوتراوە: (مەلامەتییە تەرکی سەلامەتە). مەیلی شاعیر بۆ لای رێبازی مەلامەتییە دەردەخات لە زمانی یارەوە دەڵێ: ئێستا کە مەیل و ئارەزووی رێبازی مەلامەتییەکانت هەیە، ئیتر ئەهلی ژیانی سالم و ئارام نیت.



**٢- که شنیدی که درین بزم دمی خوش بنشست**
**که نه در آخر صحبت به ندامت برخاست**

**کی شەنیدی کە دەرین بەزم دەمی خوش بنشەست، کە نە دەر ئاخەری سوهبەت بە نەدامەت بەرخاست.**

کەی بیستت (گوێت لێبوو) کە کەسێك لەم کۆڕی بەزمەدا ساتێکی بەخۆشی گوزەراند و لە کۆتاییدا بە پەشیمانییەوە لە مەجلیس هەڵنەستا.

شنیدی: بیستت    بزم: کۆڕی بەزم و شادی، مەبەست لە دونیایە
بنشست: دانیشت، واتە گوزەراندی و بەسەری برد    صحبت: هاودەمی
ندامت: پەشیمانی    برخاست: هەستا

حافز دنیا بە سووك دەزانێت و دەڵێ: تا ئێستا تۆ لە کەست نەبیستووە کە بۆ ساتێك لە دنیادا و لە هاودەمی لەگەڵ دنیا بە خۆشی ژیانی بەسەر بردبێت دوایی پەشیمان نەبووبێتەوە لە کۆتاییدا دنیا ئەو خۆشییەی لێ نەکردبێت بە ناخۆشی، واتە دنیا هەرگیز خۆشی تێیدا نییە و گەر بۆ ساتێك بەخۆشی بژی ئەوا کۆتایی ئەو ساتە خۆشییە هێندە نارەحەتی دەبینی پەشیمان دەبیتەوە لەو خۆشییەی کە لەگەڵ دنیا بینیت.

**٣- شمع اگر زان رخ خندان به زبان لافی زد**
**پیش عشاق تو شبها به غرامت برخاست**

**شەمع ئەگەر زان روخی خەندان بە زەبان لافی زەد، پیش ئوششاقی تو شەبها بە غەرامەت بەرخاست.**

گەر مۆم بە زمانی خۆی لە بەرامبەر لێوی بە خەندەی تۆدا لافی لێدا، لە بەردەم عاشقەکانی تۆدا شەوان و بە رێورەسمی (سزادان)غەرامەت بە پێوە وەستا.

رخ خندان: رووخساری بەخەندە، بەڵام لێرەدا بە لێو لێکدراوەتەوە، چونکە لێوی بە خەندە (لێوبەخەندە) سیفەتێکی جوانی یارە.

زبان: زمان، لێرەدا مەبەست لە (زبان شمع) زمانی مۆم، فتیلە یاخود دەزوە. لافی زد: لافێکی لێدا، بە زمان لاف لێدانی مۆمیش لە بەیتەکەدا واتە لە بەرامبەر لێوی خەندەباری یاردا مۆم بە نیشاندانی رووناکی خۆی لافی لێدا، کە تیشکی مۆم بە لێوی سووری یار و لەرزینی گڕەکەش بە خەندە چوێنراوە.

پیش: لای، لە بەردەم    شبها: شەوان

غرامت: له زماندا به واتای سزادان و دۆڕاندن و تاواندانەوەی ئەو یاخود قەرەبووکردنەوە دێت و له زاراوەی سۆفیگەریدا ڕێوڕەسمێکی تایبەتی بووە، ئەو سۆفییەی کە لە قۆناغەکانی تەریقەت (سیر و سلوك)دا هەڵەیەکی دەکرد یاخود تووشی لەڕێلادانێك دەبوو، دەبووایە بۆ قەرەبووکردنەوە و سزای ئەو هەڵەیە لەبەردەم ئەوانی دیکەدا لەسەر یەك قاچ ڕاوەستایە.
برخاست: هەستا

شاعیر دەڵێ: ئەگەر مۆم بە زمانی خۆی لە بەرامبەر لێوی سووری خەندە باری یار و مەعشوقدا لافێکی جوانی لێداوە کە خەندەی ئەو وەك خەندەی لێوی مەعشوق جوانە، هەڵەیەکی گەورەی کردووە و لەبەر ئەم هەڵەیەش بە ڕێوڕەسمی سۆفییەکان دەبێ قەرەبووی بکاتەوە هەربۆیەشە کە شەوان لە بەردەم عاشقانی تۆدا وەك سۆفیی تاوانبار لەسەر یەك قاچ وەستاوە.

**٤- در چمن باد بهاری ز کنار گل و سرو**

**به هواداری آن عارض و قامت برخاست**

**دەر چەمەن بادی بیهاری ز کیناری گول و سەرڤ، بە هەڤاداریی ئان ئارز و قامەت بەرخاست.**

لە باغدا بای بەهاری بە تامەزرۆیی گەیشتن بەو رووخسار و باڵایە لەلای گوڵ و دارسەرو هەستا.

عارض: رووخسار هواداری: تامەزرۆیی، لایەنداری برخاست: هەستا، لێرەدا بەمانای هەڵکردن دێت یاخود بەجێهێشتن، لە کوردیشدا هەستان بە مانای بەجێهێشتن دێت، وەك هەستان لە مەجلیس یاخود لە مەجلیسەکە هەستا واتە مەجلیسەکەی بەجێ هێشت.

لەم بەیتەدا لە نێوان گوڵ و دارسەروی میسراعی یەکەم و (عارض و قامت)ی میسراعی دووەمدا (پێچان و کردنەوەی ڕێك- لف و نشری مرتب) هەیە.

دەڵێ: بای بەهاری لە بەر تامەزرۆیی گەیشتن بە رووخسار و قەد و باڵای یار لەلای گوڵ و دارسەرو هەستا و بە جێیهێشتن. واتە: رووخسار و باڵای یاری لە گوڵ و دارسەرو بە جوانتر و ڕێکتر زانی.

**٥-مست بگـذشتی و از خلوتیان ملکوت**

**به تماشای تو آشوب قیامت برخاست**

**مەست بووگزەشتی و ئەز خەلڤەتیانی مەلەکوت، بە تەماشای تو ئاشوبی قیامەت بەرخاست.**



بە مەستی تێپەڕیت و بۆ تەماشاکردنی تۆ لە فریشتەکانی ئاسمانەوە ئاژاوە و ئاشوبی هەروەك ئاشوبی رۆژی قیامەت هەستا.

خلوتیان: خەڵوەتگەران

ملکوت: گەورە، جیهانی نادیار، بە مەقامی فریشتە جیهانی نادیار دەگوترێ خلوتیان ملکوت: خەڵوەتگەرانی مەلەکوت درکەیە لە فریشتە برخاست: بەرپابوو، بەرزبۆوە

لەگەڵ ئەوەدا کە فریشتەکان خۆیان ڕەمز و سومبولی جوانین، هەموو کەسێ ئارەزووی تەماشاکردنی ئەوانی هەیە، دەڵێ کاتێ تۆ بە مەستیی تێپەڕیت ئەوەندە جوان بوویت و جێگەی سەرنج بوویت کە فریشتەکان بۆ تەماشای تۆ کردیانە هاوار وەك ڕۆژی حەشر وابووە.

**٦- پیش رفتار تو پا برنگرفت از خجلت**

**سرو سرکش که به ناز قد و قامت برخاست**

**پیش ڕەفتاری تو پا بەر نەگرفت ئەز خیجلەت، سەرڤی سەرکەش کە بە نازی قەد و قامەت بەرخاست.**

دارسەرووی سەرکەش کە بە قەد و باڵای خۆیدا دەینازی لە بەرامبەر ڕەوتی تۆدا هەنگاوی هەڵنەهێنا.

ڕەفتار: ڕەوت، چۆنییەتی بە ڕێگادا ڕۆشتن از خجلت: لەخەجاڵەتیدا، لەشەرمدا
پا برنگرفت: پێی نەگرت، هەنگاوی نەنا، هەنگاوی هەڵنەهێنا سرکش: سەرکێش، سەربڵند

ڕەوتی یار هێندە جوانە کە لە وێنەی نییە، دارسەرووی سەرکەش بە باڵای بەرزی خۆی کە بە جوانی قەد و باڵای خۆیدا دەینازی لە بەرامبەر ڕەوتی جوان و سەرنجڕاکێشی یاردا هێندە خەجاڵەت بوو کە لە شوێنی خۆیدا وەستا و هەنگاوی هەڵنەهێنا یاخود پێی نەگرت و توانای ڕۆشتنی نەما، لێرەشدا لای شاعیر بۆیە دارسەروو ناتوانێت بڕوات، چونکە ڕەوتی ئەو لە بەرامبەر ڕەوتی یاردا ناشیرین بووە.

**٧- حافظ این خرقه بینداز مگر جان ببری**

**کاتش از خرمن سالوس و کرامت برخاست**

**هافز ئین خیرقە بیەنداز مەگەر جان ببەری، کاتەش ئەز خەرمەنی سالوس و کەرامەت بەرخاست.**

حافز ئەم خیرقەیە لە بەر داکەنە و بیخە لاوە، بەڵکو گیان بە سەلامەت دەرکەیت، چونکە ئاگر بەر بۆتە خەرمانی فریوکاری و کەرامەتەوە.

بینداز: بیخەلاوە، دووری بخەرەوە        مگر: لێرەدا بەواتای (بەڵکو) هاتووە
جان بری: گیان دەرکەیت، واتە ساغ و سەلامەت بیت        آتش: ئاگر        خرمن: خەرمان        سالوس: کەسێ کە بە زمانلوسی و زوهد و چاکە خەڵك فریو بدات، هەروەها بە واتای زمانلوسی، ماستاوکردن، خەڵەتاندن دێت   کرامت: کەرامەت، ئەو کەراماتانەی کە سۆفییەکان ئەنجامی دەدەن و خویان پێوە نەگیراوە وەك چاککردنەوەی نەخۆش و هتد. کەشف و کەراماتیشی پێدەوترێ.    برخاست: بەرزبۆوە، بەربووە.

وەك تێبینی دەکرێت  شاعیر (سالوس و کرامت)ی وەك هاووات و موراديف هێناوە بەمەش کەراماتی بەجۆرێك لە فریوکاری و هەڵخەڵەتاندن داناوە، بە خۆی دەڵێ: حافز ئەم خرقەیە کە نیشانەی سۆفیگەرییە لەبەری خۆت داکەنە، تا بەڵکو یاخود رەنگە گیان بە سەلامەت دەرکەیت و نەجاتت ببێ لە عەزاب، چونکە نمایش و خۆدەرخستنی درۆیینەی سۆفییەکان بە ناوی کەشف و کەراماتەوە زۆربووە و وەك خەرمانێکی لێهاتووە، کە لەم خەرمانە گەورەی ریاکاری سۆفییەکانەوە ئاگر هەڵدەستێ. یاخود ئاگر بەربۆتە خەرمانی ریاکاری سۆفییەکان و سۆفییەکان دەسووتێنێ، گەرتۆش لەم خیرقەیەدا بمێنیتەوە لەسەر ریاکاری و فریودانی خەڵکی بەردەوام بیت ئەو ئاگرە تۆش دەسووتێنێ.

دەکرێ مەبەست لە ئاگر ئەوەبێت کە ریاکاری و فریودان دەبێتە مایەی چوونە جەهەنم ئەی حافز تۆ واز لەم کارانە بهێنە تا لە دەست جەهەنم رزگارت ببێ.



## غەزەلی بیست و حەوتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی کەفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- باغ مرا چه حاجت سرو و صنوبر است**

**شمشاد خانه‌پرور من از که کمتر است**

**باغی مەرا چە هاجەتی سەرڤو سنەوبەرەست، شمشادی خانەپەرڤەری مەن ئەز کی کەمتەرەست.**

باخی من چ پێویستییەکی بەدرەختی سەرو و سنۆبەر هەیە، شمشادی نازپەروەری من لەکێ کەمترە.

سرو و صنوبر و شمشاد: هەرسێکیان سێ درەختی بەژن رێك و بالآبەرزن کە لە بەژنرێکیدا بالآی مەعشوقیان پێ دەچوێنرێت لێرەدا (سەرو و سنۆبەر) سروشتین و مەبەست لە شمشاد یاری بەژن رێکە.

خانه پرور: پەروەردەی ماڵ، بەناز، نازپەروەر.

شمشاد خانەپرور: یارێك کە بەنازبووە و لە ماڵەوە پەروەردەکراوە و کەس نەیدیوە.

دەڵێ: من بەبوونی یاری بالآشمشادی خۆم کە لە ماڵەوە بەناز پەروەردەکراوە پێویستم بەوە نییە کە درەختی سەرو و سنۆبەر لە باخەکەمدا هەبێ، من لە جیاتی ئەوەی بچمە نێو باخەوە لە ماڵەکەی خۆمدا بە بینینی قەد و بالآی مەعشوقم چێژ وەردەگرم.

**٢- ای نازنین صنم تو چه مذهب گرفته‌ای**

**کەت خون ما حلال تر از شیر مادر است**

**ئەی نازەنین سەنەم تو چە مەزهەب گرفتەیی، کەت خونی ما هەلالتەر ئەز شیری مادەرەست.**

ئەی بتی نازدار تۆ چ ئایینێکت هەیە، کە تیایدا خوێنی ئێمەی لە شیری دایك حەڵاڵتر کردووە.

نازنین: بەناز، نازدار        صنم: بت، درکەیە لە یار و مەعشوق
مذهب: ئایین، شێواز        کەت: کە بۆت، لات
خون: خوێن        شیر: شیر        مادر: دایك

حلالتر از شیر مادر: حەڵاڵتر لە شیری دایك، بە شتێ دەگوترێ کە ئەنجامدانی زۆر مۆڵەتپێدراو و حەڵاڵ بێت و هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نەبێ، وەك چۆن شیری دایك بۆ منداڵەکانی حەڵاڵە، بەڵام ئەم حەڵاڵەی لەگەڵ خوێندا بەراورد کردووە کە خواردنی یاخود رژاندنی خوێنی موسوڵمان بە بێ بیانوو حەرامە، دیارە بەمەش تۆ موسوڵمان نیت و ئایینێکی دیکەت هەیە، بۆیە دەڵێ:

ئەی بتی نازدار کە هێندە جوانی مایەی پەرستنی، تۆ چویتە سەر چ دینێك یاخود پەیڕەوی لە چ مەزهەب و دینێ دەکەی کە تیایدا خواردنی خوێنی ئێمە یاخود رژاندنی خوێنی ئێمەی بۆ حەڵاڵ کردوویت و هیچ گومانی تێیدا نەهێشتووە، وەك حەڵاڵی شیری دایك بۆ منداڵەکانی.

**٣- چون نقش غم ز دوور ببینی شراب خواه**

**تشخیص کردەایم و مداوا مقرّر است**

**چون نەقشی غەم ز دوور ببینی شەراب خاه، تەشخیس کەردەییم و موداڤا موقەررەرەست.**

کاتێ تارمایی خەم و خەفەتت لەدوورەوە بینی داوای مەی بکە، نەخۆشییەکەمان دەستنیشانکردووە و چارەسەرەکەش دیارە.

نقش: وێنە، نەخش، تارمایی　　　دوور: دوور　　　خواه: داوا بکە

تشخیص کردەایم: دەستنیشانمانکردووە، دۆزیومانەتەوە　مداوا: چارەسەر　　مقرر: دیار، ئاشکرا　　تشخیص و مداوا دوو زاراوەی پزیشکین.

دەڵێ: کاتێ لە دوورەوە هەست بە نیشانەکانی خەم و خەفەت دەکەیت یەکسەر پەنا بۆ شەراب و مەی(عەشقی حەق) ببە و داوای بکە، چونکە ئێمە چاك دەزانین و نەخۆشی خەممان دەستنیشانکردووە و چارەسەرەکەشی تەنیا مەی و شەرابە. جا بۆیە هەرکە بینیت داوای چارەسەرەکە بکە.

**٤- از آستان پیر مغان سر چرا کشیم**

**دولت درین سرا و گشایش درین در است**

**ئەز ئاستانی پیری موغان سەر چرا کەشیم، دۆولەت دەرین سەراڤو گوشایش دەرین دەرەست.**

بۆچی لە ئاستانە و بەردەرگای پیری موغان سەربکێشمەوە، بەخت و ئیقبال لەم خانووەدایە و حەل و کردنەوەی گرفتەکانیش لە دەرگای ئەم خانووەدایە.



پیرمغان: پیری نورانی، پیری مەیفرۆش　　چرا: بۆچی　　سرکشم: سەربکێشمەوە

دولت: بەخت و ئیقبال　　　گشایش: شیکارکردن، کردنەوە، حەلکردن　　سرا: سەرا، خانوو، ماڵ　　　　در: دەرگا

دەڵێ: بۆچی گوێڕایەڵی بڕیارەکانی پیری نورانی و عاشق نەبم و سەرپێچی بکەم، چونکە بەخت و خۆشبەختی لەم خانووەوەیە و حەلی گرفتی کاری ئێمەش لە دەستی ئەودایە.

(گشایش درین در است) بە واتای ئەوەش دێ کە دەرگای پیری عاشق و نورانی هەمیشە بە رووی ئێمەدا کراوەیە.

**٥-یک قصه بیش نسیت غم عشق و این عجب**

**کز هرکس که می شنوم نامکرر است**

**یەك قیسە بیش نیست غەمی ئیشق و ئین ئەجەب، کز هەرکەس کە میشنەڤەم ناموکەرەرەست.**

خەمی عەشق لە چیرۆکێك زیاتر نییە، بەڵام سەیر ئەوەیە کە لە هەرکەسێکی دەبیستم دووبارە نییە.

قصە: چیرۆك　　　بیش: زیاتر　　　این عجب: سەیرلەوەدایە، ئەمە سەیرە

می شنوم: دەیبیستم، گوێم لە باسی دەبێ　　　نامکرر: دووبارە نەبوو

دەکرێ ئەم بەیتە لە ژێر رۆشنایی میتۆدە نوێیەکانی رەخنەدا خوێندنەوەی بۆ بکرێت ئاماژە بە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ دەکات. لە میتۆدی بوونیادگەرییدا دوو ئاست بۆ هەر چەمك و شتێك دانراوە، کە ئاستی قووڵ و ئاستی رووکەشن و بە (معقول و محسوس) دەدرێنە قەڵەم، ئاستی قووڵ یاخود معقول هەستی پێناکرێ و تەنیا دەرك دەکرێت، سیمایەکی دیار و گرنگی ئەم ئاستە لەوەدایە کە نەگۆڕە و شێوەی جۆراوجۆر وەرناگرێت و بە گۆڕانی شوێنکات گۆڕانی بەسەردانایەت، بەڵام رووکەش یاخود هەستپێکراوەکان ئەو ئاستەیە کە بە هەستەکان هەستی پێدەکرێت و بە شێوە و روویەك بۆ ئاستی یەکەم دەدرێتە قەڵەم، سیمای دیاری ئەم ئاستە گۆڕان و بەردەوامی گۆڕانە و بە گۆڕانی شوێنکات شێوەی جیاوازی ئەم ئاستە دەردەکەوێت و لە هەر بارێکیشدا شێوەکان جیاوازن لە یەکتری، بەم میتۆدەوە دەکرێ مانایەکی قووڵ لەم بەیتە هەڵێنجین، شاعیر پێیوایە کە غەمی عەشق و ئەحواڵەکانی عەشق لە ئاستی قووڵدا یەك چیرۆك زیاتر نییە و جێگیر و نەگۆڕە، بەڵام ئەم حاڵ و ئەحواڵانەی عەشق شێوەی جیاوازیان هەیە و لە هەر شوێنکات و لای هەرکەسێك گۆڕانی بەسەردا دێت و دووبارە نابێتەوە.

گەر غەمی عەشق بە یارەوە پەیوەست بکەین و بچینە سەر رایەکەی (سودی) کە پێیوایە لەبەر ئەوەی مەعشوق یەکە هەر بۆیە غەمی عەشق و ئەحواڵی عەشق یەکێکە، بەڵام لەبەر ئەوەی عاشقان لە ژمارە نایەن و هەر عاشقەش ئەم غەمە بە جۆرێك دەردەبڕێت، چونکە یار و مەعشوق لەگەڵ هەر یەکێك لە عاشقاندا بە شێوەیەك مامەڵە دەکات، واتە بە ژمارەی ئەوەی کە عاشقان زۆرن دەرکەوتن و جیلوەگرتنی مەعشوقیش بێ شومار و زۆر دەبێت و بەمەش لای هەر عاشقێك بە رادەی ئامادەیی ئەو جیلوە دەگرێت و ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە غەمی عەشق لای عاشقان دووبارە نەبێت{سودی، ج١، ل٢٨١ } ئەم واتایە ئاماژەیە بە فەرمودەی قودسی (انا علی ظن عبدی بی)واتە: "من لەسەر گومانی بەندەکەمم بە من"

بەمە خودای گەورە کە یەکێکە بە پێی گومانی ئێمە جیلوە دەگرێت و لە دەروونی ئێمەدا خۆی نمایش دەکات.

(جانان) لای سودی لە مانا عیرفانییەکەیدا خودایە کە لە کاتێکدا یەکێکە و هاوتای نییە تەجەلی و جیلوەگرتنی لای عارفان یاخود چیرۆکی خەمی عەشقی خودایی لای عارفان جودایە و دووبارە نییە.

(د. هروی) بۆ واتای واقیعی بەیتەکە چووە و دەڵێ: واتە عەشق لە بنەڕەتدا چیرۆکێکی خەمهێنەرە بە یەك بابەت، بەڵام هەرکەسێك بە شێوەیەکی جیاواز دەیگێڕێتەوە بە شێوەیەك کە دووبارە و بێزارکەر نییە، واتە لەسەر بنچینەی خەمی عەشق چیرۆکی جیاواز دەچنرێ کە بەبێ بێزاری گوێ لە هەموویان دەگیردرێ{هروی، ج١، ل١٣٠}. بەڵام لەراستیدا بە لەبەرچاوگرتنی قووڵی واتا لای حافز ناکرێ بەم سەرپێییە ئەم بەیتە لێکدرێتەوە، بەڵکو واتاکەی زۆر لەوە قووڵترە و لە سەرەوە ئاماژەیەکمان پێکرد.

**٦- دی وعده داد وصلم و در سر شراب داشت**

**امروز تا چه گوید و بازش چه در سراست**

**دی ڤەئدە داد ڤەسلەم و دەر سەر شەراب داشت، ئیمروز تا چە گویەد و بازەش چە دەر سەرەست.**

دوێنێ لەکاتێکدا سەری بە شەراب گەرم بوو بەڵێنی دیداری بە مندا، بزانین ئەمڕۆ چی دەڵێت و دووبارە چیی لە سەر دایە.

دی/ دیروز: دوێنێ وعدەداد وصلم: بەڵێنی وەسڵی پێدام در سر شراب داشت: شەرابی لە سەردا بوو، لە کوردیدا لە بەرامبەر ئەم ئیدیەمە دەگوترێ سەری گەرم بوو، مەستبوو.



بازش چە در سر است: دووبارە چی لە سەر دایە، چ قسەیەك دەکات

دیارە دوێنێ لەکاتێکدا یار سەری گەرم بووە و مەست بووە پەیمان و بەڵێنی وەسڵ و دیداری بە شاعیر داوە، بەڵام شاعیر لە شکاندنی ئەو بەڵێنە دەترسێت و زۆر دڵنیا نییە و دەڵێ: دوێنێ بە مەبەستی ئەو بەڵێنەی دامێ تا بزانم ئەمڕۆ چۆن بیر دەکاتەوە و چی دەڵێ، رای چۆنە و چی دەڵێ ئاخۆ لە سەر بەڵێنی خۆیەتی یاخود پەشیمان بۆتەوە.

**٧- در راه ما شکستەدلی می خرند و بس**

**بازار خودفروشی از آن سوی دیگر است**

**دەر راهی ما شکەستەدلی میخەرەند و بەس، بازاری خودفروشی ئەزان سوی دیگەرەست.**

لەم رێگەیەی کە ئێمە گرتوومانەتە بەر تەنیا دڵشکاوی دەکڕن و بەس، بازاڕی خۆفرۆشی لە لاکەی دیکەوەیە.

شکستە دلی: دڵشکاوی، بێ هیوایی، رەنجیدەیی    می خرند: دەکڕن

بس: بەس    خودفروشی: خۆفرۆشی، ناز و عیشوەکردن    سو: لا، ئاراستە

لەم بەیتەدا ئاماژە بە دوو جۆر لە بیرکردنەوە یاخود دوو رێگە کراوە رێگەیەکیان کە هی شاعیر و هاوڕێگەکانییەتی کە تیایدا تەنیا دڵشکاوی و بێ هیوایی، کەوتن و نەبوونی دەکڕدرێت و تەنیا ئەو دەفرۆشرێت. واتە تەنیا شتێك کە لەم رێگەیەی ئێمەدا بەها و نرخی هەبێت دڵشکاوییە و هیچی دیکە، بەڵام کەسانێکی دیکە کە خۆفرۆش و ئەهلی رووکار و ریان ئەوا لێرە هیچیان لێ ناکڕدرێت و بەهایان نییە، با بەرەو لایەکەی دیکە بڕۆن واتە: بچنە لایەکەی دیکە کە دڵشکاو و نامۆ نین، چونکە لای ئەوان ئەم کاڵایە پارە دەکات.

واتە: ئێمە کە ئەهلی نەداری و رەنج و دڵشکان و تەوازوعین لە کەسانی خۆبەزلزان و خۆدەرخەر دووردەکەینەوە و هەرکەسێ ئەهلی ئەو جۆرە رووکەشییەیە بچێتە لایەکەی دیکە.

بەپێی تەعبیری عیرفانی دەتوانرێت بگوترێ کە خوای میهرەبان و بە بەزەیی زیاتر ئاگای لە دڵەشکاوەکانە و مەیلی بە لای ئەوانەوەیە، لێرەشدا واتە: لەم رێگەی عەشقی خوداییەدا کە ئێمە گرتوومانەتە بەر تەنیا دڵشکاوی بەهای هەیە و تا زیاتر دڵشکاو و خەمدیدە بین زیاتر لە میهر و بەزەیی خوداوە نزیك دەبینەوە. گەر (خودفروشی) بە ناز و عیشوە لێکدەینەوە بەرەی عاشقان و مەعشوق جودا دەکاتەوە کە عاشقان دڵشکاون و مەعشوقیش خەڵکی لایەکەی دیکەیە کە ناز و عیشوەیە.

**٨-شیراز و آب رکنی و این باد خوش نسیم**

**عیبش مکن که خال رخ هفت کشور است**

**شیراز و ئابی روکنی و ئین بادی خوش نەسیم، ئەیبەش مەکون کە خالی روخی هەفت کیشڤەرەست.**

عەیب لە شیراز بە ئاوی روکنی و ئەم شەماڵە بۆنخۆشەوە مەگرە، چونکە خاڵی رووی حەوت کیشوەرە.

آب رکنی، آب رکناباد: ئاوی روکنابادە کە پێشتر لە بارەیەوە دواین

بادخۆش نسیم: هەوایەکی ئارامی هێواشی بۆنخۆش، شەماڵی بۆنخۆش

عیبش مکن: عەیبی لێ مەگرە، رەخنەی لێ مەگرە     هفت: حەوت

کشور: هەرێم، وڵات لە فارسی نوێدا (کیشور) بە مانای وڵات دێت، یاخود ناوچەیەك کە خاوەن جوگرافیا و مەرزی خۆی بێت و (هفت کشور) حەوت هەرێم، یاخود حەوت وڵات، ئێرانییە دێرینەکان جیهانیان بە سەر حەوت کیشوەردا دابەشکردبوو، کە لایەنێکی ئەفسانەیی هەیە و ئێرانیان بەکیشوەری ناوەڕاست و شەش کیشوەرەکەی دیکەشیان بە دەوروبەریدا دانابوو.

خال رخ هفت کشور: واتە لە جوانیدا شیراز هێندە جوانە کە چۆن خاڵ لەسەر روومەت مایەی جوانییە شیراز ئەو خاڵەیە لە سەر رووی جیهاندا و جوانی کردووە یاخود، چونکە ئێران لە ناوەندی هەموو کیشوەرەکاندایە شیرازیش وەك خاڵ لە ناوەندی کیشوەرەکاندایە

وەك گوتمان شاعیر وابەستەییەکی تەواوی بە زێدی خۆیەوە هەیە و لێرەشدا لە بەرامبەر رەخنەی کەسانێکدا یاخود بۆ دوورخستنەوەی ئەگەری رەخنەگرتن لە شیراز دەڵێ: رەخنە و عەیب لە شیراز مەگرە، چونکە شیراز بە ئاوی رکنابادی و ئەو ئاوهەوایەی کە هەیەتی هێندە جوانە بووەتە مایەی رازاندنەوەی جیهان. واتە نەك تەنیا خۆی جوانە، بەڵکو بووەتە مایەی رازاندنەوە و جوانکردنی تەواوی دنیا، مادام ئەم مایەی جوانی دنیا بێت کەوایە رەخنەگرتن لە شیراز رەخنەگرتنە لە تەواوی جوانییەکانی جیهان.

**٩-فرق است از آب خضر که ظُلمات جای اوست**

**تا آب ما که منبعش الله اکبر است**

**فەرقەست ئەز ئابی خیزر کە زولومات جای ئوست، تا ئابی ما کە مەنبەئەش ئەڵلاهو ئەکبەرەست.**

جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئاوی خضر ـ کە سەرچاوەکەی لە نێو تاریکیدایە ـ و ئاوی ئێمە کە سەرچاوەکەی نێوی ـ الله اکبر ـ ە.



فرق: فەرق، جیاوازی     آب خضر: ئاوی حەیات، ئاوی ژیان (بە پێی سەرچاوەکان ناوی کانییەکە لە لای باکوورەوە کە بە تاریکی یان زوڵمات ناونراوە، خواردنەوەی ئاوی حەیات، دەبێتە مایەی جاویدانی و هەمیشەیی ژیان، دەڵێن ئەسکەندەری مەکدۆنی بەدوایدا رۆشت کەچی دەستی نەکەوت و لێی نەخواردەوە، بەڵام خدری زیندە (خدر پێغەمبەر) پێی گەیشت و لێی خواردەوە و جاویدان بوو بۆیەشە پێی دەڵێن خدری زیندە واتە خدری زیندوو ئاوی خضریش واتە ئاوی خدر     ظلمات: تاریکی، ئەو شوێنەی کە ئاوی حەیاتی لێوە هەڵدەقوڵێ     جای: جێگە     آب ما: ئاوی ئێمە، مەبەست لە ئاوی ئێمە ئاوی شاری شیرازە، کە ئاوی روکنابادە     منبع: سەرچاوە، الله اکبر ناوی ئەو کێوەیە کە نزیك شاری شیرازە و ئاوی روکنابادی لێوە هەڵدەقوڵێت، (سودی) هۆی ناونانی ئەم کێوە بە (الله اکبر) دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە شاری شیراز لە دامێنی ئەم کێوەدایە و هەرکەسێك لە لای (هەمەدان)ەوە بچێت تا دەگاتە سەر کێوەکە شاری شیراز نابینێت، بەڵام کاتێ گەشتە سەر کێوەکە بە هۆی بینینی شارەکە بەبێ ویستی خۆی لە سەرسوڕماندا (اللە اکبر) دەکات، پاشان بە هۆی زۆری بەکارهێنانی ئەم وشەوە ئەو کێوە (تنگ) ناونراوە کێوی الله اکبر {سودی، ج١، ل٢٨٣}.

شاعیر بۆ رەونەقدان بە دیمەنی شاری شیراز دەڵێ: لە نێوان ئاوی خدری زیندە کە ژیانبەخشە و ئاوی ئێمە لە شیرازدا جیاوازییەکی زۆر هەیە، چونکە ئەو لە تاریکییەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام ئاوی روکناباد لە کێوی (الله اکبر)ەوە هەڵدەقوڵێت و سەرچاوەکەی لەوێدایە. لە مانایەکی دووری ئەم بەیتەدا دەتوانرێت ئاماژە بێت بە خودی مرۆڤ واتە مەبەست لە (آب ما) ئاوی ئێمە واتە ئاوی مرۆڤ — ئەو ئاوەی کە مرۆڤی لێ دروستبووە و خودا لە بارەیەوە دەفەرمووێ (وجعلنا من الماء کل شیء حي). هەروەها (اللە اکبر)یش وەك وشەی سەرسوڕمان و ئافەرین کردن بەکاردێت.

ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە: جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان ئاوی خدری زیندە و ئەو ئاوەی کە خودی مرۆڤی لێ دروستبووە، چونکە ئاوی خدر لە شوێنێکی دیارەوە هەڵدەقوڵێ ـ کە زوڵومات و تاریکییە ـ بەڵام سەرچاوەی ئاوی مرۆڤ سەرسوڕمانە و بۆ خودا خۆی نەبێ بۆ هەموو کەسێ مایەی سەرسوڕمانە.

**١٠- ما آبروی فقر و قناعت نمی بریم**

**با پادشه بگوی که روزی مقدر است**

**ما ئابروی فەقر و قەنائەت نەمی بەریم، با پادشەه بگوی کە روزی موقەددەرەست.**

ئێمە ئابڕوی هەژاری و قەناعەت نابەین، بە پاشا بڵێ کە ڕۆزی براوە و دیاریکراوە.

آبرو: ئابڕو، حەیا    فقر: هەژاری    قناعت: قەناعەت، ڕازیبوون

پادشە: پادشا    روزی: ڕۆزی، رزق    مقدر: ئەوەی کە لە لایەن خودا لە چارەنووسی مرۆڤ نووسراوە و بڕیاردراوە

واتە ئێمە هەژارین و لەگەڵ هەژاریدا ڕاهاتووین و ئابڕو و حەیای نابەین و ڕوو ناکەینە دەرگای پادشایان و خەریکی سواڵکردن نابین، بۆیە بە پادشا بڵێ کە رزق و ڕۆزی لە لایەن خوداوە دانراوە و براوەتەوە هەر بۆیە ئێمە ڕازین بە بەشی خودا و بەدوای دونیا ناکەوین، مادام ڕۆزی براوە بێت بە هەوڵ و کۆشش زیاد ناکرێت و مرۆڤ هەر ئەوە دەبێتە نسیبی کە بۆی دانراوە یاخود ئێمە بە سواڵ و گەدایی ئابڕوی خۆمان نابەین و قەناعەت بە هەژاری خۆمان دەهێنین و بە پاشا بڵێین ناچینە لای بۆ داواکردنی شت و خودا ڕۆزی دەرە. (فەقر) و (قەناعەت) دوو مەقامی سلوك و تەریقەتن و عارفەکان لە بارەی فەقر و فەقیرییەوە قسەی جوان و پڕمانایان کردووە، کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

(ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم) لە بارەی (فقر)ەوە گوتوویەتی: فەقر گەنجینەیەکە لە ئاسماندا، کە شەهادە ڕێکدەکاتەوە، خودا نایدا بە کەس تەنیا ئەوانە نەبێ کە خۆشی دەوێن{ابن الملقّن، طبقات الأولياء، ل٧}.لە پێناسەی (فقیر) دا (ئەبوو توراب) دەڵێ: لە (ئەبوو یەزیدی بەستامی ـ قدس سره)م پرسی: ئایا فەقیر وەسفی هەیە، گوتی: بەڵێ ئەوکەسەیە کە هیچی نەبێت و شتی کەسیش نەبێت {هەمان سەرچاوە، ل٣٩٩} واتە نە خاوەنی هیچ بێت و نە هیچیش خاوەنی بێت.(عەمری کوڕی عوسمانی مەکی)یش " الفقر الى الله فى كل شى" بە یەکێ لە سیفاتەکانی وەلی ئەداتە قەڵەم { هەمان، ل٣٤٤}. (ڕویم کوڕی ئەحمەدی بەغداد)یش پێیوایە کە (فقر) ڕێز و حورمەتی خۆیی هەیە کە شاردنەوە و داپۆشینییەتی، هەرکەس خستییەڕوو ئیدی ئەهلی مەقامی فەقر نییە{هەمان، ل٢٨٨}.(سەهلی توشتەری)ش سێ سیفەتی بۆ (فقر) داناوە کە بریتین لە:" شاردنەوەی ڕاز و نهێنییەکەی، بەجێهێنانی واجبەکەی، ڕێکخستنەوەی فەقرەکە"{هەمان، ل٢٣٤}. دەبێ بەجێهێنانی فەقر تەنیا بە مەبەستی فەقر خۆی بێت و مەبەستی دیکەی لە پشتەوە نەبێت وەك (ئەبووبەکری کوڕی ئەبرویەی ئەسفەهانی) دەڵێ: هەرکەس داوای فەقر بکات لەبەر خاتری پاداشتی فەقر بە هەژاری ئەمرێت.{ بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: ابن الملقّن (٧٢٣ـ٨٠٤هـ)، طبقات الأولياء، حققه و خرجه نورالدين شريبه، بيروت، بێ ساڵی چاپ}.



بەمەش واتە ئێمە ئابڕوی عیرفان نابەین بە ملکەچبوونمان بۆ پادشایان هەر وەك هەندێ لە بەناو سۆفیلکەکان دەیانکرد و دەبوونە داردەستی سوڵتانەکان.

**١١- حافظ چه طرفه شاخ نباتسيت كلك تو**

**كِش ميوه دلپذيرتر از شهد و شكر است**

**هافز چە تورفە شاخ نەباتیست کلکی تو، کیش میڤە دلپەزیرتەر ئەز شەهد و شەکەرەست.**

حافز قەڵەمی تۆ لقی چ ڕووەکێکی سەرسوڕهێنەرە، کە میوەی ئەو پەسەندتر و خۆشترە لە هەنگوین و شەکر.

طرفە: سەرسوڕهێنەر، عەجیب    شاخ، شاخە: لقی درەخت    نبات: ڕووەك

کلك: قامیشی نەی، یاخود تیرێکە لە نەی، لێرەدا بەواتای قەڵەم بەکارهاتووە

کش: کە ازش: کە لێی، (مەبەست لە قەڵەمە)    دلپذیر: پەسەند، شتێ کە دڵ پەسەندی بکات (تر) بۆ پلەی بەراوردە واتە: پەسەندتر، بەڵام لێرەدا بە هۆی هێنانی (شهد و شكر)ەوە لە مانای شیرینتر نزیك دەبێتەوە    شهد: هەنگوین

شاعیر ئەم بەیتەی لە ستایشی خۆیدا نووسیوە و دەڵێ: حافز ئەم قەڵەمەی تۆ لە چ ڕووەکێکی سەرسوڕهێنەر دروستکراوە کە میوەکەی لە هەنگوین و شەکر شیرینترە، بێگومان مەبەست لە میوەی قەڵەمی حافز غەزەلە شیرینەکانییەتی، واتە حافز ئەم قەڵەمەی تۆ لە چ ڕووەکێکە کە ئەو غەزەلانەی بەو دەیاننووسی لە هەنگوین و شەکر شیرینتر و پەسەندترن.





## غەزەلی بیست و هەشتەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١- المنة لله که در میکده باز است**

**ز آن رو که مرا بر در او روی نیاز است**

**ئەلمینەتولیللاه کە دەری مەیکەدە بازەست، زان رو کە مەرا بەر دەری ئو روی نیازەست.**

سوپاس بۆ خودا کە دەرگای مەیخانە کراوەیە، لەو رووەوە کە من بۆ پێویستییەکانم روو لەو دەرگایە دەکەم.

المنة لله: منەت بۆ خودا، منەتکردن بە واتای لەڕوودانەوە دێت واتە چاکەیەك لەگەڵ کەسێ بکەیت و لە رووی بدەیتەوە، بەڵام دوو جۆرە منەتکردن هەیە کە یەکێکیان بۆ شکاندنەوەی بەرامبەرە و دروست نییە، واتە دروست نییە کە چاکەت لەگەڵ کەسێکدا کرد بۆ شکاندنەوەی یاخود بۆ ملدانەواندن و.. هتد لەڕووی بدەیتەوە وەك لە قورئانی پیرۆزیشدا جەختی لەسەر کراوەتەوە " يأَيَّهَا الَّذينَ آمَنُواْ لاتُبْطِلوا صَدَقاتِكم بِالَمَنِّ والأذى...." { البقرة، ٢٦٤}، بەڵام گەر بۆ چاککردن بێت گوناه نییە وەك منەتی خودا لەسەر بەندە کە قاچی پێداوە بۆ ئەوەی بۆ شتی چاك بڕوات و بۆ شتی خراپ نەڕوا، ئەم منەتکردنە دروستە، کە مەبەست لە مانای دووەمیانە، بەڵام لێرەدا وەك سوپاس بەکارهاتووە.

روی نیاز است، یاخود روی نیازداشتن: بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی خۆ روو لە لایەککردن، شەرم نەکردن لە خستنەڕووی پێویستییەکان. شاعیر دەڵێ: سوپاس بۆ خودا، یاخود خودا منەتی لەسەرمان هەیە کە دەرگای مەیخانە کراوەتەوە و کراوەیە، چونکە من بۆ بەدیهێنانی پێویستییەکانم روو لەو دەرگایە دەکەم، مادام بۆ دەستخستنی پێویستییەکانم ناچارم و تەنیا رووم دێ روو لە مەیخانە بکەم دەی سوپاس بۆ خودا کە دەرگاکەی کراوەیە.

لە زاراوەی عیرفانیدا (میکدە) بە (قدم موناجات) دێت و بەمەش سوپاس بۆ خودا کە دەرگای موناجات و پاڕانەوە لە خودا کراوەیە، چونکە ئێمە لە دەرگای موناجاتەوە پێویستییەکانمان بەدی دێت و شەرم ناکەین لە دەرگای موناجات و پاڕانەوەدا داوای دابینکردنی پێویستییەکانمان بکەین.

**٢- خمها همه در جوش و خروشند ز مستی**

**و آن می که در آنجاست حقیقت نه مجاز است**

**خومها هه‌مه دەر جوش و خروشه‌ند ز مه‌ستی، ڤان مه‌ی که دەر ئانجاست هه‌قیقه‌ت نه مه‌جازه‌ست.**

کوپه‌ڵه‌کان هه‌موو له تاو مه‌ستیدا که‌وتوونه‌ته جۆش و خرۆش و ئه‌و شه‌رابه‌ی که له‌وێدایه (له‌نێو کوپه‌ڵه‌کاندایه) حه‌قیقییه نه‌ك مه‌جازی.

حقیقت و مجاز: له‌ڕووی زمانییه‌وه مه‌جاز له به‌رامبه‌ر حه‌قیقه‌تدا دانراوه و بۆ نموونه وشه‌ی روو سپی له حه‌قیقه‌تدا واته رووی سپی، به‌ڵام له مه‌جازدا واته سه‌رفراز، به‌ڵام له زاراوه‌ی عیرفانی و فه‌لسه‌فیدا به ته‌واوی پێچه‌وانه ده‌بێته‌وه و شته به ناو حه‌قیقییه‌کانی سه‌ردونیا هه‌موویان مه‌جازن و وێنه‌ی ئه‌و حه‌قیقه‌تانه‌ن که له جیهانی باڵادا بوونیان هه‌یه.

ئه‌گه‌ر به مانای یه‌که‌م (حه‌قیقه‌ت و مه‌جاز) بخوێنینه‌وه واته مانای زمانی: ئه‌وا مانای به‌یته‌که ده‌بێته: کوپه‌ڵه‌کانی شه‌راب له تاو مه‌ستی هاتوونه‌ته جۆش و خرۆش و ئه‌و شه‌رابه‌ی که له نێو کوپه‌ڵه‌کاندا مه‌ی راستی حه‌قیقییه واته ئه‌و شه‌رابه‌یه‌که له (ترێ، خورما، هتد) دروست ده‌کرێت مه‌به‌ست له عه‌شق یان هه‌ر شتێکی دیکه نییه. به‌ڵام گه‌ر به واتای فه‌لسه‌فی حه‌قیقه‌ت و مه‌جاز بخوێنینه‌وه ئه‌وا واتای به‌یته‌که ده‌بێته: کوپه‌ڵه‌کانی شه‌راب یاخود ئه‌و مرۆڤانه‌ی که بوونه‌ته کوپه‌ڵه‌ی عه‌شق و مه‌ستی عیرفانی له‌تاو مه‌ستی و عه‌شقی ئیلاهی که‌وتوونه‌ته جۆش و خرۆش (لێره‌دا ئاماژه به واتای عیرفانی به‌یتی یه‌که‌م هه‌یه، که ده‌رگای موناجات کراوه‌یه) واته له کرانه‌وه‌ی ئه‌و ده‌رگایه‌دا که‌وتوونه‌ته جۆش و خرۆش، ئه‌و عه‌شق و شه‌رابه‌ش یاخود ئه‌و عه‌شق و مه‌ستییه‌ش که له عارفه‌کاندا خودی عه‌شقی حه‌قیقییه نه‌ك سێبه‌ر و مه‌جازی ئه‌و عه‌شقه حه‌قیقییه.

**٣-از وی همه مستی و غرورست و تکبّر**

**وز ما همه بیچارگی و عجز و نیازاست**

**ئه‌ز ڤه‌ی هه‌مه مه‌ستی و غرووره‌ست و ته‌که‌ببور، ڤه‌ز ما هه‌مه بیچاره‌گیڤو ئه‌جز و نیازه‌ست.**

هه‌رچی له‌و ده‌رده‌که‌وێ مه‌ستی و غرور و خۆبه‌زلزانینه و له ئێمه‌شه‌وه هه‌مووی نه‌داری و بێ هێزی و پێویستییه.

بیچارگی و عجز و نیاز: (بێچاره‌یی و بێهێزی و پێویستی) سێ سیفه‌تی بێ هێزین که شاعیر ده‌یانداته پاڵ خۆی و هه‌رسێکیان له یه‌کدییه‌وه نزیکن.



واته: ئێمه هیچمان نییه و یاریش خاوه‌نی گشت شتێکه و به‌م بوونه‌ش ئیدی ئه‌وه‌ی له‌و ده‌رده‌که‌وێ مه‌ستی و مه‌غروربوون و خۆبه‌گه‌وره‌زانینه که شایانی خۆیه‌تی و هه‌رچیش له ئێمه ده‌رده‌که‌وێ هه‌ر بێچاره‌یی و نه‌داری و بێ هێزی و پێویستییه که شایسته‌ی خۆمانه.

**٤-رازی که بر غیر نگفتیم و نگوییم**

**با دوست بگوییم که او محرم رازاست**

**رازی که به‌ری غه‌یر نه‌گوفتیم و نه‌گوییم، با دوست بگوییم که ئو مه‌هره‌می رازه‌ست.**

راز و نهێنی یه‌ك که به بێگانه‌مان نه‌گوتووه و ناشیڵێین، با به دۆستی بڵێین، چونکه ئه‌و مه‌حره‌می رازه.

رازی: رازێك، نهێنییه‌ك به غیر: لای بێگانه، به بێگانه نگفتیم و نگوییم: نه‌مانگوتووه و ناشیڵێین محرم راز: به‌که‌سێك ده‌گوترێ که راز و نهێنی پارێزبێت، ئه‌سڵه‌ن ـ مه‌حره‌م ـ واته که‌سانێك که ده‌ستنوێژیان له که‌سێ ناشکێ و پێیان حه‌رامه، لێره‌شدا مه‌حره‌می راز واته: ئه‌و که‌سه‌ی که به راز مه‌حره‌مه، له مانای زمانیدا واته: رازقایم.

ئه‌م مه‌سه‌له‌یه واتایه‌کی زۆر قووڵی مرۆیی له‌پشته‌وه‌یه که به‌ڕاستی شاعیرێکی گه‌وره‌ی وه‌ك حافز نه‌بێ هه‌موو که‌سێ ده‌رکی پێ ناکات، له نێو کۆمه‌ڵگه‌دا دوو جۆره مرۆڤ ده‌رده‌که‌وێ له‌لایه‌که‌وه گرووپێك که هه‌موو راز و نهێنییه‌کان له لای هه‌موو جۆره که‌سێك و له هه‌مووکات و شوێنێکدا ده‌ده‌رکێنن و ناوه‌وه و ده‌ره‌وه‌یان یه‌که، له‌لایه‌کی دیکه‌وه گرووپێکی دیکه هیچ راز و نهێنییه‌ك له‌لای هیچ که‌س نادرکێنن و هه‌میشه مرۆڤێکی رازقایم و ئاڵۆزن، له‌راستیدا هه‌ر دوو گرووپه‌که حاڵه‌تی په‌ڕگیری مه‌سه‌له‌که‌ن و نێگه‌تیڤیشن، چونکه یه‌که‌میان گه‌ر سه‌ری به بڕین نه‌چێ به‌لای که‌می سووکی ده‌کات له نێو کۆمه‌ڵگه‌دا و دووه‌میشیان که‌سێکی ناته‌واو ده‌بێت و ده‌کرێ تووشی کۆمه‌ڵێ نه‌خۆشی ده‌روونی بێت، بۆیه پێویسته مرۆڤ رازی دڵی به شێوه‌یه‌کی به‌شی و له شوێن و کاتی تایبه‌ت و له بار و لای که‌سی شیاو بدرکێنێ، به‌ڵام ئه‌و که‌سه شیاوه کامه‌یه که مرۆڤ رازه‌کانی خۆی لا بدرکێنێ، بێگومان ئه‌و که‌سه ده‌بێ مه‌حره‌می راز و نهێنی بێت، له کۆمه‌ڵگه‌دا دوو جۆره په‌یوه‌ندی له نێوان مرۆڤدا دێته دی په‌یوه‌ندییه‌کی ئامێرییانه که ته‌نیا جه‌سته‌کان له کار و فرمان و رووبه‌ڕووبوونه‌وه ساکاره‌کانی ژیاندا به‌ریه‌کده‌که‌ون، که له‌م جۆره په‌یوه‌ندییه‌دا ناخی مرۆڤه‌کان ئاماده‌یی نییه. به‌ڵام په‌یوه‌ندی دووه‌میان په‌یوه‌ندییه‌کی مرۆییانه‌یه و تیایدا ناخه‌کان لێکتر نزیکده‌بنه‌وه نه‌وه‌ك جه‌سته‌کان، مه‌حره‌می راز له جۆری دووه‌می په‌یوه‌ندییه‌کاندا ده‌ستنیشان ده‌کرێت، له لایه‌کی

دیکەوە سێ جۆرە میزاج بە سەر مرۆڤدا زاڵە کە (میزاجی جەستەیی و میزاجی گەدەیی و میزاجی دەماخی)ن لە میزاجی جەستەیی و گەدەییدا بە مرۆڤ شتە دەرەکییەکاندا دەنازێت و کەسایەتی خۆی لەوانەوە وەردەگرێت، هەرچی میزاجی دەماخییە ئەو مرۆڤانەن کە بە ناخ و مێشکیان بیر دەکەنەوە و کەسایەتییان لە خودی خۆیانەوە هەڵدەقوولێت، سەبارەت بەم جۆرە میزاجانە، ئەوا تەنیا لە جۆری سێیەمدا دەتوانین بەدوای مەحرەمی رازدا بگەڕێین، کەواتە مەحرەمی راز پێویستە مرۆڤێك بێت کە بە مێشکی بیر بکاتەوە و هێز و دەسەڵات و خەڵەتاندن و فریودانە مادییەکان کاریگەرییان لە سەری نەبێت، خوداش باشترین و جوانترین و چاکترین مەحرەمی رازە، کە دەکرێ لەم بەیتەشدا مەبەستی (دۆست) خودا بێت کە مەحرەمی رازە و لە نهێنی و راز و نیازی هەمووان ئاگادارە. شاعیر دەڵێ: نهێنی و رازێك کە لە ناخماندا هەیە و تا ئێستا لای هیچ بێگانەیەك نەماندرکاندووە و لە داهاتووشدا نایدرکێنین، با لای دۆست بیدرکێنین، یاخود لای دۆست دەیدرکێنین، چونکە ئەو مەحرەمی رازە.

لە نوسخەی سودیدا لە بری (غیر) (خلق) هاتووە بەمەش مانای دەبێتە: راز و نهێنییەك کە لای هیچ دروستکراوێك یاخود هیچ کەسێك نەمانگوتووە و نایلێین بە دۆستی دەڵێین، چونکە ئەو مەحرەمی رازە.

**٥-شرح  شکن  زلف خم اندر خم جانان**

**کوته نتوان کرد که این قصه دراز است**

**شەرهی شکەنی زولفی خەم ئەندەرخەمی جانان، کوتەهـ نەتەڤان کەرد کە ئین قیسە درازەست.**

ناتوانرێت شەرحی پێچ و لولی زوڵفی پێچاوپێچی مەعشوق کورتکرێتەوە، چونکە ئەم چیرۆکە درێژە.

شکن: پێچ و لولی    خم اندرخم: پێچاوپێچی، ئەڵقە ئەڵقەیی    کوتە/کوتاه: کورت
نتوان کرد: ناتوانرێت بکرێت    دراز: درێژ

هەروەك چۆن پرچی یار درێژە شەرحکردن و شرۆڤەکردنی پێچاوپێچی و چین چینیشی درێژە دەکێشێ و ناتوانرێت کورت کرێتەوە.

بە رەچاوکردنی مانای (شکن زلف — چین و پێچی پرچ) لە زاراوەی عیرفانیدا کە بە مانای نهێنییەکانی بوون و دروستکردن دێت مانای بەیتەکە دەبێتە: پەردە و نهێنییەکانی مەعشوق و بوون زۆر ئاڵۆزن و لە رادەبەدەرن. هەر بۆیە گەر بتەوێ شەرح و شرۆڤەیان بکەیت، ناتوانرێت لە کورتی ببیڕیتەوە و درێژدەبێتەوە، چونکە خودی چیرۆکەکە کە پەردە و نهێنییەکانە درێژە.



**٦-بار دل مجنون و خم طرّهٴ لیلی**

**رخسارهٴ محمود و کف پای ایاز است**

**باری دلی مەجنون و خەمی تورڕەیی لەیلی، رووخسارەیی مەهمود و کەفی پایی ئەیازەست.**

باری خەمی دڵی مەجنون و لولی پەرچەمی لەیلا، رووخساری مەحموودی غەزنەوی و ژێرپێی ئەیازە.

بار: باری غەم    خم طره: شکاوی و لاری پەرچەم، لولی پەرچەم    رخسارە: رووخسار
کف پای: ژێرپێ، (کف) واتە لەپی پێ، بەڵام لە کوردیدا لەپ تەنیا بۆ دەست بەکاردەهێنرێ.

ئەم بەیتە ئاماژە بۆ دوو چیرۆکی دڵداریی (لەیلا و مەجنون) و (مەحموود و ئەیاز) دەکات سەبارەت بە لەیلێ و مەجنون چیرۆکەکە ئاشکرایە و لە نێو نەتەوەی کوردیشدا بوونی هەیە، بەڵام (مەحموود و ئەیاز) چیرۆکی دڵداری سوڵتان مەحموودی غەزنەوییە لەگەڵ یەکێك لە خزمەتکارەکانییەتی، گوایە هێندە بۆی سووتاوە و خۆشی ویستوە ئەو سوڵتان مەحموودەی کە هێمای هەیبەت و دەسەڵاتە رووخساری خۆی سواندووەتە ژێر پێی (ئەیاز)ی دڵخوازیدا و لێرەشدا ئاماژەیە بەم رووداوە(شایانی ئاماژە پێکردنە ئەیاز کوڕە).

مانای بەیتەکە تەواوکەری بەیتی پێشووە کە گوترا، ناتوانرێت شەرحی چیرۆکی عەشق کورتبکرێتەوە و ئەم چیرۆکە درێژە، لێرەشدا دوو نموونە وەك روونکردنەوە دەهێنێتەوە دەڵێ: ئەو باری غەم و خەفەتەی کە لە تاو جوانی لەیلێوە نیشتبووە سەر دڵی مەجنون و چیرۆکی عەشقی مەحموود و ئەیاز کە سوڵتان مەحموود رووخساری خۆی دەسوییە ژێر پێی ئەیاز هەمووی لە رووی عەشقەوەیە.

ئەم چیرۆکی عەشقەیە کە درێژە و ناتوانرێت شەرح و شرۆڤەکەی بەکورتی بخرێتەڕوو، بەڵام مەبەستی حافز لەم عەشقە زۆر لەمە قووڵترە و عەشقی حەق و حەقیقییە.

**٧-بردوختەام دیدە چو باز از همە عالم**

**تا دیدەٴ من بر رخ زیبای تو بازاست**

**بەردوختەئەم دیدە چو باز ئەز هەمە ئالەم، تا دیدەیی مەن بەر روخی زیبای تو بازەست.**

لەو کاتەوەی کە چاوی من بە رووی جوانی تۆدا کراوەتەوە، وەك باز چاوم لە هەموو دنیا پۆشیوە.

بردوختن: لێكنان، چاوپۆشیكردن          دیده: چاو          چو: وەك، چۆن    باز: باز، لە میسراعی یەكەمدا باڵندەی (باز)ە، بەڵام لە میسراعی دووەمدا بە واتای (كراوە) دێت

دیده چوباز بردوختن: وەك باز چاولێكنان، ئاماژەیە بەو مانایەی كە بۆ راهێنانی باز لە سەر راوكردن چاویان دەبەستەوە و كەم كەم گۆشتی ئەو باڵندەیان دەدایە كە بازەكەیان بۆ راوكردنی ئەو رادەهێنا.

دەڵێ: لەوكاتەوەی كە چاوی من رووخساری جوانی تۆی بینیوە هەموو جیهان لە بەر چاوم سووك وكەم بووە و هەروەك چۆن كە چاوی باز دەبەستن و یەك نێچیری دەدەنێ تا بۆ راوكردنی باڵندەیەكی دەستنیشانكراو رابێت، منیش چاوم بەستووە و تەنیا تۆم بەسە. یاخود من كە تۆم هەبێ دونیا و جگە لە تۆ لە بەر چاوم هیچ نییە.

**٨- در كعبهء كوی تو هر آن كس كه در آید**

**از قبلهء ابروی تو در عین نمازاست**

**دەر كەئبەیی كوی تو هەر ئان كەس كە دەر ئایەد، ئەز قیبلەیی ئەبروی تو دەر ئەینی نەمازەست.**

كەسێك كە بێتە نێو كۆڵانی تۆوە ـ كە وەك كەعبە پیرۆزە ـ لە سەرنجدانی قیبلەی برۆی تۆوە لە نوێژدایە.

كعبه: كەعبە، كابە          درآید: بێتە          قبله: قیبله

قبله ابرو: قیبلەی برۆ، برۆی یاری بە قیبله چواندووە لە لاریدا كە وەك قیبله لارە.

نماز: نوێژ          عین نماز: نوێژ خۆی، واتە لە نوێژدا

واتە: هەركەسێ كە دێتە كۆڵانی پیرۆزی ئێوەوە، چونكە رووی لە میحرابی برۆی تۆیە وەك وایە لە نوێژدا بێت و حوكمی ئەوەی هەیە كە خەریكی نوێژ و عیبادەت بێت.

**٩- ای مجلسیان سوز دل حافظ مسكین**

**از شمع بپرسید كه درو سوز و گداز است**

**ئەی مەجلیسیان سوزی دلی هافزی مسكین، ئەز شەمع بپورسید كە دەرو سوز و گودازەست.**

ئەی ئەهلی مەجلیس، سووتانی دڵی حافزی بێچارە و هەژار لە مۆم بپرسن كە هەمیشە لە سووتان و توانەوەدایە.

مجلسیان: ئەهلی مەجلیس، ئامادەبووانی مەجلیس     سوز: سووتان

بپرسید: بپرسن          گداز: توانەوە



مۆم كە هەمیشە لە سووتان و توانەوەدایە لە حاڵەتی دڵی سووتاوی حافز ئاگادارە، واتە سووتانی دڵی حافز لە سووتانی مۆم دەچێت، كە وایە ئەی ئامادەبووانی مەجلیس گەر دەتانەوێ حاڵی دڵی حافز بزانن پێویستە لەو مۆمە بپرسن كە لە بەر دەمتاندا دەسووتێ و دەتوێتەوە، واتە لەوەوە لە حاڵی دڵی حافز خەبەردار دەبن.

## غەزەلی بیست و نۆیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسلەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١-اگر چه باده فرح بخش و بادگلبیزاست**
**به بانگ چنگ مخور می که محتسب تیزاست**

**ئەگەر چە  بادە فەرەح بەخش و باد گولبیزەست، بە بانگی چەنگ مەخورید مەی کە موهتەسیب تیزەست.**

گەرچی شەراب شادیبەخش و با گوڵ پرژێنکەرە، بە دەنگی چەنگ شەراب مەخۆرەوە چونکە دارۆغە هۆشیارە.

فرح بخش: شادی بەخش  گلبیز: گوڵ پرژێن، گوڵ رژێن، گوڵ بڵاوکەرەوە گوڵ لە بێژنگدان (لە کوردیدا نارێکە).  بیز: رەگی کاری (بیختن)ە کە واتای لە بێژنگدان دەگەیەنێ، چونکە لە کاتی لە بێژنگدانی هەر شتێکدا و لە ئەنجامی جوڵەیدا بۆنێك بڵاودەبێتەوە، لە خەیاڵی شاعیریشدا بۆنی گوڵ کە بڵاوبۆتەوە لە ئەنجامی ئەوەوەیە کە با گوڵی لە بێژنگداوە و پەڕەکانی گوڵی لە هەوادا بڵاوکردۆتەوە.

بانگ: دەنگ   چنگ: چەنگ، جۆرە سازێکە   مخور: مەخۆرەوە   تیز: هوشیار، توند

محتسب: جاران لە شاردا کەسێك یاخود دەستەیەك هەبوون کە لەلایەن دەوڵەتەوە دەستنیشانکرابوون بۆ رێگەگرتن لە کاری خراپەی وەك عارەق خواردنەوە و هتد. جا بەو راسپێدراوە دەگوترێ (موحتەسیب)، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەمیر (مبارز الدین محمد) زۆر توندبوو لە جێبەجێکردنی سنوورە ئایینییەکاندا، تەنانەت بە دەستی خۆی لە گەردنی سەرپێچیکەرانی دەدا، سوڵتانی موحتەسیب یاخود تەنیا موحتەسیبیان پێدەگوت. لە غەزەلەکانی حافزیشدا هەندێ جار درکەیە لەم سوڵتانە و هەندێ جاریش بە واتای زمانی خۆی بەکارهاتووە.

کەواتە دەکرێ ئەم غەزەلە لەو سەردەمەدا گوترا بێت کە ئەم ئەمیرە دەسەڵاتداربووە.

بەڵام (سودی) پێیوایە کە ئەم غەزەلە لە سەردەمی (دڵشاد خاتوون)دا گوتراوە کە هەموو جۆرە مەشروباتێك قەدەغە بووە و سەرپێچیکەرانی بە چەندەها جۆری سزا دەکوشت{سودی، ج٢، ل٢٩٢}.



شاعیر دەڵێ: گەرچی شەراب شادیبەخشە و با گوڵپرژێن دەکات  و وەرزی بەهارە نەکەی لەگەڵ ئاوازی ساز و مۆسیقادا(بە ئاشکرا) مەی بخۆیتەوە، چونکە سوڵتان یاخود مەئمورەکانی زۆر وریا و توندن و لە گەردەنت دەدەن (لەڕاستیدا ئاماژەیە بە قەدەغەبوونی عیرفان و عەشقی حەق لە نێو سوڵتانەکاندا).

**٢-صراحیی و حریفی گرت به چنگ افتد**
**به عقل نوش که ایام  فتنه‌انگیز است**

**سوراهەیی و هەریفی گەرەت بە چەنگ ئوفتەد، بە ئەقل نوش کە ئەیام فیتنە ئەنگیزەست.**

گەر سوراحییەك و دۆستێکت چنگ کەوت (دەستکەوت) عاقڵانە شەراب نۆشکە کە رۆژگار فیتنەهەڵگیرسێنەرە.

صراحی: سوراحی، دۆلکە (لە شێوەزاری هەولێریدا)
حریف: بە مانای دۆست یاخود هاوپیشە و هاوکار دێ
چنگ: چنگ، دەست      به چنگ افتد: دەستت کەوێ، چنگ کەوێ

بەعقل نۆش: عاقڵانە بنۆشە، دەکرێ لێرەدا مەبەست لەم عاقڵانەیە هۆشیارانە بێت تا پێی نەزانن یاخود عاقڵانە بنۆشە، واتە هێندە بنۆشە کە تەنیا سەرت گەرم بێت نە وەك عەقڵت لەدەست بدەیت.

ایام: رۆژگار      فتنه انگیز: ئاشوب بەرپاکەر، فیتنە بەرپاکەر، فیتنە هەڵگیرسێنەر

دەڵێ: لەم رۆژگارە فیتنەهەڵگیرسێنەرەدا کە گرفت لەبەردەم عاشقانی حەقدا زۆر بووە چاوەڕێی مەجلیسێکی گەورەی میخۆران و خوم و گۆزەڵەکان (عەشق) نەبێت، گەر سوراحییەك مەی و یەك دۆستت بە دەستکەوت مەی بنۆشە، بەڵام وریابە و عاقڵانە مەی بنۆشە، چونکە زەمانە و رۆژگار فیتنە بەرپاکەرە.

**٣-در آستین مرقّع پیاله پنهان کن**
**که همچو چشم صراحی زمانه خونریزاست**

**دەر ئاستینی مورەققەئ پیالە پەنهان کون، کە هەمچو چەشمی سوراهی زەمانە خونریزەست.**

پیالە لە نێو قۆڵی خرقەدا بشارەوە، چونکە رۆژگار هەر وەك چاوی سوراحی خوێنرێژە.
آستین: قۆڵی کراس یان هەر بەرگێك
مرقع: پارچە پارچە بە یەکدا دووراو، درکەیە لە خرقەی سۆفی.

پنهان کن: بشارەوە          همچو: هەروەك، وەك

چشم صراحی: چاوی سوراحی، لێوی سوراحی، جاران سوراحییان لە شێوەی کۆتر و باڵندەی دیکەدا دروستکردووە و چاو و دەنوکیان کردۆتە لێوەکەی کە ماددەکەی ناوی لێوە رژاوە.

خونریز: خوێنرێژ

زەمانەی بە چاوی سوراحی چواندووە کە شەرابی سووری لێوە دێتە دەرەوە، بەڵام لەم لێکچواندنەدا بێ رەحمی زەمانە دەخاتەڕوو، بۆیە دەڵێ: زەمانە و رۆژگارێك کە تیایدا دەژین وەك سوراحی خوێنرێژە، لەبەر ئەوە پیاڵەی شەراب لە قوڵی خرقەدا بشارەوە، واتە لە ژێر فڕوفێڵی زوهد و سۆفیایەتیدا دەست کە بە مەیخۆری (عەشقی حەقیقی ئیلاهیانە) لە رواڵەتدا خۆت بە سۆفی رەسمی بدە قەڵەم و لە ژێرەوە عاشقی حەق بە.

**٤-ز رنگ باده بشوییم خرقەها در اشك**

**که موسم ورع و روزگار پرهیزاست**

**ز رەنگی بادە بشوییم خیرقەها دەر ئەشك، کە مۆوسمی ڤەرەع و روزگاری پەرهیزەست.**

خیرەقەکانی خۆمان بە فرمێسکی چاو بشۆین تا پەڵەی (لەکەی) شەراب پاکبێتەوە، چونکە رۆژگاری زوهد و خۆپارێزییە.

رنگ: پەڵە، لەکە          موسم: رۆژگار، کات          ورع: خۆپارێزی، تەقوا، زوهد

بەئاماژە بەوەی کە رۆژگارێك مەینۆشی ئازاد بووە پرژەی شەراب بەر خیرقەکانیان دەکەوت (واتە نیشانەی عەشقی حەق بە ئاشکرا دیار بوو، کە ئەکرێ شەتەح و تامات بێ)، بەڵام ئێستا کە زەمانە و رۆژگار رۆژگاری تەقوا و زوهدە و ئەمان رەواجییان هەیە و مەینۆشی قەدەغەیە، پێویستە بە فرمێسکی چاو ئەو پەڵە شەرابانە(نیشانانە) بشۆین کە بە سەر خیرقەکانمانەوەن.

لەلایەکی ترەوە رژاندنی فرمێسك بە واتای تۆبەکردن و پەشیمانی دێت، لەکەداربوونی خیرقەش بە شەراب بە مانای گوناهکردن دێت و دەڵێ: ئەمڕۆ کە رۆژگار و کاتی تەقوا و خۆپارێزییە و ئێمەی سۆفیش لە نێو گوناهداین بۆیە پێویستە تۆبە بکەین و بگریێن و فرمێسك بڕێژین، تا ئەو فرمێسکانە ببێتە مایەی شۆردنەوە و سڕینەوەی گوناهەکانمان.

**٥- سپهر برشده پرویزنیست خون افشان**

**که ریزەاش سر کسری و تاج پرویزاست**



**سیپیهر بەرشودە پەرڤیزەنیست خون ئەفشان، کە ریزەئەش سەری کیسراڤو تاجی پەرڤیزەست.**

ئاسمانی باڵا وەك هێڵەکێکە کە خوێن دەبێژێ و بێژراوەکەی (ئەوەی لێی دەردەچێ) سەری کیسرا و تاجی پەروێزە.

سپهر: گەردون، ئاسمان، درکەیە لە دەسەڵاتی خودایی

سپهر برشدە: ئاسمانی هەڵکشاو، ئاسمانی بەرز و باڵا، مەبەست لە دەسەڵاتی سەرو دەسەڵاتی مرۆییە          پرویزن: هێڵەك، بێژنگ          پیرۆزنیست: هێڵەکێکە، بێژنگێکە          خون افشان: خوێن پرژێن، بەڵام بە هێنانی لەگەڵ (پرویزن)دا دەکرێ خوێن بێژان بگوترێت، چونکە دیسانەوە لە کاتی بێژان و لە بێژنگدانی هەر شتێکدا لەژێرییەوە دەپرژێ.          ریزە: بێژراو، ئەو دانە وردانەی کە لە ژێر بێژنگەکەوە دەکەونە خوارەوە.

کسری: بە عەرەبی بە پاشاکانی ساسانی و ئێرانییەکان (کیسرا) دەڵێن، لە فارسیدا لە بری کیسرا خوسرەو بەکاردەهێنرێت، هەروەها بە پادشاکانی رۆم (قەیسەر) و هی چین (فەغفور) و هی هند (رای) دەگوترێت، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (کسرا) دەکرێ پەروێزی کوڕی هورمزی نەوشیروان بێت کە یەکێکە لە پادشا بەناوبانگەکان یاخود خودی نەوشیروان بێت.

پرویز: مەبەست لە خوسرەوپەروێزی پاشای بەناوبانگی ساسانییە.

هیچ کەسێ لە دەست ئاسمانی بڵند و چەرخی گەردوون رزگاری نابێت و هێز و دەسەڵاتی ئەو بە گشت جێگەیەك دەگات و پیاوانی بەناوبانگی مێژووی کوشتووە و کوژراوەکانیشی لە بێژنگ دەدات و خوێن بە هەموو لایەکدا دەپرژێنی و کیسرا و تاجی پەروێز وەك دانەی ورد بە تۆڕەکەیدا تێدەپەڕن و دەکەونە خوارەوە، واتە زۆر گەورەتری لەناوبردووە و کوشتوویەتی، کەوابێ چەرخ و گەردوون بەسەر پادشاکاندا بە دەسەڵاتە چ جای مرۆڤی بێ دەسەڵات.

**٦- مجوی عیش خوش از دوور واژگون سپهر**

**که صاف این سر خم جمله دردی آمیزاست**

**مەجوی ئەیشی خوش ئەز دۆوری ڤاژگونی سیپیهر، کە سافی ئین سەری خوم جوملە دووردی ئامیزەست.**

لە دەورانی گەردوونی سەراوبن چاوەڕێی ژیانی خۆش مەبە، چونکە شەرابی سافی بێخەوش (سەرتوێژی ئەم کوپەڵەیە) بەتەواوی لەگەڵ خڵتە و خەوشی بنەکەیدا تێکەڵاو بووە.

مجوی: چاوەڕوانی مەکە، چاوەڕوان مەبە، لێی رامەبینە، داوا مەکە  دوور: دەوران، گەڕان، سوڕان          واژگون: سەراوبن، دەمەونوخون، هەڵگەڕاوە          سپهر: گەردوون،

ئاسمان، چەرخ، لەکوردیدا چەرخی چەپگەرد یا چەرخی کەچ و لار..هتد دەگوترێ
آمیز: لە چاوگی (آمیختن) وەرگیراوە واتە تێکەڵاوبوون

صاف: بێخەوش      دُرد: خڵتە، خەوش و خاڵ      جملە: هەمووی بەتەواوی

کاتێ شەراب لە کوپەڵەدایە بە سەرانسەرەکەی یاخود سەرتوێژەکەی دەگوترێ (ساف) واتە بەشی سەرەوەی کە بێخەوش و خڵتە و خاڵە، بە بنەکەشی واتە ئەوەی کە لە بنی کوپەڵەکەدا دەمێنێتەوە و خڵتەوخاڵە دەگوترێ (دوورد) کە لە بنەکەیدایە و بێخەوش نییە.

شاعیر دەورانی گەردوونی بە کوپەڵەیەکی شەراب چواندووە کە سەراوبن کراوە و لەو کاتەشدا خڵتەوخاڵەکەی بە تەواوی تێکەڵاوی شەرابە بێخەوشەکەش بووە و هیچی بە پاکی نەماوەتەوە و دەڵێ: چاوەڕێی ئەوە مەبە لە گەردوونی چەپگەرد کە ژیانی خۆشت بە نسیب بکات، چونکە ئەو وەك ئەو کوپەڵە سەربەرەو خوارەیە و چاکی و خراپییەکانی (سافی و خڵتەکانی) بە سەریەکدا تێکەڵاوبوون و هەمووی هەر ناخۆشی بووە، واتە کاری ڕۆژگار هەمیشە سەربەرەو خوار و عەکسە و شادی و خۆشی ژیان بەکەسانێ نادات کە شیاوی ئەوەن.

**٧- عراق و پارس گرفتی به شعر خویش حافظ**

**بیا که نوبت بغداد و وقت تبریز است**

**ئیراق و پارس گرفتی بە شیئری خیش هافز، بیا کە نۆبەتی بەغداد و ڤەقتی تەبریزەست.**

حافز عێراق و فارست بە شیعری خۆت گرت، وەرە کە ئێستا نۆرەی (سەرەی) بەغداد و تەبریزە.

عراق و پارس: مەبەست لە عێراق، عێراقی عەجەمە کە ئەسفەهانی ئێستایە و مەبەست لە پارس یاخود فارسیش شیرازە.

گرفتی: گرتت، ڕزگارت کرد، دەسەڵاتت بە سەریاندا سەپاند.

خویش: (ڕاناوی خۆییە)، خۆ، خود      نوبت: سەرە، نۆرە

لێرەدا شاعیر لە وەسف و پیاهەڵدانی خۆیدا دەڵێ: ئەی حافز تۆ بە شیعری ناسك و بەهێزی خۆت دەسەڵاتت بە سەر ئەسفەهان و شیرازدا گرتووە و ناوبانگت تیایاندا دەرکردووە وەرە ئێستاش سەرەی ئەوەیە کە دەسەڵات بە سەر بەغدا و تەبریزیشدا بگریت.

د. هروی لە شەرحەکەی خۆیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم بەیتە ئاماژەیە بە(امیر مبارزالدین)کە وەك گوترا توند و خوێنڕێژ بووە و دەڵێ: تۆ ئەسفەهان و شیرازت گرت و خوێنڕێژیت تیاکردن و ئێستاش سەرەی بەغدا و تەبریزە کە خوێنیان تیا برێژیت. هەروەها (د. غنی)ش پشتگیری لەم رایە دەکات.{ هروی، ج١، ل١٤٣}.

## غەزەلی سییەم:

**بەحری خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١-حال دل با تو گفتنم هوس است**

**خبر دل شنفتنم هوس است**

**هالی دل با تو گوفتەنەم هەڤەسەست، خەبەری دل شنوفتەنەم هەڤەسەست.**

حەز دەکەم حاڵی دڵم بە تۆ بڵێم لە بارەی دڵەوە هەواڵێکم گوێ لێ بێ.

گفتن: گوتن      هوس: حەز، هەوەس، ئارەزوو      شنفتن/ شنیدن: بیستن، گوێ لێبوون

ئارەزوومە کە حاڵ و ئەحواڵی دڵ لە تۆ بپرسم و خەبەرێکی دڵم گوێ لێ بێت، واتە دڵم لە دەستداوە و ئاگا و هەواڵی نازانم، بەڵام ئێستا حەز دەکەم پرسیارێکی حاڵ و ئەحواڵی لە تۆ بکەم، چونکە دەزانم لای تۆیە و حەز دەکەم هەواڵێکی ئەوم گوێ لێ بێ، یاخود ئارەزوومە باسی حاڵ و ئەحواڵی دڵ لەگەڵ تۆدا بکەم و گوێم لە هەواڵی دڵ ببێت.

**٢-طمع خام بین که قصهء فاش**

**از رقیبان نهفتنم هوس است**

**تەمەئی خام بین کە قیسەیی فاش، ئەز ڕەقیبان نوهوفتەنەم هەڤەسەست.**

بۆچوونی کاڵ و کرچ ببینە کە ئارەزوومە چیرۆکی ئاشکرا لە ڕەقیبان بشارمەوە.

طمع خام: بێ تام، کرچ وکاڵ      بین: ببینە

قصهء فاش: چیرۆکی ئاشکرا      نهفتن: شاردنەوە، پەنهانکردن

واتە: عەشقی من ئاشکرابووە و بڵاوبۆتەوە، بەڵام سەیری ڕای بێ تامی من بکە کە بە بێهودە ئارەزوومە و هەوڵدەدەم کە ئەو چیرۆکە بڵاوەی عەشم لە ڕەقیبان بشارمەوە.

**٣- شب قدری چنین عزیز و شریف**

**با تو تا روز خفتنم هوس است**

**شەبی قەدری چونین ئەزیز و شەریف، با تو تا روز خوفتەنەم هەڤەسەست.**

لە شەوێکی وا خۆشەویست و بەڕێزدا کە وەك شەوی قەدرە، ئارەزوومە لەگەڵ تۆدا تا بەیانی(ڕۆژ) بخەوم.

شب قدر: شەوی قەدر      با تو: لەگەڵ تۆدا

تا روز: تا رۆژ، تا بەیانی، تا رۆژدەبێتەوە     خفتن/خوابیدن: خەوتن

دەڵێ: لە شەوی قەدرێکی وا بەرێز و گەورەدا لە کاتێکدا پێویستە یاخود خێر و چاکەیە تا بەیانی عیبادەت و یادی خودا بکەیت، بەڵام من ئارەزوومە تا بەیانی لەگەڵ تۆدا بخەوم، هێندە ئاواتمە کە لەگەڵ تۆدا بخەوم.

**٤-وه که دُر دانه‌ای چنین نازک**

**در شب تار سفتنم هوس است**

**ڤەه کە دووردانەیی چونین نازك، دەر شەبی تار سوفتەنەم هەڤەسەست.**

وای کە ئارەزوومە لە شەوێکی تاریکدا بە دوای دانە مروارییەکی وا ناسکدا بگەڕێم.

وەکە: وای کە، چەند سەیرە، چەندەم پێ خۆشە     دردانە: دانەی مرواری

نازك: ناسك، نەرم   شب تار: شەوی تار، شەوی تاریك   سفتن: گەڕان بەدوای مرواریدا، سۆراخکردن.

مانای بەیتەکە تەواوکەری بەیتی پێشووە کە حەزی دەکرد تا بەیانی لەگەڵ یاردا بخەوێ، دەڵێ: وای کە پێم خۆشە لە شەوێکی تاریکدا بە دوای دانەی مرواری وا ناسکدا بگەڕێم، کە رەنگە مەبەست لە جوانییەکانی یاربێت، بەڵام (شب قدر) لە زاراوەی عیرفانیدا لیقای جیلوەگەری رێبواری رێگەی تەریقەتە، بەمەش مانای بەیتەکان دەبێتە لەم کاتی لیقای جیلوە و دەرکەوتنەدا کە زۆر خۆشەویست و بەرێزە حەز دەکەم تا بەیانی هاورێی بەردەوامی ئەم جیلوەیە بم، وەی کە چەندە ئارەزوومە کە لە شەوێکی تاریکدا بە دوای دانە مرواریەکانی تەجەلی یاری حەقدا بگەڕێم و بە سۆراخی ئەو جیلوە و لیقایەوە بچم.

**٥-ای صبا امشبم مدد فرمای**

**که سحرگه شکفتنم هوس است**

**ئەی سەبا ئیمشەبەم مەدەد فەرمای، کە سەهەرگەه شوکوفتەنەم هەڤەسەست.**

ئەی سەبا ئەمشەو یارمەتیم بدە، چونکە ئارەزوومە کە بەرەبەیان بپشکوێم.

مدد فرمای: یارمەتی بفەرموو، بفەرموو بۆ یارمەتی دانم     شکفتن: پشکوتن

خونچە لە بەرەبەیاندا بە هەڵکردنی هەوا دەپشکوێ، شاعیریش بۆ پشکوتن و کرانەوەی خۆی داوای یارمەتی لە بای سەبا دەکات و دەڵێ: یارمەتیم بدە و لە بەرەبەیاندا هەڵکە، چونکە ئارەزوومە لە بەرەبەیاندا بپشکوێم.



(سودی) لە شەرحی بەیتی پێشوو و ئەم بەیتەشدا (دردانە)ی بە شیعر داوەتە قەڵەم و دەڵێ: وەی کە ئارەزوومە لە شەوی تاریکدا غەزەلی وا ناسك بڵێم و ئەی سەبا ئەمشەو یارمەتیم بدە تا غەزەلێ بڵێم، چونکە ئارەزوومە بەرەبەیان بیخوێنمەوە{سودی، ج١، ل٢٩٦}.

**٦-از برای شرف به نوک مژه**

**خاك راه تو رُفتنم هوس است**

**ئەز بەرایی شەرەف بە نوکی موژە، خاکی راهی تو روفتەنەم هەڤەسەست.**

ئارەزوومە بۆ رێز و شەرەف خاکی رێگەی تۆ بە نوکی برژانگ بماڵم.

شرف: رێز و گەورەیی، لە کوردیشدا بەکاردێت، بۆ نموونە: شەرەفێکی گەورەیە بۆ من کە نۆکەری ئێوەم     نوك: نوك، سەری تیژی هەر شتێ     نوك مژە: نوکی برژانگ

رفتن: گسك دان، ماڵین

واتە: بۆ من مایەی شەرەفە گەر بە نوکی برژانگەکانم خاکی رێگەی تۆ بماڵم و سەرم بخەمە سەر خاکی رێگەی تۆ بۆیە ئارەزوومە ئەو کارەم بە نسیب ببێ تا ببێتە مایەی شەرەف و گەورەیی بۆ من. سواڵکەریی لە دەرگای تۆدا سوڵتانییە { ئیلاهی نامە، ئەکرەم عەنەبی}

**٧-همچو حافظ به رغم مدعیان**

**شعر رندانه گفتنم هوس است**

**هەمچو هافز بە رەغمی مودەئییان، شیعری ریندانە گوفتەنەم سەڤەسەست.**

ئارەزوومە هەروەك حافز بۆ قەپۆز شکاندنی بانگەشەکەران شیعری رەندانە بڵێم.

همچو: هەروەك

به رغم: بۆ دژایەتی کردن، لە دژایەتی، قسە لە عەرزدان، بەکوێری چاوی...،

مدعیان: داعیەداران و فیزدارانی هیچ لە باردا نەبوو.

شعر رندانە: شیعری رەمزی، شعرێکە کە شاعیر مەبەستی خۆی تێیدا بڵێت بە بێ ئەوەی کەسانی ناحەز بتوانن بەڵگەیەکیان بۆ تۆمەتبارکردنی تێیدا دەستکەوێت و ئەم جۆرە شیعرەش بە زۆری لە سەردەمی دەسەڵاتی دیکتاتۆریدا زۆر پەرەدەسەنێت وەك لە سەردەمی حیزبی بەعسدا کە فەلەستین کرابووە بیانوویەك بۆ قسەکردن لە بارەی کوردستانەوە و شاعیر بە درکە و لێکچواندن مەبەستی خۆی دەگەیەنێت. چیرۆکی گیاندارانیش لەم جۆرە چنینانەیە، سەردەمی حافزیش لە لایەکەوە هێز و بەندیخانەی سوڵتان و پادشا دەسەڵاتدارەکان و قسە و قسەلۆك و تۆمەتبارکردن و کافرکردنی بە ناو زاهید و شەرعزانەکان و سادەیی و خۆشباوەڕی و زو بڕیاردانی خەڵکی رەمەکی لە ئارادا بوو، بۆیە بۆ دەربازبوونی لەم هەموو چنگە بە ناچاری

شیعری رەمزی گوتووە و بە ئاشکرا مەبەستی خۆی نەدرکاندووە. بۆیە دەڵێ: وەك چۆن شیعرەکانی حافز رەمزین، ئارەزوومە کە بۆ دژایەتی رای داعیە و فیزدارە هیچ لە باردا نەبووەکان شیعری رەندانە بڵێم و مەبەستەکانم بە نائاشکرا بخەمەڕ.





## غەزەلی سی و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات)**

**١-صحن  بستان ذوق بخش و صحبت یاران خوش**

**وقت گل خوش باد کز وی وقت میخواران خوش است**

**سەهنی بووستان زۆوقبەخش و سوهبەتی یاران خوش، ڤەقتی گول خوش باد کز ڤەی ڤەقتی مەیخاران خوشەست.**

ناوباخ زەوقبەخش و هاودەمی یاران خۆشە، کاتی گوڵ خۆش بێت کە بە هۆی ئەوەوە کاتی مەی نۆشان خۆش و شادە.

صحن: بۆشایی، ناوەڕاست، ناو صحن بستان: ناوباخ، ناوەندی باخ صحبت: هاوڕێیەتی، پێکەوە بوون هاودەمی وقت گل خوش باد: کاتی گوڵ خۆش بێت، واتە گوڵ خۆشحاڵ و شادبێت

کز وی: لەوەوە، بەهۆی ئەوەوە میخواران: مەینۆشان

دەڵێ: ناوباخ بە هۆی جوانی تەڕ و پاراوییەوە زەوق و چێژ بە مرۆڤ دەبەخشێ و هاودەمی و هاوڕێیەتی یارانیش لەم شوێنەدا خۆشە، گوڵ خۆشحاڵ بێت، چونکە ئەو ئەم جوانییەی داوە بە باخ و بە هۆی جوانی و پاراوی ئەوەوەیە کە فەزایەکی خۆش و کاتێکی خۆشی بۆ مەینۆشان هێناوەتە ئارا.

**٢-از صبا هردم مشام جان ما خوش می شود**

**آری آری طیب انفاس هواداران خوش است**

**ئەز سەبا هەردەم مەشامی جانی ما خوش می شەڤەد، ئاری ئاری تیبی ئەنفاسی هەڤاداران خوشەست.**

هەستی بۆنکردنی گیانی ئێمە هەردەم لە سەباوە بۆنخۆش دەبێت و حەز و خۆشی دەست دەکەوێت، ئەرێ ئەرێ بۆنی خۆشی هەناسەی ئارەزوومەندان خۆشە.

صبا: بای بەیانیان هەردەم: هەرساتە، بەڵام (دم) بە مانای هەناسەش دێت واتە هەر هەناسەیەك.

مشام: شوێنی بۆنکردن لە دەماخدا پێی دەگوترێ مەشام، هەستی بۆنکردن.

مشام جان: هەستی بۆنکردنی گیان

آری آری: ئەرێ ئەرێ، بۆ جەختکردنە واتە بە راستی وایە  طیب: پاك، بەڵام لێرەدا بە ماناى خۆش دێت      انفاس: هەناسەکان

هواداران: لایەنگران، موشتاقان، ئارەزوومەندان، عاشقان، کەسێك کە پشتی یەکێکی کە بگرێت پێی دەڵێن هەوداری فڵانەکەسە.

دەڵێ: هەمیشە لە بای سەباوە هەستی بۆنکردنی گیانی ئێمە بۆنی خۆش بۆندەکات و گیانمان پڕ دەبێ لە بۆنی خۆش، بەڕاستی وایە کە بۆنی خۆشی هەواداران و موشتاقان خۆشە. واتە سەبا کە لایەنگری یار و مەعشوقە هەمیشە لەوێوە دێ بۆیە هەناسەی ئەویش خۆشە.

گەر (هردم) بە واتای هەر هەناسەیەك مانا بکەین ئەوا بەیتەکە دەبێتە: هەر هەناسەیەك لە بای سەباوە هەڵدەکێشین بە بۆنی گیانی ئێمە خۆشە و گیانمان پڕ دەکات لە بۆنی خۆش، هەر وایە و بە راستی گیانمان بۆنخۆش دەبێ، چونکە بای سەبا لایەنگری یارە و هەناسەی ئەویش بۆنی خۆشە، هەڵکردنی بای بە هەناسەدان داوە قەڵەم.

**٣-ناگشوده گل نقاب آهنگ رحلت سازکرد**

**ناله‌کن بلبل که گلبانگ دل افگاران خوش است**

**ناگشودە گول نەقاب ئاهەنگی ڕیحلەت سازکەرد، نالە کون بوولبوول کە گولبانگی دل ئەفگاران خوشەست.**

گوڵ هێشتا پەچەی لانەدابوو ـ بە تەواوی نەپشکوتبووە ـ نیازی سەفەری کرد(ئاوازی سەفەری سازدا) بناڵێنە بوولبوول، چونکە ناڵە و زاریی دڵبریندااران خۆشە.

ناگشودە: نەکراوە   ناگشودە گل نقاب: پەچەی گوڵ بە نەکراوەیی، مەبەست لەوەیە کە گوڵ نەکراوەتەوە و هێشتا خونچە بووە.

آهنگ: ئاواز لێرەدا بە واتای نیاز هاتووە      رحلت: سەفەر، کۆچکردن، مردن

لەم بەیتەدا ئاماژەیەکی بۆ مەرگی گوڵ تێدایە، چونکە گوڵ تەمەنێکی زۆر کورتی هەیە لێرەدا (آهنگ رحلت سازکرد) یش دەبێتە: ئاوازی مەرگی چڕی.

نالەکن: ناڵەناڵ بکە، بناڵێنە      گلبانگ: ناڵە، فریاد، بانگی خۆش

دل افگاران: دڵبریندااران، دڵئێشاوان، خەمباران

دەڵێ: بەرلەوەی گوڵ پەچەکەی سەر رووخساری لابدات، واتە بەرلەوەی کە بپشکوێت و قۆناغی خونچەیی بەجێ بهێڵێت ئاوازی سەفەری لێدا، واتە نیازی سەفەری کرد و ویستی بڕوات، یاخود بە مانای دووەم ئاوازی مەرگی لێدا و هەڵوەری، ئەی بوولبوول مادام گوڵ بەم



زووییە بەجێمان دێڵی بناڵێنە، چونکە بانگی خۆشی گریە و ناڵەی دڵبریندااران و خەمباران خۆش و غەمگینە و سووتێنەر و خەمناکە، لەڕاستیدا (گلبانگ دل افگاران خوش است) لەم بەیتەی داهاتوودا زیاتر ڕووندەبێتەوە.

**٤-مرغ شب خوان را بشارت باد کاندر راه عشق**

**دوست را با نالهء شبهای بیداران خوش است**

**مورغی شەبخان را بەشارەت باد کەندەر راهی ئیشق، دوست را با نالەیی شەبهایی بیداران خوشەست.**

موژدە بێ بوولبوولی شەوبێدار و ئاوازخوێن لە نێو ڕێگەی عەشقدا دۆست خۆشی لە ناڵەی بێدارانی کاتی شەو دێت.

مرغ شب خوان: ئەو باڵندەیەی کە بە شەودا دەخوێنێت، درکەیە لە بوولبوول لێرەدا مەبەست لەو عارفانەیە کە بە شەودا موناجاتی خودا دەکەن.

بشارت باد: مژدەبێ     اندر: لەنێو

لە میسراعی دووەمدا بە بوولبوول دەڵێت بناڵێنە و کەموکورتی نەکەی لە ناڵێدا، لێرەشدا مژدەبێ لە بوولبوول کە بە شەودا دەخوێنێ و دەناڵێنی. لە نێو ڕێگەی عەشقدا دۆست حەزی لەو ناڵەیەی ئەوە و پێی دڵخۆش دەبێت. لە مانای عیرفانیدا بوولبوول عارفی شەوبێداری ڕێگەی موناجاتە لەگەڵ خوادا. شاعیر دەڵێ: ئەی شەو بێداری دەم بە موناجات زیاتر فریاد و ناڵە بکە، چونکە دۆست ـ واتە خودا ـ زۆر حەزی لە گوێگرتنە لەو موناجاتەی تۆ (د.هروی) لە (ئوستاد فروزانفر)ەوە هێناویەتی کە چەمك و مەفهومی بەیتەکە ئاماژەیە بەم فەرموودە قودسییە: " لە خەبەردا هاتووە کە کاتێ بەندەیەك دۆعا دەکات خوای گەورە زیاتر ئەوی خۆش دەوێت و بە جوبرەئیل دەڵێ درەنگتر داواکەی جێبەجێ بکە من حەز دەکەم موناجات و ئاوازی ئەوم گوێ لێ بێ) {هروی، ج١، ل١٤٩}.

**٥-نیست در بازار عالم خوشدلی ور زانکه هست**

**شیوهء رندی و خوشباشی عیاران خوش است**

**نیست دەر بازاری ئالەم خوشدلی ڤەر زانکە هەست، شیڤەیی ڕیندی و خوشباشیی ئەییاران خوشەست.**

لە بازاڕی جیهاندا شادی و دڵشادی نییە، ئەگەر هەشبێ بە شێوەی ڕەندی و خەمنەخۆری عەیاران خۆشە.

بازار عالم: بازاڕی جیهان     خوشدلی: شادی، دڵشادی     شیوه: شێوه، شێواز     خۆشباشی: خەفەت نەخۆری، خەم نەخۆری، کەسێ که دووربێت لەخەم و خەفەت

عیار: زیرەك، چالاك، هۆشیار، واته کەسێك که هەمیشه له جوڵەدا بێت و له جێگەیەك قەرار نەگرێت و هەمیشه له هاتووچۆدا بێت، بەڵام وەك زاراوە، عەیار کەسێکه که زۆر عاقڵ بێت و به نازی عاقڵی خۆی له نێو خەڵکیدا بێ پەروا دەبێت و گوێ به داب و نەریت و سنوورەکان نادات. (عیاران)یش لەگەڵ ئەوەی کۆی (عیار)ە، بەڵام دەستەیەك بوون له خەڵکی رەمەکی که خاوەن رێکخستن بوون وەك حیزب و تا رادەیەك له شاسوار و پاڵەوانەکانی ئەوروپا چۆن له سەدەکانی ناوەڕاستدا به زۆری جل و بەرگی تایبەت و دابوونەریتی جیایان هەبووە، ئەندامانی ئەم پۆله جوامێرییان به بنچینەی کاری خۆیان داناوە و له رێگەی رێگری و چەتەییەوە ژیاون. دەستەی عەیاران خەڵکانی جەنگاوەر و شەڕانی بوون.

کورتەی مانای بەیتەکە: له بازاڕی جیهاندا شادیی وجودی نییه و گەر هەشبێ بەو شێوه خۆشه که دەستەی عەیاران به بێ پەروایی و بێ خەم و خەفەتی و ئازایەتی چێژ دەبەن خۆشه، نەك شێواز و شێوەی ئەهلی ریا که به ترس و لەرزەوە دەژین، حافز زۆر جار مەبەستی له رەند و عەیاران عارفه راستەقینەکانه.

**٦-از زبان سوسن آزاده‌ام آمد به گوش**

**کاندر این دیرکهن کار سبکباران خوش است**

**ئەز زەبانی سۆوسەنی ئازادەئەم ئامەد بە گوش، کەندەرئین دەیری کوهەن کاری سەبووکباران خوشەست.**

له زمانی سەوسەنی سەربەستەوە گوێم لێ بوو، که لەم دێره کۆنەدا کاری بارسووکەکان چاکترە.

سوسن: گیا یا گوڵێکی بۆنخۆشه که هەمیشه سەوزه و پەلەکانی وەك زمان وایه، سەوسەن.
زبان سوسن: پەلی سەوسەن، چونکه پەلەکانی سەوسەن وەك زمان وان، هەروەها له هەمیشه سەوزیدا وەك زمانحاڵێك بۆ بەردەوامی ژیان.
سوسن آزاده: واته سەوسەنێك که تەواوی ساڵ سەوزە، چونکه میوە و بەری نییه ـ هەروەها دارسەرویش ـ لقەکانی هەمیشه رێك و راستن و وەك درەختی دیکه له تاو قورسی بەرەکانیاندا ناچەمێتەوە، به ئازاد و سەربەست و بارسووك وەسفکراون سەوسەنی سەربەست واته سەوسەنی بێ بەر و بێ باری گران.



گوش: گوێ آمد     بەگوش: هاتەگوێ، گوێم لێ بوو     کهن: کۆن، دێرین  دیرکهن: مەبەست له دونیایه له بری دێری کۆن له کوردیدا هەندێ جار وێرانه بەکاردەهێنرێت.

به بوونی زمانی سەوسەن و بارسووکی ئەو له دنیادا دەڵێ: من له زمانی سەوسەنەوە، واته له هەمیشه سەوزی پەلەکانی سەوسەن و سەربەستی و بێباری گرانی ئەوەوە، ئەوەم گوێ لێ بوو لەم وێرانه دێرەی دونیادا ئەوانه چاکترن که بارسووکن و خەم و خەفەتیان نییه و باری گرانی مەسئولییەت و خزمەتکردن هەڵناگرن و بەئازادی دەژین، بارسووکان بەو کەسانەش دەگوترێ که بیر له شت ناکانەوە و له بیری نهێنییەکانی گەردوون و ئەودیو سروشتدا نین.

**٧-حافظا ترک جیهان گفتن طریق خوشدلیست**

**تا پنداری که احوال جهانداران خوش است**

**هافزا تەرکی جەهان گوفتەن تەریقی خوشدلیست، تا پینداری کە ئەهڤالی جەهانداران خوشەست.**

حافز رێگەی دڵخۆشبوون و شادی تەرکی دنیا کردنه، هەرگیز گومان نەبەیت که ئەوانەی زۆر خەریکی دونیان ئەحواڵیان چاك و خۆشه.

ترك: تەرك، وازلێهێنان   ترك جهان گفتن: تەرکی دونیاکردن، واته واز له دونیا و خۆشییەکانی دونیا هێنان     پنداری: گومان نەبەی، وا تەسەور نەکەی.   جیهانداران: ئەوانەی که خەریکی دونیان

وازهێنان له دونیا و خۆشییەکانی له پێویستییەکانی رێگەی گەیشتن به خودایه، وازهێنان له دونیا له رێگەی تەریقەتدا وازهێنانه له هەموو ئەو شتانەی که مرۆڤ بێ ئاگا دەکات له رۆشتن بەرەو ناخ و ناوەوە ـ گەیشتن به خودا ـ، بەڵام له شەریعەتدا وازهێنان له دنیا دەرهێنانی دنیایه له دڵ و دڵ نەبەستنه به خۆشییه کاتییەکانی دنیا له شەریعەتدا دەکرێ دەوڵەمەند بیت و دڵ به دنیا نەدەی، بەڵام له تەریقەتدا نابێ دەوڵەمەند بیت، تەنانەت ئەو شته پیرۆزانەش وەك نوێژ و رۆژو... که له رێگەی بیرکردنەوە و بەرەو خواچوون دوورت دەخاتەوە به دنیایی دەدرێنه قەڵەم . بۆیه حافز دەڵێ: گەر دەتەوێ بگەی به رێگەی خۆشحاڵی و شادی و ئاسوودەیی پێویسته تەرکی دنیا بکەیت و واز له دنیا بهێنیت، چونکه تەنیا رێگەی گەیشتن به ئاسوودەیی وازهێنانه له دنیا، واش بیرمەکەرەوە که ئەوانەی دونیایان هەیه و خەریکی دونیان خۆشحاڵ بن و ئەحواڵی روحییان چاك بێت، ئەوان له نەدارەکان نائاسوودەترن. دونیا ئەوەیه تا به دوایدا برۆیت نائاسوودەتر دەبیت و تا وازی لێ بهێنی خۆشحاڵتر دەبیت.





## غەزەلی سی و دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلاتن)**

**١-کنون که بر کف گل جام بادهء صاف است**

**به صد هزار زبان بلبش در اوصاف است**

**کنون کە بەر کەفی گول جامی بادەیی سافەست، بە سەد هەزار زەبان بوولبوولەش دەر ئۆوسافەست.**

ئێستا کە شەرابی بێ خەوش بە دەستی گوڵەوەیە، بوولبوول بە سەد هەزار زمان لە وەسفی ئەودایە.

کف گل: دەستی گوڵ، مەبەست لە لەپی گوڵ کاسەی گوڵە کە پەڕەکانی لەسەر دەوەستن جام بادە: پێکی شەراب، مەبەست لە پەڕی گوڵە کە وەك شەراب سوورە.

زبان: زمان در اوصاف است: لەوەسفی دایە

بەیتەکە باس لە هاتنی وەزری بەهار و سەیر و سەفای گوڵ و پشکوتنی گوڵ دەکات، کاسەی گوڵی بە لەپی دەست یاخود دەست چواندووە پەڕە سوورەکانیشی بە پێکی شەرابی سوور و دەڵێ: هەروەك چۆن بڵێی پێکی شەراب لە دەستیدابێ ئاوا گوڵیش پێکی شەرابی پەڕە سوورەکانی لە سەر دەستی داناوە، ئەم دیمەنەش هێندە جوان و سەرنجڕاکێشە بوولبوول بە سەد هەزار زمان و شێوە دەربڕین کەوتووەتە وەسفی ئەم جوانییەی کە گوڵ بە سروشتی بەخشیوە.(گوڵ یاری حەق و بوولبوول عاشقانی عارف و سروشتیش دونیای عیرفانە).

**٢-بخواه دفتر اشعار و راه صحرا گیر**

**چه وقت مدرسه و بحث کشف کشاف است**

**بخاه دەفتەری ئەشعار و راهی سەهرا گیر، چە ڤەقتی مەدرەسە ڤو بەهسی کەشفی کەشافەست.**

دەفتەری شیعر بەدەست بهێنە و ڕێگەی دەشت بگرەبەر، چ کاتی گۆشەی حوجرە و باسی (کشف الکشاف)ە.

بخواه: داوا بکە، بەڵام لێرەدا واتای بە دەست بهێنە زیاتر لەگەڵ مانای گشتی بەیتەکەدا دێتەوە هەرچەندە مانای داوابکەش راستە.

دفتر اشعار: دیوان و دەفتەری شیعر          صحرا: بیابان، دەشت

مدرسە: قوتابخانە، بەڵام لەو سەردەمەدا حوجرە قوتابخانە بووە.     کشف: کەشف، گەڕان

کشاف: تەفسیری قورئانی پیرۆزی (الکشاف)ی زانای گەورەی زەمخشرییە.

کشف الکشاف: کتێبی شەرح و حاشییەی تەفسیرەکەی زەمخشرییە کە(شیخ عەلامە ابی حفص عومەری کوڕی عبدالرحمن) ناسراو بە(سراج) داینـاوە.

لە بەیتی یەکەمدا باسی دیمەنی گوڵ و بوولبوولی بەهاری کرد و لێرەشدا فەقێ و قوتابیانی گۆشەی حوجرەکان هان دەدات کە لەم وەرزە خۆشەدا لە گۆشەی حوجرەکاندا بێنە دەرەوە و واز لە خوێندن بهێنن و رووبکەنە دەشت و دەست بکەنە خوێندنەوەی شیعر، دەڵێ: داوای دەفتەری شیعر بکە یاخود دەفتەری شیعر بەدەست بهێنە و روو بکەرە دەشت و دەر. چونکە لەم وەرزە خۆشەدا کاتی قوتابخانە و دەرس خوێندن و لێکۆڵینەوە و خوێندنی شەرحەکەی(سراج) نییە کە لە سەر تەفسیری (کشاف)ی زەمخشری داینـاوە یاخود ئێستا کاتی کردنەوە و دیراسەی تەفسیری کشاف نییە. بێگومان گوتاری شاعیر بۆ فەقێکانە، چونکە لەو سەردەمەدا و تا ئێستاش (کشاف) لە بەرنامەی فەقێیەتیدا دەخوێندرێ و هانیان دەدات بەرەو دونیای عیرفان بڕۆن.

**٣- بُبر ز خلق و ز عنقا قیاس کار بگیر**

**که صیت گوشەنشینان ز قاف تا قاف است**

**ببوور ز خەلق و ز ئەنقا قیاسی کار بگیر، کە سیتی گوشەنشینان ز قاف تا قافەسەت.**

لە خەلق دابڕێ و سیمورغ بکە بە سەرمەشقی کاری خۆت، چونکە ناوداری گۆشەنشینان لە قاف تا قافە.

ببر: بڕە        ببر ز خلق: لە خەلق جیابەرەوە و دووربە لێیان، لە خەڵك دابڕێ

خلق: دروستکراو، وجود، مرۆڤ، خەڵك  عنقا: سیمورغ، باڵندەیەکی ئەفسانەییە کە لەکێوی قاف دەژی  صیت: ناوداری، شوهرەت

گوشەنشین: گۆشەنشین، کەسێ کە تێکەڵاوی کەس ناکات.

قاف: بە مانای کێو دێت و خۆشی کێوێکە واتە کێوی (قاف) لە ئەفسانەدا باوەڕ وایە کە کێوی قاف چواردەوری دنیای گرتووە.

ز قاف تا قاف: لە قاف تا قاف، واتە ئەم سەری دنیا تا ئەوسەری دونیا.

ئاشکرایە کە سیمورغ تەنیا ناوی هەیە و کەس نەیدیوە و نەهاتووەتە نێو کۆمەڵگە لە کاتێکدا لای هەمووان بە ناوبانگە و ناو و شۆرەتی هەیە، بۆیە تۆش گەر دەتەوێ وەك سیمورغ ناوداربیت پێویستە ئەو بکەیتە سەرمەشق و وەك ئەو رەفتار بکەیت، کە دەڵێ: لە خەڵکی



دوورکەوەوە، یاخود لە تەواوی دروستکراوەکان دوورکەوەوە و تەنیایی هەڵبژێرە و سیمورغ بکە سەر مەشقی خۆت، چونکە ناو و شۆرەتی گۆشەنشین و خەڵوەتنشینان لەم سەری دنیا تا ئەو سەری دونیایە و لە دنیادا ناو و شۆرەتیان دەنگیداوەتەوە، تۆش لە خەڵك دوورکەوەوە تا ناو و شۆرەتت سەرانسەری دونیا بگرێتەوە.

**٤- فقیه مدرسه دی مست بوود و فتوی داد**

**که می حرام ولی به ز مال اوقاف است**

**فەقیهی مەدرەسە دی مەست بوود و فەتڤا داد، کە مەی هەرام ڤەلی بیە ز مالی ئۆوقافەست.**

دوێنێ زانای فیقهزانی حوجرە و قوتابخانە سەرخۆش بوو، فتوای دا: کە شەراب خواردنەوە حەرامە، بەڵام چاکترە لە خواردنی ماڵی وەقفکراو.

فقیە: فیقهزان، زانای بوواری فیقە          فتوی داد: فتوای دا          بە: بهتر: چاکترە

مال اوقاف: ماڵی وەقفکراو، پارە یا هەر شتێك کە وەقفکرا بێت، (اوقافیش) واتە: ئەو شتەی کە (وەقف) دەکرێت بۆ شتێکی دیار، بۆ نموونە دەگوترێت (فلان باخ) وەقفی مزگەوتە واتە بەروبووم و قازانجەکەی بۆ مزگەوت دەبێت و حەرامە لە شتی تردا سەرف بکرێت.

بەیتەکە بەراورد لە نێوان حەرامیی دوو حەرامدایە کە ئەوانیش عارەق و خواردنی ماڵی وەقفە و لای شاعیر مەیخواردنەوە ئاسانتر و گوناهی کەمترە لە ماڵی وەقفکراو، چونکە ئەمیان تەنیا لە نێوان خودا و بەندە دایە، بەڵام ئەوی دیکەیان حەقی خەڵکییە و دەڵێ: دوێنێ فتوادەری رەسمی حوجرە کە رەنگە خۆشی یەکێك بووبێت لەو کەسانەی کە ماڵی وەقفیان خواردووە مەست بوو، لە کاتی مەستیدا کە ئاگای لە خۆی نەما فتوایدا کە خواردنی ماڵی وەقفکراو خراپترە لە مەیخواردنەوە. لە کاتێکدا بەیتەکە تانەیەکە لەو کەسانەی کە پارە و ماڵی وەقفکراو دەخۆن ئاماژەیەکی تێدایە بۆ (مبارزالدین محمد پاشا)، چونکە ئەو پاشایە کە لەپێشدا باسکرا لە رێگەگرتن لە کاری خراپە و فەرمان بەچاکەدا زۆر توند بوو، بەڵام پاشان حەزی داگیرکردنی جیهان کەوتە سەری و دەستی کردە دەست بەسەرداگرتنی سەروەت و سامان و پارە و شوێنە وەقفکراوەکان و هەموویانی هێنایە دیوان و کۆشکی خۆی.

دەکرێ لێرەشدا هەمان ئاماژە بێت کە فتوادەری رەسمی لە کاتێکدا کە بە وشیاری هەرگیز ناوێرێت و نایەوێت فتوای وا بدات، بەڵام دوێنی سەرخۆش بوو ئەو فتوایەی دا، بەمەش دەکرێ لێی هەڵبێت کە فتوادان بە مەستی دروست نییە و ئەو فتوایە وەرناگیرێت. بە هەرحاڵ لێرەدا

حافز وەك هەمیشە تانە لە حوجرەیی و فتوادەرە رەسمییەکان دەدات و وەسفی عەشق و عیرفانی راستی دەکات.

**٥-به دُرد و صاف ترا حکم نیست خوش درکش**

**که هرچه ساقی ما کرد عین الطاف است**

**به دوورد و ساف تورا هوکم نیست خوش دەرکەش، کە هەرچە ساقیی ما کەرد ئەینی ئەلتافەست.**

بڕیار بە دەست تۆ نییە کە شەرابی بێ خەوش بنۆشی یا خڵتەوخاڵی بنەکەی، کە وایە بەخۆشی بینۆشە، چونکە ساقیی ئێمە هەرچی کردووە لوتف و خۆشەویستییە.

تراحکم نسیت: بڕیار بە دەست تۆ نییە، ئیختیاری تۆ نییە.

درکش: بنۆشە، هەڵدە، درکش واتە بکێشە، بەڵام لە کوردیدا بکێشە بۆ جگەرە و شتی وەك ئەو بەکاردێ نەوەك بۆ شەراب کە بنۆشە یاخود هەڵدە بەکاردێ

الطاف: کۆی لطف، نەرم و نیانی، بەڵام لێرەدا بە مانای چاکە و خۆشەویستی دێت.

درد و صاف: مەیی (صاف) بێخەوش گرانترە و سەرتوێژ و سەرانسەری شەرابەکەیە، بەڵام (درد) بنی کوپەڵەیەکەیە و خڵتەدارە و هەرزانترە، لێرەدا مەبەست لە خۆشی و بێخەوش و خڵتەداری و ناخۆشییە.

بەیتەکە ئاماژەیە بە پڕکردنی پێکەکانی ئێمە هەر لە سەرەتای بوونمانەوە و جەختکردنەوەیە لە سەر باوەڕی جەبرییانەی شاعیر، بەڵام لێرەدا (ساقی ـ خودا) بە نەرمی و چاکییەوە کارەکانی ئەنجامداوە و شاعیر دڵنیایە لەوەی کە ساقی هەرچیی کردووە بە خۆشەویستی و چاکییەوە کردوویەتی.

دەڵێ: وەك چۆن ساقی پێکەکان پڕ دەکات و تۆ سەربەست نیت لەوەی بۆ خۆتی تێکەی ئیتر هەرچی بوو لە بێخەوش و خڵتەدار دەبێ هەڵێدەی، ئێمەش لە کاتی دروستکردنماندا چارەنووسمان لە دونیادا دیاریکراوە لە بەر ئەمە گەر ژیانمان لە دونیادا پڕ بوو لە خۆشی و بێخەوشی یاخود پڕ بووو لە ناخۆشی و خڵتەداری نابێ خەفەتی پێ بخۆین و خەم دامانگرێت چونکە ئەوەی لەو سەرەوە کارەکانی بە دەستە لە خۆمان زیاتر بەرامبەرمان میهرەبانترە و ئەو لە خۆشەویستیدا ئەمانەی بۆ نووسیوین، هەربۆیە هەرکامێکیان بوو بەخۆشی هەڵێدە، واتە بەخۆشی بیگوزەرێنە و ژیان ببە سەر گەر خۆشی بوو یان ناخۆشی، کاتێ مرۆڤ هەستیکرد ئەم رێگەیە بە ئارەزووی خۆی تەی ناکات و ئەو کەسەش فەرمانی پێداوە میهرەبانترین و خۆشەویسترینە ئیدی بە دڵنیاییەوە پێشوازی لە مەینەتییەکانی دەکات، شاعیریش دڵنیامان



دەکاتەوە و دەڵێ: بەرنامەدانەر لە هەمووان نەرم و نیانتر و خۆشەویستترە بۆیە بە دڵنیاییەوە هەنگاوهەڵگرە.

**٦-حدیث مدعیان و خیال همکاری**

**همان حکایت زردوز و بووریاباف است**

**هەدیسی مودەئیبیان و خەیالی هەمکاری، هەمان هکایەتی زەردوز و بووریابافەست.**

چیرۆکی بانگەشەکەرانی مایەپوچ و خەیاڵی هاوپیشەیی ئەوان، هەمان چیرۆکی سیمچن و حەسیرچنەکانە.

زردوز: سیم درو، کەسانێك کە لەسەر پارچەی گرانبەهای وەك ئاوریشم بە سیم و پارچەی بریسکەدار نەخش دروست دەکەن.

بووریا: حەسیری لە قامیش دروستکراو    بووریاباف: حەسیرچن

سەبارەت بە چیرۆکی سیمچن و حەسیرچنەکان دەگێڕنەوە کە جارێکیان پادشایەك بۆ چنینی نەخش لە سەر پارچەیەکی گرانبەها، داوای نەخشسازەکانی کرد، کاتێ ئامادەبوون، حەسیرچنەکانیش هاتبوون، پادشا بە سەرسوڕمانەوە پرسی ئێوە بۆچی هاتوون؟ ئەوانیش گوتیان گەر چنین بێت ئێمەش کاری چنین دەکەین، هاوشێوەی ئەم چیرۆکە وەك تێکەڵاوبوونی کۆپاندرووەکان بووو بە بەرگدرووەکان.

مەبەست ئەوەیە: گەرچی بانگەشەکەرانی زانست و زانا راستەقینەکان هەردووکیان کتێبیان بە دەستەوەیە، بەڵام کاریان زۆر جیاوازە لە یەکتری هەروەك چۆن نەخشسازی بە سیم و لەسەر پارچەی گرانبەها و حەسیرچنین هەردووکیان چنینن، بەڵام جیاوازییان زۆرە و یەکەمیان کارێکی ورد و زەوق و سەلیقەی دەوێ، بەڵام حەسیرچنین کارێکی سەرەتاییە کەوایە هاوپیشەیی ئەوان لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێ و زۆر جیاوازن لێکدی و بانگەشەکەری مایەپوچ لە کاتی کارکردندا تێکدەشکێ.

**٧-خموش حافظ و این نکتەهای چون زر سرخ**

**نگاەدار که قُلّب شهر صرّاف است**

**خەموش هافز و ئین نوکتەهای چون زەری سورخ، نیگاهدار کە قوللابی شەهر سەررافەست.**

حافز بێ دەنگ بەو ئەم قسانەی (غەزەلە) وەك ئاڵتون وان لای خۆت بپارێزە، چونکە تەزویرکاری شار، خۆی ئەو کەسەیە کە تەزویر و ئەسڵی لە یەکتری جیا دەکاتەوە.

نکتە: قسەی کاریگەر مەبەست لە غەزەلەکانییەتی

زر سرخ: ئاڵتونی بێخەوش          نگاه دار: ئاگات لێ بێ، بیپارێزە
قلاّب: تەزویرکار، تەزویرچی، کەسێ کە سکەی قەڵب دروستدەکات
صراف: کەسێ کە ئەسڵی لە تەزویر جیا دەکاتەوە

حافز لە سەردەمێکدا بووە کە سەردەمەکە خۆی خراپبووە و بە خۆی دەڵێ: بێدەنگ بە و ئەو غەزەلانەی دەیاننووسی لای خۆت بیانپارێزە و بلاّویان مەکەرەوە، چونکە ئەو کەسەی کە ئەسڵ و تەزویر لە یەکتری جیا دەکاتەوە و ئەوکارەی پێ سپێردراوە خودی تەزویرچییەکەیە. دەکرێ ئاماژە بێت بەوەی کە ئەو سەردەمە رەخنەگری غەزەل یاخود ئەو کەسەی کە ئەرکی هەڵسەنگاندنی شیعری پێ بەخشراوە خۆی دزی شیعر بوو بێت، هەروەك چۆن ئەمڕۆ کاتێ نووسینێك، شیعرێك یان هەردەقێکی جوان دەچێتە بەردەستی دەستەی نووسەرانی تەزویرچیی گۆڤارێك یان رۆژنامەیەکەوە بە نێوی خۆیەوە بلاّوی دەکاتەوە یاخود مامۆستایەکی زانکۆ باسێکی زانستی قوتابییەکی دەدزێت و بە نێوی خۆیەوە چاپی دەکات، بە داخەوە ئەم دیاردەیە لە ئەمڕۆی رۆشنبیری ئێمەدا زۆربووە.



## غەزەلی سی و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١-درین زمانه رفیقی که خالی از خلل است**

**صراحی می صاف و سفینهء غزل است**

**دەرین زەمانە رەفیقی کە خالی ئەز خەلەلەست، سوراهیی مەی ساف و سەفینەیی غەزەلەست.**

لەم زەمانەدا هاوڕێیەك کە خراپ نییە سوراحی شەرابی بێخەوش و دەفتەری غەزەلە.

خلل: خراپی، فێڵ، تەڵەکە          که خالی از خلل: کە خاڵییە لە خراپی، کە خراپ نییە سفینە: سەفینە، کەشتی، دەفتەری شیعر یاخود دیوانی شیعر لێرەشدا هەردوو واتاکە دەگەیەنێ.

دیارە زەمانەکە پڕ بووە لە خراپەکاری و هەڵخەڵەتاندن بۆیە شاعیر دەڵێ: تەنیا هاوڕێ و دۆستانێك کە لەم دەور و رۆژگارەدا نابنە مایەی خراپەکاری و بێبەرین لە خراپە سوراحی شەراب(عەشق) و دەفتەری غەزەلیاتە.

**٢-جریده رو که گذرگاه عافیت تنگ است**

**پیاله گیر که عمر عزیز بی بدل است**

**جەریدە رۆو کە گوزەرگاهی ئافییەت تەنگەست، پیالە گیر کە ئومری ئەزیز بی بەدەلەست.**

بە بارسووکی بڕۆ چونکە رێگای سەلامەتی تەنگەلانە، پیاڵە بگرە بە دەستەوە، چونکە تەمەنی خۆشەویست بێ هاوتایە.

جریدە: بە موجەڕەدی، بە بارسووکی، مەبەست لەوەیە خۆت لە مەشغوڵ بوون بە رووکاری دونیاوە خەریك مەکە و دارنرێ لێیان          رو: بڕۆ، تێپەڕە

گذرگاه: رێڕەو، رێگا، شوێنی تێپەڕین    عافیت: سەلامەتی، رزگاربوون لە مەینەتی و مەسائیب

تنگ: تەنگ، تەسك، تەنگەلان          پیالەگیر: پیاڵەبگرە، مەبەست لە شەرابە

بی بدل: بێ هاوتا، شتێ کە بە هیچ نەگۆڕدرێتەوە.

بە ڕێبواری ڕێگەی ژیان ـ مرۆڤ ـ دەڵێ: داڕنێ لە شتەکان و باری خۆت سووککە، واتە ڕێگەی زوهد بگرە بەر و خۆت مەشغوڵی جوانییەکانی دنیا مەکە، چونکە ئەو ڕێگەیەی مرۆڤ پێیدا تێدەپەڕێ بۆ سەلامەتی تەنگە. واتە تا مەشغوڵی جوانییەکانی دونیا بی زیاتر تووشی دەرد و بەڵا دەبیت و گەر دەتەوێ سەلامەت بیت خۆت لە جوانییەکانی دونیا بکێشەرەوە و مەی بنۆشە و بە خۆشی ژیان بەسەربەرە، چونکە تەمەنی ئازیزی مرۆڤ بێ هاوتایە و کە تێپەڕی بە هیچ شتێ قەرەبوو ناکرێتەوە.

**٣-نه من ز بی عملی در جهان ملولم و بس**

**ملالت علما هم ز علم بی عمل است**

**نە مەن ز بی ئەمەلی دەر جەهان مەلولەم و بەس، مەلالەتی ئولەما هەم ز ئیلمی بی ئەمەلەست.**

تەنیا من نیم لەوە دڵتەنگم کە لە دنیادا کارێك ئەنجام نادرێ، دڵتەنگی زاناکانیش هەر بە هۆی زانستی بێ کردەوەیە.

بی عملی: بێکاری، بێ کردەوەیی، لێرەدا دەکرێ ئاماژە بێت بە مانایەکی پۆزەتیڤی کە بێکاری و بەتاڵییە و یاخود ئاماژە بێ بە مانایەکی نێگەتیڤی کە بێکردەوەییە.

ملول و ملامت: دڵتەنگ و دڵتەنگی  علم بی عمل: عیلمی بێ عەمەل ، زانستی بێ کردەوە

دەڵێ: تەنیا من نیم لەبەر بێکاری و بەتاڵی خۆم خەفەت دەخۆم و دڵتەنگم، زاناکانیش هەمیشە خەفەت ئەخۆن و دڵتەنگی زانستی بێکردەوەی خۆیانن، یاخود تەنیا من نیم بەوە دڵتەنگم کە لە دونیادا کەس کردەوەی نییە و هەمووی هەر قسەیە، بەڵکو زانا ناڕاستەقینەکانیش بە هەمان شێوەی من دڵتەنگی ئەم حاڵەتەن کە زانست بێ کردەوەیە.

**٤-به چشم عقل درین رهگذار پر آشوب**

**جهان و کار جهان بی ثبات و بی محل است**

**بە چەشمی ئەقل دەرین ڕەهگوزاری پور ئاشوب، جەهان و کاری جەهان بی سەبات و بە مەهەلەست.**

لەم ڕێیە پڕ لە فیتنە و ئاشوبەدا دونیا و کاری دنیا لە چاوی عەقڵەوە بێ بناغە و بێ ئیعتیبارە.

رهگذار: ڕێگە، ڕێ      رهگذار پر آشوب: ڕێی پڕ لە فیتنە، مەبەست لە دونیایە

بی ثبات: بێ بناغە      بی محل: بێ ئیعتیبار، بێ نرخ



لەو ڕووەوە کە مرۆڤ بە ڕێبواری ڕێگەی ئەبەدی دەزانرێت و بۆچوون هەیە کە دونیا وەك قۆناغێکی تێژپەڕە لەو نێوانەدا و مرۆڤ بەجێیدەهێڵێ، بۆیە شاعیر تەمەنی مرۆڤی لە سەر دونیادا وەك ڕێڕەوێکی پڕ لە ئاشوب و فیتنە داناوە و پێی وایە تەواوی کاروباری دونیا و خودی دونیاش بێ بناغە و ئەسڵە و هیچ ئیعتیبارێکی نییە یاخود لە چاوی عارف و عاقڵاندا دونیا و هەرچی تیایە بێ نرخ و بەهایە، چونکە زوو لەناو دەچێ، (ئەم بۆچوونە بیروڕای ئەشعەرییەکانە).

**٥-بگیر طرهء مه چهرهای و قصه مخوان**

**که سعد و نحس ز تأثیر زهره و زحل است**

**بگیر تورڕەیی مەه چیهرەیی و قیسە مەخان، کە سەئد و نەهس ز تەئسیری زوهرە ڤو زوهەلەست.**

پرچی (پەرچەمی)مانگ ڕووخسارێك بگرە و لەم قسە پوچانەی کە (خۆشبەختی و بەدبەختی لە کاریگەری زوهرە و زوحەلەوەیە) مەکە.

بگیرطرهء مه چهرهای: پرچی مانگ ڕووخسارێك بگرە، مەبەست لەوەیە کە دڵ بدە بە کچێکی جوان و لەگەڵیدا خۆشحاڵ بە  قصه مخوان: قسەی پوچ مەکە، چیرۆك مەڵێ  سعد: خۆشی، خۆشبەختی  نحس:خراپ، بەدبەختی

زهره: ئەستێرەی بەختی بچووکە و (زوحل)یش ئەستێرەی خراپی گەورەیە لە بۆچوونی ئەستێرەگەریدا (زوحەل و مەریخ) شوم و خراپن، زوحەل شومی گەورە و مەریخ شومی و بەدبەختی بچووکە، (موشتەری و زوهرە)ش خۆشی و چاکین، مشتەری خۆشی و چاکی گەورە و زوهرەش بچووکە.

لێرەدا شاعیر ئەم بیرە ڕەتدەکاتەوە کە چارەنووسی مرۆڤ لە ئەستێرەکانەوە بێت و ئەستێرەکان کاریگەرییان لە چارەنووسی مرۆڤدا هەبێت دەڵێ: دەستی کچێکی جوانی وەك مانگ بگرە و لەگەڵیدا ژیانێکی خۆش بەسەربەرە و واز لەو قسە پوچانە بهێنە کە گوایە ئەستێرەکان کاریگەرییان لە چارەنووسی مرۆڤدا هەیە. یان بەعەشقەوە خەریك ببە و واز لە ئەفسانەی ئەستێرەگەری بهێنە.

**٦-دلم امید فراوان به وصل روی تو داشت**

**ولی اجل به ره عمر رهزن امل است**

**دلەم ئومیدی فەراڤان بە ڤەسلی ڕوی تو داشت، ڤەلی ئەجەل بە ڕەهی ئومر ڕەهزەنی ئەمەلەست.**

دڵم ئومێدی زۆری هەبوو کە بە دیداری روی تۆ بگات، بەڵام ئەجەل لەڕێگەی عومردا جەردەی ئەمەل و هیوایە.

امید: ئومێد، هیوا فراوان: زۆر امل: ئەمەل، هیوا

بە یار دەڵێ: دڵم هیوای زۆر بوو بگاتە دیداری رووی تۆ، بەڵام ئێستا ئەجەل لەڕێگەی عومردا بووەتە جەردەی ئەمەل و هیوام و وردە وردە و لە دەرەنجامی پیربوونمەوە ئەو هیوایەم نامێنی کە بە دیدار و وەسڵی رووی تۆ شادبم.

**٧-بە هیچ دوور نخواهند یافت هشاریش**

**چنین کە حافظ ما مست بادەء ازل است**

**بە هیچ دۆور نەخاهەند یافت هوشیارەش، چونین کە حافزی ما مەستی بادەیی ئەزەلەست.**

بەم شێوەیە کە حافزی ئێمە مەستی شەرابی رۆژی ئەزەلە لە هیچ دەور و زەمانەیەکدا بە هۆشیاری پەیدای ناکەن و نایبیننەوە.

بە هیچ دوور: لە هیچ سەردەمێکدا، لە هیچ زەمانەیەکدا نخواهند یافت: پەیدای ناکەن، نایبینن.

دیسانەوە لەم بەیتەدا قسە لەسەر ئەو بڕیارە ئەزەلییەیە کە لە چارەنووسی مرۆڤ دەدرێ و دیسانەوەش حافز جەخت لەسەر رای خۆی دەکاتەوە کە ئەوێك مەستی شەرابی رۆژی سەرەتا و ئەزەلە، ئیدی کەوابوو لە هیچ دەور و زەمانێکدا بە هۆشیاری نایبیننەوە ئەو لە رۆژی ئەزەلدا بەو شەرابە مەست کراوە و بووە. ئیدی تا رۆژی دواییش هۆشیار نابێتەوە، ئەم بەیتە ئاماژەیە بەو بڕیارانەی کە لەو رۆژەدا لە چارەنووسی مرۆڤ دەدرێ.



## غەزەلی سی و چوارەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١- گل در بر و می درکف و معشوق بەکام است**

**سلطان جهانم بە چنین روز غلام است**

**گوڵ دەر بەر و مەی دەر کەف و مەئشوق بە کامەست، سولتانی جەهانەم بە چونین روز غولامەست.**

گوڵ لە بەردەممدا و مەی لە دەستمدایە و مەعشوق بە ئارەزووی دڵە، لەمجۆرە رۆژەدا پادشای جیهان غولام و بەندەی منە.

در بر: لەبەردەمدا، لەلادا، لەپێش چاودا درکف: لەدەستدا

کام: ئارەزوو، موراد بەکام است: بە ئارەزووی دڵە، بەو شێوەیە کە دڵ پێی خۆشە

سلطان: پادشا، سوڵتان بە چنین روز: لەم رۆژەدا، لە رۆژێکی وادا غلام: غولام، خزمەتکار و بەندە.

شاعیر سێ مەرج بۆ خۆشبەختی دەهێنێتەوە کە گەر لە دەستدا بن ئەوا مرۆڤ دەبێتە پادشا و بگرە پادشا و سوڵتانەکانیش لە چاویدا دەبنە غولام، ئەوانیش بوونی گوڵ و جوانییەکانی سروشت و مەی و جوانییەکانی ژیان و یارێکە کە بە ئارەزووی دڵ بێت، بۆیە دەڵێ: من ئێستا هەر سێکیانم هەیە و لە رۆژێکی وەهاشدا پادشا بە غولام نازانم.

**٢-گو شمع میارید درین جمع کە امشب**

**در مجلس ما ماه رخ دوست تمام است**

**گو شەمع مەیارید دەرین جەمع کە ئیمشەب، دەر مەجلیسی ما ماهی روخی دوست تەمامەست.**

بڵێ ئەمشەو لەم کۆڕەدا مۆم مەهێنن، چونکە لە مەجلیسی ئێمەدا مانگی رووی دۆست تەواوە.

میارید: مەهێنن رخ: رووخسار، روو تمام: تەواو، پڕ، بەسە

بوونی دۆست لە کۆڕ و مەجلیسدا مایەی رووناکیی ئەو مەجلیسەیە و ئیدی پێویست بەوە ناکات ئامێری رووناککردنەوە بهێنرێتە ئەو کۆڕەوە، دۆستیش چ دۆستێکە، رووخساری وەك

مانگی چوارده وایە و ئەو ئامێرەش کە دەهێنرێت بۆ ڕووناککردنەوە مۆمە، بۆیە شاعیر دەڵێ: بڵێ و هەواڵ بگەیەنە کە مۆم مەهێنن بۆ ڕووناککردنەوەی کۆڕ، چونکە ڕووخساری وەك مانگی یار تەواوە و پڕە و هەموو دنیای ڕووناککردووەتەوە و لە بوونی ڕووخساری وەك مانگی چواردەی دۆستدا دەبێ چرا و مۆم چ ڕووناکییەکیان هەبێ. گەر (تمام است) بە (بەسە) واتا بکرێت ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە: هەواڵ بدە و بڵێ مۆم مەهێنن بۆ کۆڕ و مەجلیس، چونکە ئەمشەو کە یار لێرەیە ڕووخساری وەك مانگی دۆست بەسە بۆ ڕووناککردنەوەی مەجلیسەکە.

**٣-در مذهب ما باده حلال است و لیکن**

**بی روی تو ای سرو گل اندام حرام است**

**دەر مەزهەبی ما بادە هەلالەست ڤە لیکین، بی روی تو ئەی سەرڤی گولەندام هەرامەست.**

لە مەزهەبی ئێمەدا شەراب حەڵاڵە، بەڵام بە بێ ڕووی تۆ ئەی یاری سەرووی گوڵ ئەندام حەرامە.

مذهب: مەزهەب، ئایین، ڕێچکە    لیکن: بەڵام    بی رووی تو: بێ ڕووی تۆ، بەبێ تۆ

گل اندام: گوڵئەندام، سیفەتێکە بۆ مەعشوق، واتە: ئەندامەکانی جەستەت وەکو گوڵ جوانە.

هەموو جوانی و لەزەت و چێژەکان لای حافز بە یارەوە جوان و لەزەت بەخشن و بەبێ ڕووی یار و لە غیابی ئەودا جوانییەکان دەبنە ناشیرینی و لەزەت و چێژەکانیش دەبنە عەزاب و ئازار. ئێمەی عاشق، مەزهەب و ڕێچکەیەکمان بۆ خۆمان هەڵبژاردووە، کە تیایدا بادە و شەراب حەڵاڵە، بەڵام ئەی ئەو یارەی کە باڵات لە سەرویەکی بەژن ڕێك دەچێت و ئەندامەکانی جەستەت لە گوڵ، بە بێ ئامادەیی تۆ ئەو بادەیەمان لێ حەرامە و هیچ تام و چێژێکی لێ نابەین.

لە زاراوەی عیرفانیدا (بادە) عەشقە، گەر لێرەدا (تۆ دۆست) دۆستی عیرفانی یاخود جیهانی مەلەکوت و خودا بێت ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە: لە ئایینی ئێمەدا کە ئیسلامە عەشق و خۆشەویستی حەڵاڵە بە مەرجێ لەگەڵ جیهانی مەلەکوتدا بێ و عەشقی خودایی بێت، بەڵام ئەی دۆست و یاری جیهانی باڵا گەر تۆ لەو عەشقەدا سەنتەر و چەق نەبوویت ئەوا ئەو عەشقە حەرامە.

**٤-گوشم همه بر قول نی و نغمه چنگ است**

**چشمم همه بر لعل لب و گردش جام است**

**گوشەم هەمە بەر قۆولی نەی و نەغمەیی چەنگەست، چەشمەم هەمە بەر لەئلی لەب و گەردشی جامەست.**



هەمیشە گوێم چاوەڕوانی دەنگی نایی و ئاوازی چنگە و هەمیشە چاویشم لە لێوی سوور و گەڕانی پێکە.

گوشم همە: هەمیشە گوێم    بر: لە    قول نی: دەنگی نای

چشمم همە: چاوم هەمیشە    چمشمم بر: چاوم لە، چاوەچاوی

لعل لب: لێوی سوور، لێوی یاقوتی    گردش: گەڕان، دەوری بادە، ساقی بە نۆرە شەراب دابەش دەکات مەبەست لەوەیە کە چاوەڕوانم سەرەی ئەو دەورانە بگاتە سەرمن.

من بە چاو و گوێمەوە هەمیشە لە چاوەڕوانی ڕۆژگار و کاتێکی خۆشدام و ئاواتەخوازم کە بەردەوام گوێم لە دەنگی نای و ئاوازی چەنگ بێت و چاویشم لە لێوی یاقوتین و عەشق و نۆرەی گێڕانی شەراب بێت تا بگاتە سەرم. کورتەی قسە ئەوەیە کە هەمیشە لە چاوەڕوانی ژیانێکی ئاسوودە و خۆشگوزەرانی (عیرفانی)دام.

**٥-در مجلس ما عطر میامیز کە ما را**

**هر لحظە ازگیسوی تو خوشبووی مشام است**

**دەر مەجلیسی ما ئیتر مەیامیز کە ما را، هەر لەهزە ئەز گیسوی تو خوشبوو مەشامەست.**

لە مەجلیسی ئێمەدا عەتر مەپرژێنن، چونکە دەماغی ئێمە سات بە سات لە پرچی تۆوە (یارەوە) بۆنخۆش دەبێت و بۆنی خۆشی پێدەگات.

میامیز: لە (آمیختن) هاتووە واتە: تێکەڵاوکردن و تێوەردان، لێرەدا بە مانای پرژاندن دێت

هرلحظە: هەرساتە، سات بە سات    خۆشبوو: بۆنخۆش    مشام: شوێنی بۆنکردنە لە دەماخدا.

هەروەك چۆن لە بەیتی پێشتردا لە بۆنی ڕووی یاردا شاعیر هێنانی مۆم و ئامێری ڕووناککەرەوەی ڕەتکردەوە، لێرەشدا بە بۆنی پرچی یار پرژاندنی عەتر و بۆنی خۆش بە پێویست نازانێت و بە بۆنی پرچی بۆنخۆشی یار هەستی بۆنکردنی ئێمە سات بە سات بۆنخۆش دەبێ ئیدی چ پێویست بە عەتر پرژاندن دەکات.

**٦-از چاشنی قند مگو هیچ و ز شکّر**

**زانرو کە مرا در لب شیرین تو کام است**

**ئەز چاشنیی قەند مەگو هیچ و ز شەککەر، زانرو کە مەرا دەر لەبی شیرینی تو کامەسەت.**

لە بارەی تام و چێژی شەکر و شرینییەوە هیچ مەڵێ: چونکە لە لێوی شیرینی تۆوە مواردی من شیرینە.

چاشنی: تام، چێژ، مەزە لە بەیتەکەدا مەزەی دوای شەرابە.
قند وشکر: شەکر(قند) شەکرێکی پاڵێوراوە و بێخەوشترە.
زانرو: لەورووەوە، چونکە    کام: موراد، ئاوات، ئارەزوو

ئەم مەجلیسەی کە تۆی تێدایە و لە سایەی رووی تۆوە مۆمی پێویست نییە و لە سایەی بۆنی خۆشی پرچیشتەوە پێویستی بە عەتر نییە، لە سایەی لێوی شیرنیشتەوە پێویستی بە مەزە و شەکر و شیرینی نییە، بۆیە وەسفی تام و لەزەتی قەند و شەکر مەکە بۆ من، چونکە بەبوونی لێوی شیرینی تۆ (ئەی دۆستی حەق) مورادی من شیرینە و ئارەزووەکانم چێژدار و بەتامن (واتە بە ئاواتم گەشتووم).

**٧-تا گنج غمت در دل ویرانه مقیم است**

**همواره مرا کنج خرابات مقام است**

**تا گەنجی غەمەت دەر دلی ڤیرانە موقیمەست، هەمڤارە مەرا کونجی خەرابات مەقامەست.**

تا گەنجی گرانبەهای غەمی عەشقی تۆ لە دڵی وێرانەمدا جێگیرە بەردەوام جێگەی من کونجی خەرابات و مەیخانەیە.

گەنج: گەنج، شتی بەقیمەت و گرانبەها    مقیم است: جێگیرە، هەیە
همواره: بەردەوام    کنج: کونج، گۆشە    مقام: جێگە

حافز هەمیشە بە شێوەیەکی دۆستانە لە (غەمی عەشق) دەدوێت و بە گرانبەهای دەزانێت. لێرەشدا هەر بە گەنج و گەوهەری داوەتە قەڵەم، گەنج و شتی گرانبەهاش بە زۆری لە وێرانەکاندا دەدۆزرێتەوە و شوێنی دانسقە و گرانبەها وێرانەیە. بۆیە دەڵێ: تا ئەو غەمی عەشقەی تۆ کە گەنجێکە لە دڵی وێرانەمدا جێگیر بێت من بەردەوام لە گۆشەی مەیخانە و خەراباتەکانی عەشقی حەقیقیدا دەبم، ئەم گوتەیە چەند مەبەستێك دەپێکێ لەلایەك واتە: غەمی عەشقت زۆر نارەحەتە و تا ئەو کاتەی ئەو غەمەم لە دڵدا بێت لە نارەحەتیدا هەمیشە لە گۆشەی مەیخانەکاندا دەبم و مەی دەخۆمەوە، کە ئەڵبەتە ئەمە مانایەکی نێگەتیڤی (غەمی عەشقە) و ناکرێ حافز ئەمەی مەبەست بووبێ، بەڵام لێکدانەوەی دووەم ئەوەیە: کە مادام غەمی عەشقت گەنجێکی گرانبەهایە و گەنجیش لە وێرانەدایە و ئێستاش لە دڵی وێرانەمدایە بەردەوام دەبم لەو وێرانەسازییەی دڵم و هەمیشە لە گۆشەی خەراباتدا دەبم تا بەردەوام دڵم وێرانە بێت و بەردەوامیش غەمی عەشقی تۆی تێدابێت، کە ئەم لێکدانەوەیان



لەگەڵ روحی عارفانەی حافزدا نزیکترە. بەتایبەتی کە مەیخانە لە زاراوەی عیرفانیدا خەڵوەتخانەی عارفان و شوێنی گۆشەگیرییە.

**٨-از ننگ چه گویی که مرا نام ز ننگ است**

**و ز نام چه پرسی که مرا ننگ ز نام است**

**ئەز نەنگ چە گویی کە مەرا نام ز نەنگەست، ڤە ز نام چە پورسی کە مەرا نەنگ ز نامەست.**

لە بارەی نەنگ و عەیبەوە چی دەڵێی، چونکە ناو و شۆرەتی من لە کاریگەریی ئەم نەنگی و بەدناوییەوەیە، بۆچی سەبارەت بە ناو و شۆرەت دەپرسی کە من ناوداری و شۆرەت بە نەنگی و عەیبە دەزانم.

ننگ: ناوزڕان، عەیبە، نەنگی، بەدناوی    نام: شۆرەت و ناوداری
نام زننگ است: ناوداری لە بەدناوییەوە    ننگ ز نام است: بەدناوی لە ناودارییەوەیە

لە شەرح و شرۆڤەی ئەم بەیتەدا پێویستە لە بیروبۆچوونی (مەلامەتی) بدوێین، چونکە بەیتەکە بە تەواوی رەنگدانەوەی ئەو بۆچوونەیە. (د. هروی) لە شەرحەکەی خۆیدا {ج١ ل١٦١} لە گوتەی (نجم الدین رازی) و (استاد فروزانفر)ەوە شەرحی مەلامەتییەی کردووە کە تیایدا هاتووە: مەلامەتی دەستەیەکی سۆفیگەرییە و بەو واتایە دێت کە لای کەسێك ناوداری و حەیاچوون و ستایش و پیاهەڵدان و داشۆرین و زەم و رەتکردنەوە و قەبوولکردنی خەڵکی بۆ ئەو وەك یەك بێت و هیچ جیاوازییەکیان نەبێت و بە دۆستی و دوژمنایەتی خەڵك خۆشحاڵ و دڵگران نەبێت و ئەم زاراوە و چەمکە دژانە بە یەك بزانێت، هەرچەندە ئەم بیروبۆچوونە خستنەلاوەی خەڵکییە و لە مەبدەئدا دوورکەوتنەوەیە لە بەند و داوی کۆمەڵگە، بەڵام وەك خاڵی وەرچەرخانی زاهدی و زوهد بۆ سۆفییەتی و سۆفیگەری دەزانرێت، چونکە لە سۆفیگەریدا سۆفی لە عەشقی خودایی و جیهانی مەلەکوتدا سەرقاڵ دەبێت و خەڵك لە بەرچاوی دەبنە سفر، بەڵام مەلامەتییەکان هەر لە بەند و داوی خەڵکدان و ترسی ناوداربوون و بەدناویان ماوە و هەوڵی ئەوە دەدەن لەبەر چاوی خەڵك بشاردرێنەوە و گرفتاری ئافاتەکانی ناو و شۆرەت نەبن و تووشی ریا و ریاکاری نەبن، هەربۆیە هەندێ جار کاری وا دەکەن کە بە رواڵەت بەدکارییە تا نەوەکو شۆرەتی چاکی دەرکەن و تووشی ریا بن.

بێگومان لە کۆمەڵگەدا ناوداری و شۆرەت پۆزەتیڤ و بەدناوی و ئابڕوچوون نێگەتیڤن و هەمیشە قسە لەسەر ناوداری خۆلادانە لە بەدناوبوون، بەڵام شاعیر رێچکەی مەلامەتییەی گرتووە و لەو رێگەیەدایە کە بیسەلمێنێ ئەم وەك خەڵکانی نێو کۆمەڵگە نییە و ئەو مەبدەئەی

لا کاڵبۆتەوە کە لە دوای شۆرەت بێت و لە بەدناوی بترسێ دەڵێ: من وەك مەلامەتییەکانم و بە بەدناوبوونم ناودار دەبم، بۆیە تۆ چ باسی بەدناوبوون و عەیبە عەیبەیەکتە و بیرم دەخەیتەوە لەلایەکی دیکەوە لە ناوداری دەپرسی و لێی دەگەڕێی لە کاتێکدا ناوداربوون لای من عەیبەیە و دەبێتە مایەی عەیبداربوون، چونکە لە مەزهەبە سۆفیگەرییەکەی مندا ناوداری و شۆرەت سەرم دەخوات و دەمخاتە چاڵ و داوی بەدناوییەوە.

**٩-میخواره و سرگشته و رندیم و نظرباز**

**وآن کس که چو ما نیست درین شهر کدام است**

**مەیخارەڤو سەرگەشتەڤو رەندیم و نەزەرباز، ڤان کەس کە چو ما نیست دەرین شەهر کودامەست.**

مەیخۆر و سەرگەردان و گوێ پێنەدەر و جوانپەرستین و ئەو کەسەی کە لەم شارەدا وەك ئێمە نییە کامەیە.

میخواره: مەیخۆر          سرگشته: سەرگەردان، بێ ئامانج

رند: گوێ پێ نەدەر، لاابالی نظرباز: جوانپەرست، کەسێ کە حەزی لە سەیرکردنی جوانان بێت

چو ما: وەك ئێمە          درین  شهر: لەم شارەدا          کدام: کام

لەم شارەدا کە ئێمەی تێیدا دەژین هەمووان وەك یەکین و هەموومان سیفاتی یەکتریمان هەیە، بەڵام هەندێکمان خۆمان ئاشکرا دەکەین و هەندێکی دیکەمان خۆمان دەشارینەوە، دەنا لەم شارەدا کام کەسەیە کە وەك ئێمە مەیخۆر و سەرگەردان و بێ ئامانج و گوێ پێنەدر و گوناهکار و جوانپەرست نەبێ.

**١٠-  با محتسبم عیب مگویید که او نیز**

**پیوسته چو ما در طلب عیش مدام است**

**با موهتەسەبەم ئەیب مەگویید کە ئو نیز، پەیڤەستە چو ما دەر تەلەبی ئەیشی مودامەست.**

عەیبی من بە پۆلیس (محتسب) مەڵێن، چونکە ئەویش وەك ئێمە بەردەوام لە هەوڵی ژیانی خۆشدایە.

محتسب: مەئموری ڕێگری لە خراپەکاری وەك عارەقخۆری و زیناکەری و هتد... کە بە زۆری لە پیاوە زاهید و ئاییندارەکان بوون (پۆلیسی تاوان).

عیب مگویید: شکات مەکەن، عەیب مەڵێن.

او نیز: ئەویش    پیوسته: بەردەوام



لە بەیتی پێشودا شاعیر پێیوایە لەم شارەدا کەس نییە وەك ئەمان نەبێ لێرەدا دەچێتە سەر پیرۆزترین یاخود بنچینەترین کەس کە دەکرێ دووربێ لەوکارەوە کە خودی مەئموری بەرگریکردنە لە ڕوودانی مونکەرات بە زاراوەی ئەمڕۆکە پۆلیسی تاوانە و دەڵێ: لای مەئموری بەرگری لە تاوان شکاتم لێ مەکەن یاخود تانەم لێ مەدەن لای ئەو، چونکە تەنانەت ئەویش وەك ئێمە هەمیشە خەریکی ڕابواردنی ژیانی خۆشی و شادە و لە هەوڵی ئەو ژیانە خۆشەدایە و لەگەڵ ئێمەدا جیاوازییەکی نییە.

**١١- حافظ منشین بی می و مەعشوق زمانی**

**کایام گل و یاسمن و عید صیام است**

**هافز مەنشین بی مەی و مەئشوق زەمانی، کەئەیامی گول و یاسەمەن وئێیدی سیامەست.**

حافز ساتێ بێ مەیی و مەعشوق دامەنیشە، چونکە کاتی پشکوتنی گوڵی سوور و یاسەمین و جەژنی ڕەمەزانە.

منشین: دامەنیشە، رازی مەبە          زمانی: کاتێ، ساتێك، زەمانێکی زۆر کورت

عید صیام:  جەژنی ڕەمەزان

واتە ئێستا مانگی ڕەمەزان بەسەرچووە و ڕۆژوگرتن کۆتایی هاتووە و وەرزی بەهارە کە وەرزی ڕابواردن و سەیران و سەفایە بە خۆشی بەسەری بەرە.





## غەزەلی سی و پێنجەم:

**بەحر موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- خیال روی تو در هر طریق همره ماست**

**نسیم موی تو پیوند جان آگه ماست**

**خیالی روی تو دەر هەر تەریق هەمرەهی ماست، نەسیمی موی تو پەیڤەندی جانی ئاگەهی ماست.**

بە هەر ڕێگەیەکدا بڕۆین خەیاڵی رووی تۆمان لەگەڵدایە و شەماڵی موی تۆش پەیوەستە بە گیانی بەئاگا و بێداری ئێمەوە.

در هر طریق: لە هەر ڕێگەیەکدا همره: هاوڕێ، هاوسەفەر، لەگەڵدابوون نسیم: شەماڵ، بۆنیخۆش پیوند: پەیوەست

دەڵێ: بە هەر ڕێگەیەکدا بڕۆین خەیاڵی رووی خۆتمان لەگەڵدا دەنێریت و هەمیشە لە پێش چاومانی و شەماڵ و بۆنیخۆشی زوڵفیشت بەردەوام لەگەڵ گیانی بێداری ئێمەدایە.

زاراوە عیرفانییەکانی ئەم بەیتە و تەواوی غەزەلەکەش بە بێ ماندووبوون لێکدەدرێتەوە و مانا شاراوە عیرفانییەکانیش لەم غەزەلەدا بەئاسانی دەردەکەون، بەپێی عیرفان شاعیر بە خودای خۆی ـ مەعشوقی حەقیقی عارفان ـ دەڵێ: بە هەر ڕێگایەکدا بڕۆین و لە هەر بارودۆخێکدا بین خەیاڵی رووخساری تۆمان لەگەڵدایە کە لەراستیدا ئەمە پلەیەکی بەرزی عیرفانە و لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا روونادات و لە میسراعی دووەمیشدا بە هێنانی (نسیم) ئەم بەردەوامییە تۆخ تر دەکاتەوە، چونکە شەماڵ فەیز و نوری بەردەوامە و چاولێبوون و ئاگاداری درێژخایەنە لە لایەن خوداوە و دەڵێ: نور و ڕەحمەتی تۆ هەمیشە پەیوەستە بە گیانی بێداری ئێمەوە و هەرگیز لێی جودا نابێتەوە.

**٢- بە رغم مدّعیانی کە منع عشق کنند**

**جمال چهرەء تو حجت موجّه است**

**بە ڕەغمی موددەئیانی کە مەنئی ئیشق کونەند، جەمالی چیهرەیی تو هوجەتی موڤەجەهی ماست.**

بە کوێری چاوی مرۆڤە بانگەشەکەرە مایەپوچەکانەوە کە ڕێگری لە عەشق دەکەن، جوانی رووخساری تۆ بەڵگەی رازیکەری راستگۆیی ئێمەیە.

به رغم: بەپێچەوانەی ئارەزوو، بەکوێریی چاوی        مدعی، بانگەشەکەر
جمال: جوانی     چهرە: رووخسار          حجت: بەڵگە
حجت موجە: بەڵگەی رازیکەر          ماست: ئێمەیە

هەڵبەت لە هەرکات و شوێنێکدا کەسانێك هەبوون کە عیرفان و عەشقی خوداییان بەکەم زانیوە و رێگرییان لێ کردووە، ئەم بەیتە رەتکردنەوەی رای ئەوانە و دەڵێ: بەکوێری چاوی ئەوانەی کە بە بێ ئەوەی راستگۆ بن و کردەوە بکەن هەر لاف و گەزافیان لێداوە، رێگرییان لە عەشق و عیرفان کردووە جوانی رووی یاری عیرفانی هێندە سەرنجڕاکێشە بەڵگەیەکی تەواو رازیکەرە بۆ ئەوەی کە عیرفان و عەشق راستە و قسەی ئەو مایەپوچە دیعایە و بانگەشەکەرانە درۆیە.

**٣- ببین که سیب زنخدان تو چه می گوید**

**هزار یوسف مصری فتاده در چه ماست**

**ببین کە سیبی زەنەخدانی تو چە می گویەد، هەزار یوسفی میسری فوتادە دەر چەهی ماست.**

سەیرکە کە سێوی چەناکەی تۆ چ دەڵێ، دەڵێ: هەزار یوسفی میسری کەوتووەتە چاڵی ئێمەوە.

سیب: سێو     زنخدان: چەناگە
سیب زنخدان: سێوی چەناگە، چاناگەی خڕ و جوانی وەك سێو
فتادە: کەوتوو     چە/چاه: چاڵ

سەیرکە کە جوانی چەناگەی خڕی تۆ چ دەڵێ، جوانی من هێندە، کاریگەرە تەنانەت هەزارانی وەك یوسفی میسری (حەزرەتی یوسف ـ د.خ ـ کە خۆی رەمز و سومبوولی جوانییە) کەوتوونەتە نێو چاڵی ئێمەوە و گرفتاری جوانی ئەم چەناگەیە بوون.

(سیب زنخ) لە عیرفاندا زانستی چێژە لە(بینین و مشاهدە) لێرەدا و بەم مانایە دەڵێ: سەیرکە چێژ وەرگرتن لە بینین و موشاهەدەی تۆ ئەی یاری عیرفانی هێندە لەزەت بەخشە هەزارانی وەك یوسفی کوڕی یەعقوب (د.خ) دەکەوێتە داوی و چێژە مادیییەکانی دونیا و جوانییە مادییەکانی دونیا بەجێ دەهێڵێت و گرفتاری ئەم چێژە دەبێت و (ربی سجن احب الی مما یدعوننی الیە){یوسف/٣٣} دەڵێت لە کاتێکدا ئەوان یوسفیان بۆ چێژ و رابواردن داوەت دەکرد و داوای رابواردنیان لێ دەکرد، بەڵام چونکە ئەو چێژی لە موشاهەدە و بینین بینی بوو گرفتاری ئەم چێژەبوو ئەم چێژەش هەزارانی وەك حەزرەتی یوسف گرفتار دەکات.



**٤- اگر به زلف دراز تو دست ما نرسد**

**گناه بخت پریشان و دست کوته ماست**

**ئەگەر بە زولفی درازی تو دەستی ما نەرەسەد، گوناهی بەختی پەریشان و دەستی کوتەهی ماست.**

ئەگەر دەستی ئێمە بە پرچی درێژی تۆ نەگات، گوناهی بەختی پەرێشان و دەستی کورتی ئێمەیە.

دراز: درێژ     نرسد: نەگات     گناە: تاوان، خەتا     بخت: بەخت     پریشان: پەرێشان، رەش، بەد     کوتە: کورت     دست کوتە: دەستی کورت

دەڵێ: گەر ئێمە ناتوانین بگەینە وەسڵ و دیداری تۆ و پەردە و حیجابەکانی نێوانمان هەڵدەینەوە(مانای عیرفانیی پرچ) خەتای ئەوە نییە کە تۆ پرچت کورتە و کەس دەستی پێ ناگات، بەڵکو خەتای بەختی رەش و بڵاو و پەرێشانی خۆمانە کە هاوکارمان نییە و خەتای دەستکورتی خۆمانە کە ناگاتە ئەو پەردانە، واتە: گەر ئێمە بە دیدارت شاد نابین خەتا و گوناە لە خۆمانەوەیە، چونکە بەخت یاوەرمان نییە.

**٥- به حاجب در خلوت سرای خاص بگو**

**فلان ز گوشەنشینان خاك درگە ماست**

**بە هاجبی دەری خەلڤەتسەرای خاس بگو، فولان ز گوشەنشینانی خاکی دەرگەهی ماست.**

بە دەرگاوانی دەرگای خەلوەتسەرای تایبەتی خۆت بڵێ، فلانەکەس ـ حافز ـ لە گۆشەنشینانی بەردەرگای ئێمەیە.

حاجب: دەرگاوان، بەمانای برۆش دێت، بەڵام لێرەدا بە هۆی ئیزافەکردنەوە بۆ (دەرگا) تەنیا مانای یەکەم راستە.     در: دەرگا
خلوتسرا: خەڵوەتسەرا، شوێنی تایبەتی تەنیایی     بگو: بڵێ
فلان: فلان، لێرەدا بۆ خۆ بچووککردنەوە بەکارهاتووە و مەبەست لەم فلانکەسە خودی شاعیرە.
درگە: دەرگا

دەڵێ: ئەی یار لەو خەڵوەتسەرا تایبەتییەی خۆتەوە بە دەرگاوانەکە بڵێ کە فلانەکەس واتە حافز یەکێکە لەوانەی لە بەردەم دەرگای ئێمەدا گۆشەگیربوون، با دەرم نەکات.

**٦- به صورت از نظر ما اگر چه محجوبست**

**همیشه در نظر خاطر مرفه ماست**

**بە سورەت ئەز نەزەری مـا ئەگـەر چـە مەهجوبەسـت، هەمیـشە دەر نـەزەری خـاتری مورەفەهی مـاست.**

ئەگەرچی رووخساری لە بەرچاوی ئێمە شاراوەیە و ئەو نابینین، بەڵام هەمیـشە رووخـساری ئەو لە پێش چاوی خەیاڵ و بیری ئاسوودەماندایە.

بە صورت: بە رووخسار　　از نظر ما: لەبەر چاوی ئێمە　　محجـوب: شـاراوە، داپۆشـراو

مرفە: ئاسوودە، ئارام، رەحەت　　در نظر: لە بیردا

دەڵێ: هەرچەندە یاری عیرفانی بە رووخسار و شێوە لە پێش چاوی ئێمە نادیارە و نـاییبینین و ئەو رووخسارەمان لێ شاراوەیە، بـەڵام هەمیـشە لـە بیرماندایـە و لـە نێـو خـەیاڵ و بـیری ئاسوودەماندایە، کە بەو ئاسوودەیە. یاخود دەکرێ قسەی یار بێت کە دەڵێ: هەرچـەندە حـافز لێمان دوورە، بەڵام لە خەیاڵ و بیری ئاسوودەماندا ئامادەیی هەیە و لەبەرچاومانە.

**٧- اگر به سالی حافظ دری زند بگشای**

**که سالهاست که مشتاق روی چون مه ماست**

**ئەگەر بە سالی هافز دەری زەنەد بگوشای، کە سالهاست کە موشتاقی روی چون مەهی مـاست.**

ئەگەر ساڵی یەك جار حافز لە دەرگای دا لێی بکەوە، چونکە ساڵانێکە کـە ئارەزوومەنـدی رووی وەك مانگی ئێمە.

بە سالی: بـە سـاڵێ جـارێ، سـاڵی یـەك جـار　　دری زنـد: لـە دەرگـا بـدات

بگشای: بیکەوە　　سالهاست: ساڵانێکە، ساڵهایە　　مشتاق: موشتاق، ئارەزوومەند

قسەی یارە کە بە دەرگاوانەکەی دەڵێ: گەر ساڵی جارێك حافز لە دەرگایدا کە ئەو لە حەیا و شەرمدا هەر چەندە گۆشەگیری بەردەم ئاستانەی دەرگاکەی ئێمەیە لـە دەرگـای دۆعـا و داوا نادات گەر ساڵی جارێك لە دەرگایدا دەرگای لێ بکەوە، چونکە ئـەو سـاڵانێکی دوور و درێـژە ئارەزوومەندی رووخساری جوانی وەك مانگی ئێمەیە.





## غەزەلی سی و شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١-روضهء خلد برین خلوت درویشان است**

**مایهء محتشمی خدمت درویشان است**

**رۆوزەیی خولدی بەرین خەلڤەتی دەرڤیشانەست، مایەیی موهتەشەمی خدمەتی دەرڤیشانەست.**

باخی بەرزی بەهەشت (فیردوس) خەڵوەتی دەروێشانە، ئەوەی دەبێتە مایەی گەورەیی و حیشمەت خزمەتی دەروێشانە.

روضە: باخ، گوڵزار خلد: جاوید، هەمیشەیی برین: بەرز، باڵا

خلد برین: بەرزترین جێگە و پایەی بەهەشت، فیردەوس خلوت: خەڵوەت، تەنهایی

درویشان: دەروێشان، دەروێشانی ئەم بەیتە و بەیتەکانی دیکەش ئەو کەسە رۆشنبیرانەن کە لە کۆمەڵگەدا بێبەش و بەشخوراون نەك تەنیا دەروێشی چەمکی سۆفیگەری {د.هەروی، ج١، ل١٦٦} یاخود وەك سودی دەڵێ: (مەبەست لە دەروێشان پیاوانی خودا (اهل الله) یاخود خوداپەرستانە{سودی، ج١، ل٣٣٢} لەڕاستیدا(د.هەروی) زیادەڕۆیی کردووە لە رایەکەیدا

مایە: هۆکار، مایە

محتشم: خاوەن حیشمەت، گەورە، حیشمەتیش واتە: گەورەیی، پلە وپایە، شەرم و حەیا

محتشمی: گەورەیی و پلە و پایەداری خدمت: خزمەت

واتە: ئەوەی کە لە وەسفی خۆشی و ئارامی باخی فیردەوسدا گوتراوە لە تەنیایی و خەڵوەتی دەروێشان و پیاوانی خودادا بە دەست دێت یاخود بەزرترین پایە و پێگەی خۆشی لە تەنیایی دەروێشاندایە بەمەش خزمەتکردن بە دەروێشان دەبێتە هۆکاری گەورەیی و هەرکەس خزمەتی دەروێشان بکات پلە و پایەی بەرز دەبێتەوە.

دەکرێ بڵێین ئەم غەزەلە بە تەواوی لە مەدح و سەنای دەروێشاندا نووسراوە و حافز دیدگایەکی ئیجابی و پۆزەتیڤی سەبارەت بەو دەروێشانە هەیە کە هەمیشە گەورە و سەردارن و ریاکار و مایەپوچ نین.



**٢-کنج عزلت که طلسمات عجایب دارد**

**فتح آن در نظر رحمت درویشان است**

**کونجی ئوزلەت کە تیلیسماتی ئەجایب دارەد، فەتهی ئان دەر نەزەری رەهمەتی دەرڤیشانەست.**

کونجی گۆشەگیری کە تەلیسمی سەیری هەیە، کردنەوەی ئەو تەلسیمانە لە پێش چاوی رەحمەتی دەروێشاندایە.

کنج: کونج و گۆشەی گۆشەگیری عزلت: تەنیایی، گۆشەگیری

طلمسم: تەلیسم، کار و رووداوی نائاسایی کە ئەوسا بە هێزی ئاسمانییان دەزانی.

عجایب: سەیر و سەرسوڕهێنەر فتح: کردنەوە، زانین، شیکارکردن، حەلکردن

هەرچەندە لە نوسخەی (هروی)، (سودی)، (غنی و قزوینی)، (عیوضی) دا لە بری (کنج عزلت) (گنج عزت) هاتووە، بەڵام لەلایەکەوە بە لەبەرچاوگرتنی مانای کونجی گۆشەگیری لەگەڵ دەروێش و ژیانی خەڵوەتنشینی دەروێشاندا و لەلایەکی دیکەشەوە هاتنی (کنج عزلت) لە نوسخەی (خلخالی)دا و پاشان لە نوسخەی (عەلامە قزوینی و د. قاسم غنی) کە یەکێکە لە بڕواپێکراوترین نوسخەکانی حافز و لای هەندێك رەخنەگری وەك (د. زرین کوب، ازکوچە رندان، مقدمه) بەراسترین نوسخەی حافز دراوەتە قەڵەم لێرەدا (کنج عزلت) مان نووسییەوە.

بێگومان کونجی گۆشەگیری دەروێشان یاخود خەڵوەتی تەنیایی چەندەها تەلیسم و جوانی یاخود کار و رووداوی لەتوانابەدەر و نائاسایی سەیر و سەرسوڕهێنەری تێدایە کە گەیشتن بەو تەلیسمانە تەنیا لەو گۆشەی گۆشەنشینانەوە دەبێت و زانین و شیکارکردنی ئەو تەلسیم و کار و رووداوانەش تەنیا لەپێش چاوی رەحمەتی دەروێشەکاندایە و تەنیا ئەو دەتوانێ لە تەلیسمەکانی گۆشەنشینی تێ بگات و هەموویان لەژێر رەحمەتی بۆچوونی ئەوەدان.

یاخود گەر (گنج عزت) بێت ئەوا ماناکەی دەبێتە گەنج و گەوهەری گرانبەهای عیزەت و گەورەیی کە موشکیلاتی زۆری لە رێگەدایە و بەئاسانی پێی ناگەیت تەنیا دەروێشانن کە دەتوانن ئەو گرفتانەی رێگەی گەنج و گرانبەهای عیزەت و شکۆمەندی بکەنەوە و پێی بگەن.

**٣-قصر فردوس که رضوانش به دربانی رفت**

**منظری از چمن نزهت درویشان است**

**قەسری فیردۆوس کە ریزڤانەش بە دەربانی رەفت، مەنزەری ئەز چەمەنی نوزهەتی دەرڤیشانەست.**

کۆشکی بەهەشت کە ریزوان پاسەوانی بەردەرگای ئەوە تابلۆیەکە، (شێوەکە) لە چیمەنی پاکیی دەروێشان.

قصر: کۆشك    فردوس: بەرزترین پلەی بەهەشت

رضوان: پاسەوانی بەردەرگای بەهەشت، یاخود بەمانای رەزامەندی دێت، کە رەزامەندی خودا دەبێتە مایەی چوونە ژوورەوەی بەهەشت و دەکرێ، لێرەدا ئەو مانایەش بدات کە رەزامەندی خودا پاسەوانی دەرگای بەهەشتە و هەرکەس خودا لێی رازی نەبێت ناچێتە بەهەشت.    دربان: پاسەوانی بەردەرگا    منظری: تابلۆیەك، شێوەیەك، ئەوەی لە بەرامبەر چاودا بەیەکجار دەبینرێت.

چمن: چیمەن، مێرگوزار    نزهت: پاکی، پاکیزەیی    چمن نزهت درویشان: مەبەست لە چیمەنی پاکیزەیی دەروێشان ویژدان و ناخی پاك و بێ خەوشی دەروێشانە.

لێرەدا دیسان لە وەسفی پاکی دەروون و ناخ و ویژدانی دەروێشان و هاورێیەتی و لەگەڵدابوونی دەروێشاندا نموونەی بەرزترین پلەی بەهەشت دەهێنێتەوە کە باخی فیردەوسە و ریزوان و رەزامەندی پاسەوانی بەردەگاکەیەتی و هەموو کەسێ پێی ناگات و دەڵێ: ئەو باخی بەهەشتە نموونەیەکە یاخود شێوە و تابلۆیەکە لە پاکی باخی دەروێشان و دڵپاکی و بڵندنەفسی و چاکییەکانی ناخ و دەروونی دەروێشان زۆر لە فیردەوس گرانبەهاترە.

**٤- آنچه زر می شود از پرتو آن قلب سیاه**

**کیمیاییست که در صحبت درویشان است**

**ئانچە زەر می شەڤەد ئەز پرتوڤی ئان قەلبی سیاه، کیمیاییست کە دەر سوهبەتی دەرڤیشانەست.**

ئەو شتەی کە بە کاریگەری ئەو سکەی قەڵبی رەش دەبێتە زێڕ، ئیکسیرێکە کە لە هاودەمی و پێکەوەژیانی دەروێشاندایە.

آنچە: ئەوشتەی    زر: زێڕ، ئاڵتون    پرتو: رووناکایی، کاریگەری

آن: (ئەو) راناوی کەسی سێیەمە کە بۆ بێگیان بەکاردێ، لێرەدا بۆ (ئەوشتە) دەگەڕێتەوە

قلب: سکەی قەڵب، دڵ    سیاه: رەش

کیمیا: ئیکسیر، ماددەیەکە (کە تاڕادەیەکی زۆر خەیاڵییە) کە مس و ماددەی دیکە دەکات بەئاڵتون    صحبت: هاورێیەتی، پێکەوە ژیانی، هاودەمی

دەکرێ لەروویەکی زمانەوانییەوە (قلب سیاه) لێك بدەینەوە کە سکەی قەڵبی رەشە، ئەو کاتەش شرۆڤەیەکی زمانیانە بۆ بەیتەکە دەکەین: واتە ئەو ئیکسیرەی کە لە ئەنجامی



کاریگەری ئەوەوە سکەی قەڵبی رەش (یاخود پارەی قەڵب و تەزویر کە لە مس دروست دەکرێت) دەبێتە ئاڵتون لە هاودەمی و پێکەوە ژیانی دەروێشاندا بەدەست دەکەوێت بەمەش مەبەست لەوەیە کە هاودەمی و پێکەوە ژیان لەگەڵ دەروێشاندا هێندە بە نرخە کە وەك ئەوە وایە ماددەی ئیکسیرت بەدەست هێنابێ کە لەلای زۆرینەی نەتەوە جیاجیاکان و لە ئەفسانەی شوێنکاتە جیاوازەکاندا ئامادەیی هەیە، چونکە نەك هەر لە ئەفسانەی رۆژهەڵاتدا (ئیکسیر) هەبووە لە ئەفسانەی رۆژئاوا و تەنانەت ئەمریکای لاتینیشدا بوونی هەبووە و هەیە، بۆ نموونە لە (رۆمانی ـ سەد ساڵ تەنیایی ـ گابریێل گارسیا مارکیزی کۆڵۆمبی)دا بە دوورودرێژی باسی ئەم بیرە ئەفسانەییە دەکرێت.

هەروەها (قلب سیاه) ئاماژەشە بۆ دڵی رەش و گوناهبار، لێرەشدا مانایەکی دیکە وەردەگرێت و لە واتا زمانییەکە لادەدات ئەو شتەی کە لە ئەنجامی رووناکایی و پەرتەوی ئەوەوە دڵی رەشی گوناهکاران وەك ئاڵتون و زێڕ دەدرەوشێتەوە ئیکسیرێکە کە لە هاودەمی و پێکەوە ژیانی دەروێشاندایە واتە هاودەمی و پێکەوە ژیانی دەروێشان هێندە سوودبەخشە دڵە رەشە گوناهبارەکان کە بە هۆی گوناهەوە رەش بوون (هەروەك لە فەرمووەدەدا هاتووە کە هەر گوناهێك خاڵێکی رەش لەسەر دڵ دادەنێ تا لە ئەنجامی زۆری گوناهدا بە تەواوی رەش دەبێت و مۆری لێدەدرێت کە ئیدی ئەوە دوا پلەی رەشبوون و گوناهکارییە) بەڵام حافز دەڵێ: هاودەمی دەروێشان و پیاوانی خودا هێندە کاریگەری هەیە و هێندە رۆشنایی بەخشە وەك ئیکسیر وایە و لە ئەنجامی رۆشنایی ئەوەوە دڵی رەش وەك ئاڵتون و زێڕ رووناك دەبێتەوە و لە گوناه دەشۆردرێتەوە.

**٥- آن که پیشش بنهد تاج تکبر خورشید**

**کبریاییست که در حشمت درویشان است**

**ئان کە پیشەش بنهەد تاجی تەکەبوور خورشید، کبریاییست کە دەر هیشمەتی دەرڤیشانەست.**

ئەوەی کە هەتاو لە بەرامبەریدا تاجی خۆبەگەورە زانین دابنێ (لە تاو خۆبەکەم زانی) گەورەییەکە کە لە پلە و پایەی دەروێشاندایە.

آن کە: ئەوەی کە، ئەوشتەی کە    پیشش: لە بەرامبەریدا، لەبەردەمیدا

بنهد: دابنێ    تکبر: خۆ لە هەموان پێی چاکتر و گەورەتر، تەکەبوور، خۆبەزلزانین

خورشید: هەتاو، خۆر    کبریاء گەورەیی، عیزەت    حشمت: پلەوپایە

له نوسخەی (سودی)دا له بری (آن كه) (آنچه) هاتووه {ج١، ل٣٣٣} لەبەر ئەوەی که (آن كه) بۆ مرۆڤه و لێرەشدا (كبرياء) مرۆڤ نییه بۆیه (آنچه)ی به راستتر زانیوه، بەڵام له نوسخەی (قزوینی و غنی و هروی)دا (آنكه) هاتووه، هەرچەنده (هروی) خۆی رای وایه که واتای (ئەو کەسەی که) دەگەیەنێ، بەڵام بە هۆی (كبرياء)ەوە به (ئەو شتەی که) مانای لێکداوەتەوە {ج١، ل١٦٨}. بەهەرحاڵ له کوردیدا هیچ گرفتێك دروست نابێت و (ئەوەی که) دەکرێ مرۆڤ یاخود شت بێت و دەکرێ له فارسی سەردەمی حافزیشدا به هەمان شێوە بووبێت.

بێگومان هەتاو سومبوولە بۆ بەرزی و بڵندی و هەمیشه به رەمزی خۆ بەگەورە زانین زانراوە و حەقیشی پێدراوە، بەڵام لێرەدا و له وەسفی دەروێشاندا دەڵێ: ئەو هەتاوە بەرز و بڵندەی که هەمیشه خۆی له هەمووان پێ گەورەتر و بەرز و شایستەتر بووە تاجی گەورەیی و خۆبەزلزانینی له بەردەم گەورەیی دەروێشاندا دادەنێ و خۆی بەکەم دەزانێ، به گوتەی حافز: ئەوەی که هەتاو له بەرامبەریدا (بۆ خۆکەم گرتن و تەوازوع) تاجی خۆبەگەورە زانینی دەهێنێتە خوارەوە، گەورەییەکە له پلەوپایە یاخود شەرم و حەیا و مەقامی دەروێشاندا هەیە.

**٦- از کران تا به کران لشکر ظلم است ولی**

**از ازل تا به ابد فرصت درویشان است**

**ئەز کەران تا بە کەران لەشکری زولمەست ڤەلی، ئەز ئەزەل تا به ئەبەد فورسەتی دەرڤیشانەست.**

لەشکری ستەم لەم سەر تا ئەوسەری گرتووە، بەڵام دەروێشان له ئەزەل تا ئەبەد فرسەت و بوواریان هەیە.

کران: کەنار، کۆتایی، ئەمسەر و ئەوسەر    لشکر: سوپا، ئۆردو

ظلم: ستەم    ولی: بەڵام    ازل: ئەزەل، کاتێ پێش دەستپێکردنی دونیا، هەربووو

ابد: کۆتایی    فرصت: فرسەت، بووار

یەکێك لەو بیروبۆچوونانەی که سەبارەت به مرۆڤ و ستەم هەیه و جێگەی تێڕامانی شاعیرە مەسەلەی بەردەوامی مرۆڤه له ئەزەلەوە تا ئەبەد و کاتیی بوونی شتە دنیاییەکانه، لێرەدا ئەو جەدەلەش دێتە ئاراوە که ئایا ستەم له وجودی مرۆڤدایه یاخود له دونیادایه و مرۆڤ فێری دەبێت، لای عارفەکان رای دووەم زیاتر جێگەی قەبووڵکردنە، هەر بۆیه زوڵم ناچێتەوە نێو (لامکان و لازمان)ەوە، بەڵام مرۆڤ و روح دەچێتەوە ئەودیو شوێن و کات. دەروێشان که ئەو مرۆڤه عارفانەن که ژیانی بەر له بە مرۆڤبوونیان درێژە پێدەدەن و کۆتاییشیان نایەت هەربۆیە هەمیشە هەن، بەم بۆچوونە مانای بەیتەکە دەبێتە: لەمسەر تا ئەوسەری دونیا،



یاخود تا کەنارەکانی دونیا، ئۆردوی زوڵم و ستەمە و زوڵم و ستەم هەموو دونیای داگیر کردووە، بەڵام دەروێشان لەبەر ئەوەی چاکن و حەقیقەتی روحی مرۆڤ له ئەزەلەوە تا ئەبەد (که مانای بێسەرەتا و بێکۆتایی) دەگەیەنێ بوواریان هەیە و سنووردار ناکرێن.

ئەم شەرحە لەگەڵ هیچکام له شەرحی (د. هروی و سودی)دا یەکنایەتەوە که بەجۆرێك له جۆرەکان شرۆڤەیەکی سەرزارەکییان کردووە. بڕوانە {د. هروی، ج١، ل١٦٨ـ سودی، ج١، ل٣٣٥}.

**٧- دولتی را که نباشد غم از آسیب زوال**

**بی تکلّف بشنو دولت درویشان است**

**دۆڵتی را کە نەباشەد غەم ئەز ئاسیبی زەڤال، بی تەکەللوف بشنەڤ دۆڵەتی دەرڤیشانەست.**

بێ خەم گوێت لێ بێ بەخت و دەوڵەتێك کە خەمی ئازاری له ناوچوونی نەبێ و خۆڕاگربێ دەوڵەتی دەروێشانە.

دولت: بەخت و ئیقباڵ، دەوڵەت، دام و دەزگا، خۆشبەختی    نباشد: نەبیێ

آسیب: ئازار، ئافات و بەڵا    زوال: لەناوچوون، ئاوابوون

بی تکلف: بێ خەم، بێ خۆماندووکردن    بشنو: گوێت لێ بێ، مەبەست لەم دەربڕینە(بی تکلف بشنو) ئەوەیە که به بێ ئەوەی پێویست به گومان بکات.

دەتوانرێت (دولت) به بەخت و خۆشبەختی لێکدرێتەوە و ئەو کاتەش واتای بەیتەکه دەبێتە: به بێ ئەوەی زەحمەت بکێشی و به بێ منەت پێت دەڵێم که خۆشبەختی و بەختی چاك که ترسی له ناوچوون و ئاوابوونی نەبێ تەنیا خۆشبەختی و بەختی دەروێشانە. بەڵام (دەوڵەت) به واتای دەوڵەت و دام و دەزگاش دێت که لەم مانایەدا به تەواوی به واتای بەیتی پێشووترەوە گرێ دەدرێتەوە، چونکه تەواوی دامودەزگا و دەوڵەتەکانی دونیا که ئاماژەیەکه به زوڵم و ستەمیش گرێدراوی کاتن و پاروی له ناوچوونن و (ئشپنجلر) وتەنی هەموو ژیارەکان تەمەنی منداڵی و لاوی و گەشە و پیری و مردنیان هەیە{ تدهور حضارة غربية} یاخود (تۆینبی) وتەنی هەموویان کۆتاییان دێت، بەڵام لەبەر ئەوەی دامودەزگا و دەوڵەتی دەروێشان وابەستەی دونیا نییە و له پێش ئەمەوە هەیە و هەموو ئەزەلییەکیش کۆتایی نییە، یا بەگوتەی فەلسەفی (هەرشتێ سەرەتای نەبوو کۆتایشی نییە) ئەوا تەنیا ئەو دەوڵەت و دامودەزگایە ترسی ئازار و سەدمەی لەناوچوون و ئاوابوونی نییە بۆیە بە بێ خەم و بە بێ گومان ئەم قسەیە بسەلمێنە و گوێی لێ بگرە.

**٨- گنج قارون که فرو می رود از قهر هنوز**

**خوانده باشی که هم از غیرت درویشان است**

**گەنجی قارون کە فرو می رەڤەد ئەز قەهر هەنوز، خاندە باشی کە هەم ئەز قیرەتی دەرڤیشانەست.**

رەنگە خوێندبێتەوە گەنج و ماڵ و سەروەتی قارونیش کە هێشتا لە توڕەییدا بە ناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە، هەر لە غیرەتی دەروێشانەوەیە.

گنج: ماڵ و سەروەت

قارون: قارون، دەوڵەمەندێکی سەردەمی حەزرەتی موسا بوو کە خوا بە خۆیی و سەروەت و ماڵەکەیەوە بردی بەناخی زەویدا و لە هەندێ ریوایەتدا ئێستاش هەر رۆدەچێ.

فرو می رود: دەچێت بەناخدا، رۆدەچێت   قهر: توڕەیی   هنوز: هێشتا

خواندەباشی: خوێندبێتەوە، بزانە   غیرت: غیرەت و پیاوەتی، ئیرەیی

لێرەدا زیاتر وەسفی دەروێشان دەکرێت کە کێ بوون، زیاتر رووندەبێتەوە کە پیاوانی خودابوون، چونکە چیرۆکی حەزرەتی موسا (علیه سلام) و قارون ئەوە رووندەکاتەوە، کاتێ قارونی دەوڵەمەند ئامادەنەبوو زەکات بدات بە هۆی ئەو سەرپێچییەوە خودا سزایدا و بردی بە ناخی زەویدا وەك لە ئایەتی (٨١) سورەتی (قصص)دا هاتووە (فخسفنا بە و بدارە الارض...) واتە: بەو هۆیەوە خۆیی و ماڵ و سامانەکەیان برد بە ناخی زەویدا.

بێگومان لێرەدا (دەروێشان) دەکرێ موسا و موسوڵمانان بن یاخود وەك (سودی) دەڵێ: هەژارەکانی سەردەمی موسا بن کە وتیان (لا تفرح ان الله لا یحب الفرحین){القصص/٧٦} یاخود پیاوەچاکەکانی خودا و عارفەکان بن.

قارون و ماڵ و سەروەتەکەی لە توڕەییدا بە ناخی زەویدا رۆشتن بێگومان ئەمەش توڕەیی خودابوو لە کاتێکدا دەبوو قارون ماڵ و سەروەتەکەی بڕوادارتری بکات، بەڵام فیز و خۆبەزلزانینی زیادکردبوو، خۆی بە هەموو شت دەزانی، حافز دەڵێ: ئەو گەنج و ماڵ و سەروەتەی قارون کە هەتا ئێستا هێشتا هەر بە ناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە لە غیرەت و پیاوەتی یاخود ئیرەیی و چاوەڕوانی دەروێشانەوەبوو، واتە لەبەر ئەوەبوو کە قارون بەشی دەروێشان و پیاوانی خودای لێ دەرنەدەکرد و بەمەش خودا سزایدا و سزاکەش لەبەر خاتری دەروێشان بوو.

**٩- ای توانگر مفروش این همه نخوت که ترا**

**سر و زر درکنف همت درویشان است**

**ئەی تەڤانگەر مەفروش ئین همە نەخڤەت کە تو را، سەر و زەر دەر کەنەفی هیمەتی دەرڤیشانەست.**



ئەی دەوڵەمەند، ئەم هەموو فیز و گەورەییە مەفرۆشە، کە سەر و ماڵی تۆ هەموو لە پەنای هیمەتی دەروێشاندایە.

توانگر: دەوڵەمەند، بەتوانا   مفروش: مەفرۆشە   نخوت: فیز و خۆبەگەورەزانین

سر و زر: سەروماڵ(زێڕ)   کنف: پەنا، سێبەر، سایە

مانای ئەم بەیتە بە بەیتی پێشەوە بەستراوە و زیاتر واتای دەروێشان دەردەکەوێت و لێرەدا لە بەرامبەر دەوڵەمەنداندا هاتووە و (توانگر) هەمان قارون و قارون سیفەتەکانن، پاش ئەوەی کە چارەنووسی دەوڵەمەندێکی وەك قارونی هێنایەوە کە لە غیرەتی دەروێشانەوە بە قوڕاچوو، لێرەشدا یادی دەوڵەمەندەکان دەخاتەوە کە ئێوە هەرچیتان هەیە لە هیمەت و زەحمەتی دەروێشانەوەیە کە، لێرەدا زیاتر سیفەتی هەژاران و زەحمەتکێشەکان یاخود چینی زەحمەت کێشی کۆمەڵگەن. بۆیە فیز و تەکەبوور مەفرۆشن بەسەر دەروێشاندا و خۆتان بە گەورە مەزانن، چونکە سەر و ماڵتان لە سایە و پەنای هیمەتی دەروێشاندایە و هەرکاتێ بیانەوێ وەك موسا دۆعا و نزا بکەن سەروماڵتان بەناخی زەویدا دەچێ.

**١٠- خسروان قبلهء حاجات جهانند ولی**

**سببش بندگی حضرت درویشان است**

**خوسروڤان قیبلەیی هاجاتی جەهانەند ڤەلی، سەبەبەش بەندەگیی هەزرەتی دەرڤیشانەست.**

پادشایان قیبلەی پێویستییەکانی تەواوی خەڵکی جیهانن، بەڵام هۆی گەیشتنیان بەو پلە و پایەیە بەندەبوونیانە لە حزووری دەروێشاندا.

خسروان: کۆی خوسرەوە، واتای پادشا دەگەیەنێت و بە پاشاکانی ئێرانی دێرین گوتراوە قبلهء حاجات: قیبلەی پێویستی، واتە خەڵکی لە کاتی پێویستیدا روویان تێدەکەن و پێویستی خەڵکی جێبەجێ دەکەن هەروەك چۆن خەڵك روو لە کەعبە دەکات

بندگی: بەندەیی، خۆبەکەم زانی   حضرت: حزور، لە بەردەم، لەحزوری

دەڵێ: ئەگەر پادشایان بە پلە و پایەیەك گەیشتوون و تەواوی خەڵك و جیهانییان پێوستیان بەوانە و وەك قیبلە روویان تێدەکەن لەبەر ئەوەیە کە لە حزووی دەروێشاندا خۆ بەکەم دەگرن و دەروێشان بە سەروەری خۆیان دەزانن، ئەمەش ئاماژەیە بەو پادشایانەی کە لە بەرامبەر زانا و عارفەکاندا چۆك دادەدەن و بەهای زانست و مرۆڤایەتی دەزانن.

١١- **روى مقصود كه شاهان به دعا مى طلبند**

**مظهرش آينهء طلعت درويشان است**

**رووی مەقسود کە شاهان بە دوئا می تەلەبەند، مەزهەرەش ئاینەیی تەلعەتی دەرڤیشانەست.**

رووی مەقصود کە پادشایان بە نزا داوای بینینی دەکەن، شوێنی دەرکەوتنی ئاوێنەی رووخساری دەروێشانە.

مقصود: ویستراو، ئامانج، دەکرێ مەبەستی لە زاتی خودا بێت، چونکە مانای خوداش دەگەیەنێت و یەکێکە لە ناو و سیفاتەکانی خودا بەدعا: بەدۆعا، بەنزا می‌طلبند: داوای دەکەن

بەدعا میطلبند: بەنزاوە داوا دەکەن مظهرش: شوێنی دەرکەوتنی، جیلوەگای
طلعت: رووخسار، دەم و چاو، بەخت، بەڵام لێرەدا مەبەست لە رووخسار و دەم و چاوە.

بێگومان تەواوی خەڵکی دونیا ئاواتی ئەوەیە کە بە خودا بگات یاخود بە ئامانج و ویستراوی خۆی بگات تەنانەت پادشایانیش هێشتا بە هەموو شتەکان نەگەیشتوون بە تایبەتی نزیکبوونەوە لە خودا و رەزامەندی و نزیکی لە دەرگا و ئاستانەی ئەودا، هەر بۆیە دەڵێ: ئەگەر پادشایان دەیانەوێ بە نزا و پاڕانەوە لە خودا نزیك ببنەوە و لێیان رازی بێت دەبێ بزانن کە خودا لە رووخساری عارف و نزیکەکانی خۆیدا (ولی) دەردەکەوێت و رووخساری دەروێشان رەنگدەرەوەی نوری حەقیقەتی خوداییە و رازی کردنی وەلییەکانی خوا (دەروێشان) رازی کردنی خودایە، ئەمەش دو فەرموودەمان بیر دەخاتەوە یەکەمیان مەسەلەی جلوەکردنی خودایە لە بەندەدا (کاتێ بەندە لە خودا نزیك دەبێتەوە خودا دەبێتە دەستی، ......) هەروەها لە رازی کردنی وەلییەکانی خودایە کە خودا لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرمووێ (هەرکەس وەلییەك ئازار بدات شەڕی لەگەڵدا دەست پێدەکەم ـ من عادا لی ولیا فقد آذنته بالحرب).

١٢- **حافظ ار آب حيات ازلى مى خواهى**

**منبعش خاك در خلوت درويشان است**

**هافز ئەر ئابی هەیاتی ئەزەلی می خاهی، مەنبەئەش خاکی دەری خەڵڤەتی دەرڤیشانەست.**

حافز ئەگەر ئاوی حەیاتی ئەزەلیت دەوێت، سەرچاوەکەی خاکی بەردەرگای خەڵوەتی دەروێشانە.

ار: ئەگەر آب حیات: ئاوی ژیان



آب حیات ازلی: ئاوی ژیانی ئەزەلی، ئەو ژیانەی بەر لە دەستپێکردنی دونیا هەبووە میخواهی: دەتەوێ منبع: سەرچاوە

حافز لێرەدا رو بەخۆی قسە دەکات و بە خۆی دەڵێ: گەر تۆش ئاوی ژیانی ئەزەلیت دەوێ. واتە: گەر دەتەوێ ژیانت گرێ بدرێتەوە بە ژیانی بەرلەدروستبوونی جەستەکانەوە و بچیتەوە نێو ئەزەل کە بەمەش ئیدی مردن زەفەرت پێ نابات و جاویدان دەبیت، ئەوە بزانە کە سەرچاوەی ئەو ئاوە لە خاکی بەردەرگای خەڵوەت و تەنیایی دەروێشانەوە هەڵدەقوڵێت. بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئاوی حەیاتە پێویستە لە بەردەرگای دەروێشاندا ئێشك بگریت و بکەویت تا ئەو ئاوە بەدەست بهێنیت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە شەرحی (هروی) ئەم بەیتەی تێیدا نییە و لە جیاتیدا هاتووە:

(**حافظ اینجا به ادب باش که سلطانی و ملك ـ هم از بندگی حضرت درویشان است**) {هروی، ج١، ل١٧١}

بەڵام لەلایەکەوە لەبەر ئەوەی لە نوسخەی (عەلامە قزوینی و د. قاسم غنی) و ئەوانی دیکەدا نەهاتبوو، لەلایەکی دیکەوە دووبارەبوونەوە میسراعی دووەم (**بندگی حضرت درویشان است**) کە لەبەیتی پێشووتریشدا هاتووە بەیتی نوسخەکەی (قزوینی و غنی) مان هەڵبژارد، شایانی باسکردنە لە شەرحەکەی (سودی)دا هەردوو بەیتەکە هاتووە {سودی، ج١، ل٣٣٧ ـ ٣٣٨}.

١٣- **من مريد نظر آصف عهدم كو را**

**صورت خواجگى و سيرت درويشان است**

**مەن موریدی نەزەری ئاسەفی ئەهدەم کو را، سورەتی خاجەگیی و سیرەتی دەرڤیشانەست.**

من مورید و شوێنکەوتەی بۆچوونی وەزیری سەردەمم، چونکە ئەو رووخساری گەورەیی و خو و رەفتاری دەروێشانەی هەیە.

مرید: شوێنکەوتە، پەیڕەوکەری، مورید نظر: بیروبۆچوون، را

آصف عهد: وەزیری سەردەم کە چاك بێت وەك (آصف برخیا) وەزیری حەزرەتی سولەیمان کورا: کە او را: کە ئەو صورت: شێوە، رووخسار خواجگی: گەورەیی سیرت: خو و رەفتار، بیروبۆچوون، دابوونەریت، خولق و خو.

سودی پێیوایە مەبەست لە (آصف عهد) وەزیری ئەو سەردەمە (قوام الدین حسن)ە {سودی، ج١، ل٣٣١}، بەڵام (هروی) بە هێنانی گوتەی (د. غنی) کە لە (تاریخ عصر حافظ،

ج١، ل١٧٢}دا هاتووە بە (جلال الدين تورانشاه) وەزیری (شجاع پاشا) ی دەداتە قەڵەم، گەر هەر کامێکیان بێت یاخود هیچکامیشیان نەبێت گرنگ ئەوەیە کە ئەو وەزیرە لای حافز پەسەند کراوبووە و وەزیرێکی عارفی زانابووە، دەروێشانە بیری کردۆتەوە، بۆیە حافز ستایشی کردووە ـ بە پێی ئەم غەزەلەـ و دەڵێ: من شوێنکەوتە و موریدی راوبۆچوونی ئەوم، چونکە ئەو وەزیرە گەرچی بە رووکار و جلوبەرگ لە گەورەکانە وەك پادشا و وەزیرانە، بەڵام لە ناخیدا دەروێشانەیە و بۆچوونی دەروێشانەی هەیە.

لە شرۆڤەی ئەم بەیتەدا د. هروی تێبینییەکی ورد و جوان سەبارەت بە عیرفانی حافز دەخاتەڕوو کە لەبەر ئەمانەتی زانستی وەك خۆی وەری دەگێڕن: "تێبینی دەکرێت کە عیرفانی حافز تەنیا رێگەك نەبووە بۆ گەیشتن بە ئامانجی ئەودیو سروشت و میتافیزك، بەڵکو لە بەرامبەر دەزگای دەوڵەتیشدا کە بە دروشم و لە ژێر ئاییندا دەستی کردبووە ستەم و تاڵانکردن بە وەسیلەیەکی رووبەڕووبوونەوە و هۆشیارکردنەوەی چالاك دراوەتە قەڵەم" {ج١، ل١٧٢}.

بێگومان ئەم جۆرەش لە عیرفان و دینداریکردن بە شێوەیەکی گشتی دینداریکردنە بۆ ژیان و میتافیزك پێکەوە لەکاتێکدا بە درێژایی مێژوو هەوڵی جوداکردنەوەی ئەو دوانە (دین و دونیا) لە یەکدی دەدرێت.





## غەزەلی سی و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مغاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- به دام زلف تو دل مبتلای خویشتن است**

**بکش به غمزه که اینش سزای خویشتن است**

**به دامی زولفی تو دل موبتەلای خیشتەنەست، بکوش بە غەمزە کە ئینەش سزای خیشتەنەست.**

دڵ بەدەستی خۆی گرفتاری داوی زوڵفی تۆ بووە، بە غەمزە بیکوژە کە ئەمە لایقی خۆیەتی.

متبلا: گرفتار، تووشبوون          خویشتن: خۆی (راناوی خۆیەتییە)

مبتلای خویشتن: بەدەستی خۆی گرفتاربووە، بە هۆی ئارەزووی خۆیەوە گرفتار بووە

بکش: بکوژە          غمزە: خەمزە، ئیشارەتکردن بەچاو          اینش: ئەمە

سزای خویشتن: لایقی خۆیەتی

ئەی یار دڵ بە ئارەزووی خۆی، خۆی خستۆتە نێو داوی زوڵفی تۆوە، هەر بۆیە مادام بەئارەزوو خۆی تووشی ئەو داوە کرد بە خەمزەی چاو بیکوژە، چونکە هەر ئەوە لایق و سزایەتی، شاعیر مەبەستی ئەوەیە کە دڵ بە ئارەزووی خۆی، خۆی خستۆتە سەر ڕێگای عەشق و نهێنییەکانی ئەو ڕێگایە و خۆی تووشی داوی نهێنییەکانی بوون کردووە بۆیە هەرچیی لێ بێت حەقی خۆیەتی و سزای خۆی وەردەگرێ.کەس بە زۆر ئەو ڕێگەیەی پێ هەڵنەبژاردووە.

**٢- گرت ز دست برآید مراد خاطر ما**

**به دست باش که خیری به جای خویشتن است**

**گەرەت ز دەست بەرایەد مورادی خاتری ما، بە دەست باش کە خەیری بە جای خیشتەنەست.**

ئەگەر هێنانەدی ئارەزووی دڵی ئێمەت لەدەست دێت، دەستوبرد بکە، چونکە کارێکی چاکی لە شوێنی خۆیەتی.

ز دست برآید: لەدەستت دێت، دەتوانی          مراد: ئارەزووو

خاطر: فکر، دڵ (لێرەدا مانای دووەم ڕێکترە، هەرچەندە هەر مانای بیر و فکر)ە



مراد خاطر: ئارەزووی دڵ          بەدست باش: دەست و بردکە، خێرابکە

بەجای خویشتن: لەجێی خۆیەتی

واتە ئەگەر لە دەستت دێت ئارەزوو و ئاواتی دڵی ئێمە بەجێ بهێنی ئەوا خێراکە، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا کارێکی خێر و چاکەیە و لە جێی خۆیەتی و کاری خێریش دەبێ زوو ئەنجام بدرێت.

(بەجای خویشتن) بە واتای (دەرحەق بەخۆکردن)یش دێت بەم مانایەش: ئەگەر لەدەستت دێت ئارەزووی دڵی ئێمە بهێنیتەدی، خێراکە، چونکە ئەمە کارێکی خێرە کە دەرحەق بە خۆت دەیکەی واتە گەر ئارەزووی دڵی ئێمە بێتەدی کە عاشقی تۆین ئارەزووی دڵی تۆش دێتەدی کە مەعشوقی، چونکە خۆشبەختی عاشق و مەعشوق پەیوەستە پێکەوە.

**٣- به مشك چین و چگل نیست چین گل محتاج**

**که نافەهاش ز بند قبای خویشتن است**

**بە موشکی چین و چگل نیست چینی گول موهتاج، کە نافەهاش ز بەندی قیبای خیشتەنەست.**

چینی گوڵ پێویستی بە میسکی چین و چگل نییە، چونکە نافەکانی لە بەندی قەبای خۆیەتی.

چین و چگل: ناوی دوو شارن لە(تورکستان) کە لە ئەدەبیانی فارسیدا بە شوێنی ژیانی ئەو ئاسکانە دەدرێتە قەڵەم کە میسکیان لێدەردەهێنن، هەروەها بە شاری جوانانیش ناوبانگیان دەرکردووە.          چین گل: چینی گوڵ، قەدی گوڵ

نافە: ئەو کیسەیەی کە میسکی تێدایە          قبا: کراسێکی درێژە کە پێشەوەی دەکرێتەوە وەك (جبەی) مەلا یاخود پاڵتۆ کە بە (قۆپچە و دوگمە) دادەخرێت و بەمەش دوو لای پاڵتۆکە دەکەونە سەریەکتری (بند قبا)ش هەمان ئەو کەوتنە سەریەکترییە کە لە کاتی داخستنی قۆپچەی پاڵتۆیان (قبا)دا دەکەونە سەر یەکتری. بێگومان بۆ بۆنخۆشکردنی جلوبەرگ عەتر و بۆنی خۆش بە چین و قەدەکانیاندا دەڕێژن، بەڵام لێرەدا و بە لەبەرچاوگرتنی ئەم حاڵەتە شاعیر دەڵێ: چین و قەدی گوڵ پێویستی بەوە نییە کە میسکی (چین و چگل)ی بەسەردا بڕێژن تا بۆنخۆش بێت، چونکە قەبایەك، پاڵتۆیەك کە پەڕەکانی گوڵە و لەبەریدایە خۆی بۆنخۆشە و وەك (نافە)کیسەی میسك وایە، گەر بیکەنەوە واتە گەر پەڕەکانی بکەنەوە بۆنی خۆش بڵاودەبێتەوە هەروەك چۆن کاتێ سەری (نافە) کیسەی میسك دەکەنەوە بۆنی خۆش بڵاودەبێتەوە.

٤- به جانت ای بت شیرین من که همچون شمع

شبان تیره مرادم فنای خویشتن است

**به جانەت ئەی بووتی شیرینی مەن کە هەمچون شەمع، شەبانی تیرە مورادەم فەنای خیشتەنەست.**

ئەی بتی شیرینی من بەگیانت قەسەم، شەوانی تاریك هەر وەك مۆم ئارەزووی فەنای خۆم هەیە.

بت شیرین: یاری شیرین   همچون: هەروەك   شبان: شەوان   تیره: تاریك

فنا: لەناوچوون، فەنا، نەمان

هەمیشە مۆم لە شەواندا (بەمەبەستی رووناككردنەوە) دادەگیرسێنرێت و ئەو شەو رووناك دەكاتەوە، بەڵام خۆی روو لە نەمان و فەوتانە، شاعیر سوێند بەگیانی یاری شیرین دەخوات كە منیش لە شەوانی تاریكی هیجراندا وەك مۆم ئارەزوو و هیوام ئەوەیە كە شەوانی تاریك رووناككەمەوە بە سووتانم و خۆشم بەرەو نەمان و فەنا برۆم.

(فەنا) دەماناخاتە نێو مانایەكی زۆر جوانی عیرفانی، لێرەدا روو بە خودا (مەعشوق) و یاری شیرینی هەمیشەیی عارفەكان، سوێنددەخوات كە لە شەوانی تاریكدا وەك مۆم داگیرساوم و لە دووریت دەسووتێم لەم سەروبەندەدا و لەم شەوە تاریك و نوتەكانەدا ئارەزوو و ئاواتم فەنا و توانەوەیە لە نێو زاتی تۆدا و هیوام ئەوەیە كە فەنابم.

٥- چو رای عشق زدی با تو گفتم ای بلبل

مکن که آن گل خودرو برای خویشتن است

**چو رای ئیشق زەدی با تو گوفتەم ئەی بوولبوول، مەکون کە ئان گولی خودرۆو بە رای (بەرای) خیشتەنەست.**

ئەی بوولبوول كاتێ سەبارەت بە عەشق پرسیارت كرد و رات ویست بە تۆم گوت، عەشقبازی مەكە، چونكە ئەو گوڵە خۆڕسكە تەنیا بە خۆیەوە سەرقاڵە (و بۆ خۆیەتی).

رای: را، رەئی   رای عشق زدن: راوەرگرتن سەبارەت بە عەشق   مکن: مەکە

خودرو: خۆرسك، گوڵێك كە لەخۆوە سەوزبوویێت، بەڵام لێرەدا مەبەست لە(خودرو)(بێ باك)ە واتە: كەسێك كە تەنیا لەبیری خۆیدایە و گوێ بەكەسی دیكە نادات.

بەرای(برای): بۆ، لەرێی، بە دووجۆر دەخوێنرێتەوە و مانای جیاواز، بەڵام نزیك دەدات كە بۆخۆیەتی، و بەخۆیەوە سەرقاڵە.

واتە: ئەی بوولبوول، تۆ لە سەرەتای عەشقبازیدا كاتێ سەبارەت بە عەشق پرسیارت لە من كرد و رای منت ویست من بە تۆم گوت مەكە، لەبەر ئەوەی كە ئەو كەسەی تۆ هەڵتبژارد بیكەیتە یار



و مەعشوقی خۆت گوڵێكی سروشتی بێ باكە و تەنیا لەبیری خۆیدایە و گوێ بە هەست و سۆز و سووتانی تۆ نادات، لێرەدا بنەمایەكی گرنگ بۆ عەشق دەستنیشان دەكات كە ئەویش لایەكەی دیكەی عەشقە كە مەعشوق یاخود یارە و پێویستە یاریش لەو گەمەیەی عەشقبازیدا كاریگەری هەبێت یاخود وەڵام بداتەوە گەر بە لۆمەش بێت، بەڵام ئەگەر بەهیچ جۆرێك گوێ پێ نەدا ئەوا نەكردنی ئەو گەمەیە سوودبەخشترە، دەگێڕنەوە جارێك پیاوێ هاتە لای حەزرەتی موسا(د.خ) و پێی گوت: بزانە پلەم لای خودا لە كوێدایە حەزرەتیش پاش پرسیاركردن لە خودا پێی گوت: ـــ لە بنی دۆزەخدایە. كابرا زۆر دڵخۆشبوو، موساش پێی گوت: ـ هۆی ئەم دڵخۆشییەت چییە؟ گوتی: ـ گرنگ ئەوەیە خوا لە بیری نەكردووم و لە كاتی دابەشكردندا منی بیر بووە، ئیدی شوێنەكە گرنگ نییە. لە لایەكی دیكەوە بە مانایەك لە ماناكان ئەم بەیتە رەفزكردنی عەشقی زەمینییە.

٦- مرو به خانهء ارباب بی مروت دهر

که گنج عافیتت در سرای خویشتن است

**مەرو بە خانەیی ئەربابی بی مروڤەتی دەهر، کە گەنجی ئافییەتەت دەر سەرای خیشتەنەست.**

مەڕۆ بۆ ماڵی خەڵكی دەوڵەمەندی نامەردی رۆژگار، چونكە گەنج و جەواهێری ئارامی و سەلامەتیت لە ماڵی خۆتدایە.

مرو: مەڕۆ، مەچۆ   ارباب: دەسەڵاتدار، خاوەن، دەوڵەمەند

مروت: پیاوەتی، مەردایەتی   بی مروت: نامەرد، بێ ویژدان   سرا: ماڵ

مرۆڤ بەو كەمە ماڵەی هەیەتی دەتوانێت ئارامی و سەلامەتی بە دەست خۆی بێنێت، بەڵام كاتێك چووە بەر دەرگای كەسە نامەردەكان ئیدی تووشی هەزارەها مەینەتی و دەردیسەری دەبێتەوە. حافز بە لەبەرچاوگرتنی ئەم راستییە ئامۆژگاری مرۆڤ دەكات و دەڵێ: مەڕۆ ماڵی دەسەڵاتدارانی نامەرد و بێ ویژدانی رۆژگار و مەبە داردەستی ئەوان بە مەبەستی ئارامی و سەلامەتی، چونكە بەم شێوەیە ئارامی و سەلامەتی بەدەست ناهێنیت، ئارامی و سەلامەتی گەنجینەیەكە لە نێو ماڵەكەی خۆتدا حەشاردراوە و بگەڕێوە ماڵەكەی خۆت و سەرداری ماڵی خۆت بە گەنجینەی ئارامی و سەلامەتی بەدەست دەهێنی.

٧- بسوخت حافظ و درشرط عشق بازی، او

هنوز بر سر عهد و وفای خویشتن است

**بسوخت حافز و دەر شەرتی ئیشقبازی، ئو، هەنوز بەر سەری ئەهد و وەفای خیشتەنەست.**

حافز سووتا و لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا لەسەر ئەو پەیمان وەفاییەی خۆیەتی کە بۆ عەشقبازی داویەتی.

برسر عهد خویشتن است: لەسەر پەیمانی خۆیەتی

ڕێگای عەشق ڕێگایەکی سووتێنەرە، ڕێگایەکە کە سووتان و دووری چێژ و لەزەتی وەسڵ و دیدار دەداتە عاشق، هەر بۆیە شاعیر لەو ڕێگە دوورەی عەشقی عیرفانیدا ئازار و ناڕەحەتی زۆر دەچێژێ، بەڵام ئازار و ناڕەحەتییەك کە لە بری ساردکردنەوە چێژ و لەزەتی دیدار خۆشتر دەکات، بۆیە دەڵێ: گەرچی حافز لەم ڕێگەی عەشقەدا سووتا، بەڵام هێشتا هەر لەسەر پەیمان و وەفای خۆیەتی کە بە مەرج و شەرتی عەشقبازی داویەتە قەڵەم.



## غەزەلی سی و هەشتەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١- لعل سیراب به خون تشنه لب یار من است**

**وز پی دیدن او دادن جان کار من است**

**لەئلی سیرابی بە خون تەشنە لەبی یاری مەنەست، ڤز پەیی دیدەنی ئو دادەنی جان کاری مەنەست.**

لێوی ئاڵ و پاراو و بە خوێن تینو، لێوی یاری منە، وە بۆ بینینی ئەو گیان بەخشین کاری منە.

لعل سیراب: لێوی پاراو و ئاڵ سیراب: تێرئاو، تەڕ و پاراو تشنە: تینو

بەخون تشنە: تینوبەخوێن زپی: لەپێناو، بۆ دیدن: بینین

دادن جان: گیان بەخشین، دانانی گیان، گیاندان

شاعیر دەڵێ: لێوی یاری من کە لەگەڵ ئەوەی تەڕ و پاراو و ئاڵە بەخوێن تینوە، بۆیە بۆ بینینی ئەو یارە لێوبەخوێن تینوە، گیاندان کاری منە و دەبێ خۆم بکەمە قوربانی تا لێوی ئاڵی بە خوێن ئاڵتربێت (گیان دان بۆ بنینی یار) ئەو مانایەشی لێ هەڵدەهێنجرێ کە مەعشوق و یاری شاعیر پاش مەرگ دەبینرێ و پاش گیاندان دەتوانرێ ببینرێ، بۆیە پێویستە گیان بدەم تا بیبینم. لەڕووی عیرفانیشەوە لێو کەلامی زاتی مەعشوقە و بۆ گەیشتن بەم پلەیەش پێویستی بە خۆبەختکردن و فەنابوون هەیە.

**٣- شرم از آن چشم سیه بادش و مژگان دراز**

**هرکه دل بردن او دید و در انکار من است**

**شەرم ئەزان چەشمی سیەه بادەش و موژگانی دراز، هەرکە دلبووردەنی ئو دید و دەر ئینکاری مەنەست.**

هەرکەس دڵبەرییەکانی ئەوی بینیوە و من لە عەشق قەدەغە دەکات شەرم لەو چاوە رەش و برژانگە درێژانە بکاتەوە.

شرم: شەرم، حەیا، خەجاڵەتی چشم سیە: چاوی ڕەش مژگان: برژانگ دراز: درێژ

دل بردن: دڵبردن، دڵڕفاندن، کەسێ کە توانای دڵبردنی هەیە، سەرنجڕاکێشی یار

در انكاري من است: من له عەشق قەدەغە بكات، ياخود ئينكاري له عەشقی من دەكات و من بە عاشق نازانیٚ.

واتە: هەركەسیٚ كە سەرنجڕاكێشی يار و دڵبەری ئەوی ديوە و من له عەشقی يـار قەدەغـە دەكات لە بەردەم چاوی ڕەش و برژانگی درێژيدا شەرم بيگریٚ و خەجاڵەت بـیٚ. واتـە: يـار بـە چاوی ڕەش و برژانگی درێژييەوە هێندە سەرنجڕاكێشە دڵی هەمووان بـۆ خـۆی دەبـات و دڵـی منيشی بردووە، بۆيە هەركەس من لە عەشق قەدەغە بكات ياخود من بـە عاشـق نـازانیٚ لـە بەردەم جوانی ئەودا شەرم بيگریٚ. جوانييەكانی ڕێگەی عەشـق هێنـدە بەئاشـكرا ديـارن دڵـی هەموان دەبەن و نابیٚ هيچ كەس قەدەغەی عەشقی حەقيقی بكات.

**٣-ساربان رخت به دروازه مبر كه آن سر كوى**

**شاهراهيست كه سر منزل دلدار من است**

**ساربان ڕەخت بە دەرڤازە مەبەر كە ئان سەری كوی، شاهراهيـست كـە سـەری مـەنزلی دلداری مەنەست.**

وشترەوان ئەسبابی سەفەرم مەبە بۆ دەروازەی شار، چونكە شاڕێگەيەك كـە دەگاتـە مـاڵی دڵداری من لەو سەركۆڵانەيە.

ساربان: وشترەوان، كەسـیٚ كـە وشـتر ڕادەكێـشیٚ رخـت: ئەسـبابی سـەفەر، باروبنـە دروازە: دەروازە دەرگای گەورەی شار مبر: مەبە سركوی: سەركۆڵان

آن سركوی: ئەو سەركۆڵانە شاهراە: شاڕێگە

رخت به دروازه بردن: باروبنە تێكنان، جاران هۆكاری سـەفەريان دەبـردە بـەردەم دەروازەی شار و لەویٚ سواری وڵاغ دەبوون، بۆيە لێرەدا باروبنە تێكنان دەگرێتەوە.

وشترەوان بەنيازە هۆكاری سەفەری شـاعير كۆكاتـەوە و بيباتـە دەروازەی شـار تـا شـاعير سەفەر بكات، بەڵام شاعير بەبوونی يار و دڵدار نيازی سەفەری نييە و لەشار دوورناكەوێتـەوە. وەك لە غەزەلەكانی پێشوودا دەڵیٚ:**"چـون كـوى دوسـت هـست بـه صـحرا چـه حاجـت است"** بۆيە بە وشترەوان دەڵیٚ: باروبنەم تێكمـەنیٚ و ئەسـبابی سـەفەرم مەبـە بـۆ دەروازەی شار، چونكە نيازی سەفەرم نييە و بەو كۆڵانەدا دەڕۆم كە لە شاردايە و دەگاتـە مـاڵی دڵـدارم ئەو كۆڵانەش شاڕێگەيە. لای عارفەكان مەعشوق دوور نييە و تەنيا گەڕانەوە بەسە بۆ خـود و ناسين، (مەولانا جلال الدينی ڕۆمی)- قدس سره- مەعـشوق بـە دراوسـێی ديـوار بـە ديـوار دەزانێت و لە غەزەلێكيدا بە مەتلەعی**" اى قوم به حـج رفتـه كجاييـد كجاييـد"** داوا لـە



ڕۆشتوان بۆ حەج دەكات كە بێنەوە و بەو مەعشوقە نزيكەی خۆيان بگـەن و هـەنگاویٚ بنێنـە ئەم سەربانەی عيرفان و لەو خوارەوە نەبن.

**٤-بندەء طالع خويشم كه درين قحط وفا**

**عشق آن لولى سرمست وفادار من است**

**بەندەيی تالئی خيشەم كە دەرين قەهتی ڤەفا، ئيشقی ئان لوليی سەرمەست ڤەفاداری مەنەست.**

بەندە و غوڵامی بەختی خۆمم كە لەم قات و قڕی وەفايـەدا، عەشـقی ئـەو جوانـە لولييـە مەستە وەفای بۆ من هەيە.

بندە: غوڵام، بەندە، نۆكەر طالع: بەخت قحط: قات و قڕی، وشكەسـاڵی، نـەبوونی لولی: ناوی تايەفەيەك لە (كولی)ەكان كە لە نێوان شيراز و ئەسفەهاندا كوێستان و گەرميانيان دەكرد و بە جوانی ناوبانگيان دەركردبـوو وەك قـەرەج و دۆم، ڕەمـزی جـوانی، جـوان، لێـرەدا مەبەست لە مەعشوقە. سرمست: مەست، مەغرور

ڕۆژگارێكە كە قاتوقڕی وەفا هەيە و هيچ كەس وەفـای بـۆ يـەكتری نـەماوە، بـەڵام تـەنيا شتێك وەفای بـۆ شـاعير ماوەتـەوە عەشـقی ئـەو كيژۆڵـە جوانـە لولييـە شـۆخ و مەسـت و مەغرورەيە(مەعشوق) و هيچی دی. هەربۆيە شاعير وەفاداری ئەم عەشقە لە زەمەنی قاتوقڕی وەفايەدا بە دەستكەوتێكی زۆر دەزانیٚ و بەختی خۆی بە بێدار دەزانێت و نۆكـەری و غـوڵامی بەختی خۆی دەكات و دەڵیٚ: من نۆكەر و غـوڵامی بـەختی خـۆمم، چـونكە بـەختم زۆرچـاكی هێناوە و لەم ڕۆژگاری قاتوقڕی وەفايەدا عەشقی ياری مەسـت و جـوانم بەرامبـەرم وەفـادارە. هروی{ ج١، ل١٧٨} وەفای عەشقی ياری بە وەفاداری يار شرۆڤە كردووە، بەڵام بـە بۆچـوونی بەندە مەبەست لە عەشقی يارە نەوەك وەفای خودی يار.

لە مانايەكی دووری (وەفا)دا كە (عنايت ازلی)يە دەكریٚ بڵێين: لەسەردەمێكدا يـاخود لـە دونيايەكدا كە هەموو شتەكان لە بەندی كات و شوێندان و ئـەزەل و دەسـتگرۆيی ئـەزەلی لـە قاتوقڕيدايە من بەندە و نۆكەری بەختی خـۆمم (عەشـق) ـــ كـە دەسـتگرۆييەكی ئەزەلييـە و شتێكی زەمەنی نييە ـ لە مندا ماوەتەوە و پەيوەستم بە ئەزەلەوە، بەڵام لەڕاستيدا ئەم مانايە هێندە دوورە كە لە مەحاڵ نزيكترە.

**٥- طبلهء عطر گل و درج عبیر افشانش**

**فیض یک شمه ز بووی خوش عطار من است**

**تەبلەیی ئیتری گول و دوورجی عەبیر ئەفشانەش، فەیزی یەك شەمە ز بووی خوشی ئەتتاری مەنەست.**

سندوقی عەتری گوڵ و سندوقچەی عەبیرپرژێنی ئەو، تۆزە فەیز و بەهرەیەكە لە بۆنی خۆشی عەترفرۆشی منەوە وەریگرتووە.

طبلە: سندوقێ كە عەترفرۆشەكانی جاران شتیان تێدا گێڕاوە یاخود وردەواڵە فرۆشەكان شتەكانیان تێیدا گێڕاوە بۆ فرۆشتن

درج: دوورج، سندوقچەیەكی بچووكە كە مجەوهەرات و عەتر و شتی خۆجوانكردنی تێیدا هەڵدەگیرێت.

عبیر: بۆنێكی خۆشە كە تێكەڵاوە لە چەندەها بۆنی خۆشی وەك میسك و گوڵاو و... هتد

افشان: پرژێن عبیر افشان: گوڵاوپرژێن، عەتر پرژێن

فیض: لە زماندا بە واتای لافاو دێت، بەڵام لە ئەدەبیاتدا بە واتای بەرەكەت و بەهرەوەرگرتن، سوودوەرگرتن، دێت، فەیزی ئیلاهیش لای عارفەكان زۆرتر باسی لێدەكرێت

شمە: بۆنی خۆش، تۆزێك، كەمێك، یەك جار بۆنكردن.

عطار: عەترفرۆش، (سودی) عەتار بە خودی (یار) دەزانێت، بەڵام (د.هروی) و (د. معین) و (استاد زرین كوب) عەتار بە كەسێكی دیاریكراو دەزانن، كە یا (شێخ محمود عطار) یاخود (خواجە عەلائەدین عطار)ە كە هەردووكیان زاتی گەورەبوون لای حافز {هروی، ج١، ل١٧٩}. بەڵام لە شەرحەكەیاندا، (سودی) جێناوی كەسی سێیەمی تاك (ش)ی بۆ گوڵ گێڕاوەتەوە. {سودی، ج١، ل٣٤٤ }لە كاتێكدا كە(هروی) بۆ یاری گێڕاوەتەوە{ ج١، ل١٧٩} بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی (یار ـ دۆست) لای حافز كە خودی خودا، مورشید، دۆست، مەحبووب، هتد دەگرێتەوە هیچ كاتێك ئەم لێكچوواندنەی پێ ناكرێ و بە شتێ یاخود كەسێ كەمتر نادرێتە قەڵەم یاخود هەرگیز دوو دۆست ناخرێنە تای تەرازووەوە تا فەزڵی یەكێكیان بەسەر ئەوی دیكەیاندا بدرێت، جگە لەمەش بەراوردكردنی یار و سروشت و هەمیشە فەزڵدانی یار بەسەر سروشتدا لە حافزدا كارێكی دووبارەیە و زۆرجار بەرچاو دەكەوێت. بۆیە دەكرێ رای (سودی) بە راستتر وەربگرین و (ش) بۆ گوڵ بگێڕینەوە، بەمەش واتای بەیتەكە دەبێتە:



سندوقی عەتر و بۆنی خۆشی گوڵ و سندوقچەی گوڵاوپرژێنی هەموو تۆزە بەهرە و فەیزێكە كە لە بۆنی خۆشی یاری حەق (فەیزی ئیلاهی) منەوە وەریگراوە، ئیدی ناكرێ (عەتار ـ یار) یەكێ لەو (عەتار)انە بێت كە باسكراوە و شاعیر بە یار و مورشیدی خۆی دەزانێ.

لێرەدا شاعیر پەیوەندی لە نێوان گوڵ و یاری عەترفرۆشی بۆنخۆشی خۆیدا دروست دەكات و دەڵێ: سەرچاوەی بۆنی خۆش و عەتری گوڵ یاری بۆنخۆشی منە، نەوەك سەرچاوەی بۆنی خۆشی یاری من عەتارە یاخود شێخ و یەكێ لەو مورشیدانەیە، چونكە یار و دۆست و مەحبووب خودی ئەوانن.

**٦-باغبان همچو نسیمم ز در باغ مران**

**كآب گلزار تو از اشك چو گلنار من است**

**باغەبان هەمچو نەسیمەم ز دەری باغ مەران، كابی گولزاری تو ئەز ئەشكی چو گولزاری مەنەست.**

باغەوان من هەروەك شەماڵ لە دەرگای باخ دەرمەكە (دوورمەخەرەوە)، چونكە ئاوی گوڵزاری تۆ لە فرمێسكی سووری وەك گوڵە هەناری منەوەیە.

همچو: هەروەك مران: دەرمەكە، دوورمەخەرەوە گلزار: گوڵزار

گلنار: سور، گوڵی هەنار اشك چو گلنار: فرمێسكی خوێناوی، فرمێسكی سوور

شەماڵ كە بەسەر باخ و گوڵزاردا تێپەڕ دەبێ ماوەیەكی كورتە و غەریبەیەكە و دەڕوات، نامەحرەمێكە و دێتە باخەوە، بۆیە باخەوان دەرگای بە روودا دادەخات و دەری دەكات، شاعیر بە باخەوان دەڵێ: من غەریبە نیم لە باغ و گوڵزاری تۆدا وەك شەماڵ رەفتارم لەگەڵ مەكە، من بە فرمێسكی سووری خوێناوی وەك گوڵەهەناری چاوم گوڵزارەكەی تۆ ئاو دەدەم ئیدی دەرم مەكە و دەرگام بە روودا مەگرە.

**٧- شربت قند و گلاب از لب یارم فرمود**

**نرگس او كە طبیب دل بیمار من است**

**شەربەتی قەند و گولاب ئەز لەبی یارەم فەرمود، نەرگسی ئو كە تەبیبی دلی بیماری مەنەست.**

چاوانی مەستی وەك نێرگسی ئەو كە پزیشكی دڵی بیماری منە، شەربەتی شیرین و گوڵاوی لێوی یاری بۆ داناوم كە تیمارم كات.

قند: شەكر، شیرینی گلاب: گوڵاو، بۆنی خۆش

شربت قند و گلاب: دەوایەکە بۆ بە هێزکردنی دڵ، بەڵام لێرەدا بە هێنانی (لب یار ـ لێوی یار) درکەیە لە (ماچی لێوی یار) کە وەك شەکر شیرینە و وەك گوڵاو تامدار و بۆندارە

نرگس: مەبەست لە چاوی مەستە        بیمار: نەخۆش

دەڵێ: چاوی مەستی ئەو کە خودی یارە و پزیشکی دڵی نەخۆشی منە و دەزانێ دەوای دەردەم چییە، ماچی شیرین و بۆنخۆشی لێوی یاری بە دەوا بۆ نوسیم، واتە چاوی مەستی بە ئاماژە و غەمزە تێیگەیاندم کە دەوای دەردی دڵم ماچی لێوی یارە. لە ریوایەت و چیرۆکی عارفەکاندا زۆر ئاماژە بەم رێگە دانانەی مەعشوق کراوە بۆ عاشقان بە تایبەتی لە کاتی خەوندا.

**٨- آنکه در طرز غزل نکته به حافظ آموخت**

**یار شیرین سخن نادره‌گفتار من است**

**ئانکە دەر تەرزی قەزەل نوکتە بە هافز ئاموخت، یاری شیرین سوخەنی نادیرە گوفتاری مەنەست.**

ئەو کەسەی کە لە تەرزی غەزەل داناندا مانای جوانی فێری حافز کرد، یاری منە کە قسەی شیرین و بێ هاوتایە.

طرز: تەرز، شێواز    نکتە: قسەی جوان، قسەی بەسوود    آموخت: فێرکرد    سخن: قسە    شیرین سخن: قسە شیرین    نادرە: بێ هاوتا، نایاب    گفتار: قسە

لێرەدا حافز دیسانەوە وەسفی یاری دەکات لە رووی قسە شیرینی و قسەزانییەوە کە تەنیا ئەو لەو جۆرە قسانە دەزانێت و بێ هاوتایە و دەڵێ: غەزەلی حافز بۆیە هێندە بەسوودن و دەچنە دڵەوە و لە ئاستێکی بەرزی هونەریدان، چونکە لە یارەوە فێربووە و یار فێری کردووە ئەو یارەی کە قسەی شیرین و بێ هاوتایە.



## غەزەلی سی و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١- روزگاریست که سودای بتان دین من است**

**غم این کار نشاط دل غمگین من است**

**روزگاریست کە سەودای بووتان دینی مەنەست، غەمی ئین کار نەشاتی دلی غەمگینی مەنەست.**

رۆژگارێکە (ماوەیەکە) عەشقی جوانان بۆتە ئایینی من، غەمی ئەم کارەش هۆی چالاکبوونی دڵی غەمگینی منە.

سودا: عەشق، حەز و ئارەزوو و سەودا    بتان: بووتان، رەمزێکە بۆ جوانان و خۆشەویستان

دین: دین و ئاین، پیشە و کار    نشاط: چالاکی و گورج وگۆڵی

پێشتر لە (غەمی عەشق) دواین و ئەوەش روونکرایەوە کە غەمی عەشق لای حافز پیرۆزە و جێگەی ستایشە، لێرەشدا دیسانەوە ئەو غەمەی عەشقە بە چالاکی بەخشی دڵی غەمگینی خۆی دەزانێت و دەڵێت: ماوە و رۆژگارێکە کە عەشق و ئارەزووی جوانان و خۆشەویستان بووەتە کار و پیشەی پیرۆزی من ـ بە شێوەیەك کە وەك ئایینی لێهاتووە ـ ئەم عەشقەش غەمی هەیە و ئەم غەمی عەشقەش (ئەم کارە کە عاشق بوونە بە جوانان) مایەی چالاکبوون و شەوق و نەشاتی دڵی غەمگینی منە، واتە: ماوەیەکە کەوتوومەتە سەر رێگەی عەشقی ئەزەلی و عیرفان. ئەم کارەش مایەی شەوق و نەشاتی دڵی غەمگینمە.

**٢- دیدن روی ترا دیدۀ جان بین باید**

**وین کجا مرتبۀ چشم جهان بین من است**

**دیدەنی روی تورا دیدەیی جانبین بایەد، ڤین کوجا مەرتەبەیی چەشمی جەهانبینی مەنەست.**

بۆ بینینی رووی تۆ دەبێ چاوێك هەبێت کە توانای بینینی گیانی هەبێت، ئەمەش لەکوێ پلەوپایەی چاوی جیهان بینی منە.

دیدن: بینین    دیدە: چاو    جان بین: گیان بین

دیدۀ جان بین: چاوێ توانای بینینی گیانی هەبێ    باید: دەبێ، پێویستە

مرتبە: پلە، پایە، مەقام

چشم جیهان بین: چاوێك کە تەنیا توانای بینینی هەستپێکراوەکانی هەبێت

لەرووی فەلسەفییەوە ئەم بەیتە دەچێتەوە نێو فەلسەفەی ئەفلاتوونی، کە وجود بە (مادی و مەعنەوی) یاخود وجود و سێبەر دابەشدەکرێت و جەستەی مرۆڤ نیشانە و هەڵگۆزراوی سێبەر و جیهانی مادییە و روح و گیانیش نیشانەیەکە لە جیهانی باڵا و، لێرەشدا (چاو) کە لە جیهانی سێبەر و مادەدایە توانای بینینی شتەکانی نێو جیهانی باڵای نییە و پێویستە چاوێك هەبێت کە خۆی لەو جیهانەدا بێت. بەڵام روانگەی عیرفانی (هەرچەندە هەمان بیروباوەڕە)وە چاو هەمان چاوە، لە کاتێکدا بە قۆناغەکانی تەسەوف و عیرفاندا تێنەپەڕیوە توانای بینینی مەعشوق و یاری عیرفانی نییە و، بەڵام کاتێ قۆناغەکانی عیرفان دەبڕێت و نزیك دەبێتەوە لە یار و مەعشوق ئەو توانایەی پێدەبەخشرێت و دەبێتە چاوێك کە توانای بینینی گیانی دەبێت، لێرەدا جیاوازییەکە لەوەدایە کە (چاو) لە فەلسەفەدا هەرگیز توانای بینینی روحی باڵای نابێ، چونکە لەم جیهانەدا نییە. بەڵام لە عیرفاندا دەکرێ (چاو) ئەو توانایە بەدەست بخات ئەویش بە مەرجی بڕین و تەیکردنی قۆناغەکانی عیرفان، بۆیە لێرەدا بە مەعشوق و یاری عیرفانی دەڵێ: بۆ بینینی تۆ پێویستە چاو گەشتبێتە قۆناغی بینینی گیان، بەڵام چاوانی من هێشتا بەو مەقام و پلەیە نەگەیشتووە و پێی لە قۆناغی بینینی جەستە نەبڕیوە و هەر جەستەبینە بۆیە لەم پلەیەدا چاوانی من توانای بینینی تۆیان نییە.

**٣- یار من باش کە زیب فلك و زینت دهر**

**از مە روی تو و اشك چو پروین من است**

**یاری مەن باش کە زیبی فەلەك و زینەتی دەهر، ئەز مەهی روی تۆڤۆ ئەشکی چو پەرڤینی مەنەست.**

یاری من بە، چونکە جوانی ئاسمان و رازاوەیی رۆژگار، لە رووی وەك مانگی تۆ و فرمێسکی وەك ئەستێرەی پەروینی منەوەیە.

باش: ببە، رەگی کاری (بوون) لە کاتی داهاتوو یاخود ئیلتیزامیدا بەکاردێ

زیب: جوانی     فلك: گەردوون، ئاسمان، فەلەك     زینت: جوان و رازاوە

دهر: رۆژگار، زەمانە، دنیا     مە: مانگ     چو: چۆن، وەك

پروین: ئەستێرەی (سورەیا) کە لە شێوەی هێشوە ترێدایە و شاعیرەکان فرمێسك بە دانەکانی ئەو دەچوێنن.



پەیوەندی نێوان مانگ و ئەستێرە لەوەدایە کە مانگ بە چەق و سەنتەر دەزانرێت و ئەستێرەش مایەی رازاندنەوە و جوانترکردنی مانگە، مانگ و ئەستێرە پێکەوە ئاسمان دەڕازێننەوە، شاعیر رووی یار و مەعشوقی بە مانگی ئاسمان و فرمێسکی خۆشی بە هێشوە ئەستێرەی پەروین چوواندووە و دەڵێ: هەر بەو جۆرەی کە مانگ هۆی جوانی ئاسمان و گەردوونە، رووی وەك مانگی تۆش بووەتە هۆی جوانی ئاسمان و فرمێسکی منیش وەك ئەستێرەی سورەیا کە دونیا دەڕازێنێتەوە، جیهانی رازاندۆتەوە. هەربۆیە یاری من بە، تا بە هۆی ئەم پەیوەندییەوە بەردەوام فرمێسکی من بۆ رووی تۆ ببارێت و ئەم ئەستێرە و مانگە هەمیشە مایەی جوانی و رازاوەیی ئاسمان و ژیان بن.

لێرەدا ئاماژە بەوەیە کە ئەگەر مرۆڤ لە بووندا پلەیەکی بەرزی هەیە و دەبێتە مایەی جوانی و رازاوەیی ئاسمان و رۆژگار و زەمانە بە هۆی دۆستی و خەمەگەورەکانی مرۆییەوەیە، نەوەك بە هۆی شتە مادییەکانییەوە.

**٤- تا مرا عشق تۆ تعلیم سخن گفتن داد**

**خلق را ورد زبان مدحت و تحسین من است**

**تا مەرا ئیشق تو تەئلیمی سوخەن گوفتەن داد، خەلق را ڤیردی زەبان میدهەت و تەهسینی مەنەست.**

لە کاتێکەوە کە عەشقی تۆ منی فێری چۆنییەتی قسەکردن کردووە، ستایش و ئافەرینکردنی من بووەتە وێردی سەر زمانی خەڵکی.

سخن گفتن: قسەکردن     تعلیم داد: فێرکرد     خلق: خەڵك

ورد: دۆعا و نزایەك کە رۆژانە بخوێنرێت     وردزبان: قسەیەك کە بەردەوام دووبارە دەکرێتەوە

مدحت: ستایش، مەدح     تحسین: ئافەرین کردن، بە چاکە باسکردن

هەروەك چۆن لە بەیتی پێشوودا بە شێوەیەکی شاراوە و ناڕاستەوخۆ عەشق و پەیوەندییە عاشقییەکانی نێوان خۆی و مەعشوقی عیرفانی بە مایەی جوانی گەردوون و ژیان زانی، لێرەدا بە شێوەیەکی راستەوخۆ بە مایەی جوانی و ستایشی نێو خەڵکی دەزانێت و بە مەعشوقی عیرفانی دەڵێ: لەوکاتەوەی کە عەشقی تۆ منی فێری قسەکردن کردووە بوومەتە مایەی ئافەرین و ستایشی خەڵکی. واتە عەشقی تۆ نەرمی و تەڕوپاراوییەکی بە من داوە کە بووەتە مایەی جوان قسەکردنی من و قسەم شیرین بووە، بە شێوەیەك کە خەڵکی بە بەردەوامی و رۆژانە ستایش و ئافەرینی من دەکەن.

**٥- دولت فقر خدايا به من ارزانى دار**

**كاين كرامت سبب حشمت و تمكين من است**

**دۆولەتی فەقر خودایا بە مەن ئەرزانی دار، کین کەرامەت سەبەبی هیشمەت و تەمکینی مەنەست.**

خوایە خۆشبەختی (فەقر) هەژاریم پێ ببەخشە، کە ئەم بەخششەی تۆ دەبێتە هۆی گەورەیی و بەڕێزی من.

دولت: خۆشبەختی، بەختی چاك

فقر: (فەقر) لە زماندا بە مانای هەژاریی دێت، بەڵام لە زاراوەی عیرفانییدا ماناکە تەواو پێچەوانەوە دەبێتەوە و بریتی دەبێت لە: پێویستی نەبوون بە هیچ کەسێك جگە لە خودا (فەقیر)ش بە دەروێشێك یاخود سۆفی و عارفێك دەڵێن کە ڕێبواری ڕێگەی کەماڵ بێت

ارزانی داشتن: بەخشین       به من ارزانى دار: پێم ببەخشە، بە لایقم بزانە

کرامت: بەخشش، گەورەیی       تمکین: ڕێزداری، بەتوانایی، خۆڕاگری

لەم بەیتەدا بە تەواوی ماناکان ڕوونتر دەبنەوە و شاعیر بەڕاشکاوی باس لە عیرفان دەکات و زاراوەکان بە واتا عیرفانییەکانیانەوە بەکاردەهێنێت و خوداش دەهێنێتە نێو قسەکانییەوە و لێی دەپاڕێتەوە کە مەقامی (فەقر)ی پێ ببەخشێت و وای لێ بکات کە جگە لە خۆی پێویستی بە کەسی دیکە نەبێت، لێرەدا ئەو هەژارییە هەڵدەبژێرێت کە هاوڕێی پێغەمبەر و وەلییەکانی خودا بوون وەك پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ" هەرکەس منی خۆشبووێ با خۆی بۆ فەقیری ئامادە بکات". واتە گەر (فقر)ی سۆفیگەری و عیرفانیش نەبێت ئەو هەژارییە کە (پێغەمبەر) بە مایەی ڕێزی دەزانێ و لە خۆشەویستانی ئەوە. بۆیە دەڵێ: خودایە خۆشبەختی و بەخت چاکی (فەقر)م پێ ببەخشە، چونکە ئەم گەورەیی و بەخششەی تۆ کە ـ چاوپۆشینە لە گشت پێویستییەکان و پێویست نەبوونە بە هیچ یەکێ لە دروستکراوەکان ـ دەبێتە مایەی ڕێز و گەورەیی من و بەڕێز و گەورەم دەکات.

**٦- يا رّب آن كعبهء مقصود تماشگه كيست**

**كه مغيلان طريقش گل و نسرين من است**

**یا ڕەب ئان کەئبەیی مەقسود تەماشاگەهی کیست، کە موغیلانی تەریقەش گول و نەسرینی مەنەست.**

خودایە ئەو کەعبەی ئارەزووە (ویستراوە) کە دڕکی موغیلانی ڕێگەی لە لای من گوڵ و نەسرینە ڕوانینگەی کێیە.



مقصود: ئامانج، ئارەزوو       تماشاگە: ڕوانینگە، شوێنی بۆ ڕوانین

مغیلان: جۆرە (دڕك)درەختێکە لە ڕێگەی حەج (بیابان)دا دەڕوێت و دڕکی درێژی هەیە و دەکەوێتە سەرەڕێی حاجیانی ڕێگەی کەعبە       طریق: ڕێگە

بە تێبینی ئەوەی کە کەعبە لای موسوڵمانان پیرۆز و خۆشەویستە، یاری خۆی بە کەعبە چوواندووە. هەروەها چونکە حاجیانی کەعبە لە عەشقی گەیشتن بە کەعبەدا ناچاربوون بە نێو دڕك ودالی بیباباندا بڕۆن، دەڵێ: ئەو یارە خۆشەویستەی من کە کەعبەی ئارەزووی منە و لەڕێگەی گەیشتن بە ئەودا دڕك و داڵ، تەنەنات دڕکی موغیلانیش وەك گوڵ و نەسرین نەرم و جوان دەنوێنێ، ڕووی خۆی بە چ کەسێ پیشان دەدات و بووەتە ڕوانینگەی چ کەسێك، ئەم جۆرە لە قسەکردن لە عیرفاندا هەیە کە عارف جۆرێك لە (غبطە)و تەنانەت غیرەیشی هەیە کاتێ یار خۆی بۆ کەسی دیکە نمایش بکات هەرنا خەفەتی پێدەخۆن و بە ئەسەفەوە باسی لێوە دەکەن یاخود حەز دەکەن لە بری ئەو کەسە خۆیان بن.

**٧- واعظ شحنەشناس اين عظمت گو مفروش**

**زآنكه منزلگه سلطان دل مسكين من است**

**ڤائیزی شەهنەشناس ئین ئەزەمەت گو مەفروش، زانکە مەنزلگەهی سولتان دلی مسکینی مەنەست.**

بە واعیز(ئامۆژگاریکەر)ی دارۆغەناس بڵێین کە بەم شێوەیە گەورەیی مەفرۆشە (بەگەورەییدا مەنازە)، چونکە دڵی فەقیری من مەنزڵگای خودی پادشایە.

واعظ: وتارخوێن، ئامۆژگاری کەر     شحنە: دارۆغە، کەسێك بووە کە لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ ڕێکخستنی کاروباری خەڵکی لە شارێکدا دادەمەزراوە و دەسەڵاتێکی کەمی هەبوو وەك پۆلیسی ئێستا

شحنە شناس: دارۆغەناس، کەسێ کە ئاشنای پۆلیسە       گو: بڵێ

عظمت: گەورەیی، خۆبەگەورە زانین       مفروش: مەفرۆشە، مەنازە، مەزانە

منزلگە: مەنزڵگا       سلطان: پادشا

لێرەدا لە نێوان ناسراوی و دۆستی دارۆغە و مەنزڵگەبوونی پادشادا پەیوەندی دروستکراوە، لە کاتێکدا ئاشنایەتی لەگەڵ پۆلیسێکدا و دڵ بوونە مەنزڵگەی پادشا هێنراوە کە ئەڵبەت پادشا هەزارەها و بگرە ملیۆنەها پۆلیسی هەیە و بەرامبەر (واعیز)و بە کەسێکی دیکە دەڵێ: بڵێ بەو واعیزەی کە بە هۆی ناسراوی لەگەڵ دارۆغە و پۆلیسی شاردا گەورەیی و فیز بە خەڵکی دەفرۆشێت، گەورەیی مەفرۆشە، چونکە لە کاتێکدا تۆ (دارۆغە) دەناسیت و دوورە

ئاشنایەتییەکتان هەیە، دڵی من مەنزڵگەی خودی پادشایە کە دارۆغە یەکێکە لە کاربەدەستەکانی ئەو و لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە.

بێگومان دڵی موسوڵمان جێگەی خودایە و لێرەشدا بەو وتارخوێنە درۆزنانەی کە دەستیان لەگەڵ دەسەڵاتدا تێکەڵاو دەکەن و بە هۆی دەسەڵاتەوە خۆیان بە گەورە دەزانن دەڵێ: خۆت بەگەورە مەزانە، چونکە دڵی هەژار (یاخود دڵی ئێمە کە گەیشتۆتە پلەی فەقر) مەنزڵگای خودایە کە تۆ و دارۆغە و هەموانی دروستکردووە و من لە تۆ گەورەترم.

(سودی) لەشەرحی ئەم بەیتەدا (واعیز) بەو وتارخوێنانە دەزانێ کە ئامۆژگاری خەڵکیان نەکردووە و هەمیشە لە کۆڕی گەورە و خۆبەگەورەزانە زاڵمەکاندا بوون و بەگوتنی قسە و نوکتەی گاڵتەئامێز کۆڕەکەیان گەرم کردووە و تا بە قسەخۆشی بزانن و ئەویش بە یەکێ لە هاوکۆڕەکانیان بزانن و وەك هاوڕێ سەیری کەن و یارمەتی بدەن{ ج١، ل٣٥١} .

**٨- حافظ از حشمت پرویز دگر قصه مخوان**

**که لبش جرعه‌کش خسرو شیرین من است**

**هافز ئەز هیشمەتی پەرڤیز دیگەر قیسە مەخان، کە لەبەش جورئەکەشی خوسروڤی شیرینی مەنەست.**

حافز ئیتر دەربارەی گەورەیی و دەسەڵاتی خوسرەو پەروێز باس مەکە، چونکە لێوی ئەم پادشایە پاشماوەنۆشی (جرعەنۆشی) پادشای شیرینی منە.

پرویز: خوسرەو پەروێزی کوڕی هورمزی نەوەی نەوشیروانە و یەکێکە لە پادشاکانی ئێرانی کۆن و دڵداری شیرینە  قصە مخوان: چیرۆك مەگێڕەوە، باسی مەکە، دەربارەی مەدوێ لبش: لێوی

جرعەکش: کەسێ کە پاشماوەی بنی پەرداخ بخواتەوە، پاشماوە خۆر

خسرو: پادشا    شیرین: شیرین، خۆشەویست

خسرو شیرین: خوسرەو(پادشا)ی شیرین و خۆشەویست

خوسرەوەی پەروێز کە لە گەورەییدا زۆر دەربارەی گوتراوە و یەکێك بووە لە پادشا بەناوبانگەکانی ساسانی، لە بەرامبەر پادشای گەورە و خۆشەویستی خەیاڵی شاعیردا زۆر کەمە و بە پاشماوەنۆش دادەنرێت، بۆیە دەڵێ: حافز سەبارەت بەگەورەیی خوسرەو پەروێز چیرۆك سازمەکە و لە گەورەیی و دەسەڵاتی ئەو مەدوێ، چونکە ئەو لە بەرامبەر پادشای شیرین و خۆشەویستی عیرفانی مندا لەوکەسانەیە کە خڵتەی پاشماوەی پەرداخەکانی دەخواتەوە و هیچ دەسەڵات و ڕێزێکی نییە.



(د. هروی) پێیوایە ئەم غەزەلە وەسفی یەکێ لە پادشاکانە کە ڕەنگە (مەنسور پاشا) یا (یەحیا پاشا) بێت { ج١، ل١٨٦ }، بەڵام ئەوەی راستی بێت وەسفەکانی نێو غەزەلەکە زۆر عیرفانین و بە دەگمەن دەبینرێ (حافز) پادشا ئێرانییەکان بەم شێوەیە بەرز بکاتەوە، بۆیە پێ ناچێت وەسفی کەسێکی ماددی یاخود پادشایەکی دنیایی و مرۆیی بێت هەروەها (سودی)ش هیچ ئاماژەی پێ نەداوە.

## غەزەلی چلەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١-منم که گوشهء میخانه خانقاه من است**

**دعای پیر مغان ورد صبحگاه من است**

**مەنەم کە گوشەیی مەیخانە خانەقاهی مەنەست، دوئایی پیری موغان ڤیردی سوبهگاهی مەنەست.**

منم کە گۆشەی مەیخانە خانەقامە و، دۆعای پیری موغانیش وێردی بەیانیامە.

خانقاه: لە فارسیدا خانگاه دەگوترێت و(خانقاه) بە عەرەبی کراوە، خانگاه: خانەقا، تەکیەی سۆفیان، شوێنی پەرستشی سۆفیەکانە، هەروەها (خوان گاه) یش دەگرێتەوە کە شوێنی خواردن و حەوانەوەی سۆفیەکانە، لە بنەڕەتدا بنیاتنانی خانەقا لەبەر ئەوە بووە کە کاتێ سۆفی و دەروێشە غەریبەکان دەچوونە شارێکی دیکە و خانەخوێیان نەدەبوو، لە خانەقا دەمانەوە و خزمەتدەکران، (خانگاه) بەواتای مەنزڵگەش دێت.

واتە: من لە بری ئەوەی لە خانەقادا بم و عیبادەت بکەم، گۆشەی مەیخانەم بۆ خۆم کردووەتە خانەقا و لە بری وێردی بەیانیانیش دۆعا و نزا بۆ پیری موغان دەکەم، یاخود بەردەوام بەیانیان دۆعا بۆ پیری موغان دەکەم.

بە لەبەرچاوگرتنی واتای (مەیخانە و پیری موغان) بەواتا عیرفانییەکانیان ئەوا مەبەست لە بەیتەکە دەبێتە: منم کە لە بری عبادەتە رۆتینییەکان، عەشق و عیرفانم کردۆتە پیشە و خەڵوەتگەی عاشقیم گرتووە و خەڵوەتگەی عاشقیم کردۆتە خانەقا و بەردەوامیش دۆعا بۆ پیری تەریقەت دەکەم و لە بری وێردی بەیانیان دۆعا بۆ ئەو دەکەم.

**٢-گرم ترانهء چنگ صبوح نسیت چه باك**

**نوای من به سحر آه عذر خواه من است**

**گەرەم تەرانەی چەنگی سەبووە نیست چە باك، نەڤای مەن بە سەهەر ئاهی ئوزرخاهی مەنەست.**

ئەگەر لەگەڵ شەرابی بەیانیاندا ئاوازی چەنگم نییە چ باکمە، چونکە ئاهی بەیانیانی من بۆ داوای لێبووردن لە گوناهەکانم وەك گۆرانی من وایە.



ترانە: دووبەیتی بە گۆرانی بگوترێت، ئاواز، سرود

ترانەء چنگ: ئاوازی چەنگ    صبووح: شەرابێك کە بەیانیان دەخورێتەوە، هەروەها (سودی) دەڵێ: شەرابێك کە شەو بخورێتەوە پێی دەڵێن (عیوق) و پێچەوانەوە (صبووح)ە

چنگ صبووح: چەنگ لێدان لە کاتی نوشینی شەرابی بەیانیاندا

چە باك: چ باك، چ خەم    نوا: گۆرانی، ئاواز، هاوار

بە سحر: لە کاتی بەیانیدا    عذرخواه: داوای لێبووردن، داوای بەخشین

لە بەیتی یەکەمدا باسی لە گۆشەی مەیخانە و دۆعای بۆ پیری موغان کرد، لێرەشدا دەڵێ: گەرچی کۆڕی عارفانە بە دەستەجەمی خۆشە، بەڵام من کە نوقسانییەکم هەبێ لەو کۆڕەی سەحەر و بەیانیاندا چ خەممە، چونکە ئەو ئاهو ناڵەیەی کە لە کاتی دۆعا و نزای لێبووردن و ئیعتیرافکردن بە گوناهەکانمدا دەیکێشم ئەو بۆشاییەم بۆ پڕدەکاتەوە و خوداش ئەو ئاهوناڵە و گریانەی بەندەی زۆر پێخۆشە و حەز دەکات زیاتر لێی بپاڕێتەوە.

(ترانە) لە فەرهەنگی عیرفانیدا (شێوازی خۆشەویستی و موحەبەتە) و ئەکرێ لەو سەردەمەشدا ئەم شێوازە لە نێودا نەمابێت. واتە من گەر ئەو گۆرانییەی موحەبەتە لە عیرفانەکەدا نەبێ ئەوا ئاهو ناڵەم خۆی بۆ خۆی شێوازێکی زۆر جوان و رێکی خۆشەویستییە.

**٣-ز پادشاه و گدا فارغم بحمدالله**

**گدای خاك در دوست پادشاه من است**

**ز پادشاە و گیدا فاریغەم بیهەمدیللاهـ، گیدای خاکی دەری دوست پادشاهی مەنەست.**

سوپاس بۆ خودا پێویستیم بە پاشا و گەدا نییە، لای من ئەو کەسەی کە سواڵکەر و گەدای خاکی دەرگای دۆستە گەورەیی و رێزی پادشای هەیە.

فارغم: بەتاڵم، پێویستیم نییە

لێرەدا ترازو و شایانی گەورەیی دادەنێ و پێیوایە هەر کەس ببێتە گەدا و سواڵکەر، یاخود نیازمەندی خاکی درگای دۆست، یاری عیرفانی ـ کە خودایە ـ گەورە و بەڕێزە وەك پادشا و هیچ پێویستییەکی بە پاشا و گەدا نابێت و شوکر و سوپاسی خودای دەوێت، بۆیە دەڵێ: سوپاس بۆ خودا من بە عیرفانەوە پێویستیم بە پادشا وگەدا نییە و رێبواری رێگەی تەریقەتیش لە پێش چاوی من وەك پادشایە.

**٤-غرض ز مسجد و میخانەام وصال شماسرت**

**جز این خیال ندارم خدا گواه من است**

**غەرەز ز مەسجید و مەیخانەئەم ڤیسالی شوماست، جوز ئین خیال نەدارەم خودا گوڤاهی مەنەست.**

ئامانجم لە چوونم بۆ مزگەوت و مەیخانە تەنیا ویسالی تۆیە، خوا شایەتی منە کە جگە لەمە خەیاڵێکی دیکەم نییە.

غرض: مەبەست، ئامانج — وصال: ژوان، بەیەکگەیشتن، ویساڵ

جز: جگە — گواه: شایەت، گەواه

گەر مزگەوت هێمای شەریعەت و مەیخانەش رەمزی تەریقەت و عیرفان بێت، ئەوا شاعیر دەڵێ: من ئامانجم یاخود مەبەستم لە بەجێهێنانی ئەرکە ئایینییەکان یاخود بوونە رێبوارم لە رێگەی تەریقەتدا تەنیا ژوان و دیداری تۆیە و هیچی دیکە، خودا شاهێدە کە جگە لەم خەیاڵە، واتە جگە لە خەیاڵی گەیشتن بە تۆ و دیداری تۆ، هیچ خەیاڵێکی دیکە یاخود هیچ ئامانجێکی دیکەم نییە، دەکرێ ئەم خەیاڵە بریتی بێ لەوەی کە من لە کاتی گرتنی رێگەی شەریعەت یاخود تەریقەتدا جگە لە دیتن و دیداری تۆ هیچ ئامانجێکم نییە، واتە لە خۆشی بەهەشت یاخود ترسی جەهەنەم نییە ـ وەك رابیعەی عەدەوی دەیگوت: تەنیا رەزامەندی خودایە ـ یاخود واتە من جگە لە تۆ هیچ خەیاڵێکی دیکەم لەسەردا نییە.

لە مەسەلەی گرتنی رێگەی تەریقەت یاخود شەریعەتیشدا ـ مەیخانە و مزگەوت ـ ئاماژە بە جیاوازبوونی رێگاکانە بۆ گەیشتنە خودا وەك پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرموێ: "الطرق الى الله بعدد انفس الخلایق) {د. هروی، ج١، ل١٨٩} یاخود وەك (د. عبدالکریم سروش) ناوی لێناوە رێگا راستەکان ـ صراطهای مستقیم ـ، چونکە رێگەی گەیشتنە خودا تەنیا رێگەیەك نییە، هەرچەندە لە ئاست و بوونیادی قووڵی هەموویاندا تەنیا رێگەیەکی رەزامەندی خودا هەیە و جیاوازییەکەیان لە رووکار و روکەش و بوونیادی سەرەوەیاندایە.

**٥-از آن زمان که برین آستان نهادم روی**

**فراز مسند خورشید تکیەگاه من است**

**ئەز ئان زەمان کە بەرین ئاستان نەهادەم روی، فەرازی مەسنەدی خورشید تەکیەگاهی مەنەست.**

لەوکاتەوەی رووم کردۆتە ئەم دەرگایە، سەروو، جێگەی خۆر تەکییەگای منە.

از آن زمان: لەوکاتەوەی — رونهادن: رووکردنە، رووخستنە سەر

فراز: سەرووی، سەر — مسند: قەرارگا، شوێن



مسند خورشید: شوێنی خورشید: درکەیە لە ئاسمانی چوارەم کە لە گەردوونناسی دێریندا بەجێگەی خۆر دەزانرا — تکیه گاه: شوێنی پاڵدانەوە، جێگا

واتە: لەوکاتەوەی کە سەرم ناوەتە سەر دەرگای ماڵی دۆست، یاخود رووم لەم رێگەی تەریقەتە کردووە هێندە گەورە و بەرزبووم کە شوێن و جێگای من ئاسمانی چوارەم و تەنانەت لەوێش بەرز و بڵندترم. یاخود لەوکاتەوەی بیر لە تۆ دەکەمەوە و بۆ لای تۆ دێم، هێندە گەورەبووم وادەزانم جێگەم لە سەرو خۆر و هەتاوەوەیە.

**٦-مگر به تیغ اجل خیمه برکنم ور نی**

**رمیدن از در دولت نه رسم وراه من است**

**مەگەر بە تیغی ئەجەل خەیمە بەرکونەم ڤەر نی، رەمیدەن ئەز دەری دۆولەت نە رەسم و راهی مەنەست.**

مەگەر بە شمشێری ئەجەل چادر هەڵکەنم وەگەرنا، راکردن لە دەرگای خۆشبەختی و بەخت رێورەسمی من نییە.

تیغ: شیر، شمشێر، تیغ — تیغ اجل: شمشێری ئەجەل — خیمە: خێمە، چادر

برکنم: هەڵکەنم — ورنی: وەرگەرنا — رمیدن: هەڵهاتن، راکردن

رسم و راه: عادەت، رێ و رەسم، رەوشت

جاران عادەت بووە کە دەروێشان لە بەرامبەر ماڵی دەوڵەمەند و دەسەڵاتداراندا چادریان هەڵدەدا وەك جۆرە داوایەك بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکانیان، جاری وا هەبوو دەوڵەمەندەکان لە بری ئەوەی پێداویستییەکانیان جێبەجێ بکەن، پیاوەکانی خۆیانیان دەنارد تا بە چەقۆ و شمشێر پەتی خێمەکانیان بپچڕێنن و خێمەکانیان هەڵکەنن و لە بەردەرگا دەریان کەن، لێرەشدا و بە رەچاوکردنی ئەم دیاردەیە شاعیر دەڵێ: من لە بەردەم ئاستانەی تۆدا پلە و پایەم گەیشتۆتە کەشکەشانی فەلەك، بۆیە هەرگیز لێرە ناڕۆم مەگەر ئەوەی ئەجەل بە چەقۆ و شمشێرەکەی خۆی بەند و داوی چادرەکەم بپچڕێنێت و بمرم، ئەگەر نا هەرگیز ئەم بەردەرگایە چۆڵناکەم و راکردن و هەڵهاتن لە بەخت و خۆشبەختیش کەمن، لێرەدا دەبینم لە رەوشت و عادەتی من نییە، واتە، مەگەر مەرگ لەم تەریقەتەم جودام بکاتەوە.

**٧-گناه اگر چه نبوود در اختیار ما حافظ**

**تو در طریق ادب باش و گو گناه من است**

**گوناه ئەگەر چە نەبوود دەر ئیختیاری ما هافز، تو دەر تەریقی ئەدەب کوش و گو گوناهی مەنەست.**

گەرچی گوناه بە دەستی ئێمە نەبووە حافز، بەڵام تۆ بە ئەدەب بە و بڵێ گوناهی منە.

در اختیار ما: بەدەستی ئێمە، بە ویستی ئێمە در طریق ادب کوش: بە ئەدەب، بەڕێز بە

لەراستیدا پێویستە بە شێوەیەکی زۆر ورد و بە ئاگاییەوە ئەم بەیتە شرۆڤە بکرێت، چونکە گەر بەو شێوەیە شرۆڤە نەکرێت نەنگییەك لە مانای غەزەلەکەدا دروست دەکات. چونکە لە ئاستی سەرەوەیدا بەیتێکە بە تەواوی مانا، بیری (جەبریەت) دەخاتەڕوو کە لەگەڵ ڕێباز و شێوازی تەریقەت و عیرفاندا یەکناگرێتەوە یاخود کۆناکرێتەوە، هەر بۆیە گەر ئەم شرۆڤەیە بە راست بزانین دەبێ ئەو راستییە بخەینەڕوو کە بەیتەکانی غەزەل لە مانادا پەیوەست نین پێکەوە و مەرج نییە یەکیەتی بابەت لە نێوانیاندا هەبێ، بەم رایەوە ئەوا دەتوانین بڵێین ئەم بەیتە باس لەوە دەکات کە مرۆڤ بە ویستی خۆی گوناه ناکات و لە چارەی نووسراوە کە بیکات. بەڵام حافز دەڵێ: ئەگەر وابێ و کە هەرواشە تۆ بە ئەدەب بەو ئەم رایە مەخەرەڕوو، تۆ مەڵێ مرۆڤ هیچ شتێ بە ئارەزووی خۆی ناکات و کەسێکە موجبیرە، بەڵکو بڵێ مرۆڤ خۆیەتی گوناه دەکات، (د.هروی) ئەم بەیتە و چەندین بەیتی دیکەش دەکاتە بەڵگە بۆ بڕوابوونی حافز بە جەبریەت {ج١، ل١٩٠} کە ئەمە تەنیا لێکدانەوەیەکی رووی دەرەوەی غەزەل و بەیتەکانە و مانای قووڵی شیعرەکان نادات بە دەستەوە و لە بەرامبەر ئەمەشدا چەندین (بەیت)ی دیکە هەیە کە ئەم بیرە رەتدەکاتەوە. بەڵام سودی خۆی بۆ خۆی بیری جەبرییەتی (حافز) رەتدەکاتەوە و جۆرە تەئویلێك بۆ بەیتەکە دەکات کە دەڵێ: خۆشەویستی یار گوناهە، بەڵام من بەئارەزووی خۆم ئەم گوناهەم نەکردووە، واتە ئیختیاری نەبووە و من لە عەشقی دڵدارا هیچم بەدەست نییە، بەڵام ئەی حافز تۆ بەئەدەب بە و بڵێ ئەم گوناهە لە منەوەیە، واتە بڵێ من بە ئارەزووی خۆم یارم هەڵبژاردووە و خۆشم دەوێت، لەم بارەوە بەشێ لە ئیختیارم لەدەستدایە، مەبەست لەوەیە کە بە تەواوەتی ئیختیاری لێ نەسەندۆتەوە کە مەزهەبی جەبرییەت بێتە ئاراوە{ ج١، ل٣٥٨}. لە راستیدا وەك گوتم ئەم شەرحەی سودی جۆرێکە لە تەئویل بۆ رەتکردنەوەی مەزهەبی جەبرییەت لای حافز. بەڵام بە رای بەندە، ئەوە بە پێویست دەزانم کە تەنیا روانگەیەك بۆ شەرح و شرۆڤەی حافز هەڵنەبژێرین، واتە تەنیا روانگەیەکی عیرفانی یاخود رووکاری یاخود مێژوویی...هتد، بەڵکو پێویستە بەپێی مانا و مەدلولاتی شیعرەکە بۆ روانگەی نووسینی شیعرەکە یاخود راستتر، بەیتەکە بگەڕێین و لە خودی بەیتەکە شێوازی شرۆڤەکردنەکە هەڵبژێرین، راستە حافز زۆرینەی بەیتەکان و غەزەلەکانی لە عیرفاندا نووسراون و شەرحی عیرفانیش هەڵدەگرن، بەڵام هەمیشە حافزێکی عارف لە نێو بەیتەکاندا نییە و هەندێ جار (حافز) وەك پیاوێکی سادەی نێو کۆمەڵگەی (٧٠٠)ەکانی شیراز دەردەکەوێ



(هەروەك د. زرینکوب لە ـ از کوچەء رندان)دا ئاماژە بەم راستییە دەکات {ل ٣٩ ــ٤٠، از کوچەء رندان، دربارەء زندگی و اندیشەء حافظ، ١٣٧٧، چاپ هشتم، تهران، نشر امیر کبیر}. هەر بۆیە دەکرێ لە بەیتێکدا ئەم حافزە عارفە نەدۆزینەوە و سەر لە خۆمان و خوێنەریش بشێوێنین و مانای بەیتەکەش تێکدەین. بە رای بەندە ئەم بەیتە گەر پابەندی بەیتەکانی پێشو بێت ئەوا شەرحێکی وەك شەرحەکەی سودی یاخود شەرحەکەی (استاد مطهری) پێویستە، بەڵام من وادەزانم ئەمە رای خەڵکی دیکە بێت و حافز ئاماژەی پێ بدات واتە: حافز گەرچی دەگوترێ کە مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی نییە لە کردن یاخود نەکردنی گوناهدا، تۆ بەم رێگایەدا مەڕۆ، تۆ وەك ئەوان بیر مەکەرەوە یان بەلای کەمەوە گەر واش بیردەکەیتەوە بە ئەدەبەوە بڵێ گوناهی ئێمەیە، ئیدی لێرەدا من لەوە نادوێم کە ئایا حافز لە رێی ئەدەبەوە دەیەوێ گوناهەکان بە هی ئێمە بزانێ یاخود بەمە دەڵێ: من رەفزی مەزهەبی جەبری دەکەمەوە و بەبێ تانەوتەشەر لێدان دەڵێم: ئەم مەزهەبە هەڵەیە و گوناه لە دەستی مرۆڤدایە، لە کاتێکدا هەموو شەرحەکان ئەندازەیەك لە راستیان تێدایە تەنیا ئەوە راستترە کە هیچکامیان بە راستی رەها نەزانین و بە پێچەوانەشەوە.

## غەزەلی چل و یەکەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١-ز گریه مردم چشمم نشسته درخون است**

**ببین که در طلبت حال مردمان چون است**

**ز گریە مەردومی چەشمەم نشەستە دەر خونەست، ببین کە دەر تەلەبەت هالی مەردومان چونەست.**

لە تاو گریان سۆمای چاوم نغرۆی خوێن بووە، سەیرکە حاڵی خەڵکی لە تامەزرۆیی بەدەستهێنانی تۆدا چۆنە.

گریە: گریان    مردم چشم: سۆما، گلێنەی چاو، بیلبیلەی چاو

نشستە: نغرۆ، غەرق، چەقین    خون: خوێن    طلب: داوا، هەوڵ    مردمان: خەڵکی،

لێرەدا ئاماژەیەکی تێدایە بۆ خودی گلێنەی چاو یاخود خەڵك و مرۆڤەکانی دیکە

بێگومان لە تاو زۆر گریان چاوی مرۆڤ سوورهەڵدەگەڕێت و دەڵێی گلێنە تیایدا چەقیوە یاخود نغرۆبووە و سپییایەتی تێدا نامێنێت، لێرەدا ئاماژە بەم دیاردەیە کراوە و شاعیر دەڵێ: لەتاو زۆر گریانم گلێنەی چاوم نغرۆی خوێن بووە، واتە هێندە گریاوم خوێن دەورووبەری سۆمای چاومی گرتووە، کە ئەمەش مایەی شەوق و تامەزرۆییە بۆ تۆ و سەیرکە کە لەتاو تامەزرۆیی بۆ تۆ خەڵکی دنیا چ حاڵێکیان هەیە و چۆن پەرێشانن، یاخود سەیرکە لەتاو تامەزرۆیی بۆ تۆ گلێنەی چاوان چ حاڵێکیان هەیە.

**٢-به یاد لعل تو و چشم مست میگونت**

**ز جام غم می لعلی که می خورم خون است**

**بە یادی لەئلی تو ڤو چەشمی مەستی مەیگونەت، ز جامی غەم مەیی لەئلی کە می خورەم خونەست.**

ئەو شەرابە سوورەی کە بە یادی لێوی تۆ و چاوی مەستی مەیگونتەوە لە پێکی غەمدا دەیخۆمەوە، دەڵێی خوێنە.

لعل تو: لێوی تۆ

میگون: مەیگون: وەك مەی، مەی ئاسا، (مەیگون) بە واتای وەك مەی دێت، واتە سووری، بەڵام کاتێ دەدرێتە پاڵ چاو مەست یاخود چاوی مەستە.



می خورم: دەخۆمەوە

کاتێ بیر لە لێوی سوور و چاوانی مەستت دەکەمەوە غەمبار دەبم و خەم دامدەگرێ، بۆیە هەمیشە بەیادی لێوی سووری تۆ و چاوانی مەستی مەیگونتەوە بە غەمباری و لە بری مەی، خوێناو دەخۆمەوە.

**٣-ز مشرق سر کوی آفتاب طلعت تو**

**اگر طلوع کند طالعم همایون است**

**ز مەشریقی سەری کوی، ئافتابی تەلعەتی تو، ئەگەر تلوئ کونەد تالئەم هومایونەست.**

ئەگەر لە رۆژهەڵاتی سەرکۆڵانەوە هەتاوی رووی تۆ هەڵبێ، بەختم هەمایۆنییە.

مشرق: رۆژهەڵات، جێگای رۆژهەڵاتن    سرکوی: سەرکۆڵان

آفتاب طلعت تو: هەتاوی، خۆری رووخساری تۆ

طلوع کند: هەڵبێ، دەرکەوێ    طالع: بەخت

همایون: مبارەك، پیرۆز، هەمایۆنی نازناوێکی پادشایان بوو

طالع همایون: بەختی باش، بەختی موبارەك

دوو بەیتی یەکەم باس لە دەرەنجامەکانی دووری یار و نادیاربوونی ئەو دەکرێت، بەڵام بە شێوەیەکی راستەوخۆ هۆی ئەو دەرد و خەمە ناخرێتەڕوو، لەم بەیتەدا ماناکە زۆر روون دەبێتەوە بەوەی کە من لە چاوەڕوانی ژوانی تۆدا خەم و مەینەتیم زیادی کردووە و هەمیشە لە گریاندام، بە شێوەیەك کە چاوم سوورهەڵگەڕاوە و سەیروسلوکم بە شێوەیەکی خەمبارانە ئەنجام دەدەم، هەموو هۆیەکەشی جیلوەنەکردنی تۆیە لە پێش چاومدا، لێرەدا دەڵێ: گەر رووخساری وەك خۆر رووناکت لە رۆژهەڵاتی کۆڵانەوە هەڵبێ، من بەختێکی چاك و پیرۆزم هەیە، واتە گەر لە سەرکۆڵانەوە دەرکەوی و جیلوە بکەیت من خاوەن بەختێکی باشم و گشت خەم و خەفەتەکانم دەڕەوێتەوە.

**٤-حکایت لب شیرین، کلام فرهاد ست**

**شکنج طرّهء لیلی مقام مجنون است**

**هیکایەتی لەبی شیرین کەلامی فەرهادەست، شکەنجی توررەیی لەیلی موقامی مەجنونەست.**

قسەی فەرهاد باسی لێوی شیرینە و شوێنی مەجنونیش پێچ و لولی زوڵفی لەیلایە.

حکایت: باس    مقام: جێگا، شوێن

له چیرۆكی عەشقدا له ئەدەبیاتی عەرەبیدا (لەیلیٚ و مەجنون) و له ئەدەبیاتی فارسی (شیرین و خوسرەو) یاخود (شیرین و فەرهاد) زۆر دووباره دەبنەوه، لای شاعیر له هەموو عەشقێكدا هیچ مایەی گەورەبوونی عاشق نییه جگه له مەعشوق و یار، بۆیه قسەی فەرهاد هەمیشه باسی لێوی شیرین بوو، شوێنی مەجنونیش هەمیشه پێچ و لولی زوڵفی لەیلا بوو، ئەو دوو عەشقەش به عەشقی راستی یاخود نموونەی باڵای عەشق دادەنرێن. واته عاشق هەمیشه لەو جێگا و شوێنەیه که مەعشوقی لێیه و هەمیشه له بارەی مەعشوقەوه دەدویٚ و لەسەر زاریەتی.

**٥-دلم بجو که قدت همچو سرو دلجوی است**

**سخن بگو که کلامت لطیف موزون است**

**دلەم بجو که قەدەت هەمچو سەرڤ دلجویەست، سوخەن بگو که کەلامەت لەتیف و مۆوزونەست.**

دڵم بدەرەوه، چونکه باڵات وەك دارسەرو دڵەکان بۆ خۆی رادەکێشیٚ، قسه بکه، چونکه قسەت ناسك و رێك و پێکه.

دڵم بجو: دڵم بدەرەوه، میهرەبانیم بەرامبەر بنوێنه (دلجویی) واته دڵدانەوه، میهرەبانی نواندن   دلجوی: دڵڕفێن، دڵ راکێشەر   سخن بگو: قسه بکه   موزون: مەوزون، رێك و پێك، لەجێی خۆیدابوون.

دەڵیٚ: قەد و باڵات که وەك سەروه هێنده سەرنجڕاکێشه دڵان بۆ خۆی دەڕفێنیٚ، منیش دڵم رفێنراوه بۆ لای تۆ دێم، بۆیه داوات لیٚ دەکەم دڵم بدەرەوه و قسه بکه، چونکه قسەت ناسك و نەرم و رێك و پێکیشه.

**٦-ز دوور باده به جان راحتی رسان ساقی**

**که رنج خاطرم از جور دوور گردون است**

**ز دۆوری باده به جان راهەتی رەسان ساقی، که رەنجی خاتڕەم ئەز جۆوری دۆوری گەردونەست.**

ساقی به دەوری شەراب ئارامییەك بگەیەنه (بده) به گیان، چونکه دڵتەنگی و ناڕەحەتیم لەبەر زوڵمی دەوری گەردونه.

دوور: دەور، دەوران، گێران   راحتی: ئارامی   رسان: بگەیەنه، بده

رنج: زەحمەت، خەم، دڵتەنگی   خاطر: هزر، دڵ

جور: زوڵم، ستەم، جەور   دوور: دەور، زەمانه، گەڕان



دڵتەنگی و خەمی شاعیر لەتاو زوڵم و ستەمی زەمانه و چەرخی گەردوونه که ئەم خەمه ئەزەلییەی کەسی عارف هەرگیز کۆتایی نایەت تەنیا به عەشق نەبێت، ئەویش عەشقێك که مرۆڤ لەو گەڕانەی گەردوون داببڕێت. له عیرفاندا گەر باده لەگەل ساقیدا هێنرا واتای عەشق دەگەیەنێت.

لێرەشدا حافز هەمان عەشق داوا دەکات بۆ ئەوەی ئارامییەك بەگیانی بگات و کەمیٚ یاخود زۆر له خەمی دنیا دووركەوێتەوه، بۆیه دەڵیٚ: ئەی ساقی به گێڕانی شەراب و باده گیانمان ئارام بکه و ئارامی به گیان بگەیەنه، واته: با به عەشق و چوونه نێو مەرزەکانی عەشقی عیرفانییەوه روحمان ئارام بکەین، چونکه مانەوه له نێو مەرزەکانی زوڵم و ستەمی گەردوونی دیلی کاتدا دڵتەنگی کردووین، با بچینه نێو تەریقەت و عەشقەوه تا پشویەکی گیانی بدەین.که دەکریٚ ئەو غەم و دڵتەنگییەی، ئەو نەهامەتییه بێت یاخود ئەو ئازاره بێت که به هۆی مەرگی کوڕه نازدارەکەیەوه چووەته دڵی ـ وەك له بەیتی حەوتەمدا- ئاماژەی پیٚ دەکات.

**٧-از آن زمان که ز چنگم برفت رود عزیز**

**کنار دامن من همچو رود جیحون است**

**ئەزان زەمان که ز چەنگەم بەرەفت رودی ئەزیز، کیناری دامەنی مەن هەمچو رودی جەیهونەست.**

لەوکاتەوەی که کوڕه شیرینەکەم لەدەست چوو، دەوروپشتم (ئەملاولام) هەروەك رووباری جەیحون وایه.

از آن زمان: لەوکاتەوەی   چنگ: چنگ، دەست   برفت: چوو

رود: کوڕ، سودی دەڵیٚ: له شێوازی خوراسانیدا به منداڵ (رود) دەڵێن {ج١، ل٣٦٢} هەروەها به مانای (رووبار)یش دێت، هەروەك له میسراعی دووەمدا بەو مانایه هاتووه

کنار: کەنار، ئەملاولا   دامن: داوێن، خوارەوه   همچو: هەروەك

رود جیحون: رووباری جەیحون، رووبارێکه له نێوان خوراسان و سەمەرقەندایه که به بەشی پشتەوەی (ئەوبەری) دەڵێن: ئەودیو رووبار (ما وراء النهر) {سودی، ج١، ل٣٦٢}

مەبەستی لەوەیه له مەرگی کوڕەکەمەوه هێنده گریاوم و فرمێسکم وەك لافاو رژاندووه ئەملاولا و داوێنم وەك ئاوی رووباری (جەیحون) زۆره و فرمێسکم رۆشتووه، هروی له (فرصت شیرازی)یەوه سەبارەت بەم کوڕەی حافز نووسیویەتی:(خواجه کوڕێکی هەبوو ناوی ـ شاه

نوعمان ـ بووە و رۆشتووە بۆ هیندستان لە ـ برهان پور ـ مردووە و گۆڕەکەی نزیکی قەڵای ـ ئاسیر ـ)ە {هروی، ج١، ل١٩٤}.

**٨-چگونه شاد شود اندرون غمگینم**

**به اختیار، که از اختیار بیرون است**

**چگونە شاد شەڤەد ئەندەرونی غەمگینەم، بە ئیختیار، کە ئەز ئیختیار بیرونەست.**

دەروونی غەمگینم چۆن بە ئارەزووی خۆی شاد بێتەوە کە ئەم کارە لە توانای (ئیختیاری) من بەدەرە.

| | |
|---|---|
| شاد شدن: شادبوون | اندرون: دەروون، ناخ |
| به اختیار: بە ئارەزوو | بیرون: دەرەوە |

(اختیار) لە کاتێکدا کە مانای هەڵبژاردن و ئارەزوو دەگەیەنێ، لە هەمانکاتدا ناوی ئەو مەزهەبەیە کە لە بەرامبەر جەبرییەتدا دێت و پێیوایە مرۆڤ خۆی هەڵدەبژێرێت و بە زۆر کردارەکان بەسەر مرۆڤدا نادرێت. گەر بەم واتایە لێکدرێتەوە کە لێکدانەوەیەکی دوور لە راستی نییە ئیشکالی جەبرییەت و عیرفان دێتە ئاراوە، بەڵام لە هەمانکاتدا واتا زمانییەکەشی مانای جوانی هەیەکە بریتییە لە:

من لە دەرەنجامی ئەو خەمە گەورەیەی بە سەرمدا هاتووە ناتوانم شادببم و ناخی خەمبارم بە ئارەزووی خۆی ناتوانێت شاد بێتەوە، چونکە بە دەست خۆم نییە وا غەمبار بووم و لە مەرگی کوڕەکەمەوەیە، بەم مانایەش پەیوەندی لە نێوان بەیتەکاندا دروست دەبێت، بەڵام گەر بە مانای مەزهەبی (اختیاری) لێکدرێتەوە مانای بەیتەکە دەبێتە: چۆن هزر و ناخی غەمگینم بە ئیرادە و اختیار شادبێتەوە و بچێتەوە نێو ئیرادە کە ئەم کارە لە دەستی ئەودا نییە و دوورە لە هەڵبژاردن و ئیختیارەوە.

**٩-ز بیخودی طلب یار می کند حافظ**

**چو مفلسی که طلبکار گنج قارون است**

**ز بیخودی تەلەبی یار می کونەد هافز، چو موفلیسی کە تەلەبکاری گەنجی قارونەست.**

حافز لە پەشێوحاڵییەوە داوای گەیشتن بە یار دەکات وەك موفلیسێك کە داوای سەروەتی قارون دەکات.

| | |
|---|---|
| بیخودی: پەشێوحاڵی، جزبە، بێ هۆشی | موفلس: موفلیس، بێ پارە و پول |
| طلبکار: داواکەر، ئارەزووی | گەنج، سەروەت |



بێگومان قارون بە رەمزی دەوڵەمەندی دادەنرێت، حافزیش داوای گەیشتن و لیقای یاری عیرفانی دەکات، بەڵام هەروەك چۆن موفلیس شیاوی سەروەتی قارون نییە ئەمیش ئاوا خۆی بە شیاوی لیقای یار نازانێت، بۆیە وەك جۆرە عوزر و پۆزشێك بۆ ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەی ئەم چواندنە دەکات و دەڵێ:

حافز لە پەشێوحاڵییەوە یاخود لە ئەنجامی جەزبەوە داوای لیقای یار دەکات نەوەك لە حاڵەتی عەقڵ و بەئاگاییدا، ئەمەش هەروەك موفلیسێك وایە کە داوای سەروەتی قارون بکات یاخود، ئارەزووی وابێت ببێتە خاونی سەروەتی قارون کە زۆر بێ جێیە، یاریش بۆ حافز زۆر دوورە و حافز لە خۆوە و بەبێ رەچاوکردنی مەرجەکان ئەم داوا نابەجێیە دەکات، بەڵام هۆکارەکەی پەشێوحاڵییە. ئەکرێ ئەم داوای لیقایە بە داوای لیقای کوڕە مردووەکەشی لێکدرێتەوە.

## غەزەلی چل و دووەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەقسور**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)**

**١- خم زلف تو دام کفر و دین است**

**ز کارستان او یک شمّه این است**

**خەمی زولفی تو دامی کوفر و دینەست، ز کارستانی ئو یەك شەممە ئینەست.**

پێچ و لولی زولفی تۆ داوی کفر و دینە، ئەمە کورتەیەکە لە چیرۆکی کارە زۆرەکانی ئەو.

دام: داو کفر: کوفر، لێرەدا مەبەست لە کافرە، واتە بێ ئیمان کە لە بەرامبەر (دین)دا هاتووە و بە مانای ئیماندارە. کارستان: کاری زۆر، کاری گرنگ، حکایەت و بەسەرهات، جێگەیەك کە کاری زۆری تێدا ئەنجام بدرێت. یك شمه: بۆنی کەم، تۆزێك، کەمێك، کورتەیەك.

دەڵێ: لولی زولفی تۆ داوێکە بۆ کافر و موسوڵمان دانراوە و هەردووکیان لەداو دەنێت، واتە: چ کافر و چ موسوڵمان تووشی داوی زولفی تۆ دەبن، عاشقت دەبن، کە ئەمەش بە هۆی جوانی زولفی لولتەوەیە و ئەمەش یەکێکە لە کارە زۆر و گرنگەکانی زولفت. بە ئاماژە بەوەی کە (خم زلف) لە عیرفاندا نهێنییە خوداییەکانن و ئەو نهێنییانەش بووەتە مایەی سەرسوڕمانی کافر و موسوڵمان، بۆیە دەڵێ: نهێنییەکانی گەردوون و ئەودیو سروشت کە خودا خۆی دەیانزانێ، وەك داوێکن و موسوڵمان و کافر لە ئاستیاندا دەستەوسان دەبن و سەرنجیان رادەکێشی و دەیانخاتە کەڵکەڵەی کردنەوەیانەوە. ئەمەش واتە بیرکردنەوە یەکێکە لە کارە زۆر گرنگەکانی ئەسرار و نهێنییەکانی گەردوون و ئەودیو سروشت، واتە چ کافر و چ موسوڵمان کەڵکەڵەی شیکارکردنی نهێنییەکانی خەلقیان ـ بوونیان ـ لە سەردایە.

**٢- جمالت معجز حسن است لیکن**

**حدیث غمزهات سحر مبین است**

**جەمالەت موئجیزی هوسنەست لیکن، هەدیسی غەمزەئەت سیهری موبینەست.**

جوانیت موعجیزەی جوانییە، بەڵام قسەی غەمزەت بە ئاشکرا سیحر و جادووە.

معجز: موعجیزە، پەرجو معجز حسن: موعجیزەی جوانی، لە جوانیدا موعجیزەیە، لە دوا پلەی جوانیدایە لکن: بەڵام

حدیث: بابەت، قسە غمزه: ئیشارەت کردن بە چاو



سحر: سیحر، جادو سحر مبین: سیحری ئاشکرا، جادوی دیار

باسی جوانی یار دەکات، ئەو یارەی کە کافر و موسوڵمان لە داوی نهێنییەکانیدا ئەبڵەق بوون و نازانن چ بکەن، ئەو یارە عیرفانییەی کە بووەتە مایەی سەرسوڕمانی عاشقان لەم بەیتە و بەیتەکانی دواییشدا باس لە گەورەیی و سەرنجڕاکێشی ئەو دەکرێت، بە شێوەیەك کە عاشقان لە بەرامبەریدا دەستەوسانن.

دەڵێ: جوانی تۆ موعجیزەیەکە لە جوانیدا واتە: لە سنوور دەرچووە و بووەتە پەرجوییەك لە نێو جوانیدا، بەڵام قسەی ئاماژەکانی چاوت، یاخود غەمزەکانی چاوانت سیحرێکی ئاشکرایە و خەڵکی و عاشقان فریو دەدات. واتە تۆ لە جوانیدا موعجیزەیەکی واقعیت و لە فریوکاری و عیشوەگەریشدا فریو و هەڵخەڵەتاندنی ساحیرانەت هەیە.

**٣- ز چشم شوخ تو جان کی توان برد**

**که دایم با کمان اندر کمین است**

**ز چەشمی شوخی تو جان کی تەڤان بورد، کە دایم با کەمان ئەندەر کەمینەست.**

لەتاو چاوی تۆ کێ دەتوانێ گیان دەرکا، کە دایم بە کەوانی برۆوە لە بۆسەدایە.

شوخ: دلێر، هاروهاج، بێ شەرم، جەسور، دڵگیر و پەسەند

جان بردن: گیان دەرکردن کمان: کەوان، لێرەدا مەبەست لە برۆیە کە وەك کەوان وایە

اندر: لە ناو کمین: کەمین، بۆسە

هێشتا هەر باس لە یاری عیرفانی دەکرێت، دەڵێ: پاش جوانی و غەمزەت چاوانی جوانیشت یەکێکە لە هۆکارەکانی سەرسوڕمانی خەڵکی. تۆ کە چاوانت هێندە پەسەندە یاخود دلێر و بێشەرمە کەس ناتوانێ بەسەلامەتی گیان دەرکا و نەکەوێتە نێو داوتەوە، چونکە ئەو چاوانە بە برۆی کەوانی خۆیانەوە لە نێو بۆسەدا بوون تا دڵی عاشقان رام بکەن و بیانخەنە داوەوە.

**٤- بر آن چشم سیاه صد آفرین باد**

**که در عاشق کشی سحر افرین است**

**بەران چەشمی سیاه سەد ئافەرین باد، کە دەر ئاشقکوشی سیهرئافەرینەست.**

سەد ئافەرین لەو چاوە رەشانە بێت، کە لە عاشق کوژیدا زۆر ساحیرە.

برآن: لەو آفرین: ئافەرین باد: ببێ در: لە

عاشق کشی: عاشقکوژی سحرآفرین: سیحرداهێنەر، سیحرهێنەرەئارا، ساحیرانە

دیسان وەسفی چاوی رەشی یار دەکات و دەڵێ: سەد ئافەرین لەو چاوە رەشانە کە لە عاشقکوژیدا جۆرە کاری تازەی وا دادەهێنێ هەر لە کاری ساحیران دەچێت.

**٥- عجب علميست علم هيئت عشق**

**كه چرخ هشتمش هفتم زمين است**

**ئەجەب ئیلمیست ئیلمی هەیئەتی ئیشق، کە چەرخی هەشتومەش هەفتوم زەمینەست.**

زانستی بنەماکان و یاساکانی عەشق زانستێکی هێندە ناوازەیە، کە ئاسمانی چەرخی هەشتەم لە بەرامبەریدا وەك چینی حەوتەمی زەوییە. عجب علمیست: زانستێکی سەیرو ناوازەیە.

هیئت: بەشێکە لە زانستی گەردوونناسی کە لە دەور و باری ئەستێرەکان و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتریدا و شێوە و یاسای جێگیریی جوڵەیان دەکۆڵێتەوە، شێوە، پەیکەر چرخ هشتم: ئاسمانی وەستاو و جێگیر، واتە گەردوونێك کە هەسارەی جێگیریی تێدایە و مەبەست لێی ئاسمانی بەرزە و واتە پلەوپایەی بەرز.

هفتم زمین: چینی ژێری ژێری زەوی کە مەبەست لێی نزمییە، اسفل السافلین، نزمترین.

بەیتەکە باس لە پەیوەندی نێوان عەشق و زانستە، کە لای شاعیر هەرگیز یەکناگرنەوە و ئەمەش رای عارفەکانە و پێیان وایە کە زانستی بنەمادانان و جێگیرکردنی جوڵە و پەیوەندییەکانیان کە زانستی هەیئەتی پێ دەگوترێت، یاخود پەیکەر و شێوەی عەشق زانستێکی سەیر و ناوازەیە، چونکە عەشق بەم شێوەیە نییە و بەرزترین پلەی ئەم زانستە لە بەرامبەر خودی عەشقدا چینی خوارەوەی زەوییە و سەرەتای عەشقە. واتە زانست ناتوانێ پەی بە عەشق ببات (د. هروی) سەبارەت بەم بەیتە دەڵێ: (بۆچوون و بڕیاری گەردوونناسی سەبارەت بە گەردوون و ئەستێرەکان لای عارفەکان کە لە ڕێگەی عەشقەوە دەگەنە پلەی بەرز و باڵا گرنگی و بەهای نییە، چونکە لە بۆچوونی عارفدا چەرخی هەشتەم کە دوا قۆناغی گەردوونناسییە لەگەڵ چینی حەوتەمی زەویدا یەکسانە و دوا سنووری دەرکی زانست و عەقڵ سەرەتای قۆناغی عەشقە) {ج١، ل١٩٧}سودیش بە شێوەیەکی پۆزەتیڤی وەسفی ئەم زانستەی کردووە کە زانستی هەیئەتی عەشقە و دەڵێ: (زانستی هەیئەتی عەشق زانستێکی ناوازەیە بە شێوەیەك کە ئاسمانی حەوتەم لە بەرامبەریدا چینی حەوتەمی زەوییە) {ج١، ل٣٦٦}.

**٦- نپنداری كه بدگو رفت و جان برد**

**حسابش با كرام الكاتبين است**

**نەپەنداری کە بەدگو ڕەفت و جان بوورد ، هیسابەش با کیرامیلکاتیبینەست.**

گومان نەبەی کە بەدگۆ ڕۆشت و گیانی ڕزگارکرد، چونکە حسابی لای کرام الکاتبینە (فریشتەکانە).

نپنداری: گومان مەبە. بدگو: بەدگۆ، ئەو کەسەی کە قسەی خراپی کردووە، غەیبەتچی



رفت: رۆشت، لێرەدا مەبەست لە مردنە. جان برد: گیانی برد، واتە گیانی بە سەلامەتی دەرکرد، رزگاری بوو

کرام الکاتبین: ئەو فریشتانەی کە نامەی کردەوەی مرۆڤ دەنووسن و خیانەتیش لە نووسینەکە ناکەن.

واتە: واگومان مەبە کاتێ کەسی بەدگۆ دەمرێت رزگاری بووبێت لە مەینەتی و گیانی ئازاد کردبێ بە بێ ئەوەی سزای کردەوەکانی وەرگرێ، هێشتا تەواو نەبووە، چونکە حیساب و مامەڵەکەی لەگەڵ فریشتەکاندا تەواو نەبووە و لای ئەوانە و لەوێ حەقی خۆی وەردەگرێتەوە.

**٧- مشو حافظ ز كيد زلفش ايمن**

**كه دل برد و كنون در بند دين است**

**مەشو هافز ز کەیدی زولفەش ئیمەن، کە دل بوورد و کنون دەر بەندی دینەست.**

حافز لە فێڵی زوڵفی دڵنیا مەبە، چونکە دڵی بردووە و ئێستاش لە سەروبەندی بردنی دیندایە.

مشو: مەبە کید: فێڵ، فریو، مەکر

ایمن: دڵنیا، ئەمین کنون: ئێستا دربند: لە سەروبەندی، لە بیری، بە نیازی

واتە: حافز هەرگیز لە فڕوفێڵی زوڵفی دڵنیا و ئەمین مەبە، چونکە هەر زوڵفی ئەوبوو کە دڵی خستە نێو داوی عەشقەوە و بردی، ئێستاش لە بیری ئەوەدایە کە ئیمانیشت ببات، بێگومان ڕێگەی عەشق گەر بە نەزانی پیایدا بڕۆین خەتەری بۆ سەر دڵ و دین هەیە، بۆیە پێویستە مرۆڤ هەمیشە دڵنیایی بخاتە لاوە تا دەگاتە مەنزڵ، چونکە تا مەرگ مرۆڤ لە ڕێی ئەوەدایە گرفتاری دەرد و مەینەتییەکانی ڕێگە ببێتەوە، نهێنییەکانی ئەودیو سروشتیش هێندە نادیارن کە گەر مرۆڤ بە دڵنیاییەوە ڕێگەی ژیان ببڕێت تووشی لادان دەبێت و ڕەنگە گومڕای بکات.

## غەزەلی چل و سێیەم:

**بەحری موزاریعی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوف**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١-زلفت هزار دل به یکی تاره مو ببست**

**راه هزار چارەگر از چار سو ببست**

**زولفەت هەزار دل بە یەکی تارە مو ببەست، راهی هەزار چارەگەر ئەز چار سو ببەست.**

زولفت هەزار دڵی بە تاڵە مویەك بەستەوە، ڕێگـای هـەزار چـارەگەر (فێڵبـاز)ی لـە هـەر چوارلاوە بەستەوە.

تـارە: تـاڵ، تاریـك، لـە بەیتەکـەدا هـەردوو ماناکـەی تێدایـە، واتـە تاڵـەموی ڕەش

راه: ڕێگە چارە: چارەسەر، فێڵ، جادوو، گەر بە مانای یەکەمیان بێت (چارەگر) واتـای چارەسەر دەگەیەنێت، بەڵام گەر مانای دووەمیـان (فێـڵ و جـادوو) بـدات (چـارەگر) فێڵبـاز، جادووگەر دەگەیەنێت چار: چوار سو: لا

ازچارسو: لە هەر چوارلاوە، (لەهەمووڵایەکەوە) ببست: گرت، بەست

زولفی تۆ بە تاڵێکی یاخود بە تاڵەمویەك کە نیشانەی باریکی و بێهێزییـە هـەزار دڵـی بەستەوە، یاخود بە تاڵێکی هەزار دڵی گرفتار کرد، کـە لێرەشـدا هـەزار نیـشانەی زۆرییـە نەوەك خودی هەزار، ئەم بەستنەوەیەش بە شێوەیەك بوو کە ڕێگەی چارەگەری لە هەر چـوار لاوە گرت، کە (عەقڵ و زانستە)، واتە مرۆڤی هۆشیار و عاقڵ نەیتوانی لە داوی زولفی تـۆ دەرچێت. بێگومان نهێنییەکانی ئەودیو سروشت هێندە سەرنجڕاکێشن کـە تـەنیا یـەکێکیان هەزاران دڵ بە خۆیەوە پەیوست دەکات و ڕێگەی عەقڵ و ژیریش لە هەرچوار لاوە دەگرێت و ژیری تیایدا دەستەوسانە.

**٢-تا عاشقان به بووی نسیمش دهند جان**

**بگشود نافەای و در آرزو ببست**

**تا ئاشقان بە بووی نەسیمەش دەهەند جان، بگوشود نافەئی و دەری ئارەزوو ببەست.**

تا عاشقان بە هیوای بۆنی خۆشـی گیـان بـەخت بکـەن، کیـسەیەکی میـسکی کـردەوە و دەرگای ئارەزووی گرت.

تا: تا، بۆ ئەوەی بە بووی: بە ئومێدی، بە هیوای نسیمش: بۆنی



دهند جان: گیان بدەن، گیان بەخت بکەن بگشود: کردییەوە

نافە: کیسەیەکی بچووکی سەر بەستراوە کە میسکی تێدایە، لێـرەدا مەبەسـت لـە لـولی زولف و پرچە.

وەك لە بەیتی یەکەمیشدا ئاماژە بە زولفی مەعشوق کرا بۆ گرفتـارکردنی دڵـی عاشـقان، لێرەشدا بە درکە دیسانەوە باس لە زولفی لولی یار دەکرێت و دەڵێ: مەعشوق گرێیەکی یاخود لولییەکی زولفی خۆی کە وەك کیسەی میسك بۆنخـۆش و بۆنـدارە، کـردەوە تـا بـۆنی خۆشـی پەخش بێت و عاشقان بە هیوای گەیشتن و هەڵمژینی ئەو بۆنەخۆشە گیان بەخت بکـەن، بـەڵام دەرگای ئارەزووی داخست، واتە: ئەو دەرگایەی داخست کە عاشقان بگەن بەو گرێی پرچـە، تـا لە غەمی گەیشتن بەودا گیان بدەن یاخود گیان ببەخشن.

لە عیرفاندا مانای بەیتەکە دەبێتە: عاشقی عیرفانی تەنیا نورێك یـاخود نهێنییـەك لـە نهێنییە بێ شومارەکانی خودایی و ئەودیو سروشتی بۆ دەرکـەوت. یـاخود دروسـتتر خـودی مەعشوق یەکێك لە نهێنییە بۆنخۆشەکانی خـۆی بـۆ عـارف دەرخـست، بـەڵام ڕاز و نهـێنی دیکەی زۆری هێشتەوە تا عارفەکان لە ڕێگەی کەشفکردنی ئـەم نهێنیانـەدا گیـانی خۆیـان بەخت کەن.

**٣- شیدا از آن شدم کە نگارم چو ماه نو**

**ابرو نمود و جلوەگری کرد و رو ببست**

**شەیدا ئەزان شودەم کە نیگارەم چو ماهی نۆو، ئەبرو نەمود و جیلڤەگـەری کـەرد و رو ببەست.**

لەوە شێت و شەیدا بووم کە یارم وەك مانگی تازە بە نیـشاندانی بـرۆ خـۆی نمـایش کـرد و رووی خۆی داپۆشی.

شیدا: شێت و پەشێو نگار: نیگار، لای ڕۆمەکان بە ژنی جوان دەگوترێ (نگار)، بەڵام لە ئەدەبیاتی فارسیدا یەکێکە لە ناوەکانی یار ماه نـو: مـانگی تـازە، مـانگی یەکـشەوە ابـرو نمـود: بـرۆی دەرخـست جلـوەگری: نمـایش، خۆدەرخـستن روببست: روی بەست، رووی داپۆشی، رووی شاردەوە

لێرەدا دەرکەوتنی برۆی یار لەگەڵ مـانگی تـازە یـاخود یەکـشەوەدا پەیوەنـدییان هەیـە، چونکە مانگی یەکشەوە لە شێوەی برۆدا دەردەکەوێت و خێرا ون دەبـێ، یـاخود پەیوەندییەکـە پێـچەوانەیە و یـار لـە ژێـر پەچـەوە بـرۆی وەك مـانگی یەکـشەوەی پیـشانداوە و پاشـان شاردوییەتییەوە. هەرچۆن بێ ئەم شاردنەوەیە شاعیری شێت و شـەیدا کـردووە یـاخود دەکـرێ

پەیوەندی بەو بۆچوونەوە هەبێ کە سەیرکردنی مانگی یەکشەوە کاریگەری لەسەر میزاج و دەماخی مرۆڤی پەشێوحاڵ هەبێ.

بەڵام دەکرێ روونکەرەوەی زیاتری بەیتی دووەم بێت کە مەعشوق بە کردنەوەی نهێنییەکەی بۆ عاشقان دەرگای ئارەزووی داخست و غەمی بەخشییەوە. لێرەشدا بە جیلوەکردنێکی خێرا و خۆحەشاردانی، دیسان عارف و عاشقی شێت و شەیداکرد، لەگەڵ ئەمەشدا مانای (برۆ) لە عیرفاندا مەقامی قوربە و ونبوونی قەبز و لە دەستدانی مەقام و پلەکانە لە لایەن رێبواری رێگەی تەریقەتەوە بە هۆی گوێپێنەدان و ئیهمالی خۆیەوە. دەکرێ ئەم لە دەستدانە شاعیری شێت و شەیدا کردبێ.

**٤- ساقی به چند رنگ می اندر پیاله ریخت**

**این نقشها نگر که چه خوش در کدو ببست**

**ساقی بە چەند رەنگ مەی ئەندەر پیالە رێخت، ئین نەقشها نیگەر کە خوش دەری کەدو ببەست.**

ساقی بە چەند جۆر شەرابی کردە نێو پێکەوە، سەیری ئەم نەخشانە بکە کە چەند جوان بە سەر سوراحی شەرابەوە کێشاونی.

رنگ: رەنگ، جۆر　　ریخت: رژاند، کردیەناوی

نقش: پەخش، وێنە، نیگار　　نگر: ببینە　　خوش: خۆش، جوان

کدو: کولەکە، لێرەدا مەبەست لەکولەکەی ئاوییە، لە شێوەی سوراحی دایە و ناوەندەکەی باریکە، لە کاتی وشکبوونیدا توێکڵە قایمەکەی رەق دەبێت و پاش دەرهێنانی ناواخنەکەی ئاوی تێدەکرێت، جاران شەرابی تێکراوە و بۆ جوانکردنیش نەخشیان لەسەر کێشاوە و پێیان گوتووە کولەکەی شەراب یاخود کولەکەی سوراحی ، شەرابی ناو ئەم جۆرە کولەکەیەش لە باشترین جۆرەکانی شەراب بووە.

ساقی لە سوراحی (کولەکەی شەرابەوە) بە چەند شێوەی جیاواز یاخود چەند جۆر شەرابی کردە نێو پیاڵەوە و شێوەی جیاوازیان لەسەر پیاڵەکە کێشا و نەخشاند، کە هەمان ئەو نەخش و نیگارانە ناوازنەن کە بە سەر کولەکەی شەرابەکەوە بۆ جوانی کێشراون، ئێستا ببینە کە چەندە جوان بە سەر کولەکەی شەرابەکەوە نەخش و نیگاری جوانی کێشاوە.

لە عیرفاندا (ساقی) عەشق فێری رێبوار دەکات و بە چەندەها شێواز جوانییەکانی عەشق نمایش دەکات کە رەنگدانەوەی خودی جوانییەکانی سوراحییە، چونکە سوراحی حاڵ و مەقامەکانە کە رێبوار پیایاندا تێدەپەڕێ.



**٥- یا رّب چه غمزه کرد صراحی که خون خم**

**با نغمه‌های قُلقُلش اندر گلو ببست**

**یا رەب چە غەمزە کەرد سوراهی کە خونی خوم، با نەغمەهای قولقولەش ئەندەر گەلو ببەست.**

خوایە سوراحی چ غەمزەیەکی کرد کە شەراب بە ئاوازی قوڵقوڵییەوە لە گەرویدا گیرا.

غمزه: عیشوە و غەمزە　　خون خم: خوێنی کوپەڵە (خوم)، مەبەست لە شەرابە

نغمە: ئاواز

قلقل: قوڵەقوڵ، کاتێ شەراب یاخود ئاو لە سوراحی دادەکرێت قوڵپەقوڵپ دەکات، لێرەشدا هەمان ئەو قوڵپەقوڵپەیە کە بە ئاوازی سوراحی دەزانێت.

گلو: گەرو　　اندر گلو ببست: لە گەرویدا گیرا

بێگومان کاتێ شەراب لە سوراحی دەکرێتە نێو پێك جگە لە قوڵپەقوڵپی سوراحییەکە هیچ دەنگێکی لێ نایەت. شاعیر وای خەیاڵ کردووە کە سوراحی لە بنەڕەتدا قسەکەر بووە و توانای دەنگ دەربڕین و عیشوە و غەمزەی هەبووە، بەمەش سەرنجی خەڵکی بۆ لای شەراب راکێشاوە، ئیدی بە مەبەستی نۆشینی یاخود رژاندن و شکاندنی خومەکانی، هەر بۆیە لە ئەنجامی ئەم خراپەوە شەراب قوڵپەقوڵپەکەی لە گەروی گیراوە و جگە لەو دەنگە ناتوانێ هیچی دیکە دەربڕێت.

حاڵ و مەقامەکانیش کە سوراحی رەمز و جەفەنگێکیانە، لە شیعری عیرفانیدا بە هەمان شێوەن و تیایاندا عارف لە قوڵپەقوڵپ و ئاوازێکی تایبەتی یاخود دووبارەکردنەوەی چەند وشەیەکی دیار و تایبەتی زیاتر کە عەشق پێی دەبەخشێ ناتوانێ هیچی دیکە دووبارە بکاتەوە.

**٦-مطرب چه پرده ساخت که در پردهء سماع**

**بر اهل وجد و حال در های و هو ببست**

**موتریب چە پەردە ساخت کە دەر پەردەیی سەمائ، بەر ئەهلی ڤەجد و هال دەری های و هو ببەست.**

موتریب چ ئاوازێکی ژەند کە لە نێو پەردەی (ئاوازی) سەماعدا دەرگای های و هوی لە ئەهلی وجد وحاڵ داخست.

مطرب: گۆرانی بێژ، مۆسیقا ژەن　　پردە: پەردە، ئاواز　　پردە ساختن: ئاواز ژەندن

سماع: گوێ لێ بوون، سرود و ئاواز، بەڵام لە زاراوەی سۆفیگەریدا (سماع): خۆشی و سرور و سەما و خۆبادانە وەك حاڵی دەروێشان کە بە ئاوازی خێرا سەما دەکەن و دەست رادەوەشێنن (پاشان بە درێژی لێی دەدوێین)، هەروەها مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە

مۆسیقاژەن لـە پـشت پـەردەوە و بـەجیا لـە کـۆڕی مۆسـیقای ژەنـدووە و یـارانی نێوپـەردە کەوتوونەتە سەما و شادی و سرورەوە.

پردە سماع: ئاوازی خۆشی و سروری سۆفیان، ئاوازی پشتی پەردە، یاخود ئەو ئاوازە تایبەتیەی کە بۆ سەما و شادی دەست دەدات.

وجد: خۆشی زۆر لەگەڵ سەمادا، سەماکردن بە جۆش و شادییەکی زۆرەوە، حاڵەتێکە یاخود حاڵێکە کە خوای گەورە لە پڕ ناخی مرۆڤ بگۆڕێت بە خۆشی یان هەرحاڵێکی دیکە، هەروەها بە هەستپێکردنی نوری جیلوەش هەر (وجد) دەڵێن، کەواتە (وجد) حاڵێکی شەیدایی و نائارامی و خۆشی و سرورێکە کە لە ئەنجامی سەماعەوە بە بێ ویستی خۆ سۆفی تێی دەکەوێت.

حاڵیش دیسانەوە بەخششێکی خوداییە کە لە جیهانی باڵاوە جاروبار بۆ دڵی ڕێبواری تەریقەت دادەبەزێ و کاتییە.

های و هو: هایهو، مەبەست لەو وتانەیە کە لە کاتی جەزبە و حاڵدا دەگوترێت.

در: دەرگا      در ببست: دەرگای داخست

بەیتەکە بەتەواوی پەیوەندی بە عیرفان و سۆفیگەرییەوە هەیە و جیاوازییەکەشیان تا رادەیەکی کەم دەخاتەڕوو، بێگومان عیرفان لە نێو سۆفیگەریدا سەرهەڵدەدات، بەڵام سۆفیگەری بەردەوام مانا جوان و حەقیقییەکانی خۆی لەدەستدەدات و لە تەریقەتی روحییەوە دەگۆڕێت بۆ هەندێ دروشمی سەرزارەکی و دەبێتە هۆکارێك بۆ مەرامی دیکەی وەك دەستخستنی پلەوپایە و پارە و سەروەت و سامان و... هتد. هەربۆیەشە تا رادەیەکی زۆر پابەندبوون پێیەوە پابەندبوونێکی رووکارییە و لە کاتی دەرکەوتنی هەر ئاسۆیەکدا ڕێبوارانی راستەقینەی ڕێگەی تەریقەتی راستەقینە هەست بەو کەم وکورتییە دەکەن، بۆیە شاعیر پێی وایە هەرکە مۆسیقاژەن یاخود ڕێبواری یەکەمی عیرفان یاخود هەر داینەمۆ و جوڵێنەرێکی عیرفانی دەرکەوت، گشت پەردە و دەمامکەکان هەڵدەگیرێن و ڕێبواران ئەبڵەق دەبن، بۆیە دەڵێ: مۆسیقاژەن چ ئاوازێکی ژەند وابووە هۆی ئەوەی کە ئەهلی وەجد و حاڵ لە (های هو) بکەون و بێدەنگ بن.

بێگومان ئەوان ـ سۆفییەکان ـ چاکتر لە عارفەکان تێدەگەن بۆیە کاتێ عارفێك، سۆفییەکی راستەقینە ئاوازێکی حەقیقی دەژەنێت زاریان دەبەسترێت و مەراسیمی خۆشی و سروری وەجد رادەگرن.

بەیتەکە ئاماژەیەکی تێدایە بۆ گەورەیی عیرفان و تانەیەکیشە بۆ سۆفیگەری رواڵەتی.



**٧- حافظ هر آنکه عشق نورزید وصل و خواست**
**احرام طوف کعبهء دل بی وضو ببست**

**هافز هەرانکە ئیشق نەڤەرزید و ڤەسل خاست، ئیهرامی تۆوفی کەئبەیی دل بی ڤوزو ببەست.**

حافز ئەوەی کە مەرجی نەزانی و داوای دیدار و وەسڵی کرد، بێ دەستنوێژ ئیحرامی تەوافی کەعبەی دڵی بەستووە.

عشق ورزیدن: عەشقکردن، عاشق بوون      خواست: ویستی، داوایکرد
طوف: تەواف، سوڕانەوە      طوف کعبه: تەوافی کەعبە
طوف کعبهء دل: تەوافی کەعبەی دڵ      وضو: دەستنوێژ
بی وضو: بێ دەستنوێژ

احرام ببست: ئیحرامی بەست، ئیحرام بەستن واتە نییەتی حەج کردن، جل و بەرگی تایبەتی حەج لەبەرکردن.

بێگومان یەکێ لە مەرجەکانی تەواف و ئیحرامبەستن ئەوەیە کە پێویستە حاجی بە دەستی بە دەستنوێژەوە تەواف بکات ئەگەرنا دروست نییە، حافزیش پێیوایە کە پێویستە (کەعبەی دڵ)یش تەواف بکرێت و لە کاتی ئیحرام بەستنی ئەم تەوافەشدا تەواوی مەرجەکانی تەوافی کەعبە دەستەبەر بکرێت، کە گرنگترینیان عاشق بوونە بە مەرجە عیرفانییەکانییەوە کە خۆگرتنەوە و بەرگەگرتنی نارەحەتییەکانی ڕێگەیە، ئەمە عاشق بوونە و هەر ئەم عەشقەیە کە دەستنوێژی تەواف و دیداری دڵە، یاخود کەعبەی عەشقی عارفانەیە، بۆیە بەبێ ئەم دەستنوێژی عەشقە دیدار و ژوان نایەتە جێ. هەروەك چۆن تەوافی ماڵی خوا بەبێ دەستنوێژ دروست نییە.

گرێدانەوەیەکی زۆر جوان لە نێوان مانای بەیتەکاندا هەیە. چونکە سەرەتا باس لە نهێنی و رازە عیرفانییەکانی مەعشوق دەکرێت و بەختکردنی گیانی عاشقان بە مەرجی کرانەوەی ئەم نهێنییانە دەزاندرێ پاشان لە جوانییەکانی ساقی و عەشقی ساقی و لەزەت و چێژەکانی عەشقی عیرفانی دەدوێ، و دواتریش قسە لە عەشقە بێ دەستنوێژەکانی ئەهلی تەریقەت دەکات کە خیانەت لە عەشق دەکەن و دواجار بە ئاشکرا دەڵێ: عەشقێك کە گیانی لە پێناودا بەخت نەکرێت بە دیدار کۆتایی نایەت، چونکە لە ئیحرامی بێ دەستنوێژی حاجی دەچێت کە لە شەریعەت و فیقهدا رەفز دەکرێتەوە.

## غەزەلی چل و چوارەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- خدا چو صورت ابروی دلگشای تو بست**

**گشاد کار من اندر کرشمەهای تو بست**

**خودا چو سورەتی ئەبروی دلگوشای تو بەست، گوشادی کاری مەن ئەندەر کریشمەهای تو بەست.**

ئەوکاتەی خودا شێوەی برۆی دڵکەرەوەی تۆی کێشا، کرانەوەی کاری منی بە غەمزەکانی تۆوە بەستەوە.

دلگشا: دڵکەرەوە، شتێ دڵ پێی بکرێتەوە    بست: کێشا    گشاد: کرانەوە

کرشمە: ناز و خەمزە، ئیشارەتی چاو و برۆ    بست: بەستەوە

هەر لەوکاتەوە کە خودا برۆی تۆی دروستکرد کە مایەی کرانەوەی دڵە و دڵ بە بینینی شادی و خۆشی تێدەکەوێت، کرانەوە و ئاڵۆزبوونی کاری منی بە ئیشارەتی چاو و برۆی تۆوە بەستەوە. دەکرێ لێرەدا مەبەست لەوە بێ کە تۆ برۆت کرایەوە کاری منیش سادە دەبێت و دەکرێتەوە، بەڵام کە تۆ برۆ تێکنێی کاری منیش ئاڵۆز و داخراو دەبێ یاخود من بە ئاماژەی برۆی تۆ دەجولێمەوە.

**٢- مرا و سرو چمن را به خاك راه نشاند**

**زمانه تا قصب زركش قباى تو بست**

**مەرا ڤو سەرڤی چەمەن را بە خاکی راه نیشاند، زەمانە تا قەسەبی زەرکەشی قەبای تو بەست.**

لەوکاتەوەی زەمانە پشتوێنی سیمداری کراسی تۆی بەست من و دارسەرووی باخی بەدبەخت کرد.

خاك راه: خاکی رێگە    نشاند: دانیشاند

بە خاك راه نشاند: لە سەرەرێدا داینایین، ئەم دەربڕینە لە فارسیدا بە مانای بەدبەخت و ریسوا، بێ نەوا و ماڵوێران، بێ هێزو لاوازە ـ کە (بە خاك سیاه نشاندن)یش بەکاردێت ـ قصب: نەی، پارچەی ئاوریشم و کراسێك کە لەم پارچەیە دوورابێت    زرکش: سیمدار



قبا: کراسێکی درێژی بێ یەخەیە کە پێشەوەی کراوەیە وەك جبە و بە پشتوێن دەبەسترێت یاخود بە قۆپچە و دوگمە.

قصب زرکش قبا بستن: واتە پشتوێنی سیمداری کراس بەستن، هەروەها بە واتای پشتوێن بەستن یاخود شاڵ پێچان لەسەر دێت، کە بۆ رازاندنەوە و گەورە سەیرکردن بەکاردێ

واتە: لەوکاتەوەی زەمانە پشتوێنی زێرین و سیمداری کراسی تۆی بەست هێندە جوان و دڵڕفێن بوویت کە من لە عەشقدا و دارسەرووی بە جوانی ناسراویش لە شەرم و خەجاڵەتیدا بێچارە و بەدبەخت بووین.

لە شەرحی (سودی) و لە نوسخەی (عەلامە قەزوینی و د. غنی) دا میسراعی دووەم بەم شێوەیە (**زمانه تا قصب نرگس قباى تو بست**) . سودی بە شێوەیەکی روون و بەدرێژی لە بارەی (نرگس قبا) یاخود (نرگسین قبا)وە دواوە کە بە پێویستی دەزانم بۆ روونکردنەوەی مەبەستەکە لێرەدا بینووسینەوە ئەو دەڵێ: " نرگسین قبا ـ کراسی نێرگسی، جۆرە کراسێکە، نزیکەی چل ساڵ لەمەوبەر ـ سەردەمی خۆی ـ ، لەم جۆرە کراسەم لە بەری یەکێ لە بەگزادەکانی گورجیدا بینی لە ئەرزرۆم ـ پرسیارم لە یەکێ لە نۆکەرانی کرد بەم جۆرە کراسە دەڵێن چی، گوتی بەمە دەڵێن: کراسی نێرگسی، چونکە پێشتریش لە لێکۆڵینەوە لەم بەیتەدا و سەبارەت بە کراسی نێرگسی و پشتوێنی ئەو کراسە زۆرم لە مامۆستاکەم بیستووە لە بینینی بەدواوە بە تەواوی بۆم روونبوویەوە کە چ جۆرە کراسێکە و چۆن لەبەر دەکرێت و بە پشتوێنی تایبەتی خۆی دەبەسترێتەوە. کراسی نێرگسی پشتوێنی تایبەتی خۆیی هەیە کە لە ناو خۆیدایە تەقریبەن وەك بەندوخێنی شەرواڵی کۆن ـ وەك قەیتانی پاڵتۆی ئێستا کە لە کەمەردایە (تێبینی) ـــ هەردوو سەری پشتوێنەکەش جاروبار بە سیم و زەڕ یاخود بە ئاوریشم دەرازێنرێتەوە.." {سودی، ج١، ل٢٣٩}.

بەم روونکردنەوەیەش مانای بەیتەکە لە سودیدا دەبێتە زەمانە کاتێ پشتوێنی کراسی نێرگسی تۆی بەست من و سەرووی باخی خستە سەرسورمان و شڵەژاوییەوە.

**٣- ز كار ما و دل غنچه بس گره بگشود**

**نسيم گل چو دل اندر پى هواى تو بست**

**ز کاری ماڤو دلی غونچە بەس گرەه بگشود، نەسیمی گول چو دل ئەندەر پەیی هەڤای تو بەست.**

لە کاتێکەوە بۆنی گوڵ دڵی بە تۆدا، گرێی زۆری لە کاری ئێمە و دڵی خونچەدا کردەوە.

بس: زۆر    اندر پی هوای تو بست: هەوای تۆی کەوتە سەر، عاشقی تۆ بوو

دەڵێ: لەوکاتەوەی کە شەماڵ و بۆنی گوڵ دڵی بە تۆ داوە و حەزی لە تۆکردووە، سەدان گرێی کاری من و گرێی دڵی خونچە کراوەتەوە.

چونکە ئاشکرایە کە خونچە گەر بێت و شەماڵ لێی بدات بە زوویی دەکرێتەوە، بۆیە بە یار دەڵێ: هێندە خاوەن کەرامەتی، کە لەو کاتەوەی شەماڵ عاشقت بووە بە هۆی هەڵکردنی ڕۆژانەی ئەوەوە گرێی کاری من و دڵی خونچە کراوەتەوە واتە من بە هۆی ئەوەی هەموو جارێ شەماڵ لە کۆڵانەوە بۆنی تۆم بۆ دەهێنێ، گرێ زۆرەکانی دەروونم کراوەتەوە و خونچەش بە هۆی هەڵکردنی شەماڵەوە بووەتە گوڵ و گرێی دڵی کراوتەوە.

**٤-مرا به بند تو دووران چرخ راضی کرد**

**ولی چه سود که سررشته در رضای تو بست**

**مەرا بە بەندی تو دۆورانی چەرخ رازی کەرد، ڤەلی چە سود کە سەرریشتە دەر ریـزای تو بەست.**

ڕۆژگار منی رازی کرد لە بەند و داوی تۆدا بێنمەوە، بەڵام چ سوودێك دەبەخشێ کە سەرەداوی ئەسڵی دایە دەست ڕەزامەندی تۆ.

بند: بەند، بەندەیی          دووران چرخ: فەلەك، هێزی گەردوون

رضی: رازی          ولی: بەڵام   سر رشتە: ئەسڵی کارەکە، سەرەداوەکە

واتە: من رازیبووم کە لە بەند و داوی تۆ دابمێنمەوە یاخود من رازی بووم کە بەندە و عاشقی تۆبم، بەڵام ئەم رازیبوونەی من چ سوودێکی هەیە لە کاتێکدا گرنگ ئەوەیە کە تۆ رازی ببیت. چونکە هەرخودی فەلەك کە منی رازی کرد بە بەندەیی تۆ شەرتی ئەسڵی کارەکەی دایە دەست ڕەزامەندی تۆ، دیسانەوە واتە من رازی بووم هەمیشە بەندەی تۆ بم و لە عەشق و سووتانی تۆدا بژیم و هەرگیز لێی دەرنەچم و هەمیشە لە حاڵی عیرفانیدا بژیم، بەڵام ئەمە چ سوودێکی هەیە لە کاتێکدا ئەسڵی کارەکە ئەوەیە تۆ بەمە رازی بیت نەوەك من.

**٥-چو نافه بر دل مسکین من گره مفکن**

**که عهد با سر زلف گره‌گشای تو بست**

**چو نافە بەر دڵی مسکینی مەن گرەه مەفکەن، کە ئەهد با سەری زولفی گرەهگوشای تو بەست.**

وەك نافە گرێیەك مەخەرە سەردڵی هەژارم، کە لەگەڵ سەری زوڵفی گرێ کەرەوەی تۆدا پەیمانی بەستووە.

گره: گرێ          گره مفکن: گرێ مەخەرە، واتە دڵگران، دڵتەنگ



گرەگشا: گرێ کەرەوە، چارەسەری کێشە و گرفتەکان

زلف گرەگشای: پرچێك کە گرفتەکانی عاشق چارە دەکات

شاعیر دڵی هەژار و هیلاکی خۆی بە (نافە) دەچوێنێت و بە یار دەڵێ: هەژاری من وەك نافە گرێ مەدە و دڵتەنگم مەکە، چونکە ئەم دڵە هەژارەی من پەیمانی وەفای لەگەڵ سەری پرچی تۆدا بەستووە کە کێشەکان چارە دەکات واتە تۆ لە بری ئەوەی دڵتەنگم بکەیت بە نهێنییە ئیلاهییەکان، دڵخۆشم بکە کە دڵی هەژارم پەیمانی وەفای لەگەڵ ئەوانەدا بەستووە کە دەبنە مایەی چارەکردنی کێشەکان و کردنەوەی دڵەکان.

**٦-تو خود حیات دگر بوودی ای نسیم وصال**

**خطا نگر که دل امید در وفای تو بست**

**تو خود هەیاتی دیگەر بوودی ئەی نەسیمی ڤیسال، خەتا نیگەر کە دل ئومید دەر ڤەفای تو بەست.**

ئەی شەماڵی ژوان ـ دیدار ـ تۆ خۆت بۆ من ژیانێکی دیکە بوویت، سەیری هەڵە بکە کە دڵ ئومێدی بە وەفاداری تۆ بەستەوە.

حیات: ژیان    حیات دگر: ژیانێکی دیکە گەر (دیگر) بە کەسێکی دیکە لێك بدەینەوە (وەك سودی ج١ ل٢٤٢) ئەوا دەبێتە ـ ژیانی کەسێکی دیکە ـ نسیم وصال: شەماڵی ژوان، سەرەتای دیدار و وەسڵی یار واتە سەرەتاکانی یەکەمین ژوان وەك ئاماژە و نامە و قسە و خەندە و بزە (بە رای د. هروی ج١ ل٢٠٨)    خطا: هەڵە    خطا نگر: سەیری هەڵە بکە.

گەر (حیات دگر) بە هەر مانایەك لێکدرێتەوە ئەوا ژیانێکە کە پەیوەست نییە بە شاعیرەوە یاخود شاعیر تیایدا ناژی بۆیە دەڵێ: ئەی شەماڵی دیدار و ژوان تۆ بۆ خۆت ژیانێکی دیکەبوویت جودا لە ژیانی ئێمە. بەڵام هەڵەی من لەوەدابوو کە دڵم بە وەفای ئەم شەماڵەوە بەسترابوویەوە و ئومێدی پێی هەبوو.

**٧-ز دست جور تو گفتم ز شهر خواهم رفت**

**به خنده گفت که حافظ برو که پای تو بست**

**ز دەستی جۆوری تو گوفتەم ز شەهر خاهەم رەفت، بە خەندە گوفت کە هافز بـرو کـی پای تو بەست.**

گوتم لە تاو زوڵمی تۆ لە شار دەڕۆم، بە خەندەوە گوتی حافز کێ پێی تۆی بەستووە بڕۆ.

جور: جەور، زوڵم          شهر: شار          خواهم رفت: دەڕۆم (لەداهاتوودا)

کە: یەکەمجار بە مانای (کە) دێت، بەڵام دوەم جار بە واتای (کێ) دێت

پای بست: قاچ بەستنەوە، ڕێگەگرتن.

شاعیر دەڵێ: بە یارم گووت تۆ ستەمی زۆرم لێ دەکەیت و ڕۆژێك لە دەستی ستەمی تۆ لە شار دەڕۆم و بەجێی دەهێڵم، بەڵام یار بە خەندەوە گوتی: کێ ڕێگەی لێ گرتووی جا بۆچی ناڕۆیت. واتە: تۆ خۆت ناتوانی لەم شارە بڕۆیت ، هەرچەندە یار ستەم و زوڵمت لێ بکات دڵت نایە بڕۆیت ئیتر ناز مەکە و ئەگەر ڕاست دەکەی بڕۆ، بەڵام دڵنیام کە ناتوانی بڕۆیت و واز لە شاری عەشق بهێنی.



## غەزەلی چل و پێنجەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- بە جان خواجە و حق قدیم و عهد درست**

**کە مونس دم صبحم دعای دولت تست**

**بە جانی خاجەڤو هەقی قەدیم و ئەهدی دروست، کە مونیسی دەمی سوبهەم دوئای دۆولەتی توست.**

بە گیانی سەروەر و حەقی دۆستی قەدیمی و پەیمانی ڕاست، هاوڕێ و هاودەمی کاتی بەیانیانم دۆعا و نزای بەختی باش وخۆشبەختی تۆیە.

خواجە: سەروەر، گەورە، ئاماژەیە بە گەورەیەك کە حافز لێی ڕازی بووە و (سودی) پێیوایە کە مەبەست لە خواجە (قوام الدین حسن)ە {ج١، ل٢٠٩}

حق قدیم: حەقی دۆستی قەدیمی، لێرەشدا بە ڕای (سودی) مەبەست لەو دۆستایەتیەیە کە لە نێوان (قوام الدین) و (حافز)دا هەبووە وەك دەڵێ: مەبەست لە (حق قدیم) ئەوەیە کە خواجە قوام الدین لە تەواوی تەمەنیدا بەسەر حافزدا هەیبووە {هەمان}

عهد درست: پەیمانی ڕاست، پەیمانی دۆستایەتی بێ درۆ

مونس: هاودەم، لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی کارێکەوە دەبێتە خو

دم صبح: سەحەرگاهان، کاتی بەیانیان

تست: لێرەدا کورتکراوەی (تو است)ە واتە (تۆیە)

حافز ستایشی خواجەیەك، سەروەرێك دەکات کە لای ئەو ڕێزێکی زۆری هەبووە. دەڵێ:

سوێند بە گیانی ئەو گەورەیە یاخود سوێند بە خودا و بە دۆستایەتی و حەقی ئەو بەخشندەییەی کە لە کۆنەوە بەسەر منەوە هەتە و بە پەیمانی دروست، هەموو بەیانییەك دۆعای سەرفرازای و بەختی باشت بۆ دەکەم بە شێوەیەك ئەم دۆعاکردنە بووەتە خوویەك و لەگەڵیدا ڕاهاتووم، وەك هاودەمی بەیانیانی لێهاتووە.

**٢- سرشك من كە ز طوفان نوح دست ببرد**

**ز لوح سینە نیارست نقش مهر تو شست**

**سریشکی مەن کە ز توفانی نوه دەست ببوورد، ز لۆوهی سینە نەیارست نەقشی میهری تو شوست.**

فرمێسکی من کە پێش تۆفانی نوح کەوت، نەیتوانی لە لەوحی سینەدا وێنەی خۆشەویستی تۆ بشواتەوە.

سرشك: فرمێسك    دست بردن: پێشکەوتن، سەرکەوتن، زاڵبوون، بردنەوە
نیارست: نەیتوانی    نقش مهر: وێنەی خۆشەویستی، لێرەدا مەبست لە خودی عەشقە
شست: شووشت

شاعیر فرمێسکی خۆی لە تۆفانی نوح بە گەورەتر دەزانێت و دەڵێ: ئەم فرمێسکەی من کە لە زۆریدا لە تۆفانەکەی نوح گەورەترە و پێشکەوتووە لە کاتێکدا ئەو تۆفانە هەموو دنیای سڕیەوە و شۆردەوە کەچی ئەم فرمێسکە زۆرەی چاوانی من کە لە تۆفانەکەی نوحیش زیاترە یاخود لەو درێژخایەن ترە، نەیتوانی رەسم و وێنەی خۆشەویستی و عەشقی تۆ لە دڵی مندا بشواتەوە و بسڕێتەوە. واتە لەگەڵ ئەوەی دەرد و عەزابێکی زۆرم دیوە و فرمێسکی زۆرم باراندووە کەچی عەشقی تۆم لە دڵ دەرناچێ.

**٣- بکن معاملەیی وین دل شکستە بخر**

**کە با شکستگی ارزد بە صدهزار درست**

**بکون موئامەلەیی ڤین دلی شکەستە بخەر، کە با شکستەگی ئەرزەد بە سەدهەزار دروست.**

مامەڵەیەك بکە و ئەم دڵەشکاوە بکڕە، کە بە شکاویش سەد هەزار (دروست) دەهێنێ.

شکستە: شکاو    بخر: بکرە    شکستگی: شکاوی    ارزد: دەیهێنێ، دەیکات.

(درست) دوو مانای هەیە کە هەر مانایەکیشیان مانای میسراعەکە دەگۆڕێت. بەڵام لە بنەڕەتدا هەمان مانایە، لە یەکەمیاندا (دروست) بە مانای نەشکاو، ساغ دێت و مانای بەیتەکە دەبێتە:

مامەڵەیەك بکە و ئەم دڵەشکاوەی من بکڕە، چاك بزانە کە زەرەرناکەیت، چونکە ئەم دڵە شکاوەی من بەم شکاوییەش سەدهەزار دڵی نەشکاو دەهێنێ.

لە مانای دووەمدا (درست) جۆرێکە لە جۆرەکانی ئاڵتون، (درست مغربی) واتە ئاڵتونێك کە لە مەراکیش و مەغریب دروست کرابێت، بەمەش مانای بەیتەکە دەبێتە: مامەڵەیەك بکە و ئەم دڵە شکاوەی من بکڕە، چونکە ئەم دڵە شکاوە بەم شکاویەشەوە سەد هەزار ئاڵتونی جۆری (دروست) دەهێنێ.



لە هەردوو بارەکەدا مەبەستی شاعیر ئەوەیە کە دڵی خۆی زۆر بە نرخ و بەهایە و هەرکەس مامەڵەیەك بکات و ئەو دڵە بکڕێت یاخود ئەو دڵەشکاوە رازی بکات لە سەد هەزار دڵی نەشکاو یاخود سەد هەزار سکەی ئاڵتونی دروست چاکترە بۆی.

دەبێ ئەم دڵەشکاوە بەهای لە کوێوە وەرگرتبێ، بێگومان دڵی شکاو هەمان دڵی عارفە کە هەر لە جودایی سەرەتاییەوە شکاو و مەلولە. بەڵام دڵانێك کە ئەم هەستەیان نییە بێ بەهان یاخود هەمان ئەو دڵەشکاوانەیە کە جێگەی جیلوەگرتنی خودایە، چونکە عارفەکان پێیان وایە کە خودا لە دڵەشکاوەکاندا جیلوە دەکات، هەروەك لە فەرموودەشدا هاتووە (انا عند المنکسرة قلوبهم لاجلی) بێگومان عارفەکانیش لە پێناو خودا دڵیان شکاوە هەربۆیەش ئەم دڵە شکاوانە سەد هەزار دڵی نەشکاو دەهێنن.

لەم روانگەیەوە شاعیریش دەڵێ: مامەڵەیەك بکە و ئەم دڵە شکاوە بکڕە و بەدەستی بێنە، چونکە بەها و نرخی زۆرگرانە و لە سەد هەزار سکەی ئاڵتون یاخود سەد هەزار دڵی نەشکاو (بێ ئاگا) بە قیمەت ترە.

**٤- ملامتم بە خرابی مکن کە مرشد عشق**

**حوالتم بە خرابات کرد روز نخست**

**مەلامەتەم بە خەرابی مەکون کە مورشیدی ئیشق، هەڤالەتەم بە خەرابات کەرد روزی نوخوست.**

سەرزەنشتی ئەوە مەکە کە سەرخۆش و خەرابم، چونکە رابەری عەشق هەر لە رۆژی یەکەمەوە منی حەواڵەی خەرابات کردووە.

ملامت: سەرزەنشت    خرابی: مەستی، خراپەکاری رێگەی عەشق    مرشد: رابەر، مورشید، رێگەپیشاندەر    حوالت: حەواڵە، ناردن    خرابات: مەیخانە، جێگەی ژوانی عەشق
نخست: یەکەم    روز نخست: رۆژی یەکەم

حافز پێیوایە کە هەر لە رۆژی یەکەمەوە لە سەرەتای وجود و بوونەوە مورشید و رابەری عەشق ئەمی فێری عەشق کردووە و ئیدی ئێستاش ئەم کاروبارەی عەشق یاخود ئەم هەنگاوانەی عەشق لەخۆوە نانێت و نابێت ببنە مایەی سەرزەنشتی، چونکە کاری رابەری عەشقەکە ئەکرێ خودا بێت.

لەلایەکی دیکەوە گەر (خرابات) بە دونیا لێکدرێتەوە ئەوا دونیا کۆمەڵێك کاری تێدا ئەنجامدەدرێ کە شیاو و لایقی خودی دونیا بێت، منیش کە کۆمەڵێ کار ئەنجام دەدەم کە

شیاوی ئەم خەراباتەیە سەرزەنشتم مەکە، چونکە بە ئارەزووی خۆم نەهاتووم و رابەری عەشق هەر لە رۆژی یەکەمەوە حەواڵەی ئەم خەراباتەی کردم.

وەك (د.هروی) زۆرجار جەخت لەسەر ئەم رایە دەکاتەوە لێرەشدا دەڵێ (پێیوایە کە جەبرییەتی چارەنووس ئەمی بەم شێوەیە لێکردووە بۆیە دەڵێ: لەوەی کە خەرابم سەرزەنشتم مەکەن، چونکە ئەوەی کە بەپێی ویستی خودا ئەنجام دراوە لە ئارەزووی من بەدەر بووە) {ج١، ل٢١١} .

بە رای بەندە زیاتر مەبەست لەوەیە کە سەرزەنشتم مەکە لەوەی عاشقم و عارفم، چونکە هەر لە رۆژی یەکەمەوە مورشیدی عەشق منی حەواڵەی خەراباتی عەشق کردووە.

**٥- زبان مور به آصف درازگشت و رواست**

**که خواجه خاتم جم یاوەکرد و باز نجست**

**زەبانی مور بە ئاسەف دراز گەشت و رەڤاست، کە خاجە خاتەمی جەم یاڤەکەرد و باز نەجوست.**

زمانی سەرزەنشتی مێرووڵە لە (ئاسەف) کرایەوە و رەوایە، چونکە خواجە ئەنگوستیلەی جەمی ونکرد و هەوڵی دۆزینەوەشی نەدا.

زبان: زمان    مور: مێرووله

آصف: ئاصەف، ئاسەفی کوڕی بەرخیا کە وەزیری حەزرەتی سولەیمان بوو

درازگشت: درێژبوو (زبان درازگشتن) زمان درێژبوون، بێ شەرم قسەکردن و سەرزەنشت کردن، زمانکرانەوە    رواست: رەوایە، حەقی خۆیەتی    خاتم: ئەنگوستیلە

جم: لێرەدا مەبەست لە سولەیمانە    خاتم جم: ئەنگوستیلەی حەزرەتی سولەیمان

یاوەکرد: ون کرد، لەدەستیدا، زایعی کرد    نجست: هەوڵی دۆزینەوەی نەدا

بەیتەکە ئاماژەیە بە ونبوونی ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان کە بە هۆی ئەو ئەنگوستیلەوە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکا، دەڵێن: خێوێك ئەو ئەنگوستیلەیەی دزیوە و ئەو خێوە چل رۆژ لە جێی سولەیمان دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، بەڵام چونکە بوونیادی پادشایی بە هۆی ناوی (اعظم)ەوە بوو کە لە ئەنگوستیلەکە هەڵکۆڵرابوو ئەو ناوەش لەلایەن خێوەکەوە نەدەدۆزرایەوە و بۆیە ئەنگوستیلەکەی فرێدایە دەریا و ماسییەك ئەنگوستیلەکەی قوتدا و هەر ئەو رۆژە ئەو ماسییە کەوتە داوی راوچییەوە و راوچییەکەش ماسییەکەی دایە سولەیمان. کاتێ حەزرەتی سولەیمان ئەنگوستیلەکەی دەستکەوتەوە دەسەڵاتی کەوتەوە دەست {سودی، ج١، ل٢١٤، پەراوێزی ٢}



لێرەدا ئاماژە بەوەیە کە وەزیرەکە بووەتە هۆی ونبوونی ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان و لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی پەیداکردن و دۆزینەوەشی نەدا بۆیە مێرووڵە زمانی درێژکردو کەوتە سەرزەنشتی خواجەی وەزیر و ئەمەش حەقی خۆیەتی و لەجێی خۆیدایە.

وەك (هروی) دەڵێ: شاعیر لە دەقی چیرۆکەکە دەرچووە و بە شێوەیەکی گشتی مێرولەی بە سیمبوول و رەمزی لاوازی داناوە و درکەیە لە خودی شاعیر و ئاسەفی بە سیمبوولی وەزیر و ئەنگوستیلەکەشی بە سیمبوولی شتی گرانبەها داناوە و درکەیە لە دڵی خۆی، دەیەوێ بڵێ: وەزیر دڵی منی شکاند و دڵیشی نەهێناوە جێی خۆی، بۆیە زمانی من بەرامبەر بەو کرایەوە و حەقی خۆشمە.

**٦- دلا طمع مَبُر از لطف بی نهایت دوست**

**چو لاف عشق زدی سر بباز چابك و چست**

**دڵا تەمەع مەبوڕ ئەز لوتفی بی نیهایەتی دوست، چو لاف ئیشق زەدی سەر بباز چابووك و چوست.**

ئەی دڵ لە لوتفی بێ کۆتایی دۆست بێ ئومێد مەبە، چونکە لافی عەشقت لێدا چوست و چالاك سەری خۆت فیداکە.

طمع مبر: بێ ئومێد مەبە    لاف زدن: لاف لێدان، ئیدیعاکردن

سر بباز: سەربەخت کە، سەرت دانێ    چابك: چالاك

چابك و چست: چوست و چالاك

یەکێ لە بنەما گرنگەکانی رێگەی عەشق گەیشتنە بە دوا قۆناغەکانی ئەو رێگەیە و سەروگیان بەختکردنە لە پێناویدا، لێرەدا شاعیر جارێکی دیکە ئەم بنەمایە بیری دڵی خۆی دەخاتەوە و دەڵێ: ئەی دڵ تۆ بێ ئومێد مەبە لە لوتف و رەحمی بێ کۆتایی دۆست و یاری عیرفانی و سەروگیان بەختکە. چونکە تۆ لافی عەشقت لێداوە و خۆت بە عاشق دەزانی و ئەمەش یەکێ لە بنەماکانی عەشقە. بێگومان بە کە مەعشوق ـ خوداـ لوتفی خۆی لەسەر تۆکەم ناکاتەوە و ئەمەش وابەستەی ئەو هەوڵانەیە تۆ لە رێگەی عەشقی ئەودا دەیدەیت.

**٧- به صدق کوش که خورشید زاید از نفست**

**که از دروغ سیەروی گشت صبح نخست**

**بە سیدق کوش کە خورشید زایەد ئەز نەفەسەت، کە ئەز دروغ سیەهرِوی گەشت سوبهی نوخوست.**

بە راستگۆیی و راستی هەوڵبدە تا لە هەناسەت هەتاو هەڵبێ، چونکە لە ئەنجامی درۆوە گزنگی درۆزن (صبح کازب) رورەش و ریسوا بوو.

بەصدق: بەراست، بەراستگۆیی   کوش: کۆشش بکە، هەوڵبدە   خورشید: هەتاو، خۆر
زاید: لەدایك بێت، لێرەدا مەبەست لە هەڵهاتن و دەرکەوتنی هەتاوە   نفس: هەناسە، گوفتار
دروغ: درۆ   سیەرو: روسیا، روو رەش، رسوا   گشت: کارێکی بێ هێزە بە واتای (بوو)
نخست: یەکەم، سەرەتا

صبح نخست: بەرەبەیان، گزنگی یەکەم، هەروەها گزنگی درۆزن (صبح کاذب)یشی پێدەگوترێت، پێش رووناکبوونەوەی دونیا و هەڵهاتنی رۆژ ئاسۆ دووجار رووناك دەبێتەوە، رووناکبوونەوەی یەکەم نابێتە مایەی خۆرهەڵاتن و دووبارە تاریك دەبێتەوە بۆیە پێی دەگوترێ گزنگی درۆزن، بەڵام رووناکبوونەوەی دوەم ئیدی هەتاو هەڵدێت بۆیە پێی دەگوترێ گزنگی راستگۆ.

لە خەیاڵی شاعیردا روح کراوە بە بەری ئەم گزنگانەدا و هۆی رەشبوون و تاریکبوونی گزنگی یەکەم بۆ درۆزنی ئەو دەگێڕێتەوە و وا دەزانێ ئەو درۆیەی بووەتە هۆی رووڕەشبوونی و راستگۆیی گزنگی دووەمیش بووەتە هۆی هەڵهاتنی هەتاو کە دنیای داگیر کردووە.

بۆیە دەڵێ: تۆش گەر دەتەوێ هەتاو هەڵبێ یاخود قسەکانت وەك رۆژ بە هەموو جێگە و شوێنێکی دونیادا بلاوببنەوە و راستگۆ بە و بە راستی هەوڵ بدە، چونکە گەر درۆزن بیت سەرەنجام و چارەنووست وەك گزنگی درۆزن دەبێ کە لە ئەنجامی درۆزنییەوە رووڕەش و رسوا بوو.

**٨- شدم ز دست تو شیدای کوه و دشت و هنوز**

**نمی کنی به ترحم نطاق سلسله سست**

**شودەم ز دەستی تو شەیدای کوە و دەشت و هەنوز، نەمی کونی بە تەرەهەوم نیتاقی سیلسیلە سوست.**

بەدەستی تۆ شەیدا و دێوانەی کێو و دەشت بووم هێشتا رەحم پێ ناکەیت و بەندی زنجیرەکەم شل ناکەیت.

ز دست تو: بە دەستی تۆ، بە هۆی تۆوە   شیدا: شێت، دێوانە   کوە: کێو
هنوز: هێشتا   نطاق: بەند، گرێ   سلسله: زنجیر   سست نمیکنی: شل ناکەیت

شاعیر جۆرێك لە گلەیی لە یار دەکات و دەڵێ: بە هۆی عەشقی تۆوە و بە دەستی تۆ شێت و دێوانەی کێو و دەشتان بووم و عەقڵ لە سەرمدا نەماوە، کەچی تۆ ئێستاش یاخود بەم حاڵەشەوە هێشتا بەند و گرێی زنجیرەکەم شل ناکەیت تا، بەڵکو بێتەوە سەر رێگەی عەقڵ، لێرەدا ئەو زنجیرەی کە شاعیری بەستۆتەوە بە یارەوە زنجیری خۆشەویستی و عەشقی یارە و هەر



ئەم زنجیرەیە کە عەقڵی لێ سەندووە و ئاوارە و شێتی بیابان و کێوانی کردووە، بەمەش شاعیر گلەیی دەکات کە لەگەڵ ئەم سووتانەی مندا تۆ رەحم پێ ناکەیت و ئاوڕم لێ نادەیتەوە.

**٩- مرنج حافظ و از دلبران حفاظ مجوی**

**گناه باغ چه باشد چو این گیاه نرست**

**مەرەنج هافز و ئەز دولبەران هیفاز مەجوی، گوناهی باغ چە باشەد چو ئین گیاە نەروست.**

حافز داوای وەفاداری لە دولبەران و یاران مەکە و لەمەش مەرەنجێ، کاتێ ئەم گیایە (گیای وەفادرای) نەڕوا گوناهی باغ چییە.

مرنج: مەرەنجێ، عاجز مەبە، دڵگران مەبە   حفاظ: وەفاداری، پەیمان
مجوی: داوا مەکە   رست: رووا   نرست: نەڕووا، سەوز نەبوو

بێگومان لە عەشقدا هەمیشە دولبەران و یاران بە بێ وەفا لە قەڵەم دەدرێن. بەڵام لێرەدا حافز بیرێکی نوێ دەخاتە سەر ئەم بۆچوونە و ئەویش نەڕەنجانە لەم جۆرە بێ وەفاییە، چونکە دولبەران هەر لە سەرەتاوە درەختی وەفا یاخود گیانی وەفایان تێدا نەڕواوە و خەتای خۆیان نییە.

لە میسراعی یەکەمدا دەکرێ نەڕەنجانی حافز لە خودی دولبەران بێت یاخود لەوەبێ کە دولبەران بێ وەفان، بۆیە دەڵێ: حافز مەرەنجێ و داوای وەفا و وەفاداری لە یاران یاخود لە دولبەران مەکە، چونکە ئەوانە هەر لە ئەزەلەوە گیانی وەفایان تێدا سەوزنەبووە و لەگەڵ دروستبوونیاندا وەفادار نەبوون و ئەم بێ وەفاییەش خەتای خۆیان نییە. هەروەك ئەوە وایە کە باخێك گیایەکی تێدا نەبێ کە گوناهی نییە و باخەوانەکە نەیناشتووە.





## غەزەلی چل و شەشەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- رواق منظر چشم من آشیانەء تست**

**کرم نما و فرودآ که خانه خانەء تست**

**رەڤاقی مەنزەری چەشمی مەن ئاشیانەیی توست، کەرەم نوما و فرودئا کە خانە خانــەیی توست.**

هەیوان و پاساری گلێنەی چاوی من هێلانەی تۆیە، گەورەمانکە و دابەزە (پێی بخەرەســەر) کە ماڵ ماڵی خۆتە.

رواق: هەیوان، پاسار، پەردەی پێشەوەی ماڵ        منظر چشم: گلێنەی چاو، ســۆمای چــاو

آشیانه: هێلانە        کرم نما: گەورەیی بنوێنە        فرودآ: دابەزە

خانه خانەء تست: ماڵ ماڵی تۆیە، چاوم هی تۆیە

بە یار دەڵێ: هەیوان و پاساری گلێنەی چاوم، یاخود پەردەی پێشەوەی چاوم وەك هێلانــەی تۆ وایە و ماڵی خۆتە، چاوم کە وەك ماڵێکە موڵکی تۆیە یـاخود جێگـەی ئـارامی و سـەبر و قەراری تۆیە و هێندە سەیرم کردووی وەك ماڵی تۆی لــێ هـاتووە. بۆیــە ئـەمجارەش گـەورەیی بنوێنە و یاخود گەورەمانکە و دابەزە و بەسەر چاومەوە قەرار بگـرە و وەرەوە نـاو چـاوم، ئـەم کارەشت بۆ من گەورەییە.

لە هەشت نوسخەی دێرینی حافز تەنیا لە دوو نوسخەدا لەبری (آشیانه)(آستانه) هاتووە کـە مانای میسراعەکە دەبێتە هەیوان و پاساری گلێنەی چاوم بەردەرگای ماڵی تۆیە.

**٢- به لطف خال و خط از عارفان ربوودی دل**

**لطیفەهای عجب زیر دام و دانەء تست**

**بە لوتف و خال و خەت ئەز ئارفان روبوودی دل، لەتیفەهای ئەجەب زیری دام و دانەیی توست.**

بە سەرنجڕاکێشی خاڵ و خەت دڵت لە عارفان رفاند، نوکتەی سەرسـوڕهێنەری زۆر لـە ژێـر داو ودانی تۆدایە.

لطـف: نــەرمی، میهرەبـانی، لێـرەدا لەبەرئـەوەی لەگـەڵ خـەت و خاڵـدا هـاتووە مانـای سەرنجڕاکێش و جوانە        خط: خەت، موی نەرم و ناسکی سەر روومەت

ربوودی: رفاندنت          لطیفه: نوکته

نەرمی خاڵ و خەتی تۆ دڵی عارفانی رفاند، بەڕاستی لە ژێر ئەم خاڵ و خەتەی سەر روومەتدا نوکتەی سەرسوڕهێنەر هەیە. لە نێوان (خال و خـط) و (دام و دانە)دا (لەف و نەشەری نامورەتەب ـ لف و نشر نامرتب) هەیە، بۆیە مەبەست لە (دام) خەت و مەبەستیش لە (دانە) خاڵە.

گەر بە شێوەیەکی ماددی و رووکاریانە لێکی بدەینەوە ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە: بە جوانی و سەرنجڕاکێشی خاڵ و گەندە موی سەر رووخسارت دڵی عارفانت رفاند، بەڕاستی نوکتەی سەیر یاخود رووخسارێکی سەرسوڕهێنەر لە ژێر خاڵ و خەتتدا هەیە، بەڵام لە زاراوەی عیرفانیدا مەبەست لە (خاڵ) جیهانی نادیار و غەیبە و لەڕاستیدا بە هێنانی عارفانیش کە هەمیشە مەشغوڵی عەشقی خودایی بوون ئیدی گومانی مەجازی و دنیایی بوونی ماناکە دەسڕێتەوە، چونکە گەر عاشقان بووایە دەکرا گومانی عەشقی دونیایی هەبێت، بۆیە مانای بەیتەکە دەبێتە: نەرمی و سەرنجڕاکێشی جیهانی غەیبی تۆ (ئەی خودا) دڵی لە عارفان رفاند و دڵی عارفانی بۆ کردنەوە و کەشفکردنی ئەو نهێنییە راکێشا، لە راستیدا نوکتە و قسەی زۆر سەرسوڕهێنەر لەم جیهانە نادیارەی تۆدا هەیە و وەك داو و دانە وایە دڵی عارفانی راکێشاوە بۆ نێو ئەو تەڵەیە و ناتوانن لێی دەرچن.

**٣- دلت به وصل گل ای بلبل سحر خوش باشد**

**که در چمن همه گلبانگ عاشقانهء تست**

**دڵەت بە ڤەسلی گوڵ ئەی بوولبوولی سەحەر خوش باشەد، کە دەر چەمەن هەمە گولبانگی ئاشقانەیی توست.**

ئەی بوولبوولی سەحەر دڵت بە وەسڵی گوڵ شادبێتەوە، چونکە لە باخدا هەر ئاوازی خۆشی عاشقانەی تۆیە.

خوش باشد: شاد بێت          گلبانگ: ئاوازی خۆش و بەرز، گۆرانی خۆش

شاعیر نزای خێر بۆ بوولبوولی عاشق (عارف) دەکات کە بە دیداری یار (گوڵ) شادبێت. چونکە بەردەوام تەواوی باغ و چەمەنزاری بە گۆرانی و ئاوازی خۆشی عاشقانەی خۆی پڕ کردووە.

**٤- علاج ضعف دل ما به لب حوالت کن**

**که آن مفرح یاقوت در خزانهء تست**

**ئیلاجی زەئفی دلی ما بە لەب هەڤالەت کون، کە ئان موفەریح یاقوت دەر خەزانەیی توست.**

چارەی لاوازی دڵی ئێمە بدە دەستی لێو، چونکە ئەو مەرهەمی یاقوتینەی دڵ لە خەزێنەی تۆدایە.



علاج: چارەسەر، چارە          ضعف دل: لاوازی دڵ

حوالت کن: بدە دەستی، حەواڵەی کە

مفرح: دڵخۆشکەر، بەخشندەی چالاکی و خۆشی، لەکۆندا ناوی هەندێ داوودەرمانی دڵ بووە.

مفرح یاقوت: مەرهەمێکی چالاکی بەخش بووە کە لە یاقوت و مرواری و دەرمانی دیکەی دڵ دروستکراوە بۆ بەهێزکردنی دڵ و دەماغ بەکارهاتووە لە (تحفه حکیم مؤمن)دا هاتووە کە: (مفرەحی یاقوتی بە دەرمانی دڵ دراوەتە قەڵەم) لەبەر گرانبەهایی ئەم دەرمان و مەرهەمەش لە خەزێنەی پادشاکاندا یاخود ناودارەکاندا هەڵدەگیرا. {هروی، ج١، ل٢١٥}

شاعیر دڵی خۆی بە زەعیف و لاواز دەزانێت و لێوی یاریش یاخود لێویش بە مەرهەمی وزە بەخشی دڵ دەزانێت و داوا لە یار دەکات مادام ئەو مەرهەمە گرانبەهایە لە خەزێنەی ئەودایە، دڵی حەواڵەی لای لێو بکات یاخود بیسپێرێتە دەستی لێوی، دەکرێ لە رواڵەتدا ئەم سپاردنە مانای (ماچ) بگەیەنێت، بەڵام لە بەیتەکەدا ئاماژە بە لێوت (لێوی یار) نەکراوە هەروەك سودی (ج١، ل٢٥٢) و هروی (ج١، ل٢١٥) ئاماژەی پێدەدەن، بۆیە راستتروایە کە مانای عیرفانی (لێو) بدەینە بەیتەکە، لە عیرفاندا (لێو) بە واتای (کەلام) دێت، شاعیر پێی وایە دڵی لاواز بووە و تاکە مەرهەمی چاکبوونەوەی ئەم لاوازییەش بە قسەی یاری عیرفانی دەزانێت، هەربۆیە داوای قسە دەکات لە یار، کە ئەی یار مەرهەمی یاقوتی وزەبەخشی دڵی لاوازی من لە خەزێنەی تۆدایە و دڵی من بە گوێ گرتن لەو وتانە چالاك دەبێتەوە و هێز و وزەی بۆ دەگەڕێتەوە، تۆ ئەو گوتانەم بە نسیب بکە، لێرەدا شاعیر بە شێوەیەکی ئالۆز داوای ئیلهام و قسەی خودا دەکات.

**٥-به تن مقصرم از دولت ملازمتت**

**ولی خلاصهء جان خاك آستانهء تست**

**بە تەن موقەسیرەم ئەز دۆڵەتی مولازەمەتەت، ڤەلی خولاسەیی جان خاکی ئاستانەیی توست.**

گەرچی ناتوانم بە جەستە هەمیشە لە خزمەتکردنت بەهرەمەندبم، بەڵام پوختەی گیانم خاکی بەردەرگای تۆیە.

بەتن: بەجەستە

مقصر، بێ توانا، خەتابار (هروی) مقصری بە تاوانبار داوەتە قەڵەم، واتە من خەتای خۆمە کە بە جەستە نایەمە خزمەتکردنت، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی مانای عیرفانی بەیتەکانی

پێشەوە واتای یەکەمی جوانتر و راستتر دێتەوە کە شاعیر (مرۆڤ) توانا و دەسەڵاتی ئەوەی نییە کە بچێتە مەنزڵی یاخود خزمەتی یاری عیرفانی (خودا).

ملازمت: ئەو کەسانەی هەمیشە لە خزمەتکردندان، پێکەوەبوونی بەردەوام بۆ نموونە بەو کەسانەی کە هەمیشە لە خزمەتی سوڵتاندان و خزمەتی دەکەن (ملازمان سلطان) دەگوترێ.

خلاصە: کورتە، ساف و پوختە، هەڵبژاردە (هروی) چکیدەی نووسیوە کە کورتە یاخود پوختە دەکرێتەوە. بەڵام لێرەدا(پوختە، بێخەوش) مانایەکی جوانتر بە بەیتەکە دەبەخشێ کەوا هەستدەکەم نزیکتر بێ لە مەبەستی شاعیرەوە

خلاصەء جان: پوختەی گیان، گیانی هەڵبژاردە، هەڵبژاردەی گیان

لە بەیتی پێشوودا شاعیر داوایەك لە یاری عیرفانی دەکات کە قسەی لەگەڵ بکات، لێرەدا چۆنییەتی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ یاردا دیاری دەکات و دەڵێ: من هەرگیز ناتوانم و لەتوانامدا نییە بە جەستە بەختی خزمەتکردن و هەمیشە لە خزمەت تۆدابوونم بە نسیب ببێ، واتە من ناتوانم بەم جەستە خاکییەوە بگەمە خزمەتی تۆ، چونکە ئەم جەستەیە بەکات و شوێنەوە پەیوەستە و تۆش لە دەرەوەی کات و شوێنی، بەڵام گیانم کە پەیوەست نییە بە کات و شوێنەوە و توانای دەربازبوون و گەیشتن بە تۆی هەیە، پوختە و هەڵبژاردەکەی، خۆڵی بەردەرگای تۆیە.

واتە: ئەی یاری عیرفانی (خودا) من بەجەستە ناتوانم بگەمە لای تۆ بەڵام چاکترین بەشی روحم بووەتە خاکی بەردەرگات و لەلاتە.

**٦- من آن نیم کە دهم نقد دل بە هر شوخی**

**در خزانە بە مهر تو و نشانەء تست**

**مەن ئان نییەم کە دەهەم نەقدی دل بە هەر شوخی، دەری خەزانە بە موهری توڤو نیشانەیی توست.**

من ئەو کەسە نیم کە سکەی دڵی خۆم بە هەر شۆخێ بدەم، سەری خەزێنەی دڵی من گیراوە و مۆر و نیشانەی تۆی پێوەیە.

آن نیم: ئەو کەسە نیم نقد: سکە نقد دل: سکەی دڵ، نەقدی دڵ

شۆخی: شۆخێك، عەیارێك مهر: موهر، مۆر

جاران دەرگای خەزێنە دەگیرا و مۆری کەسێکی لێدەدرا کە ئیتر کەسی دیکە بۆی نەبوو ببێتە خاوەنی و خاوەن مۆر بەکاری دەهێنا و دەیکردەوە. حافزیش دەڵێ: من کەسێك نیم کە دڵی خۆم کە وەك نەقد و سکەیەکی بەهادارە بە دەستی هەر شۆخ و عەیارێکەوە بدەم، بەڵکو دڵی من موڵکی تۆیە و دەرگاکەی داخراوە و مۆری تۆ و نیشانەی تۆی پێوەیە. لێرەدا قسە



لەگەڵ هەمان ئەو یارەدا دەکرێ کە شاعیر موشتاقی قسەیەتی و هەمیشە پوختەی گیانی لە بەردەرگایایەتی و دڵی بە موڵکی ئەو دەزانێت و نایداتە دەست هیچ شۆخ و عەیارێك.

**٧- تو خود چە لعبتی ای شهسوار شیرین کار**

**کە توسنی چو فلك رام تازیانەء تست**

**تو خود چە لوئبەتی ئەی شەهسەڤاری شیرین کار، کە تۆوسەنی چو فەلەك رامی تازیانەیی توست.**

تۆ خۆت چ شاسوارێکی سەرنجڕاکێشی لێزانی ، کە ئەسپی سەرکەشی وەك فەلەك لە بەرامبەر قاچی تۆدا رام بووە.

لعبت: بووکەڵە، سەرنجڕاکێش، سەرسوڕهێنەر، لێرەشدا بە مانای دووەم بەکارهاتووە

شهسوار: شاسوار شیرین کار: لێزانی، جوڵەی جوان نمایشکردن بەسەر ئەسپەوە، لێرەدا هەر بەو واتایە هاتووە

توسن: ئەسپی سەرکەش، سەرکەش رام: رام، ملکەچ تازیانە: قامچی، شەلاق

لە وەسفی شاسوارێکدا دەڵێ: تۆ زۆر سەرنجڕاکێشی لە سواریدا و سوارچاکێکی لێزانی، بۆیە ئاسمان کە وەك ئەسپێکی سەرکەشە ملکەچی قامچی تۆیە و بارهاتووی دەستی تۆیە واتە: تۆ هێندە لێزانی توانای دەستگرتنت بەسەر چارەنووسدا هەیە و فەلەکی سەرکەشت ملکەچ کردووە.

**٨- چە جای من کە بلغزد سپهر شعبدەباز**

**از این حیل کە در انبانەء بهانەء تست**

**چە جای مەن کە بلەغزەد سیپیهری شەئبەدەباز، ئەز ئین هییەل کە دەر ئەنبانەیی بەهانەیی توست.**

لە بەرامبەر فێڵ و مەکرەکانی تۆوە کە لە توێشەبەرەی (انبانە) بەهانەی تۆدان، ئاسمانی فاڵچی و کەڵەکچی پێی هەڵدەکەوێ چ جای من.

چە جای من: چ جای من، زاراوەیەکە لە کاتێکدا بەکاردێ کە ئەو رووداوە لە توانای (کەسێ) زۆر بەدەربێ، بۆ نموونە دەگوترێ رۆستەمیش ناتوانێ چ جای من

بلغزد: هەڵدەکەوێت، دوچاری هەڵە دەبێت سپهر: ئاسمان

شعبدەباز: کەڵەکچی، کەسێ کە چاوبەست لە خەڵکی دەکات، فێڵزان، فێڵباز

حیل: کۆی فێڵ و تەڵەکەیە

انبانە: تورەکە، کیسەیەکی بچووکە کە لە چەرم دروست دەکرێ و بە زۆری دەروێش شتومەکی خۆی تێدا هەڵدەگرێ

بە یار دەڵێ:

بەو هەموو فێڵ و تەڵەکە زۆرانەی کە لە تورەکەی بیانووەکانی تۆدا هەن، نەك من کە هیچ نیم، ئاسمانی تەڵەکەباز و کەڵەکچیش فریودەخوات و دوچاری هەڵە و سەرلێشێوان دەبێتەوە، لێرەدا وەسفی حیلەگەری و مەکربازی یار دەکات و پێیدەڵێ:

ئەی یار گەر بتەوێ بیانوو بە منی عاشقی بێ چارە بگریت ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوانی، چونکە تورەکەکەت هەزارەها حیلە و مەکری تێدایە.

رەنگە ئەم بەیتە ئاماژەیەکی لێڵ و دووری بە ئایەتی (و یمکرون و یمکر الله و الله خیر الماکرین) تێدابێت و ستایشێکی نادیار و لێڵی تێدا بێت کە ئەی خودا تۆ هێندە (مەکر)ت هەیە کە تەواوی فێڵبازەکان دەکەونە نێو داوت چ جای بەندەی زەلیلی وەك من.

**٩- سرود مجلست اکنون فلك به رقص آرد**

**که شعر حافظ شیرین سخن ترانهء تست**

**سرودی مەجلیسەت ئەکنون فەلەك بە رەقس ئارەد ، کە شیئری هافزی شیرین سوخەن تەرانەیی توست.**

سرود و ئاوازی کۆڕ و مەجلیست ئێستا فەلەك دەهێنێتە سەما، چونکە شیعری حافزی قسە شیرین گۆرانی تۆیە.

اکنون: ئێستا　　به رقص آرد: دەهێنێتە سەما، دەخاتە رەقس　　ترانە: گۆرانی

لەم بەیتەدا شاعیر ستایشی خۆی یاخود شانازی بەخۆیەوە دەکات و گەورەیی شیعرەکانی دەردەبڕێ، دەڵێ: ئەی یار ئێستا کە مادام شیعری حافزی قسەشیرین بووەتە شیعری گۆرانییەکانی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی تۆ، سرودی مەجلیست هێندە خۆش و تەڕ و پاراوبوون ئاسمان دێنێتە سەما و ئاسمانیش بە خۆشی سرودی کۆڕی تۆوە سەما دەکات.

سودی دەڵێ: ئەو گۆرانیانەی کە بە لێوی شیرینی تۆ دەگوترێ و لە شیعری شیرینی حافزن فەلەك دێننە سەما، چونکە لە دوو شتی شیرین پێکهاتوون یەکێکیان دەمی شیرینت و ئەوی دیکەیان شعری شیرینی حافز{ ج١، ل٢٥٤} .



## غەزەلی چل و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١-بیا که قصر امل سخت سست بنیادست**

**بیار باده که بنیاد عمر بربادست**

**بیا کە قەسری ئەمەل سەخت سوست بوونیادەست، بیار بادە کە بوونیادی ئومر بەربادەست.**

وەرە کە بوونیاد و پایەی کۆشکی ئارەزوو (هیوا) زۆر لاوازە، شەراب بێنە، چونکە بوونیادی تەمەن وێرانە ـ بەربادە.

بیا: وەرە　　قصر امل: کۆشکی هیوا　　سخت: زۆر

سست: لاواز　　بنیاد: بوونیاد، پایە　　بیار: بهێنە

برباد: بەرباد، وێران، خراپ، لەسەرهەوا، واتای زمانی (برباد است) واتە (لەسەرهەوا) کە بەم واتایەش واتە پایەی تەمەن لەسەر هەوایە واتە بناغە و پایەی نییە و زۆر زوو دەڕوخێ

حافز لە بناغەپوچی تەمەن و هیوا و ئاواتە دونیاییەکان دەدوێ و دەڵێ: ئەی مرۆڤ بزانە کە کۆشکی هیوا و ئارەزووە ئایدیالییەکانی نێو دونیات زۆر بێ سەروبنە و پایە و بناغەی لاواز و سستی هەیە، بگرە هەرخودی ئەو تەمەنەی کە لێرە هەتە لەسەر هەوایە یاخود وێران و خراپبووە و لە هەرساتێکدا گومانی روخانی لێدەکرێت، هەربۆیە وەرە و شەراب و بادە بێنە، با لەم پێنجودو رۆژەی ژیاندا بەخۆشی بادەوە ژیان بەسەر بەرین.

لە رواڵەتدا شاعیر داوای خۆشگوزەرانی و مەیخۆری دەکات لە کاتێکدا دەزانێ کە دونیا و کۆشکە خەیاڵییەکانی ئارەزوو و بێ بناغەیە، واتە شاعیر لە خەیاڵەوە بەرەو سەرخۆشی داوەتمان دەکات، بەڕاستی بەم واتایە بەیتەکە زۆر بێ مانا دەبێت، بەڵام کاتێ (بادە) بە عەشق لێکدەینەوە ئیدی واتای بەیتەکە جوانتر دەردەکەوێت و ئەم بێ مانایەش لە شعری گەورە پیاوێکی وەك حافز دووردەخەینەوە. خواجە دەڵێ: ئەی مرۆڤ مادام لە ژیاندا چ تەمەن و چ کۆشکە خەیاڵییەکانی ئارەزووت بێبناغە و وێرانن، وەرە با مەشغوڵی عەشق بین و دەست لە دونیا هەڵگرین.

**٢- غلام همّت آنم که زیر چرخ کبوود**

**ز هرچه رنگ تعلّق پـذیرد آزادست**

**غولامی هیممەتی ئانەم کە زیری چەرخی کەبوود، ز هەرچە رەنگی تەئەللوق پـەزیرەد ئازادەست.**

غولامی هیمەتی ئەو کەسەم کە لە ژێر ئاسمانی شیندا، لە هەر شتێ کە رەنگی دڵپێبەستن قبووڵ بکات ئازادە.

غلام: غولام، نۆکەر      همت: هیمەت، ئازایەتی   زیر: لەژێر     کبوود: شین

چرخ کبوود: ئاسمانی شین

رنگ تعلق پـذیرد: دڵپێبەستن قبووڵ بکات، ببێتە مایەی دڵخۆشی دونیایی

بێگومان لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا واتە لە دونیادا چەندین شتی جوان و فیتنە هەیە کە مرۆڤ دڵیان پێوە ببەستێت وەك ماڵ و سەروەت و منداڵ و پلە و پایە و.. هتد، وازهێنانیش لەو دەستکەوتە دونیایانە کارێکی گەلێ گرانە و هیمەت و ئازایەتی خۆیی ئەوێت، شاعیر ئەم راستییە دەزانێت کە وازهێنان لەم دەستکەوتانە گەلێ نارەحەتە، بۆیە دەڵێ: دەبمە نۆکەر و بەندە و غولامی هیمەت و غیرەتی ئەوەی کە بتوانێ لەم دونیایەدا دڵی نەدات بە شتەکانی ناوی و بێ باك بێ لە خۆشییەکانی دونیا.

بە رای (د. هروی) شاعیر خۆی بەم پلەبەرزە نەگەیشتووە و حەسرەت بۆ ئەم مەرتەبە و پایە بڵندیەی عارفان دەخوازێ و ستایشی دەکات{ ج١، ل٢١٩}.

(سودی)ش دەڵێ: ئەم بەیتە لە نێوان عارفاندا بووەتە پەند و نموونە{ ج١، ل٢٦٥}، بەڵام لە راستیدا مەقامی حافز لای عارفەکان گەلێ بەرز و مەزنە و ناکرێ بانگەشەی ئەوە بکەین کە حافز بەم پلەیە گەیشتووە یا نا.

دەکرێ ئەم خەڵاتە یاخود ئەم هیمەتە هەمان ئەو مەقامی (فقر)ە بێت کە رێبواری رێگەی تەریقەت تیایدا پێویستی بە خودا نەبێ پێویستی بە کەسی دیکە نییە و حافزیش لە جێگەیەکی دیکەدا لە خودا دەپارێتەوە کە پێی ببەخشێ و دەڵێ:

**(خدایا دولت فقر به من ارزانی دار).**

**٣- چەگویمت کە بە میخانە دوش مست و خراب**

**سروش عالم غیبم چه مژدەها دادست**

**چە گویەمەت کە بە مەیخانە دوش مەست و خەراب، سروشی ئالەمی غەیبەم چە موژدەها دادەست.**



چیت پێ بڵێم (چی بڵێم) کە شەوی رابردوو کاتێ لە مەیخانە مەست و حەیران بووم، فریشتەی جیهانی غەیب چ مژدەگەلێکی بە من داوە.

دوش: شەوی رابردوو لە کوردیدا دەگوترێ ئەم شەو یا ئەم شەوی رابوورد، بەڵام لە فارسیدا دوێنێ شەو بەکاردەهێنرێت و ئەم شەو بۆ شەوی داهاتووە.

مست و خراب:  مەست و حەیران      سروش: فریشتە، فریشتەی نیگاهێنەر، جوبرەئیل

عالم غیب: جیهانی نادیار، غەیب

لە سەرەتای بەیتەکەوە سەرسوڕمانی شاعیر بەدیاردەکەوێت، چونکە مرۆڤ لە کاتێکدا جۆرە سەرسوڕمانێکی هەبێ (چی بڵێم ـ چیت پێ بڵێم) دەکاتە دەستپێك و سەرەتای قسەکانی، لێرەشدا بە هەمان شێوەیە، دەڵێی نایەوێ قسەکانی بکات بۆیە دەڵێ: چی بڵێم یاخود چیت پێ بڵێم، دوێنی شەو لە کاتێ مەست و حەیرانی تەواودا، واتە لە جیهانی لاهوتی خۆمدا، لە پلە بەرزەکانی حاڵ و جەزبەدا، چونکە مەیخانە لە مانا عیرفانییەکەیدا لاهوت دەگەیەنێ، کە غەرق و نغرۆی عەشقی خودایی ببووم بە شێوەیەك کە لە جەستەم جودا ببوومەوە و لە ناسووت داماڵرابووم و چووبوومە جیهانی لاهوت و غەیبەوە فریشتەی ئەو جیهانە نادیارە چ مژدەگەلێکی خۆشی بە من داوە، بۆیە لە سەرەتادا ئەم (چیت پێ بڵێم)ە دەڵێت، چونکە گومانی لە گوێچکەکانی هەیە.

ئەو مژدەیەی کە بە شاعیر دراوە لەم بەیتەی دواییەدا یاخود ئەم دوو بەیتەی دواییدا (وەك سودی دەڵێت) دەخرێتەڕوو.

**٤- کە ای بلندنظر شاهباز سِدرەنشین**

**نشیمنِ تو نە این کنج محنت آباداست**

**کە ئەی بوولەندنەزەر شاهبازی سیدرەنشین، نشیمەنی تو نە ئین کونجی میهنەت ئابادەست.**

کە ئەی ئەو شابازەی کە جێگەت درەختی (سدرە)یە و لەو بڵندیەوە سەیری زەوی دەکەی، ئەم گۆشەیەی کە بە دەرد و مەینەت ئاوەدانکراوەتەوە جێگەی دانیشتنی تۆ نییە.

بلند نظر: پایەبەرز، کەسێك لە بەرزاییەکەوە سەیردەکات کە زیاتر مەبەست لە بەرزی پایەکەیەتی   شاهباز: شاباز، جۆرێکە لە باز کە زیاتر سپییە و بە شای باز دەدرێتە قەڵەم

سدرە: درەختی (سدرە) درەختێکە کە بە سەر ئاسمانی حەوتەمەوەیە و لە سورەتی (نجم) ئایەتی (١٤)دا ناوی هاتووە کە خودا دەفەرموێ: (عند سدرة المنتهی) لە راڤەی قورئانی پیرۆزدا

هاتووه کە درەختێکە لای ڕاستی عەرشەوە و هیچ فریشتەیەك لێی تێناپەڕێت، لە فـەرموودەدا هاتووە کە گەڵای وەك گوێی فیلە

نشیمن: جێگەی دانیشتن، هێلانە، جێگەی ژیان، ژوری دانیشتن

**محنت آباد**: مەینەتسەرا، بە ڕەنج و مەینەت ئاوەدان بووەوە

ئاوایی ڕەنج و مەینەت بە جێگەیەك دەگوترێ کە ژیان تیایدا پڕ لە مەینـەتی و ناڕەحـەتی بێت، (شاری ماتەم) وەك لە بەیتی پێشەوەدا گوتمان لە کاتی مەستی عەشقدا فریشتەی مژدەی داوە کە تۆ ئەی مرۆڤی عارف کە وەك ئەو شابازە پایەبەرزەیت کـە بەسـەر درەختـی سـدرەوە هەڵنیشتووە و جێگەی هەمیشەیی سەر درەختی سدرەیە و مەقامی بەرزە، جێگەی تـۆ دونیـا نییە و ئەو کونجی دەرد و ڕەنجە لایق و شیاوی تۆ نییە و جێگەی دانیشتنی تۆ یاخود هێلانـەی تۆ ئەو گۆشەیە نییە کە مەینەتسەرایە و پڕە لە دەرد و مەینەتی.

**٥- ترا ز کنگرهء عرش می زنند صفیر**

**ندانمت که درین دامگه چه افتادست**

**تورا ز کونگرەیی ئـەرش مـی زەنەنـد سـەفیر، نەدانەمـەت کـە دەریـن دامگـەه چـە ئوفتادەسەت.**

لە لوتکەی عەرشەوە تـۆ بانگهێـشت دەکـەن، نـازانم کـە لـەم داوگـە (تەڵـە)یـەدا چـیت بەسەرهاتووە.

ترا: تۆ                    کنگرە: ستارە، محاجەرە کە بەسەر باڵەخانـەی بـەرز و قـەڵاوە دەکرا لە ترسی بەربوونەوە، بەگشتی بە شوێنی بەرزی باڵەخانە (قولە) دەگوترێ

عرش: تەختی پاشایەتی، گەردوونی گەورە، عەرشی خودا (شوێنی خـودا) مـەقامی خـودا

صفیر: بانگ و هاوار بەتایبـەتی خوێنـدنی باڵنـدە                    صـفیرزدن: بـانگکردن بـەرەوخۆ

می زنند صفیر: بانگ دەکەن     ندانم: نازانم     دامگە: داوگە (تەڵە) مەبەست لە دونیایە

چە افتادست: چی ڕوویداوە، بەڵام لێرەدا بە هـۆی هـاتنی (ت) جێنـاوی کەسـی دووەمـی تاکەوە ماناکەی دەبێتە چیت بەسەرهاتووە

ئەم بەیتەش لە مژدەکانی فریشتەی غەیبە کە لە حـاڵی مەسـتی و عەشـقدا بـە شـاعیری گوتووە کە تۆ ئەی پایەبەرز جێگەت زەوی نییە، لێرەدا زیاتر جەخت لـە سـەر بـە جێهێـشتنی زەوی دەکاتەوە، جۆرێك لـە سەرسـوڕمان و گلەییـشی تێدایـە، فریـشتەی غـەیب دەڵـێ: لـە بەرزترین شوێنی عەرشەوە (ئاسمانەکانەوە) لوتکەی گەردوونی گەورەوە تۆ بەرەو خۆیـان بـانگ دەکەن و دەعوەتت دەکەن، نازانم تۆ چیت بەسەرهاتووە و لەم تەڵە و داوگەی ژیاندا ماویتـەوە،



واتە سەیرم پێ دێ کە تۆ چۆن لەم دونیا نـزم و کەمـەدا وەك دیـل ماویتـەوە و ناچـیت بـەدەم بانگهێشتەکەی جیهانی باڵاوە.

قسەکانی فریشەی غەیب لێرەدا تەواو دەبێ: بە کورتی مژدەکانی فریشتەی غـەیب هـەمان ئەو بیروڕایانەن کە لە عیرفاندا هەیە و چەندین جار لە شـوێنی جیـاوازدا هـاتووە کـە ئـەویش دیلبوونی مرۆڤە لە دونیادا و غەریب بوونییەتی لەم جیهانە خاکیـەدا و بڕوابوونـە بـەوەی کـە مرۆڤ خەڵکی بەهەشتە و پێویستە هەمیشە بیر لە ڕۆشتنەوە بکاتـەوە نـەوەك گرفتـاربوون بـە خۆشییە کاتییەکانی دونیاوە.

هەروەك خودی حافز دەڵێ:

**چنین قفص نه سزای چو منی خوش الحان است**

**روم به گلشن رضوان که مرغ آن چمنم**

ئەم مژدانەی فریشتە جگە لە بیرخستنەوەی ڕاستییەك کە شـاعیر خـۆی دەیـانزانێ هیـچی دیکە نییە، بەڵام دونیا بەرچاوی گرتووە هیچی دیکە نییە.

**٦- نصیحتی کنمت یادگیر و در عمل آر**

**که این حدیث ز پیر طریقتم یادست**

**نەسیهەتی کونەمەت یادگیر و دەر ئەمـەل ئـار، کـە ئـین هـەدیس ز پـیری تەریقەتـەم یادەست.**

ئامۆژگارییەکت دەکەم  فێرببە و کاری پێ بکە، چونکە ئەم قسەیە (ئەم ئامۆژگارییە)م لـە پیری تەریقەتەوە بیستووە.

یادگیر: لەبەری کە، فێرببە      در عمل آر: بیخە کارەوە، کاری پێ بکە          حدیث: قسە

بەتەواوبوونی موژدەکانی فریشتەی غەیب، خواجە خۆی ڕووبەڕووی خوێنەر قسە دەکـات و ئامۆژگاری دەکات، گرنگی ئەم ئامۆژگارییەش لەوەدایە کە خواجە قسەی خۆی نییـە، بـەڵکو قسەی پیری موغانە و لەبیری ماوە، بۆیە دەڵێ: ئامۆژگارییەکت دەکەم لە بیرت بمـێنێ یـاخود فێری ببە و بیهێنە بوواری کارکردنەوە و کاری پێ بکە، چونکە ئەم قسەیەم لە پیری موغانـەوە بیستووە و لەبیرم ماوە، ئامۆژگارییەکەش ئەم چـەند بەیتـەی خوارەوەیـە کـە بـە جۆرێـك لـە جۆرەکان ڕوونکەرەوە و درێژە پێدەری دەرئەنجامی مژدەکانی فریشتەی جیهانی غەیبە کە دەڵێ:

**٧- مجو درستی عهد از جیهان سست نهاد**

**که این عجوزه عروس هزار دامادست**

**مەجو دروستیی ئەهد ئەز جـەهانی سوسـت نـەهاد، کـەین ئـەجوزە ئەروسـی هـەزار دامادەست.**

داوای وەفا و بەڵێنی ڕاست لە جیهانی سروشتنزم (نەفسنزم) مەکە، چونکە ئەم پیرەژنە، بووکی هەزار زاوایە.

**مجو**: داوای مەکە، بەتەمای مەبە    درستی: ڕاستی    درستی عهد: بەڵێنی ڕاست
نهاد: تەبیعەت، سروشت    سست نهاد: نەفس نزم، سروشت نزم    عجوزه: پیرەژن
داماد: زاوا

ئامۆژگارییەکەی خواجە بریتییە لە وەلانانی جیهان و بەتەمانەبوونی بەڵێنی ڕاست لە جیهان و دونیا، چونکە ئەو دونیایە نەفسی نزمە و نەفسنزمیش هەرگیز لەسەر وەعد و پەیمانی خۆی نامێنێت و گەر مرۆڤ بە بەڵێنی ئەو بخەڵەتێ زیانی زۆری پێدەکەوێ، خواجە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بیروبۆچوونە، میسراعی دووەمی بەیتەکەی وەك ڕۆشنکەرەوەی یەکەم هێناوە و ئیقتباسی لەو چیرۆکە کردووە کە دونیا وەك ئەو پیرەژنە وایە کە هەزار شوی کردووە و پەیمان و بەڵێنی ڕاستی بە کەسیان نەداوە و وازی لە هەموویان هێناوە یاخود هەموویانی کوشتووە، هەربۆیە دونیا ئەو پیرەژنە بێ وەعد و بەڵێنەیە کە هەزار زاوای گۆڕیوە تۆش بە تەمای وەعد و پەیمانی ڕاستی مەبە.

بە ڕای (د.هروی) میسراعی دووەمی ئەم بەیتە لە ژێر ڕۆشنایی بەیتێکی (سەعدی) و چیرۆکێکی حەزرەتی عیسا لەگەڵ دنیادا نووسیوە، کورتەی چیرۆکەکە: "دونیایان لە شێوەی پیرەژنێکدا بە من پیشان دا کە زۆر ڕازێنرابوویەوە، وتم چەند شوت کردووە؟ وتی ناتوانم بیانژمێرم، گوتم مردن یاخود تەڵاقیان دای؟ وتی: هەموویانم کوشت. وتم: وای بۆ مێردەکانی ترت، کە لە مێردە پێشوەکانت پەندیان وەرنەگرت) {ج١، ل٢٢١، بە نقل از د. یوسفی، بووستان سعدی}

کەواتە دونیا ئەو پیرەژنە ڕازێنراوەیە کە بەڵێنی ڕاستی لەگەڵ کەسدا نەبووە و نییە و هەموو ئەو کەسانەی کە پێشتر دڵیان پێداوە کوشتوونی، تۆش دڵ بە دونیا مەدە بەو نیازەی کە بەڵێنی ڕاستت پێ بدات، چونکە ئەو بەڵێنی ڕاستی بە کەس نەداوە و نایدات، لە کوردەواریدا دەڵێن: ئەگەر چاکبوایە کەسانی پێش ئێمە بە جێیان نەدەهێشت یاخود نەدەگەیشت بە ئێمە.

ئامۆژگارییەکە هەر بەردەوامە و دەڵێ:

**٨- غم جهان مخور و پند من مبر از یاد**

**که این لطیفهء عشقم ز رهروی یادست**

**غەمی جەهان مەخور و پەندی مەن مەبەر ئەز یاد، کە ئین لەتیفەیی ئیشقەم ز ڕەهرەڤی یادەست.**



خەمی دونیا مەخۆ و ئەم پەندەی من (کە ئێستا پێت دەڵێم) لە بیرخۆت مەبەرەوە، چونکە ئەم نوکتەی عەشقەم لە ڕێبوارێکەوە لە بیرماوە.

**مخور**: مەخۆ    مبر از یاد: لە یادی خۆتی مەبەرەوە    لطیفه: نوکتە
لطیفهء عشق: نوکتەی عەشق، لای عارفەکان عەشق نوکتەیەکی غەیبییە و نازڵ دەبێتە سەر دڵی ڕێبواری ڕێگەی عیرفان و هەر قۆناغ و مەنزڵێکیش نوکتەی جۆراوجۆری هەیە، نوکتەی عشق، مانا و مەدلولێکی پڕ واتا و بەسوودە کە بە هۆی عەشقەوە نازڵ دەبێت
رهرو: ڕێبوار، عارف، ڕێبواری ڕێگەی تەریقەت.

ئامۆژگاری یەکەمی خواجە لە پیری تەریقەتەوە لە بیری ماوە ئەم ئامۆژگارییە کە دەیەوێ بە خوێنەری بڵێ لە عارفێکەوە کە ڕێبواری ڕێگەی تەریقەتە و لە ئەنجامی عەشقەوە دەیڵێ لە بیرم ماوە، خواجە دەڵێ جیهانێك کە باسکرا شایانی ئەوە نییە خەمی بۆ بخۆی، هەربۆیە خەمی جیهان مەخۆ و گوێ لەم پەندەی دیکەشم بگرە، ئەم پەندەش زۆر گرنگە، چونکە هی عارفێکە و نوکتەی عەشقیشە کە بریتییە لە:

**٩- رضا به داده بده و ز جبین گره بگشای**

**که بر من و تو در اختیار نگشادست**

**ڕەزا بە دادە بدەڤو ز جەبین گرەهـ بگوشای، کە بەر مەن و تو دەری ئیختیار نەگوشادەست.**

ڕازی بە بەوەی کە پێت دراوە و چرچ و لۆچی ناوچاوانت بڕەوێنەرەوە، چونکە دەرگای هەڵبژاردن لە من و تۆ نەکراوەتەوە.

دادە: پێدراو    جبین: ناوچاوان، تەوێل    گرەبگشای: گرێ بکەرەوە، بەڵام لێرەدا مەبەست گرێ کردنەوەی نێوچاوانە کە هەمان لابردن و ڕەواندنەوەی چرچ و لۆچی نێوچاوانە کە مایەی تووڕەییە، واتە شاد و خۆشحاڵ بە    بە من و تو: بۆ من و تۆ، لە من و تۆ
در: دەرگا

کاتێ مرۆڤ بە عەشقەوە سەیری نیعمەتەکانی خودای گەورە دەکات ئیدی هەمیشە خۆشحاڵ دەبێت و ڕووگرژی و ناڕەحەتی ناکاتە بەشی خۆی لە دونیادا، مادام هەرچی هەیە لە لایەن مەعشوقەوە بە دیاری پێمان دراوە و ئەو خۆی باشتر دەزانێت چ دیارییەك بۆ ئێمە بە نرخ و بە کەڵکە، ئیدی مایەی ڕووگرژی نییە، خواجە ئامۆژگاری دەکات و دەڵێ: شاد و خۆشحاڵ بە بەو بەشەی کە خودا بە خەڵات پێی داوی و ڕووگرژی خۆت بخەلاوە و چرچ و لۆچی ناوچاوانت بڕەوێنەرەوە، ئێمە بۆ خۆمان نەچووین بەشی خۆمان لە جیهانی باڵا بهێنین تا ئێستا

خەفەتی ئەوە بخۆین و بلێین دەبووایە ئەو شتە چاکترەمان بهێنایە نەوەك ئەوەی دی، مادام ئەو دەرگایەی ئیخیتیارمان لێ نەکراوتەوە و پێمان بەخشراوە رازی بەو بە شادمانی بژی.

(هروی) ئەم بەیتەی حافز بە بەڵگەی ئاشکرای مەزهەبی جەبری حافز دەزانێ {ج١،ل٢٢٢}، بەڵام لەڕاستیدا ئەم جەبرییەتەی حافز (ئەگەر جەبریەت بێ) زەوی تا ئاسمان جیاوازی هەیە لەگەڵ خودی جەبرییەتدا، چونکە جەبرییەت جۆرە عاجزی و رووگرژیەك بە مرۆڤ دەدات و هەمیشە لە گلەیی و گازاندەدا ژیانی بەسەر دەبات و هەرگیز رێگەیەك نییە بۆ ئاسوودەیی، بەڵام ئەم بیروبۆچوونەی حافز رێگەیەکە بۆ ئاسوودەیی و خۆشبەختی لە نێو ژیاندا. بە بەستنەوەی واتای بەیتەکان ئەم رایە دەسەلمێنرێ ئەو لە سەرەتاوە سەرزەنشتی دونیا و جیهان دەکات و بە کەم و نەفسنزمی دەداتە قەڵەم، لێرەشدا دوابەدوای ئەو مانا جوان و واقیعیانە ئەم بەیتە دەهێنێتەوە کە حەقیقەتێکی دیکەیە، چونکە مرۆڤ لە جیهاندا سنووردارییەکی تەواوی هەیە گەر بەتەواوی باوەڕی بە ئازادی و ئیختیار هەبێت، هەر بۆیە باوەڕبوون بە ئیختیار سەبارەت بە دونیا جۆرە دڵەڕاوکێیەك دروست دەکات، چونکە زەمینە دونیاییەکان ئەو بیروڕایە رەتدەکەنەوە. هەربۆیە حافز دەڵێ: تۆ بەم بیرە ئیختیارییەتەوە توشی ناوچاوگرژی دەبیت ئەویش بۆ خاتری پیرەژنێکی هەزار شووکردووی بێ بەڵێن. بۆیە هەرچی بەشی خۆتە لە دونیا بە خەڵاتی خودایی بزانە و رووخۆش و شادومان بە، چونکە لەم دونیایەدا دەرگاکانی ئیختیار بە رووی ئێمەدا نەکراوەتەوە. لە ئایینی بووزیدا دونیا شوێنی مەینەتییە و هەر خۆشییەك بە خەڵاتی نێو رێگە دەزانن و ئەسڵ لای ئەوان ناڕەحەتییە لە ژیاندا.

لە راستیدا وەك (سودی) دەڵێ: ئەم بەیتە سەراسەر پەندە، ئەڵبەتە بۆ کەسێك کە تێبگات {ج١، ل٢٧٠}.

**١٠- نشان عهد و وفا نیست در تبسم گل**

**بنال بلبل عاشق که جای فریاد ست**

**نیشانی ئەهد و ڤەفا نیست دەر تەبەسومی گول، بنال بوولبوولی ئاشق کە جای فەریادەست.**

لە خەندەی گوڵدا نیشانەی پەیمان و وەفا نییە، بوولبوول بناڵێنە، چونکە شوێنی هاوار و فریادە.

نشان: نیشانە، هێما تبسم: خەندە

تبسم گل: خەندەی گوڵ، مەبەست لە خەندەی گوڵیش پشکوتنی گوڵە

بنال: بناڵێنە فریاد: هاوار جای فریاد است: جێگەی خۆیەتی هاوار و فریاد بکەی



هەمیشە گوڵ بە مەعشوقی بوولبوول دەزانرێت. لێرەدا شاعیر ئەو مەعشوقە وەك دونیای بێ وەفا سەیر دەکات و بە بوولبوول دەڵێ: وامەزانە گوڵ نیشانەی وەفاداری ئەو بێت بۆ تۆ، بەڵکو ئەوە رێوڕەسمی ژیانی خۆیەتی و هەر دەپشکوێ، ئەگەر بە هیوای وەفاداری گوڵی، بناڵێنە، ئەم بێ وەفاییەش شایانی ئەوەیە کە ناڵە و هاواری بۆ بکەیت و فریاد لە جێی خۆیدایە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی دڵ بە دونیا خۆشدەکەی گەر ماوەیەك دونیات بۆ لوا وامەزانە دونیا وەفادارە و ئەم بۆلوانە وەفاداری نییە و هەرگیز نیشانە و رەمزی وەفای تێدا دەرناکەوێ، بۆیە واچاکە ناڵین و هاوار و داد بکەین.

**١١- حسد چه می بری ای سست نظم بر حافظ**

**قبوول خاطر و لطف سخن خدا دادست**

**هەسەد چە می بەری ئەی سوست نەزم بەر هافز، قەبوولی خاتر و لوتفی سوخەن خودا دادەست.**

ئەی شاعیری بێ هێز حەسودی و ئیرەیی چی بە حافز دەبەی، خۆشەویستی لای خەڵکی و قسەنەرمی و قسەزانی بەهرەی خوداییە.

حسد: حەسودی، ئیرەیی سست نظم: شیعری بێ هێز، شاعیرێك کە توانای دانانی شیعری بڵند و شاکاری نەبێ، کۆڵکە شاعیر یاخود بە زاراوەی باوی ئەمڕۆ (ماعیر)

قبوول خاطر: خۆشەویستی خەڵکی، بوونە جێگەی پەسەندکردنی خەڵکی

لطف سخن: قسە نەرمی، قسەزانی خداداد: بەهرەی خودایی، بەشی خودایی

دەکرێ (سست نظم) هەمان ئەم کۆڵکە شاعیرانە بن کە ئیرەییان بە شیعری حافز هاتبێ و ئەم بەیتە رووبەڕووی ئەوان گوترابێت و ئەو راستییە روون بکاتەوە کە شیعر ئیلهامێکی خوداییە و شتێکی ئیکتیسابی نییە و فێری نابیت، مادام ئەو دوو شتە (پەسەندبوون و قسەزانی یا قسەنەرمی) بەخششی خوداین ئیدی جێگەی ئەوە نین کە ئیرەییان پێ ببرێ. بۆیە دەڵێ: ئێرەیی چی دەبەی بە حافز ئەی کۆڵکە شاعیر، کاتێ حافز لای خەڵك پەسەندە و شیعری جوان دەنووسێ ئەمانە بەهرەی خودایین.

بەڵام رەنگە مەبەست لەم (سست نظم)ە دونیاش بێت، چونکە ئەم غەزەلە لە زەم و سووککردنی دونیادا نووسراوە و جارێکی دیکەش لە بەیتی حەوتدا (سست نهاد)ی بۆ وەسفی دونیا بەکارهێناوە، بە هەرحاڵ ئەم غەزەلە یەکێکە لە غەزەلە درێژەکانی حافز و پانتاییەکی زۆری بۆ زەمی دونیا تەرخانکراوە.

## غەزەلی چل و هەشتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- تا سر زلف تو در دست نسیم افتادەست**

**دل سودازدە از غصە دو نیم افتادەست**

**تا سەری زولفی تو دەر دەستی نەسیم ئوفتادەست، دلی سۆودازەدە ئەز غوسسە دو نیم ئوفتادەست.**

لە کاتێکەوە سەری زوڵفت کەوتۆتە دەستی شەماڵ، دڵی سەودازەدە لەتاو خەفەت دووکەرت بووە.

تا: لە کاتێکەوە، هەرچەندە (تا) بە مانای (تا)ی کوردی بەکاردەهێنرێ، بەڵام لێرەدا بۆ واتای(سەرەتا) بەکارهاتووە      افتادە است: کەوتووە

سودازدە: ماخۆلیایی، ماخۆلان      غصە: خەم، خەفەت

دونیم افتادە است: دووکەرت بووە، دوو لەت بووە

لە عەشقدا هەمیشە ترسی هاتنی رەقیب لە ئارادایە، جاروباری ئەو رەقیبە هێندە گەورە دەبێت شتەکانیش دەگرێتەوە، عەشقی دونیایی ئەوەندەی جیاوازە لە عەشقی خودایی (بە جیاوازی مەحبووب) کە لە عەشقی دونیاییدا هەمیشە ترسی هاتنە ناوەوەی رەقیب هەیە، عەشقی حافزیش (هەرچەندە عەشێکی عیرفانی ئیلاهیە)، بەڵام مۆدێلی عەشقی دونیایی بەسەردا دەسەپێنێ، هەربۆیە ئەو ترسە لای حافزیش سەرهەڵدەدات کە لە لای مەولانا (بۆ نموونە) بەدی ناکرێت.

لەم مۆدێلەی عەشقدا عاشق چاوی بەرایی نادات کە مەعشوقەکەی ببێتە جێگەی سەرنجی کەسی دیکە و خەفەت بەم حاڵەتە دەخوات، چ جای ئەوەی مەعشوق لەمەش کراوەتر بێت ئەو دەڵێ: لەوکاتەوەی کە سەری زوڵفت کەوتۆتە دەستی شەماڵ و شەماڵ یاری بە سەری زوڵفی تۆ دەکات ـ کە لای شاعیر بێگانەیە ـ لە داخ و خەفەتدا دڵی ماخۆلانی عاشق شکاوە و دووکەرت بووە، ئەمە ئەو ترسەیە کە لەم مۆدێلە عەشقەدا بەدی دەکرێت ئەم بەیتەش گوزارشت لەو خەم و خەفەتە دەکات کە رەقیب دەیهێنێ.



**٢-چشم جادوی تو خود عین سواد سحرست**

**لیکن آن هست کە این نسخە سقیم افتادەست**

**چەشمی جادوی تو خود ئەینی سەڤادی سیهرەست، لیکەن ئان هەست کە ئین نوسخە سەقیم ئوفتادەست.**

چاوی جادووگەری تۆ خۆی خودی رەشنووسی سیحرە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم دانەیە (نوسخەیە) سەقیم بووە.

جادوی: جادووگەر، فریودەر      عین: خودی، هەرخۆی      سواد: رەشنووس، رەشایی

لیکن: بەڵام      آن هست: ئەوەندە هەیە، ئەوە هەیە      سقیم: نەخۆش، نارێك و ناڕاست

سقیم افتادست: نەخۆش کەوتووە، نارێك و چەوت بووە

وەسفی چاوانی جادووبازی یار دەکرێت، یار بە چاوە سیحراوییەکانییەوە هێندە سەرنجڕاکێشە، توانای هەیە کە هەموان بخاتە نێو داوی سیحری خۆیەوە، بۆیە ئەم چاوە سیحراویانەی یار لای شاعیر خۆی لە خۆیدا رەشنووسێکی سیحرە و هیچی دیکە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم نوسخەیەی سیحر کە سیحری چاوانی یارە کەمێ نەخۆش کەوتووە یاخود ئەم نوسخەیە خوار و نارێکە، لێرەدا گەر (سقیم) ئاوەڵناوی (چاو) بێت بە واتای (نەخۆش) دێت و مەبەست لە چاوی خومارە، کەواتە جادووگەری یار نوسخەیەکی سیحرە، بەڵام ئەوەنە هەیە ئەم چاوانە مەست و نەخۆشە.

بەڵام گەر (سقیم) ئاوەڵناوی (نسخە) بێت واتای نارێك یاخود ناڕاست دەگەیەنێ واتە: چاوانی جادووگەری یار نوسخەیەکی سیحرە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم نوسخەیە بە تەواوی لە نوسخە رەسەنەکە ناچێت و کەمێ شێواوە کە دیسانەوە هەر مەبەست لە خومار و مەستی چاوانی یارە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا سەرنجڕاکێشتر پیشاندانی چاوانی یارە لە ساحیری و جادووگەری، چونکە ئەم نارێکبوونە (مەستبوون) چاو ساحیرتر دەکات.

**٣-در خم زلف تو آن خال سیە دانی چست**

**نقطەء دودە کە در حلقەء جیم افتادەست**

**دەر خەمی زولفی تو ئان خالی سیەهـ دانی چیست، نوقتەیی دودە کە دەر هەلقەیی جیم ئوفتادەست.**

دەزانی ئەو خاڵە رەشەی لە نێو لولی پرچتدایە وەك چییە؟ خاڵێکی مرەکەبە کە کەوتۆتە نێو ئەڵقەی جیمەوە.

سیاە: رەش      دانی: دەزانی      دودە: مرکب

حلقە: ئەڵقە          جیم: جیم، حەرفی جیم (ج)

شاعیر لولی پرچی یاری بە چەماوەیی پیتی (ج) چواندووە و خاڵی ڕەشی سەر روومەتی یاریشی بە خاڵەکەی ناوی. دەڵێ: ئەو خاڵە ڕەشەی کەوتۆتە نێو لولی پرچت، وەك ئەو نوقتە مرەکەبە وایە کە کەوتۆتە نێو ئەڵقەی پیتی جیمەوە.

ئەمەی سەرەوە واتایەکی ساکار و سادەی بەیتەکەیە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی واتا عیرفانییەکانی خاڵی ڕەش (کە جیهانی غەیبە) و لولی پرچ (کە نهێنییە ئیلاهیەکان)ە واتایەکی قووڵ و جوانی ئەم بەیتەمان بۆ روون دەبێتەوە:

شاعیر پێیوایە کە جیهانی غەیب لە نێو نهێنییە ئیلاهییەکاندا تەنیا نوختەیەکی نێو ئەڵقەیەکی گەورەی وەك پیتی جیمە، یاخود گەر (جیم) جواب بێت ئەوا جیهانی غەیب کە ئێمە تامەزرۆی زانینی ئەسرار و نهێنییەکانی ئەوێین، تەنیا نوقتەیەکی مرەکەبە لە نێو وەلامە زۆرەکانی سەرجەم نهێنییە ئیلاهییەکان. لەڕاستیشدا هەروایە مرۆڤ تەنیا ماخۆلانی کەشفی ئەو بەشە بچووکەی جیهانی غەیبە کە خودا بۆ خۆی پێی ڕاگەیاندوین، بەڵام لە نێو نهێنییەکانی خواوەندا ئەم جیهانە بچووکەی غەیب وەك خاڵێك وایە و هیچی دیکە، کەوایە شاعیر پێیوایە نهێنییە خوداییەکان زۆر لەوە زیاترن کە تەنیا ئەو جیهانی غەیبە بن کە مرۆڤ تامەزرۆی شرۆڤە و ڕاڤەکردنییەتی.

**٤-زلف مشکین تو درگلشن فردوس عذار**

**چیست، طاوس کە در باغ نعیم افتادەست**

**زولفی میشکینی تو دەر گولشەنی فیرۆوسی ئیزار، چیست؟ تاوس کە دەر باغی نەئیم ئوفتادەست.**

پرچی ڕەشی تۆ لە باغی بەهەشتی رووخساردا چییە؟ تاوسێك کە کەوتووەتە باخی بەهەشتەوە.

مشکین: ڕەش، میسکبار          گلشن: باغ

فردوس: باغ و بووستان و ناوی باغێکە لە بەهەشت          عذار: رووخسار

طاوس: تاوس، بە باڵندەی بەهەشت دەزانرێت (د. هروی، ج١، ل٢٢٤)

نعیم: ناز و نیعمەت و ئاسایش، ناوێکە لە ناوەکانی بەهەشت   باغ نعیم: باخی بەهەشت

لە وەسفی زوڵفی مسیکباری یار یاخود زوڵفی ڕەشی یاردا ئەم بەیتە گوتراوە و شاعیر پێی وایە زوڵفی ڕەشی یار بەسەر رووخساری جوانەوە کە وەك باخی بەهەشت رازاوەیە لەو تاووسە دەچێت کە لە باخی بەهەشتدایە، لێرەدا لە نێوان (زلف و عذار) و(طاوس و باغ نعیم)دا پێچان



و کردنەوەی ڕێك، هەیە کەواتە زوڵفی ڕەش بە تاووس و رووخساری یار بە باغی بەهەشت چوێنراوە، بەم پێیەش دەبێ تاووس ڕەنگی ڕەش بێت لە کاتێکدا تاووس ڕەنگاوڕەنگ یاخود سپییە، هەربۆیە لێکدانەوەی (مشکین) بە ڕەش ئەم ناڕێکییە لە واتادا دێنێتە کایەوە بۆیە ئەکرێ مانایەکی دیکەی مشکین وەرگرین کە میسکبار، واتە زوڵفی بۆنخۆشی تۆ کە بۆنی وەك بۆنی میسکە لە تاووسی بەهەشت دەچێ بەمەش رووی پەیوەندییەکە لە نێوان زوڵفی میسکبار و تاووسدا لە بەهەشت و رووخساری یاردا دەبێت، وەك (د. هروی) دەڵێ: لەبەرئەوەیە کە تاووس بە باڵندەی بەهەشتی دەزانن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا خودی (د. هروی) (مشکین)ی بە ڕەش لێکداوەتەوە. {ج١، ل٢٢٤}.

**٥-دل من در هوس بووی تو ای مونس جان**

**خاك  راهی ست کە در دست نسیم افتادەست**

**دلی مەن دەر هەڤەسی بووی تو ئەی مونیسی جان، خاکی ڕاهیست کە دەر دەستی نەسیم ئوفتادەست.**

ئەی هاودەمی گیان دڵی من لە ئارەزوو و حەسرەتی تۆدا، گەردی ڕێگەیەکە کە کەوتووەتە دەستی شەماڵ.

درهوس بووی تو: لە ئارەزووی بۆنی تۆدا          مونس جان: هاودەمی گیان

خاك راە: گەرد و تۆزی ڕێگە، شاعیر لە ئارەزوو و تامەزرۆیی یاری دا وەك گەردی ڕێگە ـ کە بێگومان شەماڵ لەگەڵ خۆیدا دەیانبات ـ کەوتووەتە دەستی شەماڵ و وێڵە

ئەم بەیتە جۆرە نیگەرانییەکە، یاخود روونتر جۆرە و ونبوونێکە لە یار و گەڕانە بە شوێنیدا، ئەم دیاردەیەش لە عەشقی حافزدا زۆر بەرچاو دەکەوێت، چونکە ئەو ڕێبواری ڕێگەی تەریقەتە و هێشتا بە حەقیقەت پەیوەست نەبووە، هەربۆیە بەردەوام ئەو فەیز و عینایەتە ئیلاهییە ون دەکات و ئەمەش دەبێتە مایەی خەم و خەفەتی.

دەکرێ نیگەرانی  نێو ئەم بەیتەش جۆرێك بێت لە جۆرەکانی دەردی عاشقی ڕێگەی حەقیقەت. حافز لەم بەیتەدا دا دەڵێ: ئەی هاودەمی گیان، دڵم لە  ئارەزووی تامەزرۆیی تۆدا بووەتە گەردی ڕێگە و کەوتۆەتە دەستی شەماڵ و بەملاولادا دەیبات، واتە لەو ونبوونەی تۆ من سەرگەردان و وێڵم و هەوساری کارەکانم لە دەست دەرچووە. (هروی) بووی بە بۆن شەرح کردووە و نووسیویەتی: "دڵی من بە ئارەزووی ئەوەی کە بۆنی تۆ هەڵمژێ.. {ج١، ل٢٢٥}، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم دەربڕینە ـ دڵ ئارەزووی بۆنی یاری هەبێ ـ زۆر شاز و ناباوە و دەکرێ (بۆن ـ بووی) هەمان ئەو ئومێدە بێ کە لە غەزەلی یەکەمدا هاتوە (**بە بووی نافەای کە**

آخر صبا آن طره بگشاید) و خودی د. هرویش بەوشێوەیە لێکیداوەتەوە. لەم حاڵەتەشدا واتای یەکێك لە (هوس ـ بووی) زیاد دەبێت.

**٦- همچو گرد این تن خاکی نتواند برخاست**

**از سر کوی تو زانرو که عظیم افتادەست**

**هەمچو گەرد ئین تەنی خاکی نەتەڤانەد بەرخاست، ئەز سەری کوی تو زانرو کە ئەزیم ئوفتادەست.**

ئەم جەستە خاکییەی من ناتوانێت لەسەر کۆڵانی تۆ وەك گەرد و غوبار هەستێت، چونکە زۆر توند کەوتووە.

گرد: گەرد و غوبار، تۆز          تن: جەستە

تن خاکی: جەستەی لە خاك دروستکراو     زانرو: لەو رووەوە کە، چونکە

عظیم: گەورە، بەڵام لێرەدا ئاوەڵکاری کەوتنە بە واتای زۆرتوند

حافز پێیوایە کە ئەو بە شێوەیەکی زۆر توند کەوتۆتە سەرکۆڵانی ماڵی مەعشوق یاخود یار، بەڵام ئەوانەی کە سووکن و بە سووکی لەوێ کەوتوون بە ئاسانی هەڵدەکەنرێن بۆیە بە یار دەڵێ:

ئەم جەستە لە خاك دروستکراوەی من وەك گەرد و تۆز سووك نییە هەرکاتێ بایەك هەڵی کرد لە کۆڵانی تۆ هەستێ و رەدوی کەوێ، ئەم جەستەیە ناتوانێ بەو ئاسانییە لەم ئاستانە و سەرکۆڵانە دووركەوێتەوە، چونکە زۆر توند داکوتراوە پێیدا و زۆر توند تەسلیم بووە بەو عەشقە و کەوتووە، واتە ئەم جەستەیە بە هیچ شێوەیەك ئاستانە و سەرکۆڵانت چۆڵ ناکات بارودۆخ هەرچۆن بێت.

**٧- سایەء سرو تو بر قالبم ای عیسی دم**

**عکس روح است کە بر عظم رمیم افتادەست**

**سایەیی سەرڤی تو بەر قالبەم ئەی ئیسادەم، ئەکسی روهەست کە بەر ئەزمی رەمیم ئوفتادەست.**

سێبەری باڵای دارسەروی تۆ لەسەر جەستەم ئەی عیسانەفەس، وێنەی روحێکە کە کەتۆتە سەر ئێسکی پوکاوە.

سایە: سێبەر      قالب: جەستە، مەبەست لە خود و وجودی شاعیرە      دم: هەناسە

عیسی دم: عیسا نەفەس، یەکێ لە موعجیزەکانی عیسا (د.خ) ئەوەبووە کە بە هەناسەی خەڵکی زیندووکردۆتەوە، هەر هەناسەیەك مایەی بووژاندنەوە و زیندوکردنەوە بێت پێی



دەگوترێ (عیسی دم)، لای خواجە حافز ئەم ئاوەڵناوە دەدرێتە پاڵ مەعشوق

عکس: وێنە       عظم: ئێسك  رمیم: پوکاوە        عظم رمیم: ئێسکی پوکاوە، ئێسك و پروسکی مردو کە پوکاوەتەوە، مرۆڤ پاش مردنی دەبێتە ئێسکی پوکاوە و هیچی دیکەی نامێنێتەوە شاعیر خۆی بەم ئێسکە پوکاوانە دەزانێت

هەروەها یەکێ لە موعجیزەکانی عیسا (د.خ) ئەوە بووە کە مردوو زیندوو بکاتەوە ـ بە فەرمانی خودا ـ هەربۆیە پەیوەندییەك لە نێوان خۆی و کە ئێسکی پوکاوەیە و مەعشوقدا دادەنێ کە ئەویش بە عیسانەفەس دەداتە قەڵەم و دەڵێ: ئەی یاری باڵا سنەوبەر و بەژن رێك وەك سەروو کە نەفەسی عیسایت هەیە و دەتوانی مردوو زیندوو بکەیتەوە، سێبەری تۆ لەسەر من لە وێنەی ئەو روحە دەچێت کە دەکرێت بە بەر ئێسکی پوکاوەدا و زیندودەبێتەوە، یاخود کە دەکەوێتە سەر ئێسکە پوکاوەکان. لێرەدا لە لایەکەوە نرخاندنی گەورەیی یار و بچووکی خۆیی و لە لایەکی دیکەوە پێویستی ئەمە بۆ یارێك کە دەبێتە مایەی ژیانەوەی لەکاتێکدا ئەم لە دووری یار مردووە.

**٨- آنکه جز کعبه مقامش نبُد از یاد لبت**

**بر در میکده دیدم که مقیم افتادەست**

**ئانکە جوز کەئبە موقامەش نەبوود ئەز یادی لەبەت، بەر دەری مەیکەدە دیدەم کە موقیم ئوفتادەست.**

ئەوەی کە جگە لە کەعبە لە هیچ کوێی دیکە ئارامی نەدەگرت، بە ئومێدی لێوتەوە بینیم کە لەبەر دەرگای مەیخانە بە بەردەوامی کەوتووە.

آنکە: ئەو کەسەی کە، ئەوەی کە       جز: بێجگە        مقام: شوێنی ئارام گرتن

نبُد: کورتکراوەی (نبود)ە بۆ خاتری کێشی شیعرەکە(نەبوو)      مقیم: بەردەوام، هەمیشە

ئەم بەیتە ئاماژە بە جێهێشتنی شێوازی شەریعەت و چونە نێو شێوازی تەریقەت دەکات هۆی ئەم جێهێشتنەش لای شاعیر (لێوی یارە)، کە مانای (قسە) دەگەیەنێ لە عیرفاندا و پێی وایە کە ئەو کەسەی کە هەمیشە لەسەر شێوازی شەریعەت و فیقهـ (روو لە کەعبە) خواپەرستی دەکات کاتێ دەبیستێ کە عارفەکان توانای قسەکردنیان هەیە یاخود لە غەیبەوە قسەیان گوێ لێ دەبێ، یەکسەر واز لەو شێوازە دێنن و روودەکەنە موناجات و شێوازی تەریقەت هەڵدەبژێرین و هەمیشە لەو شوێنە دەکەون کە رەمزی تەریقەتە.

د. هروی پێیوایە ئەم بەیتە ئاماژەیە بە داستانی شێخی سەنعان کە بە عەشقی کچی گاورەوە مەککەی بەجێهێشت و رووی کردە رۆم{ ج١، ل٢٢٦}.

**٩-حافظ گمشده‌را با غمت ای جان عزیز**

**اتحادیست که در عهد قدیم افتادەست**

**هافزی گومشودەرا با غەمەت ئەی جانی ئەزیز، ئیتیهادیست کە دەر ئەهدی قەدیم ئوفتادەست.**

ئەی گیانی ئازیز لە نێوان حافزی ونبوو و غەمی تۆدا، یەککگرتنێك هەیە کە هەر لە زەمانی کۆنەوە رووی داوە.

گمشده: ونبوو      اتحاد: یەککگرتن، یەککگرتنی خالق و مەخلوق      عهد قدیم: رۆژی ئەزەل، سەرەتای بوون

غەمی عەشقی یار و حافزی ونبوو پەیوەندییەکان هەیە لای شاعیر ئەو پەیوەندییە (اتحاد)یەککگرتنە و هەر لە رۆژی ئەزەلەوە رووی داوە و حافز هەر لەو کاتەوە ئەم غەمەی لەگەڵدا شێلراوە.(د. هروی) دەڵێ: مەبەست لەوەیە چونکە شاعیر رێگەی ئەسڵی گەیشتنی بە حەقیقەت نادۆزێتەوە وەك مرۆڤێکی ونبوو وایە و ونبووش هەمیشە خەم و خەفەتی هەیە{ج١، ل٢٢٦} . بەڵام لە راستیدا ئەم غەمە ئەو خەموخەفەتە دونیاییە نییە و زۆر جار حافز شانازی بە غەمی عەشقەوە دەکات و مەبەستیشی لە خەفەت نییە.



## غەزەلی چل و نۆیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- برو بەکار خود ای واعظ این چه فریادست**

**مرا فتاد دل از ره ترا چه افتادست**

**برو بەکاری خود ئەی ڤائیز ئین چە فەریادەست، مەرا فوتاد دل ئەز رەه تورا چە ئوفتادەست.**

ئەی واعیز برۆ بەلای کاری خۆتەوە ئەمە چ هاوارکردنێکە، من لە رێگە دڵم لێ کەوتووە تۆ چیت بەسەرهاتووە.

فریاد: هاوار، داد      فتاد دل از ره: دڵ لە رێگە کەوتن، ئەم ئیدیەمە بە مانای دڵ گومڕابوون یاخود دڵ پەرێشان بوونە کە لە سنووری ئاسایی ژیانی رۆژانە لادەدات ترا چه افتادست: تۆچیت بەسەرهاتووە

ئەم ناکۆکییەی نێوان حافز و واعیز هەمیشە بەردەوامە، حافز پێیوایە کە نابێ واعیز یاخود ئامۆژگارییکەرە فقهییەکان خۆیان لە کاروباری عەشق و عیرفاندا هەڵقورتێنن، هەربۆیە لێرەشدا هەمان بیروڕای خۆی دووپات دەکاتەوە و روو بەو ئامۆژگارییکەرەی کە ویستویەتی لە بارەی عەشقەوە قسە بکات دەڵێ: ئەی وتارخوێنی ئامۆژگارییکەر و برۆ بەلای کاری خۆتەوە، ئەمە چ هاوار و سەدایەکە و خەڵکی لە بارەی عەشقەوە رێنومایی دەکەی (واز لەم قسانە بهێنە و برۆ بە لای کاروباری فیقهەوە)، من دڵم سەرگەردان بووە لە رێگەی عەشقدا (حەقی خۆمە گەر هاواریش بکەم) تۆ چیت بەسەر هاتووە کە هاوار دەکەی.

**٢- بەکام تا نرساند مرا لبش چون نای**

**نصیحت همه عالم به گوش من بادست**

**بە کام تا نەرەسانەد مەرا لەبەش چون نای، نەسیهەتی هەمە ئالەم بە گوشی مەن بادەست.**

تا لێوی وەك نای من بە ئاوات نەگەیەنێت، ئامۆژگاری هەموو جیهان لە گوێی مندا وەك بایە.

کام: ئاوات      نرساند: نەگەیەنێت      نای: نەی      باد: هەوا

به گوش من بادست: له گوێی مندا هەوایە، لەگوێی مندا پوچە، واتە گوێ لە نەسیحەتی کەس ناگرم

لەم بەیتەدا ایهام (لێڵی) هەیە و ئەمەش واتای هەردوو وشەی (کام و نای) دروستی کردووە لە واتای نزیکدا (کام ـ ئاوات) (نای ـ نەی) و شرۆڤەی بەیتەکە دەبێتە: تا لێوی یارمن بە مەرامی خۆم نەگەیەنێ وەکو نەی، واتە چۆن نەی بە مەرامی خۆی گەیشتووە و هەمیشە یار لە کاتی نەی ژەندندا لێوی دەخاتە سەرلێوی نای ـ لێوی منیش بە مەرامی خۆی نەگات ئامۆژگاری هەموو جیهان لە گوێی مندا بێهودە و پوچە و گوێ لە قسەی کەس ناگرم و وەك نای هەر ناڵەم دێت.

لە واتای دووریشدا (کام ـ مەلاشو) (نای ـ بۆری هەناسە) شرۆڤەی بەیتەکە دەبێتە: تا لێوی یار من بە خۆی نەگەیەنێ وەك چۆن بۆری هەناسە گەیشتووە بە مەلاشو پێوەی لکاوە — دیسان واتە تا لێوی یار بە لێوی من نەگات — ئامۆژگاریی هەموو جیهان لای من وەك بایە و قسەی کەس ناچێ بەگوێمدا و کاریگەریی لە سەرم نابێت.

لە راستیدا هەردوو واتاکە هەمان مەبەستیان هەیە و ئەم مەبەستەش لای حافز و لە عەشقی حافزدا زۆر روون و ئاشکرایە کە گەیشنە بە یار و هەر سەرەتا حافز بۆ ئەم گەیشتنە پێی خستۆتە نێو مەیدانی عەشقی عیرفانییەوە. ئەم بەیتەش هەر روو بە ئامۆژگارییکەرە و دەڵێ: من لەم رێگەی عەشقەمدا تا بە ئاواتی خۆم نەگەم کە گەیشتنە بە مەعشوق واز ناهێنم و قسەی کەس کاریگەریی لە سەرم نابێت جا ئامۆژگاریی نەکەیت باشترە. شیاوی گوتنە لێکدانەوەی دووەم هونەرییانە نییە و دوورە لە لێکدانەوەی ئەدەبییەوە.

**۳- میان او که خدا آفریده است از هیچ**

**دقیقه‌یی ست که هیچ آفریده نگشادست**

**میانی ئو کە خودا ئافەریدەئەست ئەز هیچ، دەقیقەیست کە هیچ ئافەریدە نەگشادەست.**

کەمەری ئەو کە خودا لە هیچ دروستی کردووە، نوکتەیەکی ئاڵۆزە کە هیچ دروستکراوێك پەی پێ نەبردووە.

میان: کەمەر آفریده است: دروستی کردووە

دقیقە: نوکتەی ورد و ئاڵۆز، مەبەستی شاراوە

آفریده: دروستکراو، مەخلوق



نگشادست: نەیکردۆتەوە، بەڵام لێرەدا (پەی پێ نەبردووە) زیاتر لەگەڵ نوکتەی ئاڵۆزدا هەماهەنگی هەیە.

کەمەری مەعشوق کە هێندە باریکە دەڵێی خودا لە هیچ دروستی کردووە نەوەك لەگۆشت و خوێن و ئێسك، یاخود کەمەری ئەو کە خودا لە هیچ دروستی کردووە (هەروەك چۆن ئادەم و تەوای مەخلوقاتی لە هیچ دروستکردووە) نوکتەیەکی ورد و ئاڵۆزە و تا ئێستا هیچ مەخلوقێك نەیتوانیوە پێی بگات و پەی پێ ببات، یاخود هیچ مەخلوقێ نەیتوانیوە بەندی ئەم کەمەرە بکاتەوە و بە دیدار و ژوانی ئەو یار و مەعشوقە بگات.

**٤- گدای کوی تو از هشت خلد مستغنی ست**

**اسیر بند تو ز هردو عالم آزادست**

**گیدای کوی تو ئەز هەشت خولد موستەغنیست، ئەسیری بەندی تو ز هەردو ئالەم ئازادەست.**

سواڵکەری گەڕەکی تۆ پێویستی بە بەهەشت نییە، ئەسیری بەندی تۆ لە هەردوو جیهاندا ئازادە.

هشت خلد: هەشت بەهەشت هەشت ناوی بەهەشت بریتن لە: (خلد، دار السلام، دار القرار، جنت عدن، جنه المأوی، جنه النعیم، علیین، فردوس) مستغنیست: موستەغنییە، پێویستی پێی نییە، بێ نیازە

سواڵکەرێك کە لەئاستانەکەی تۆدا سواڵ بکات هیچ پێویستی بە (هەشت بەهەشت) نابێت، هەروەها کەسێ لە نێو بەند و زیندانی تۆدا ئەسیر بێت گوێی لە هەردوو جیهان نییە و دڵی پێیانەوە نابەسترێتەوە.لێرەدا هەمان ئەو رێبازە سۆفیگەرییە دەخرێتەڕوو کە(رابیعەی عەدەوی) خوازیاری بوو ئەویش تەنیاوتەنیا خودا و عەشقی خودا بوو، رابیعە چووبووە نێو ئەو قۆناغەی کە گوێی بە بەهەشت و دۆزەخ نەدەدا و بەلایەوە گرنگ نەبوو، بەڵکو تەنیا زاتی حەقی مەبەست بوو. شاعیر لێرەدا باس لەو مەنزیلەیە دەکات کە عارف پێی دەگات و دەڵێ: عارف گەر لە نێو عەشقی عیرفانیدا گەدا و سواڵکەریش بێت واتە لە نزمترین ئاستدا بێت، بەڵام کەوتبێتە نێو داو و بەندی عەشقی ئیلاهییەوە و تەنیا مەبەستی خودا بێت ئیدی هیچ پێویستی بە هەشت بەهەشت نابێ ـ واتە لە خۆشی بەهەشتەوە خودا ناپەرستێ ـ بەڵکو لە خۆشەویستی خوداوە خودا دەپەرستێ و گوێ بە چارەنوسی ئەو دونیا و ئەم دونیاش نادات، هەروەك وتە بەناوبانگەکەی رابیعەی عەدەوی کە سەبارەت بە خۆشەویستی خودا و پەرستشی ئەو فەرموویەتی.

**٥- اگر چه مستی عشقم خراب کرد ولی**

**اساس هستی من زان خراب آبادست**

**ئەگەر چە مەستی ئیشقەم خەراب کەرد ڤەلی، ئەساسی هەستیی مەن زان خەراب ئابادەست.**

ئەگەرچی مەستی عەشق ویرانی کردم بەڵام، بنچینەی وجودی من لەو ویرانەوە ئاوەدانە.

مستی عەشق: مەستی عەشق، ئەمانەتی (انا عرضنا الامانة..) (الاحزاب/٧٢)

خراب کرد: ویرانی کرد، لەناوی برد   ولی: بەڵام   هستی: وجود   آباد: ئاوەدان

ئەم بەیتە قسە لە سەرەتای وجودی مرۆڤ دەکات و جیاوازی ئەم لە تەواوی مەخلوقاتی دیکەی خوا، لە ئایەتی (انا عرضنا الامانة علی السموات و الأرض و الجبال فأبین أن یحملنها وأشفقن منها وحملها الأنسان انه کان ظلوما جهولا) (الاحزاب/٧٢) باس لەو جیایە دەکات کە هیچ یەکێ لە ئافریدەکانی خودا ئامادەیی هەڵگرتنی ئەمانەتی خودایی (مەستی عەشق) قورئان و تەکالیفی نەبوون تەنیا مرۆڤ نەبێ کە رازی بوو بە هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە خوداییە.

بە رای شاعیر گەرچی ئێمە ئەو ئەمانەتە ویرانی کردین، بەو واتایەی تووشی دڵەڕاوکێ و ئیختیاری کردین، چونکە جگە لە مرۆڤ لە ئارامییەکی رەهادا دەژین و چارەنووسیان مسۆگەرە بەڵام عەقڵ و ئیختیاری مرۆڤ ئەو ئارامییە رەهاییەی لێ سەندۆتەوە، بۆیە هەمیشە لە غەمدا دەژی بە هەموو جۆرەکانییەوە. شاعیر پێیوایە ئەو رازی بوونە ویران و مەستی کردین، بەڵام دیسانەوە هەر خودی شاعیر ئەم ویران بوونە بە بوونیاد و بناغەی وجودی مرۆڤ دەزانێت و دەڵێ: بنچینەی وجودی ئێمە یاخود ئەساسی بوونی ئێمە لەو ویرانییەوە ئاوەدانە، واتە ئێمە وجودی مرۆییمان بەو ویرانبوونە ئاوەدان بوویەوە ئەگەر نا هیچ وجودێکمان نەدەبوو، لە ئافەریدەکانی دیکە جیاواز نەدەبووین یان راستتر مرۆڤ نەدەبووین ئەو مرۆڤەی کە خودا دەفەرمووێ (ولقد کرمنا بنی ادم)، یاخود ئەم ویرانبوونە فەنا و ویرانی جەستە و خود بێت بۆ ئاوەدانی دڵ و روح.

**٦- دلا منال ز بیداد و جور یارکه یار**

**ترا نصیب همین کردەاست و این دادست**

**دلا مەنال ز بیداد و جۆوری یار کە یار، تورا نەسیب هەمین کەردەست و ئین دادەست.**

ئەی دڵ لە دەست زوڵم و ستەمی یار مەناڵێنە، چونکە یار ئەمەی کردووە بە نسیبی تۆ و ئەمەش عەدالەتە.

دلا: ئەی دڵ، دڵ لە دۆخی بانگکردندا   منال: مەناڵێنە

بیداد: (داد) واتە عەدالەت لێرەدا (بیداد) واتە زوڵم و ناعەدالەتی



جور: ستەم، جەور   همین: هەرئەمە   داد: عەدالەت

کاتێ مرۆڤ بڕوا بەخۆی دەهێنێت کە ئەوەی لە لایەن خوداوە پێی دراوە بەخششێکی خوداییە نەوەک حەقێکی رەهای بەندە بەسەر خوداوە، جگە لەمەش، خودا هەرگیز نایەوێ زوڵم و ستەم لە بەندەکانی بکات و کارەکانی هەمیشە راست و رێک و پێکن، ئەوکاتە ئیدی تەواوی بەخششەکان بە زیاد دەزانێت و عەشقی بۆ خودا زیاتر دەبێت، لێرەشدا حافز پێیوایە کە خودا هەرچی بەخشیوە هەرئەوە عەدالەتە، بۆیە دەڵێ: ئەی دڵ کاتێ یار تۆ تووشی زوڵم و ستەم دەکات وادەردەکەوێ کە بێ رەحمیت لەگەڵ دەکات، مەناڵێنە لەتاو ئەم ستەمە عاشقانە، چونکە خۆی ئەمەی کردووە بە نسیبی تۆ و بەشت هەر ئەمەیە و هەر ئەمەش عەدالەتە.

سودی لە شەرحەکەی خۆیدا جگە لە واتای (دادست) بە (بەخشش ـ پێدراو) لێکدەداتەوە و دەڵێ: ماناکەی دەبێتە: هەرچی کردووە بە نسیبی تۆ پێی عەتا کردویت و لە بەرامبەریدا هیچت نەداوە. {سودی، ج١، ل٢٥٧ }، بەڵام خوێندنەوەی بەم شێوەیە کە لە بنەڕەتدا (دادەست)ەو (ە)ی ـ دادە ـ سواوە، ناهەماهەنگی لە مۆسیقا و ریتمی ئەم بەیتە و بەیتەکانی دیکەدا دروست دەکات.

**٧- برو فسانه مخوان و فسون مدم حافظ**

**کزین فسانه و افسون مرا بسی یادست**

**برو فەسانە مەخان و فسون مەدەم هافز، کەزین فەسانە ڤو ئەفسون مەرا بەسی یادەست.**

حافز چیرۆك هەڵبەستە و ئەفسونگەری مەکە و بڕۆ، چونکە من زۆرم لەم چیرۆك و فێڵانە بیستووە.

فسانه مخوان: چیرۆکی ئەفسانەیی هەڵبەستە

فسون مدم: سیحرمەکە، نوشتە مەکە، (مدم) فوی پیا مەکە، چونکە جاران لە کاتی سیحر و جادو و نوشتەدا لە ژێر لێوەوە شتێك خوێندراوەتەوە و پاشان فوی پێداکراوە، بەڵام بە گشتی بە واتای ئەفسوونگەری و جادووگەری و فریودان دێت.   بس/ بسیار: زۆر

بەگوتەی د.هروی لە سەرەتای غەزەلەکەوە تا ئەم بەیتە قسەی حافزە بۆ یار، بەڵام لێرەدا یار بە حافز{ج١ ل٢٣٠} دەڵێ: ئەی حافز چیرۆك هەڵبەستە و جادوو و ئەفسوونگەری مەکە چونکە لەم ئەفسانە و جادوانە زۆر دەزانم و پێیان هەڵناخەڵەتێم.

بەڵام (سودی) ئەم (چیرۆك هەڵبەستن و جادووگەرییە) بە کاری ناپێویست و لاوەکی دەزانێت و حافز بە خۆی دەڵێ: سەرقاڵی کاروباری ناپێویست و لاوەکی مەبە، چونکە لەم شتانە زۆر دەزانم.

یاخود دەکرێ (حافز) بە واتای زمانی لێکدرێتەوە و قسەی خودی شاعیر بێت بە وانەی کە چیرۆك لەبەر دەکەن و دەیڵێنەوە و ئەو کەسانە دەربکات{ سودی، ج١، ل٢٥٨} .



## غەزەلی پەنجایەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١- زلف آشفته و خوی کرده و خندان لب و مست**

**پیرهن چاك و غزلخوان و صراحی در دست**

**زولف ئاشوفتەڤو خەی کەردەڤو خەندان لەب و مەست، پیرهەن چاك وغەزەلخان و سوراهی دەر دەست.**

پرچی تێکئاڵاو و عارەق لەسەر گۆنا و خەندە لەسەرلێو و مەست، کراسی یەخەکراوە و دەم بە غەزەل و سوراحی لەدەستدا.

آشفته: پەرێشان، تێکئاڵاو خوی کرده: عارەق کردو خندان لب: لێو بەخەندە

پیرهن/پیراهن: کراس چاك: کراوە، درز پیراهن چاك: کراسی یەخەکراوە، کراسی کراوە غزلخوان/غزلگو: دەم بەغەزەل، لە کاتی غەزەل گوتندا.

لەم بەیتەدا شاعیر وەسفی یار دەکات کە (زوڵف تێکئاڵاو و عەرەق کردو و لێو بەخەندە و مەست و کراسی یەخەکراوە و دەم بەغەزەل و سوراحی بەدەست) بووە، شیاوی وتنە وەسفەکان تەواو نەبوون و بەیتی دووەم درێژەی ئەم بەیتەیە.

وەك د. سروش لە (قصەء ارباب معرفت)دا سەبارەت بە عەشقی حافز دەڵێ: جاروبار هێندە دونیاییە کە بە تەکەلوف و بەزۆر تەئویلی عیرفانییان بۆ دەکرێت{د.عبدالکریم سروش، قصەء ارباب معرفت}، ئەم غەزەلە و بە تایبەتی بەیتەکانی پێشەوە ئەو گومانە هەڵدەگرن و بە گران دەتوانرێ یاری عیرفانی لە پشت ئەم وەسفانەی حافزەوە بدۆزرێتەوە، بەڵام دواجار دەچێتەوە ناو دونیای عیرفان و بە بڕوای من ئەو دەرچوونەی حافز بە بێئاگایی نەبووە و بە ویستی خۆی ئەو هاتووچۆیە بە خوێنەر دەکات و لە بنەڕەتدا یاری عیرفانی وجودی هەیە.

**٢- نرگسش عربدەجوی و لبش افسوس کنان**

**نیمشب دوش بە بالین من آمد بنشست**

**نەرگسەش ئەربەدەجوی و لەبەش ئەفسوس کونان، نیمشەب دوش بە بالینی مەن ئامەد بنشەست.**

بە چاوانی مەستی فیتنە ئەنگێز و لێوی سەرزەنشتەوە، نیوەشەوی شەوی رابردوو هاتە ژوور سەرم و دانیشت.

نرگس: چاوانی مەستی وەك نێرگز

عربدەجوی: کەسێ کە حەزی لە هاوار و شەڕ و بەزمە، یان کەسێك کە دنەی خەڵکی دەدات بۆشەڕکردن، فیتنە ئەنگێز، واتە حەزی لە فیتنە بازییە، یاخود فیتنە دەنێتەوە

افسوس کنان: بەگاڵتە کردنەوە، بە سەرزەنشتکردنەوە     نیم شب: نیوەشەو     بالین: پشتی، سەرین، بەڵام لێرەدا بە مانای جێگەی خەوتن بەکارهاتووە، دەکرێ لە کوردیدا لە بری (بە بالین من آمد) هاتە ژوورسەرم بەکاربرێ

سەرباری وەسفەکانی بەیتی پێشەوە دوو وەسفی دیکە بۆ یار زیاد دەکات، ئەویش چاوانی مەستی فیتنە هەڵگیرسێنەر و دنەدەری شەڕ و هەراو، لێوانی بە سەرزەنشت، بەمەش دەیەوێ بڵێ: دوێنی شەو و نیوەشەو یار بە زوڵفی تێکئاڵاو و عارقی سەر روومەتی و لێوبەخەندە و مەست و یەخەکراوە و دەم بە غەزەل و سوراحی شەراب بەدەست و چاوانی مەستی شەڕ هەڵگیرسێنەری و دەم بەگلەیی لە کاتێکدا لە خەودا بووم هاتە ژوورسەرم. هێشتا مانای بەیتەکە بەردەوامە و لە بەیتی سێیەمدا درێژەی هەیە:

**٣- سر فراگوش من آورد و به آواز حزین**

**گفت کای عاشق دیرینهء من خوابت هست**

**سەر فەراگوشی مەن ئاڤەرد و بە ئاڤازی هەزین، گوفت کەی ئاشقی دیرینەیی مەن خابەت هەست.**

سەری هێنایە بناگوێم و بە ئاوازێکی نەرم و حەزین وتی: ئەی عاشقی دێرینەی من خەوت لێدەکەوێت.

فراگوش: پەناگوێ، نزیك گوێ، لە کوردیدا دەگوترێ پەناگوێ، بناگوێ     آورد: هێنا
آواز: ئاواز     حزین: خەمبار، بەڵام لێرەدا بە مانای نەرم یا ئاوازێك کە تێکەڵاو بێت لە خەفەت وخۆشی     دیرینە: دێرینە، کۆن، دێرین     خواب: خەو

خوابت هست: خەوت لێدەکەوێ، خەوت دێ

یار بەو هەموو وەسفە جوانەیەوە دوێنی نیوەشەو هاتە سەر جێگەکەم و لە ژوورسەرم دانیشت، سەری هێنایە پەناگوێم و بە دەنگێکی نەرم و ئاوازێکی تێکەڵاو لە خەم و شادی وتی: ئەی عاشقی دێرینی من خەوت دێ؟ سودی دەڵێ: یار یان جانان دەڵێ من بەم هەموو وەسفەوە هاتوومەتە ژوورسەری تۆ، ئایا ئێستاش دیسان خەوت دێت و دیسان دەخەوی؟ هەستە با ئەو شەرابەی هێناومە نۆشی بکەین و دنیا و کاروباری دونیا فەرامۆشبکەین {ج١،ل٢٠١} . بەڵام خواجە خۆی هیچ ئاماژەیەکی بەم جۆرە قسەیە نەداوەوە هەر ئەمەش



جارێکی دیکە دەمانباتەوە نێو عیرفان و لە عەشقی مەجازی جودامان دەکاتەوە، چونکە گەر بە شەرحەکەی سودی بێت بە تەواوی دەبێتە عەشقی دونیایی، بەڵام بەیتی چوارەم بە ئاراستەی عیرفاندا دەڕوات.

**٤- عارفی را که چنین ساغر شبگیر دهند**

**کافر عشق بوود گر نشود بادەپرست**

**ئارفی را کە چونین ساغەری شەبگیر دەهەند، کافری ئیشق بووڤەد گەر نەشەڤەد بادەپەرست.**

عارفێك کە بەم شێوەیە نیوەشەو پێکی بدەنێ گەر نەبێتە بادەپەرست کافری عەشق دەبێت.

ساغر: پێك     شبگیر: لەکاتی شەودا، نیوەشەو     دهند: بیدەنێ

ئەگەر لە نیوەشەودا یاری عیرفانی بەو هەموو وەسفەوە کە کرا پێکێکی دایە دەستی عارف و ئەو عارفە بە تەواوی تەسلیمی ڕێگەی عیرفان نەبوو، ئەوە کافری ڕێگەی عەشق دەبێت و بە کەڵکی عیرفان نایەت.

سودی دەڵێ: ڕەخنە لە خواجە حافز گیراوە کە چۆن ناکرێ عارف بێت و بادە لە دەستی مەعشوق وەرنەگرێت و نەیخواتەوە، ئەمە لەگەڵ ویستی عارفدا یەکنایەتەوە، چونکە هەموو ئاوات و مەرامی عارف ئەمەیە ـ و لەلایەکی دیکەوە مەرجی عیرفان تەسلیمبوونی بێ مەرجە لە بەرامبەر مەعشوقدا لە تەواوی مەسەلەکاندا {ج١، ل٢٠٢} .

**٥- برو ای زاهد و بر دردکشان خرده مگیر**

**که ندادند جز این تحفه به ما روز الست**

**برو ئەی زاهید و بەر دووردکەشان خوردە مەگیر، کە نەدادەند جوز ئین توهفە بە ما روزی ئەلەست.**

ئەی وشکە زاهید بڕۆ و ڕەخنە لە بادەنۆشان مەگرە، چونکە لە یەکەم ڕۆژی خەلقەوە جگە لەم دانسقەیە هیچیان بە ئێمە نەداوە.

زاهد: ئەو وشکەسۆفیانەن یاخود ئەو وشکەدیندارانەن کە هەمیشە خەریکی ڕەخنەگرتنن لە خەڵکی و خۆیان بیرچووە لە کاتێکدا خۆیان تەنیا بە ڕواڵەت زاهیدن

دردکش: ئەوانەی کە خڵتەی شەراب دەنۆشن، بەگشتی مەبەست لە بادەنۆشان و عارفانی هەژاری ڕێگەی تەریقەتە     خردە: ڕەخنە     خردە مگیر: ڕەخنە مەگرە
ندادند: نەیانداوە     تحفە: دانسقە، توحفە

شاعیر عاشقی و عارفی بە شتێکی دانسقە و توحفە دەزانێت کەوا هەر لە رۆژی قەزا و قەدەرەوە بە خەلآت دراوەتە هەندێ لە مرۆڤەکان، لێرەدا بەو وشکەئیماندرانە دەڵێ: کە خۆیان بە زاهید دەزانن رەخنە لە عارف و سۆفیە راستەقینەکان دەگرن کە خەریکی عیرفانن چونکە هەر لە سەرەتای قەزاوقەدەرەوە خودا ئەوەی بە خەلآت پێ داون یاخود ئێمە ئەم رێگەیەمان بە ئارەزووی خۆمان هەڵنەبژاردووە هەر لە رۆژی ئەزەلەوە بۆمان دانراوە، ئیتر رەخنە لە چی دەگرن.

**٦- آنچه او ریخت به پیمانەء ما نوشیدیم**

**اگر از خمر بهشت است و گر از بادەء مست**

**ئانچە ئو ریخت بە پەیمانە ما نوشیدیم، ئەگەر ئەز خەمری بیهیشت ئەست و گەر ئەز بادەیی مەست.**

ئەوەی ئەو کردییە پێکەکەی ئێمەوە نۆشیمان ئەگەر لە شەرابی بەهەشتە یا بادەی مەست.

ریخت: رژاند، بەڵام لە کوردیدا لەگەڵ شەراب و چا و شەربەت و..هتد (تێکردن) بەکاردێت، بە مەرجێ بۆ نێو پێك یا پیاڵە یاخود پەرداخ بێت          پیمانە: پێك          ما: ئێمە.   نوشیدیم: خواردمانەوە، نۆشمان کرد          خمر بهشت: شەرابی بەهەشت (شرابا طهورا) بادەء مست: شەرابی سەرخۆشکەر، (سودی) پێیوایە بادەی مەست — واتای شەرابی سەرخۆشکەر ناگەیەنێ، بەڵکو بە واتای شەرابی بکوژە — بادەء قتال — {ج١، ل٢٠٣}

درێژەی بەیتی پێشووە و هەمان ئەو (توحفە — دانسقە)یە کە لە رۆژی ئەزەلەوە بە مرۆڤ دراوە، شاعیر بۆ رەت دانەوەی قسەکانی  وشکە زاهید دەڵێ:  ئێمە بۆ خۆمان نەچووین سەری قەزاوقەدەر لادەین و خۆمان لە گۆزەکانی قەدەر شەراب بکەینە پێکەکانمانەوە، بەڵکو ئەوەی ئەو کردییە پێکەکانمانەوە نۆشمان کرد، واتە بەوپەڕی رەزامەندییەوە ئەوەی لە رۆژی ئەزەلەوە بە باڵاماندا بڕاوە پێی رازی بووین، ئەگەر ئەو تەقدیرەی رۆژی ئەزەل شەرابی شیرین و پاکی بەهەشت بێت یاخود شەرابی تاڵی دونیایی واتە ئێمە بە خۆشی و تاڵییەکان بۆمان نووسراوە و پێشی رازین، بێگومان حافز ئەم بەشەی بە دڵە و لە جێگەیەکی دیکەدا دەڵێ:  **(کە هرچە ساقی ما کرد عین الطاف است)**

**٧- خندەء جام می و زلف گرەگیر نگار**

**ای بسا توبە کە چون توبەء حافظ بشکست**

**خەندەیی جامی مەیی و زولفی گرەهگیری نیگار، ئەی بەسا تۆوبە کە چون تۆوبەیی هافز بشکەست.**



خەندەی پێکی مەی و پرچی لول و تێکئالآوی یار ئای چەندەها تۆبەی شکاند کە وەك تۆبەی حافز بوون.

خندەء جام می: خەندەی پێکی مەی، لەرینەوەی مەیی لە نێو پێکدا بە خەندە داوەتە قەڵەم     گرەگیر: لول و تێکئالآو، سودی دەڵێ: کاتێ پرچ و قژی تەڕ دەکرێتە پەلکە پاشان کە وشکبوویەوە بەردەبێتەوە و شانەدەکرێت، لەم حاڵەتەدا وەك زنجیر لول و تێکئالآو دەوەستێ و زۆر سەرنجڕاکێشە {ج١، ل٢٠٣}

نگار: ناوێکی یارە لە ئەدەبیاتی فارسیدا، نیگار          بسا: زۆر          چون: وەکو، چۆن

خەندە و لەرینەوەی سەرنجڕاکێشی پێکی مەی و پرچی تێکئالآوی یار چەندەها تۆبەی وەك تۆبەی حافزی شکاندووە.

ئەمە واتای سەرزارەکی بەیتەکەیە سودی دەڵێ: (ای) لێرەدا بانگکردنی (یارانە) واتە ئەی یاران چەندەها تۆبەی وەك تۆبەی حافز شکان، بەڵام واپێدەچێ (ای) لێرەدا بۆ سەرسوڕمان بەکارهاتبێ نەوەك (ئەی یاران) بێت. بەڵام وەك چەند جاری دیکەش گوترا (زوڵفی لول و تێکئالآو) لە عیرفاندا واتای نهێنییە خوداییەکان دەگەیەنێت و (جام)یش حاڵەکانی نێو سۆفیگەری، بەمەش ئیدی واتایەکی دیکەی شاراوە خۆی نمایش دەکات کە بریتییە لە:

سەرنجڕاکێشی و خەندەی حاڵەکانی نێو سۆفیگەری و تەریقەت و نهێنییە خوداییەکان هێندە سەرسوڕهێنەرن کە چەندەها تۆبەی وەك تۆبەی حافزی شکاند. بێگومان مرۆڤ کاتێ تۆبە دەکات لە خراپەکاری و بەرەو ئیسلام دەگەڕێتەوە بە شەریعەت و شتە سەرزارەکییەکانی دین ئاشنا دەبێت، بەڵام پەیتاپەیتا و لەگەڵ زیاتر رۆچوونی لە نێو دونیا فراوان و بێ کەنارەکانی وەك عیرفان و سۆفیگەری و.. هتد کە هەموویان لە مەعریفەتی پاش تۆبەوە سەرچاوە دەگرن، ئیدی ئەو تۆبەیەی دەشکێنێ و دیسانەوە تۆبەیەکی دیکە دەکات، یاخود دەکرێ (حافز) چەندەها جار تۆبەی لەوەکردبێ کە واز لە تەریقەت و عیرفان بهێنێ، بەڵام سەرنجڕاکێشی خەندەی حاڵەکانی تەریقەت و نهێنییە خوداییەکان تۆبەکەی شکاندبێ و ئێستا گەیشتبێتە ئەو بڕوایەی کە ئەم سەرنجڕاکێشییە چەندەها تۆبەی وەك تۆبەکەی ئەمی شکاندووە و دەشکێنێ.

د. هروی لە کۆتایی ئەم غەزەلەدا بە شێویەکی گشتی لە غەزەلەکە دواوە و پێیوایە زۆرینەی وەسفەکانی وەسفی مرۆڤییە و سەراسەری غەزەلەکە بەستراوە بە یەکەوە و وەسفی رووداوێکە و هەر خۆی دەڵێ: دەرهێنانی واتا عیرفانییەکانی ئەم غەزەلە لە توانای بەندە بەدەرە{ ج١، ل٢٣٢ — ٢٣٤}

له راستیدا ئەمە تەوازوعێکی گەورەیە بەندەش هەمان قسە دووبارە دەکەمەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە وەك هەر غەزەلێکی دیکە دەتوانرێ تروسکاییەك بگرە رووناکییەکی تەواوی عیرفانی لەم غەزەلەشدا ببینرێت. لە لایەکی دیکەوە ئەو پێکبەستراوییەی کە د. هەروی ئاماژەی پێدەدا بەو شێوە توندوتۆڵەش نییە و دەکرێ بگوترێت هەمان ئەو پەیوەندییە قووڵەیە کە لە غەزەلەکانی دیکەشدا تا رادەیەك دەبینرێن.



## غەزەلی پەنجا و یەکەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١-بی مهر رخت روز مرا نور نماندەست**

**وز عمر مرا جز شب دیجور نماندەست**

**بی میهری روخەت روزی مەرا نور نەماندەست، ڤەز ئومر مەرا جوز شەبی دەیجور نەماندەست.**

بێ میهری رووت رۆژی من رووناکی لێ بڕاوە و جگە لە شەوی دەیجور هیچ لە تەمەنی من نەماوە.

مهر: خۆشەویستی، رۆژ، لێرەدا بە هەردوو واتاکە بەکاردێ. گەر واتای ئاشکرای بەکاربهێنرێ مەبەست لە (رۆژ، هەتاو)ە، بەڵام وەك سروشتی شیعری حافز، لێرەدا واتای لێڵی (ایهام) بەکارهاتوە کە مانای خۆشەویستییە.

رخت: رووخسارت　　نور: رۆشنایی، نور　　نماندست: نەماوە، لێبڕاوە

جز: جگە　　دیجور: دەیجور، تاریك

شب دیجور: شەوی دەیجور، شەوی تاریك، دەیجور بە واتای تاریکترین شەوی ساڵیش دێت کە تاریکەشەوە، لێرەدا بە مانای شەوی زۆرتاریك هاتووە

گەر (مهر) بە مانای هەتاو بێت ئەوا دەڵێ: ئەی یار بەبێ رووخساری تۆ کە وەك خۆر/هەتاو وایە، رۆژی من رووناکی لێبڕاوە و تاریکە و هەموو تەمەنم بووەتە شەوی تاریك کە تەمەنم جگە لە شەوی دەیجور هیچی نەماوە.

گەر (مهر) خۆشەویستی بێت دەڵێ: ئەی یار بە بێ خۆشەویستی رووخساری تۆ رۆژم نوری لێ بڕاوە و هەموو تەمەنم جگە شەوی دەیجور هیچی نەماوە.

**٢- صبرست مرا چارەء هجران تو لیکن**

**چون صبر توان کرد کە مقدوور نماندەست**

**سەبرەست مەرا چارەیی هیجرانی تو لیکەن، چون سەبر تەڤان کەرد کە مەقدوور نەماندەست.**

لە دووری تۆدا چارەی من تەنیا ئارامگرتنە، بەڵام چۆن دەتوانرێ ئارام بگیرێت کە توانای ئارامگرتن نەماوە.

مرا چارهء هجران تو: چارەی دووری تۆ بۆ من     چون: چۆنچۆنی

توان کرد: دەتوانرێ بکرێت  مقدوور: بووار، مەجال، ئیمکان، ئەوەی لە توانای مرۆڤدا بێت

دووری یار تەنیا چارەیەکی هەیە ئەویش ئارامگرتنە و شاعیر خۆشی ئەم راستییە باش دەزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێیوایە کە ئارامگرتن لە توانا بەدەرە و زۆر نارەحەتە، هەربۆیە چۆن دەتوانرێ سەبر بکرێت.

بێگومان ئەو یارەی تەنیا چارەی دووری لەو ئارامگرتن بێت لە هەموو وەسفە دونیاییەکان دەچێتە دەرەوە. چونکە گەر مرۆڤ بێت رێگایەك ـ هەرچۆن بێت ـ پەیدا دەبێ بۆ بەیەکگەیشتن، بەڵام یاری عیرفانی ـ خودا ـ یە، کە جگە لە ئارامگرتن تا ئەو رۆژەی خۆی بریاری لیقادەدات کەس ناتوانێ پێشی بخات، بەڵام لە هەمانکاتیشدا حافز دەڵێ: ئارامگرتن لە توانای مندا نییە.

**٣- هنگام وداع تو ز بس گریه که کردم**

**دوور از رخ تو چشم مرا نور نماندەست**

**هەنگامی ڤەدائی تو ز بەس گریە کە کەردەم، دوور ئەز روخی تو چەشمی مەرا نور نەماندەست.**

لە کاتی خواحافیزی تۆدا هێندە گریام، دووربێ لە روی تۆ چاوانی من رووناکی نەماوە.

هنگام: لە کاتی، کاتی     وداع: خواحافیزی، ماڵئاوایی

گریە: گریان     گریەکردم: گریام

دوور از رخ تو: دووربێ لە رووی تۆ، دۆعا ونزایەکە، لە کاتێکدا کە رووداوێکی تراژیدی یاخود بەڵایەك دەگێردرێتەوە ئەم ئیدیەمە بەکاردەهێنرێ، واتە تۆ لەو بەڵایە دووربیت بۆ نموونە دەگوترێ (دووربێ لەم ماڵە).

شاعیر لە ئەنجامی زۆر گریانی لەکاتی خوداحافیزی و ماڵئاوایی لە یار هێندە گریاوە کە رووناکایی چاوەکانی لەدەستداوە و کوێر بووە ئێستا ئەم رووداوە بۆ یار دەگێڕێتەوە و پێی دەڵێ: لە کاتی ماڵئاواییتدا هێندە گریام و فرمێسکم رشت، چاوەکانم رووناکاییان نەما یاخوا ئەم بەڵایە لە تۆ دووربێ.

یاخود دەکرێ ئەم دەربڕینە ئیدیەم نەبێ و وەك هەواڵ بێ: لە کاتی رۆشتن و ماڵئاواییتدا زۆر گریام و ئێستا لە دووری رووی تۆ رووناکی چاوم نەماوە.



**٤- می رفت خیال تو ز چشم من و می گفت**

**هیهات ازین گوشه که معمور نماندەست**

**می ڕەفت خیالی تو ز چەشمی مەن و می گوفت، هەیهات ئەزین گوشە کە مەئمور نەماندەست.**

خەیاڵی تۆ لە چاومدا دەڕۆشت و دەیگوت: ئەفسووس لەم گۆشەیە کە بە ئاوەدانی نەماوە.

می رفت: دەڕۆشت     می گفت: دەیگوت     هیهات: هەیهات، ئەفسووس، وشەی خەم و ئەفسووسە     ازین: لەم     گوشە: گۆشە، مەبەستی چاوە

معمور: ئاوەدان

شاعیر لەبەر دووری یار چاوانی رووناکییان نەماوە و بووەتە وێرانە، پاش ئەو رۆشتنەش خەیاڵ و یادگارییەکانی یار کە لە پێشچاوی بوون، یاخود کە لە نێوچاوانیدا پاراستبوونی دەڕۆشتن و چاوانیان بەجێدەهێڵا، یاخود راستر وایە بەجێیان دەهێڵاو کاڵدەبوونەوە لەم کاتەدا خەیاڵەکانی تر دەیانووت ئەفسووس بۆ ئەم گۆشەیە، بەداخەوە وێران بووە و ئاوەدانی نەماوە.

**٥- وصل تو اجل را ز سرم دوور همی داشت**

**از دولت هجر تو کنون دوور نماندەست**

**ڤەسلی تو ئەجەل را ز سەرەم دوور هەمی داشت، ئەز دۆولەتی هیجری تو کنون دوور نەماندەست.**

دیداری تۆ ئەجەلی لە من دووردەخستەوە، بەڵام ئێستا لە بەرەکەتی دووری تۆوە لێم دوورنییە.

اجل: ئەجەل، مۆڵەت، ماوەی دانراو بۆ تێپەڕاندنی شتێك، لێرەدا مەبەست لە وادەی مەرگە(لەرووی سەرزارییەوە)     همی داشت:دەیخستەوە

زسرم دوور همی داشت: لێمی دووردەخستەوە     دولت هجر: بەرەکەتی دووری، بە هۆی دووری     دوورنماندست: دوورنییە، بەدوور نەماوەتەوە، نزیکە.

شاعیر ژیانی خۆی بە وابەستەی دیدار و بەیەکگەیشتنی یار دەزانێت و پێیوایە جاران کە لە یار نزیك بوو دیداری لەگەڵدا دەکرد و ژوانییان هەبوو ئەجەل دەستی پێی نەدەگەیشت و ئەمەش بە هۆی ئەو ژوانەوە بوو، بەڵام ئێستا لە سایەی دوورییەوە ئەو سێبەری دیدار و ژوانە نەماوە و ئەجەلیش دوورنییە و نزیکە، واتە من بە ژوانت زیندوبووم ئێستا کە نەماوە دەمرم.

**٦- نزدیک شد آن دم که رقیب تو بگوید**

**دوور از درت آن خستهء مهجور نماندەست**

**نەزدیك شود ئان دەم کە ڕەقیبی تو بگویەد، دوور ئەز دەرەت ئان خەستەیی مەهجور نەماندەست.**

نزیکبوویەوە ئەو کاتەی کە پاسەوانی بەردەرگای تۆ بڵێت، دوور لە دەرگای تۆ ئەو ماندووە دەرکراوە نەماوە.

نزدیك شد: نزیکبوویەوە، کاتیەتی        آن دم: ئەوکاتەی

رقیب: پاسەوانی بەردەرگا، ڕەقیب، لە ئەدەبیاتدا (ڕەقیب) بە مانایەکی دیکە دێت کە کاتێ دووکەس یەك کەسیان خۆش بووێ ئەوا ڕەقیبی یەکترن. بەڵام لێرەدا بە مانای فەرهەنگی خۆی (پاسەوانی بەردەرگا) بەکارهاتووە.

دوور از درت: دوور لە دەرگای تۆ، دەکرێ ئەم دەربڕینە ئیدیەم بێ و بە واتای (دووربێ لە دەرگای تۆ) یاخود هەواڵ بێت واتە لە جێگەی دوور لە ماڵەکەی تۆ کە هەردووکیان جێگەی تێرامانن        خستە: نەخۆش، ماندوو، هیلاك

مهجور: دەرکراو، پشتگوێخراو        نماندست: نەماوە، مردوە، لە ناوچووە

شاعیر لە ئەنجامی دووری یار ڕووناکی چاوانی نەماوە و خەیاڵی یاریش بەجێیهێشتووە و بە دیداری ئەویشەوە ئەجەل زەفەری پێ نەبردووە، ئێستاکە لە سایەی دووری و هیجرانەوە دەڵێ: ئەی یار ئەو کاتە نزیکبوویەوە کە پاسەوانی بەردەرگاکەت پێت بڵێ کە دوور بێ لەم ماڵە ئەو هیلاك و ماندووە، پشتگوێ خراوە مردوە یاخود ئەو ماندووە پشتگوێخراوە دوور لە دەرگای تۆ مردووە و نەماوە.

**٧- من بعد چه سود ار قدمی رنجه کند دوست**

**کز جان رمقی در تن رنجور نماندەست**

**مەن بەئد چە سود ئەر قەدەمی ڕەنجە کونەد دوست، کز جان ڕەمەقی دەر تەنی ڕەنجور نەماندەست.**

لەمەو پاش ئەگەر دۆست تەشریف بهێنێ چ سوودێکی هەیە، لە کاتێکدا پاشماوەی گیانیش لە جەستەی زەحمەتدیدەمدا نەماوە.

من بعد چه سود: پاش ئەمە چ سوودێکم پێ دەگات        ار: ئەگەر



قدم رنجەکردن/قدم رنجەفرمودن: زەحمەتی ڕێگە قەبووڵ کردن، زەحمەتکێشان، بەئەدەبەوە هاتن، تەشریف هێنان        کز: کە لە        رمق: پاشماوەی گیان، توانا و وزە

رمقی: تۆزقاڵە گیانێکیش        تن: جەستە        رنجور: زەحمەتدیدە، ڕەنجدیدە، زەحمەتکێش

شاعیر لە دووری یار مردنی بۆ خۆی بڕیارداوە، ئیدی گەیشتۆتە دوادواییەکانی گیانکەنشت و ئێستا ئیدی لە حاڵی گیانکێشانە و دەڵێ: ئیدی لەمەوپاش گەر یار زەحمەت بکێشێ و بۆ دیدەنم هەنگاوهەڵگرێ و تەشریف بهێنێ هیچ سوودی نییە، چونکە گەیشتوومەتە ئەو حاڵەتەی کە پاشماوەی گیانیشم لە جەستەی زەحمەتدیدە و زەحمەتکێشمدا نەماوە و لەدەست چووم.

**٨- در هجر تو گر چشم مرا آب نماند**

**گو خون جگر ریز که معذور نماندەست**

**دەر هیجری تو گەر چەشمی مەرا ئاب نەمانەد، گو خونی جیگەر ریز کە مەئزور نەماندەست.**

ئەگەر لە دووری تۆدا چاوانی من فرمێسکیان لێ بڕا، بڵێ خوێنی جگەر بڕژە کە بیانووی نەماوە.

نماند: نەمێنێت، لێ ببڕێت        خون: خوێن        ریز: بڕژە

معذور: مەعزور، مۆڵەتپێدراو، بیانووبەدەست

شاعیر بە یار دەڵێ: گەر لە دووری تۆ ئاوی چاوانم وشکیان کردووە بڵێ لە بری فرمێسکی چاوان خوێنی جگەر بڕژە، چونکە ئیدی جگەر مەعزور نییە و بیانووی نەماوە پێی بڵێ ئاوی چاوان تەواوبوو دەبێ خوێنی جگەر بڕژێ.

**٩- حافظ ز غم از گریه نپرداخت به خنده**

**ماتم زده را داعیهء سور نماندەست**

**هافز ز غەم ئەز گریە نەپەرداخت بە خەندە، ماتەمزەدە را دائییەیی سور نەماندەست.**

حافز لە خەم، لە گریان فریای پێکەنین نەکەوت، مرۆڤی تەعزیەدار ئومێدی خۆشی نەماوە.

پرداخت: مەشغوڵ نەبوو، فریانەکەوت، نەپیەرژایە

ماتم زدە: پرسەدار، غەمگین، خەفەتبار

داعیە: ئەنگێزە، پاڵنەر، هۆکار، عیلەت، تەوەقوع        سور: خۆشی و سرور

بێگومان مرۆڤی پرسە و تەعزیەدار پاڵنەرێکی نییە بۆ شادی و خۆشی و هەمیشە مات و مەلولە، حافزیش دەڵێ: من لەتاو گریان و خەم و خەفەت هەرگیز مەشغوڵی خەندە نەبووم کە لێرەدا خەندە هێمای خۆشی و سرورە، ئەمەش ڕاستییەکە کە مرۆڤی پرسەدار کە منم ئەنگێزە

و پاڵنەرم نییە بۆ خۆشی و سرور، حافز پێیوایە کە لە ژیاندا وەك پرسەدارێك ژیاوە و هیچ پاڵنەرێکی نەبووە بۆ شادی.

سەراپای ئەم غەزەلە بە تایبەتی بەیتەکانی پێشەوە گوزارشت لە ناخی کەسێك دەکەن کە لە شەوقی دیداری یاردا دەسوتێ، ئەو یارەی کە پێشتر دیداری لەگەڵ عارف و عاشقدا هەبووە و بووەتە مایەی ژیان پێ بەخشین، بەڵام هەنووکە ئەو وەسڵ و ژوانەی بە هیجران و دووری گۆڕاوە و ئەم هیجر و دوورییەش قۆناغ بە قۆناغ بووەتە مایەی مەرگی عاشق، کە دەکرێ گوزارشت لە دووریی بکات لە وەسڵ و حاڵەکانی نێو تەریقەت و پچڕانی فەیزی ئیلاهی.

ئەم غەزەلە باس لە نەمانی فەیز و بێ ئومێدبوونی حافز دەکات کە تا سەر ئێسقان لە (قبض) نووسراوە.



## غەزەلی پەنجا و دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- شکفته شد گل حمرا و گشت بلبل مست**

**صلای سرخوشی ای صوفیان وقت پرست**

**شکوفتەشود گولی هەمراڤو گەشت بوولبوول مەست، سەلای سەرخوشی ئەی سوفییانی ڤەقت پەرەست.**

پشکوت گوڵی سوور و بوولبوول مەست بوو، سەڵای سەرخۆشییە ئەی سۆفییانی کات پەرست.

شکفته: پشکۆتوو حمرا: سوور

گشت: لێرەدا فرمانێکی ناتەواوە و لەگەڵ (مست)دا فرمانێکی لێکدراوی پێکهێناوە و واتای (بوو) دەگەیەنێ، واتە: مەست بوو

صلا: سەڵا، بانگکردنی خەڵك بۆ نوێژ، بانگکردن صلای سرخوشی: بانگهێشتی شادی صوفیان وقت پرست: سۆفیانی کات پەرست، (د.هەروی) سۆفی وقت پرست بەوە لێکدەداتەوە کە لە ئێستادا خۆشحاڵن و لە بیری رابردوو، و داهاتوودا نین.

ئەگەر سوفی کات پەرست بە واتای دووەم لێکدرێتەوە، ئەوا هەر لە سەرەتاوە شیعرەکە بانگهێشتە بۆ سۆفییە بێ باکەکان کە وەرزی سەرخۆشی و حاڵە و هەموو شتێ ئامادەیە، چونکە گوڵی سوور پشکۆتووە و بوولبوول مەست بووە. ئەم دووانەش دەکرێ ببنە بانگهێشتی سەرخۆشی و سەرمەستی، ئەی ئەو سۆفیانەی لە بیری ئێستادان و گوێ بە دوێنی و بەیانی نادەن (ابن الوقت)ن، ئەم بۆچوونە بە شێوەیەکی پۆزەتیڤی لە سۆفی دەڕوانێت، بەڵام گەر سۆفی کات پەرست بە سۆفی ریاکار لێکدرێتەوە (هەروەك سودی وایکردووە) و زیاتریش ڕێی تێدەچێ ـ چونکە حافز بە زۆری لە هێنانی نیاوی سۆفیدا لایەنە نێگەتیڤییەکەی دەهێنێتە ئاراوە ـ ئەوا مانای بەیتەکە دەبێتە:

وەرز وەرزی عیرفان و چوونە نێو دونیای مەستی و سەرخۆشییە و هەموو ئاماژەکان لە بارن بۆ چوونە نێو دنیای سەرخۆشی و سەرمەستی، ئەی سۆفی ریاکار تۆ مەشغوڵی شتی دیکەی دنیایت و ئاگات لەو سەڵا و بانگهێشتە نییە کە سروشت بە پشکوتنی گوڵی سوور و مەستی بوولبوول دەتکات بۆ مەستی عیرفانی.

**٢- اساس توبه که در محکمی چو سنگ نمود**

**ببین که جام زجاجی چه طرفه‌اش بشکست**

**ئەساسی تۆبە کە دەر موهکەمی چو سەنگ نەمود، بـبین کـە جـامی زوجـاجی چـە تورفەئەش بشکەست.**

بنچینەی تۆبە کـە لـە مەحکەمیـدا وەك بـەرد دەکەوتـە بەرچـاو، سـەیرکە چـۆن پێکـی شووشەیی بە شێوەی سەرسوڕهێنەر شکاندی.

اساس: ئەساس، بنچینە، بناغە    محکم: مەحکەم، بەهێز

سنگ: بەرد    زجاجی: شووشەیی    طرفه: سەرسوڕهێنەر

جاران تۆبەکردن لە نێو موسوڵمانانـدا زیاتر لە کـاری بـەد و خراپـەکان بـوو کـە بـە زۆری مـەیخۆری یـەکێك بـوو لەوانـە، کـاتێ کەسـێك تۆبـەی دەکـرد وەك ڕەمزێـك بـۆ تۆبـەکردن شووشەیەکی شەرابیان بە بەرد دەشکاند. خواجە، لێرەدا ئەم دیاردەیەی پێـچەوانە کردۆتـەوە و لە بری بەرد شووشەکان بشکێنی شووشەی مەی تۆبە مەحکەمەکە وەك بـەردەکان دەشـکێنێ، واتە: ئەو تۆبەیەی کە لە بەهێزی و مەحکەمیدا وەك بەرد ڕەق بوو کەچـی بـە دەسـتی پێکـی مەی بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر شکا.

لە رووکاری بەیتەکەدا واهەست دەکرێ کە شاعیر پەشیمانبۆتەوە لە تۆبە و جارێکی دیکـە گەڕاوەتەوە سەر مەیخۆری و ئەویش بە شێوەیەکی زۆر عەجایەب، بەڵام لـە راسـتیدا ئاماژەیـە بەوەی کە عیرفان و جیلوە مەسـتیهێنەرەکانی عیرفـان، زۆر سەرسـوڕهێنەرانە تۆبـەی یەکـەم جاریان لە بنچینە هێنام و لە شەریعەتەوە جارێکی دیکە چوومە نێو تەریقەت.

**٣- بیـــار بـاده کـــه در بـارگــاه اســـتغــنـا**

**چه پاسبان و چه سلطان چه هوشیار و چه مست**

**بیار بادە کە دەر بارگاهی ئیستیغنا، چە پاسـبان و چـە سـولتان چـە هوشـیار و چـە مەست.**

شەراب بهێنە، چونکە لە بارەگای ئیـستیغنادا پاسـەوان و سـوڵتان و مەسـت و هۆشـیار وەك یەکن.

بارگاه: بارەگا

استغنا: بە واتای پێویست بەکەس نەبوون دێت، یەکێکـە لـە سـیفاتەکانی خـوا، لێرەشـدا ئاماژەیە بەوەی کە خودا پێویستی بە پەرستشی هیچ یـەکێك لـە بەنـدەکانی نییـە، بێنیـازی بارگاه استغنا: بارەگای بێ نیازی، بارەگای خودای موستەغنی.



خواجە پێیوایە کە خودای گەورە کـە هـیچ کـات پێویـستی بـە بەنـدەکانی نییـە، کـاتێ مرۆڤەکان دەچنەوە بارەگای ئەو هەمووو یەکسانن و جیاوازی لە نێوانیاندا نییە و چ پاسـەوان و پاشا یاخود چ مەست و هۆشیار کە توێژی جیاوازن لە نێو کۆمەڵگادا.

**٤- ازین رباط دودر چون ضرورت است رحیل**

**رواق و طاق معیشت چه سربلند و چه پست**

**ئەزین ریباتی دودەر چون زەرورەتەست ڕەهیل، ڕەڤاق و تاقی مەئیشەت چە سەربوولەند و چە پەست.**

چونکە ڕۆشتن لەم کاروانسەرا دوو دەرگاییەدا بە ناچاری و زەرورییە، تاق و سەقفێك کە بـۆ ژیانی دروست دەکەین چ بەرز بێت و چ نزم.

رباط:کاروانسەرا    در: دەرگا

رباط دو در: کاروانسەرای دوو دەرگا، مەبەست لێـی دونیایـە کـە لـە دەرگـای لـە دایـك بوونەوە دەبێینە ژوورەوە و لە دەرگای مەرگەوە لێی دەردەچین، کاروانسەراش بـە هـەمان شـێوە دوو دەرگای هەیە کە دەرگای هاتنە ژوورەوەی جودایە لە چوونە دەرەوە    رحیـل: کۆچـکردن، بەجێهێشتن    رواق: تاقی کەوانەیی بەردەم ماڵ و هەیوان    طـاق: سەقفی بەرزو چەماوە    معیشت: ژیان    سربلند: بەرز، سەربڵند    پست: نزم، پەست، کەم

هەمان بۆچوونە هەمیشەییەکانی حافزە سەبارەت بـە دونیـا کـە دونیـای بەهەنـد نـەگرتووە و هەمیشە پێیوایە کە ڕەوتەنێ و پێویست ناکات هێندە خۆمان بە دونیاوە خەریك بکـەین: لێرەشـدا دونیا بەو کاروانـسەرایە دەچـوێنێ کـە بـۆ ماوەیـەکی کـورت تیایـدا نیـشتەجێ دەبـین و پاشـان تێدەپەڕین، ئیدی پێویست ناکات لە بیری جوانکردنی ئەم کاروانسەرایەدا بین، دەڵێ: ئێمە ناچارین و پێویستە کە ئەم کاروانسەرا دوو دەرگایە بەجێبهێڵین و تێپەڕین، هەربۆیە تاق و سەقفەکانی ژیـان و بژێوی کە ئاست و پلەکانی ژیانن هەرچۆن بن جیاوازییەکی نییە، یاخود سوودێکی نییە چ بەرز بن و لە دواپلە و ئاستەکاندا بن یاخود لە پەستترین و کورتترین ئاسـتەکانی خـوارەوەدا جیـاوازی نییـە، مادام ڕۆژێ دادێ بە ناچاری بەجێیدەهێڵین و دەڕۆین، هەربۆیەشـە مـرۆڤ چـاکتر وایـە بـە کرۆکـی شتەکانەوە خۆت خەریك کەی نەوەك بە شتە سەرزارەکییەکانەوە.

**٥- مقام عیش میسر نمی شود بی رنج**

**بلی به حکم بلا بسته‌اند عهدالست**

**مەقامی ئەیش مویەسەر نەمی شەڤەد بی ڕەنج، بـەلی بـە هـوکمی بـەلا بەسـتەئەند ئەهدی ئەلەست.**

مەقامی چێژ و خۆشی و عەیش بە بێ ڕەنج و زەحمەت فەراهەم نایەت ئەرێ پەیمانی (الست) یان بەحوکمی بەڵاوە گرێداوە.

مقام: جێگە پلەوپایە، مەقامی عیرفان و سۆفیگەری        عیش: ژیان و چێژ و خۆشی
میسر: مەیسەر، فەراهەم        رنج: زەحمەت، عەزیەت، رەنج
بلی: بەڵێ، ئەرێ        بلا: بەلا، زەحمەت و مەینەت

عهد الست: مەبەست لەو پەیمانەیە کە لە ڕۆژی ئەزەلدا نەوەکانی ئادەم لەگەڵ خودادا بەستیان بە وەلامی (بەڵێ ـ بلی) بۆ (الست ربکم) هەروەك لە ئایەتی (١٧٢)ی سورەتی (الاعراف)دا هاتووە (واذا اخذ ربك من بنی آدم من ظهورهم ذریتهم واشهدهم علی انفسهم الست ربکم قالوا بلی).

بە ڕەچاوکردنی ئەو واتا سەرزارەکیانەی وشەکان ئەوا خواجە پێیوایە کە چێژ و خۆشییەکانی ژیان بەبێ زەحمەت و عەزیەت نایەتە کایەوە و فەراهەم نابێ و بۆ بەدەستهێنانیان مرۆڤ پێویستی بە زەحمەت و رەنجێکی زۆر و لە رادەبەدەر هەیە، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە کاتێ هەر لە سەرەتای ئەزەلەوە ئادەمی پەیمانیان بە خودا دا کە پەروەردگارمانی و بە(بلی) وەلامیان دایەوە و ئەم (بلی)یە بە بەلا و رەنج و زەحمەتەوە گرێدراوە.

دەکرێ لە پشت ئەم واتا سادە و دووبارەیەوە واتایەکی قووڵ دەربهێنرێت، ئەویش بە هێنانی واتا عیرفانییەکانی (عیش و رنج)، چونکە لە عیرفاندا (عیش و عشرت): بەردەوامی چێژی پێکەوە بوون و هاودەمییە لەگەڵ حەقدا و (رنج)یش کار و فەرمانێکە کە بە پێچەوانی ویستی دڵەوە دەبێت.

لەسەر ئەم بنەمایەش خواجە بە ئاماژە بەوەی کە (عیش) یەکێکە لە مەقامەکان دەڵێ: مرۆڤ بە بێ ئەوەی کە پێچەوانەی ویستی دڵ بجولێتەوە ـ کە دەکرێ لێرەدا ئارەزووە دونیایەکان بن ـ بە هیچی دیکە ناگاتە مەقامی عەیش یاخود مەقامی عەیش بە بێ وازهێنان لە ویست و ئارەزووەکانی دڵ فەراهەم نابێت، ئەمەش وەك نموونەی ئەوە وایە کە مرۆڤ هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە پەیمانیان بە خواوەند داوە پەروەردگاریان بێت و خۆیانی بە گەواه گرتووە و ئەم (بەڵێ)یەش بووەتە مایەی ئەم دەرد و رەنجە.

**٦- به هست و نیست مرجان ضمیر و خوش می باش**

**که نیستیست سرانجام هر کمال که هست**

**بە هەست و نیست مەرەنجان زەمیر و خوش می باش، کە نیستیست سەرەنجامی هەر کەمال کە هەست.**



نەفسی خۆت بە بوون و نەبوون نارەحەت مەکە و خۆشحاڵ بە، چونکە سەرەنجامی هەر کەماڵ و لوتکەیەك نەمان و تیاچوونە.

هست و نسیت: بوون و نەبوون، دار و نەداری        مرجان: مەرەنجێنە، ئازارمەدە
ضمیر: مێشك، بیر، ناخ        خوش می باش: خۆشحاڵ بە        نیستی: نەمان، فەوتان
سرانجام: سەرەنجام، عاقیبەت        کمال: کەماڵ، بەلوتکەگەیشتن

خواجە دەیەوێ زیاتر ئەو رایە بچەسپێنی کە دونیا شایانی ئەوە نییە کە مرۆڤ خەفەتی بۆ بخوات، چونکە چارەنووس و ترۆپکی هەر شتێك و بەکەماڵگەیشتنی هەر تیاچوون و نەمانە، هەربۆیە مرۆڤیش نابێ مێشکی خۆی بە بوون و نەبوون ئازار بدات، بەڵکو لە بری ئەوە چاکتر وایە بە خۆشحاڵی دونیا تێپەڕێنێت.

**٧- شکوه آصفی و اسب باد و منطق الطیر**

**به باد رفت و ازو خواجه هیچ طرف نبست**

**شوکوهی ئاسەفی و ئەسبی باد و مەنتیقی تەیر، بە باد ڕەفت و ئەزو خاجە هیچ تەرف نەبەست.**

شکۆی وەزیری وەك ئاسەف و ئەسپی با و زانینی زمانی تەیروتیور، هەموو بە با چوون و خواجە هیچ سوودێکی لێ نەبینین.

شکوه: شکۆ     آصف: ئاسەفی بەرخیا، وەزیری شکۆدار و گەورەی حەزرەتی سولەیمان (سلاوی خوای لەسەر)

اسب باد: ئەسپی با، مەبەست لە ئەسپی با ئەوەیە کە حەزرەتی سولەیمان بای وەك ئەسپ بە کاردەهێنا و بە خێرایی و لەسەر پشتی با لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دی دەچوو
منطق الطیر: ئاماژە بەوەیە کە سولەیمان زمانی باڵندەکانی زانیوە، زانینی زمانی باڵندە
به باد رفت: بە با چوو، لەناوچوو، تیاچوو  خواجە: سەردار، گەورە، لێرەدا مەبەست لە حەزرەتی سولەیمانە (د.خ)   طرف: سوود، فایدە.

خواجە حافز ئەم بەیتەی وەك ڕۆشنکەرەوەی بەیتی پێشوو هێناوە کە دوا پلەی گەیشتن بە لوتکە، خۆی لەخۆیدا بەرەو نەمانچوونە، ئاشکرایە کە حەزرەتی سولەیمان ناز و نیعمەتی خوای لەبەردەستدابوو هەر لە گەورەیی و عەزەمەتەوە تا ژێربارbوونی با بۆی و زانینی زمانی باڵندەکان کە ئەمە خۆی لەخۆیدا گەیشتنە بە کەماڵی مرۆیی (لە رووی جەستەییەوە)، بەلام وەك حافز دەڵێ: ئەمانە هیچیان سوودیان پێ نەگەیاند و دواجار کۆچیکرد و سەرەنجامی هەر نەمان و مەرگ بوو، ئەویش دونیای بەجێهێشت، بەیتەکە دەڵێ: گەورەیی و شکۆداری و

ئاسەفی و ئەسپی با و زانینی زمانی تەیروتیور هەموویان بەباچوون و هیچیان سوودیان بۆ حەزرەتی سولەیمان نەبوو، دەکرێ ئەم بەیتە بەوەش لێکدرێتەوە کە هەموو ئەمانە لە دەستی سولەیمان دەرچوون و کۆتاییان هات، بەڵام لێکدانەوەی یەکەم جوانتر دێتە بەرچاو.

**٨- به بال و پر مرو  از ره که تیر پرتابی**

**هوا گرفت زمانی ولی به خاك نشست**

**بە باڵ و پەر مەرو ئەز رەه کە تیری پەرتابی، هەڤاگرفت زەمانی ڤەلی بە خاك نشەست.**

بە باڵ و پەڕ لە ڕێ لامەدە، چونکە گەرچی تەیری پەڕدار ماوەیەك بە ئاسماندا بە لوتکە دەگات بەڵام، دواجار دەچێتەوە خاك.

باڵ و پڕ: باڵ و پەڕ، لێرەدا درکەیە لە بوون و دەسەڵات و دیار بوون     مرو: مەڕۆ

ره: ڕێگە     مرو ز راه: لەڕێ لامەدە

تیر پرتابی: ناوی جۆرە تیرێکە کە زۆر دەڕوات و پەڕ دەکەن بە کۆتاییەکەیەوە بۆ ئەوەی زیاتر بە هەوادا بڕوات     هواگرفت: گەیشتە لوتکە، تێپەڕی     زمانی: ماوەیەك، زەمانێك

ولی: بەڵام     خاك: خاك، زەوی     نشست: بەخاکدا چوون، لە خاکدا نیشتن، چەقینە خاك.

بەیتێکە لەو بەیتانە کە تیایدا خواجە حافز ڕاستەوخۆ پەند و ئامۆژگاریی خەڵکی دەکات و ئاگاداریان دەکاتەوە کە خۆیان لێ نەگۆڕێت ئەم جۆرە ئامۆژگاریکردنەش زۆرجار لە دیوانەکەیدا بەرچاو دەکەوێ، خواجە دەڵێ: ئەی مرۆڤ گەر بۆ ماوەیەك باڵ وپەڕ یا شتێکت دەستکەوت، واتە ماوەیەك بوویە خاوەن شت لە ڕێ لامەدە و خۆت لێ نەگۆڕێ، چونکە سەرەنجام هەردەبێ بچیتەوە ژێرخاك، چونکە مرۆڤ هەروەك ئەو تیرە وایە کە کاتێ ئەتەقێنرێ بۆ ماوەیەك لە ئاسماندا بەرز دەبێتەوە، بەڵام دواجار دەچەقێتەوە بە زەویدا و دەکەوێتە سەرخاك. ئێمەی مرۆڤیش لە خاك دروستکراوین و دوایین ماڵی دونیاشمان هەر ژێر گڵە جا بۆیە پێویستە بە هۆی بەرزبوونەوە و دەسەڵاتمانەوە لە ڕێگەی حەق لانەدەین.

**٩- زبان کلك تو حافظ چه شکر آن گوید**

**که گفتهء سخنت می برند دست به دست**

**زەبانی کلکی تو هافز چە شوکری ئان گویەد، کە گوفتەیی سوخەنەت می بەرەند دەست بە دەست.**

حافز زمانی قەڵەمی تۆ چۆن سوپاسگوزاری ئەوە بێت کە قسە گوتراوەکانت دەست بە دەست دەبەن.



کلك: قەڵەم     شکر: شوکر، سوپاسگوزار     گفته: گوتراو     سخن: قسە

گفتهء سخن: قسە گوتراوەکان، چونکە دەکرێ قسە زۆر بێت، بەڵام دەرنەبڕدرێت و بە نەگوتراوی بمێنێتەوە، د. هروی بە سوودوەرگرتن لە نوسخەی (قدسی) دیوانی حافز لە بری (گفته) (تحفه)ی هێناوە، بەڵام لە (قزوینی) و (خانلری) و (سودی) و نوسخە ڕەسەنە دێرینەکاندا (گفته) هاتووە، بەهەرحاڵ گەر (تحفه) بێت ئەوا بە واتای دانسقە دێت می برند: دەبەن، دەگێڕن.

ئەم بەیتە لەگەڵ ئەوەدا داوا لە خۆی دەکات کە سوپاسگوزاری ئەو حاڵەتە بێت کە شیعرەکانی دەست بە دەست دەبردرێن و گرنگییان پێ دەدرێت، ستایش و مەدحی خۆشی تێدایە، چونکە دەیەوێ پێمان بڵێ شیعرەکانم هێندە نایابن دەست بە دەستیان پێدەکرێت ئەمەش سوپاسگوزاری دەوێت و نازانم قەڵەمەکەم چۆن ئەم سوپاگوزارییە دەربڕێت و لە ئاستیدا خامەم کولە.



## غەزەلی پەنجا و سێیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**
**(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١-مطلب طاعت و پیمان و صلاح از من مست**
**که به پیمانەکشی شهره شدم روز الست**

**مەتەلەب تائەت و پەیمان و سەلاح ئەز مەنی مەست، کە بە پەیمانەکەشی شوهرە شودەم روزی ئەلەست.**

داوای گوێڕایەڵی و پەیمان و چاکبوون لە منی مەست مەکە، چونکە هەر لە رۆژی ئەلەستەوە بە مەیخۆری بەناوبانگ بووم.

مطلب: داوا مەکە     طاعت: گوێڕایەڵی، تاعەتی پەروەردگار
پیمانە: پێك     پیمانەکشی: مەبەست لە مەینۆشییە
شهرەشدم: ناوبانگم دەرکرد     روز الست: رۆژی ئەزەل

(طاعت و پیمان و صلاح) کۆمەڵێ وشەی جوانی ئاینین کە بەسەر زاری پیاوانی ئاینییەوەیە و دەکرێ هەندێ جار لەلایەن روکاریی و ریاکاریەوە بۆ مەبەستی نائاینیی بەکاربهێنرێن، لە حافزدا زۆرجار مەبەست لە هێنانی نێگەتیڤی ئەم وشانە ئەم رووەیانە. لێرەدا لە نێوان عەشق و عیرفان لەلایەکەوە و ئەم پەیمانە روکەشیانەدا سنوردادەنێت و خۆی دەخاتە سنوری یەکەمیانەوە، خواجە بەو کەسانەی (وشکەسۆفیەکان) کە داوای لێدەکەن وەك خەڵکی دیکە بە کاروبارە سەرزارەکیەکانی ئاینەوە مەشغوڵ بێت دەڵێ: داوای ئەوە لە منێك مەکە کە نغرۆی عەشقی خودایی بووم و مەستی ئەو عەشقەم، کە بێمە سەر رێگەی تۆ و مەشغوڵی کارە سەرزارەکییەکان بم، چونکە من هەر لە ئەزەلەوە بەم شێوەیە هەویرەکەم شێلراوە و پیاوی مەیدانی روکار نیم، بە عاشق و عارف ناوبانگم دەرکردوە.

**٢- من همان دم که وضو ساختم از چشمەء عشق**
**چارتکبیر زدم یکسرە بر هرچە کە هست**

**مەن هەمان دەم کە ڤوزو ساختەم ئەز چەشمەیی ئیشق، چارتەکبیر زەدەم یەکسەرە بەر هەرچە کە هەست.**

من هەر ئەوساتەی کە دەستنوێژم لەکانی عەشق هەڵگرت یەکسەرە چوارتەکبیرەی هەموو ئەو شتانەم کرد کە لە جیهانی بووندا هەن.



دم: سات     همان دم: هەمان ئەوساتەی     وضو: دەستنوێژ
چشمە: کانی، سەرچاوە     چار: کورتکراوەی (چهار)ە واتە: چوار
تکبیر: الله اکبرکردن وەك تەکبیرەی سەرەتای نوێژ

چار تکبیر: چوار جار الله اکبر کردن، چوار تەکبیر، ئاماژەیە بە نوێژی مردوو کە تیایدا چوار جار تەکبیرە دەکرێت و مەبەست لێی وازهێنانە لە شتێ یا کەسێ (د.غنی) دەربارەی ئەم چوار تەکبیرە نوسیویەتی:{نوێژی مردوو لای ئەهلی سونەت چوار تەکبیرەی تێدایە و شیعە پێنج} هەر لەو جێگەیەدا د. غنی ئەوە رەتدەکاتەوە ئەمە بەڵگەی سونی بوونی حافز یاخود بەکارهێنانی شێوازی سوننی بێت، بەڵکو لە ئێراندا وەك پەند بەکارهاتووە بۆ وازلێهێنان و بەجێهێشتن

خواجە بۆ ئەوەی کە زیاتر داواکارە رووکارییەکان هیوابڕاو بکات، دەڵێ: من هەرە لەو ساتەی کە لە کانی عەشق دەستنوێژم شوشت و چوومە نێو عەشقەوە، نوێژی مردوانم بۆ هەرچی شتی دیکەی نێو دونیا دابەست و وازم لە هەموویان هێنا.

**٣- می بدە تا دهمت آگهی از سرّ قضا**
**کە بە روی کە شدم عاشق از بووی کە مست**

**مەی بدە تا دەهەمەت ئاگەهی ئەز سیری قەزا، کە بە روی کی شودەم ئاشق و ئەز بووی کی مەست.**

مەیم بدەرێ تا لە نهێنییەکانی قەزا و چارەنوس ئاگادارت کەمەوە و پێت بڵێم عاشقی رووی کێ بووم و بە بۆنی کێ مەست.

بدە: بدە     دهمت: بتدەمێ
آگهی: ئاگایی، زانیاری     سر: سڕ، نهێنی

ئەوەی مرۆڤ لەکاتی ئاگایی بە بەندوباوەکانی کۆمەڵگەدا نایڵێت یا ناتوانێ بیانڵێت، لەکاتی رەهابوون لەم بەندوداوانەدا بە ئاسانی دەیانڵێت، بە نیسبەتی عارفەکانیشەوە ئەوەی کە لەکاتی ئاگاییدا نەیاندەگوت لەکاتی حاڵ و نائاگاییدا بە عەشق دەیانگووت. خواجەش دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ لە نهێنییەکانی چارەنوس و قەزا ئاگادارت بکەمەوە و بڵێم عاشقی رووی کێ بووم و بە بۆنی کێ مەست بووم، من ئەو کاتە پێت دەڵێم، قووڵی ئەم مانایە لەوەدایە کە لە مەجازیشدا مرۆڤ لە حاڵەتی مەستیدا لەسەری بێ ئاگاییەوە ناوی مەعشوقەکەی دەڵێت و بەڵام قسەکانی جێگەی بڕوانییە، چونکە لە خۆوە دەیانڵێت، بەڵام مەستی عیرفان لەوەدا جیاوازە، کە واقیعەن عارف لە دەرەوەی حاڵەتە تایبەتیەکانی بەتەواوی ناتوانێ دەربارەی

مەعشوق قسە بكات نەوەك لە ترسدا قسە نەكات، بەڵام كە دەچێتەوە نێو مەستی ئیدی ئاسانتر دەركی مەعشوق دەكات. بە گوتەیەكی دیكە دەكرێ ئەم حاڵە بگاتە (شهود) و عارف لە رێگەی مەستی عیرفانییەوە مەعشوق تەجەلی بكات و لە رێگەی جیلوەكردنەوە بینینی روبدات (مەولانا خالیدی نەقشبەندی ـ قدس سرە) لە عەقیدە كوردییەكەیدا بینینی خودا لە دونیادا بە جائیز دەزانێ هەرچەندە پێی وایە واقیع نەبووە{ مەولانا خالیدی نەقشبەندی، عەقیدەی كوردی} ، ئەم گوتانەی خواجە حەقیقەتێكی عیرفانییە و چاو و گوێی دەوێ بۆ بینین و بیستن بەڵام لەبەر نەبوونی ئەم چاو و گوێیە ئەم جۆرە گوتانە بە شەتەحات و قسەی هەڵەق و مەلەق دراونەتە قەڵەم.

**٤- كمره كوه كم است از كمر مور این جا**

**ناامید از در رحمت مشو ای باده پرست**

**كەمەری كوه كەمەست ئەز كەمەری مور ئین جا، نائومید ئەز دەری رەحمەت مەشو ئەی بادە پەرەست.**

لێرەدا خۆڕاگری كەمەری كێو لە خۆڕاگری كەمەری مێرولە كەمترە، ئەی بادەپەرست لە رەحمەتی خودا نائومێد مەبە.

كمر: كەمەر   كوه: كێو   كمركوه: كەمەری كێو

مور: مێرولە   مشو: مەبە

لە بەیتەكەدا (كوه) ئاماژەیە بە (جبال) لە ئایەتی (٧٢)ی سورەتی (الاحزاب)دا كە خودای گەورە دەفەرموێ: ئێمە ئەمانەتی خواپەرستی و عەشقی ئیختیاریمان بۆ ئاسمانەكان و زەوی و شاخەكان ـ كێوەكان ـ نمایشكرد، بەڵام رەتیان كردەوە كە بیخەینە ئەستۆی خۆیان ـ هەڵیگرن ـ و لەوە ترسان بە تەواوی ئەدای نەكەن، مرۆڤ خستیە ئەستۆی خۆی، ئایەتەكە دەفەرموێ (إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً).

ئەم ئەمانەتە گەورەیەی خواپەرستی و عەشقی ئیختیارییە هێندە گەورە و قورسە تەواوی مەخلوقاتە بەهێز و پتەوەكانی وەك زەوی و ئاسمانەكان و كێوەكان لە ئاستیدا كەمەریان سست بوو، بۆیان هەڵنەگیرا، تەنیا مێرولەی بێهێزی كەمەرباریك كە مرۆڤە شانی دایە ژێر ئەم لێپرسیراوێتییە و لە ئاست ئەم ئیختیارەدا كەمەری لەكەمەری كێو بەهێزتر بوو، ئەوەی شایانی باسە لە ئایەتەكەدا باس لە زاڵمی و نەزانیی مرۆڤ دەكات، كە لە راڤە عیرفانییەكانی وەك (خواجە رشیدالدینی میبدی)دا زاڵم بەوە راڤە كراوە كە مرۆڤ لە بەرامبەر



بەرژەوەندییەكانی خۆیدا زوڵمی كرد و گوێی بە بەرژەوەندی خۆی نەدا، نەزانیشی ئەوەبوو كە وازی لە بەرژەوەندی هێنا و بە عەقڵی بەرژەوەندیخوازانە مامەڵەی نەكرد(دواتر بە درێژی لێی دەدوێین)، بەڵام خواجە حافز و عارفەكانی دیكەی ئەم جیهانەش ئەمە وەك بیانویەك بۆ لێخۆشبوونی خودا لە بەندەكانی دەهێننەوە هەروەك (د. عبدالكریم سروش) دەڵێ (بەهەشت بە نرخ و بەها نییە بەڵكو بە بیانو و بەهانەیە).

چونكە گەورەیی مرۆڤ لەوەدایە كە رازی بوو شان بداتە ژێر قورسترین باری خودا كە ئیختیارە، ئیدی خوداش لە بەرامبەر ئەم عەشقەی مرۆڤدا عاشقانە دەجوڵێتەوە و كڕین و بەهایەك لە ئارادا نامێنێت، خواجە لە بەیتەكەدا دەڵێ: ئەی مرۆڤی عاشق و بادەپەرست نائومێد مەبە لە دەرگای رەحمەتی خودا، چونكە لەم هەڵگرتنەدا كەمەری تۆیەكی وەك مێرولە لاواز و بێهێز لە كەمەری كێوێكی پتەو بەهێزتربوو خودا دەتبەخشێ، ناكرێ بادەپەرست ئەو مرۆڤە عارەقخۆرە بێت كە مانای ئەمانەت نازانێ بەڵكو هەر نا دەبێ عاشقێكی عارفی عەشقپەرست بێ كە بە ئاگاییەوە خودا دەپەرستێ.

**٥- به جز آن نرگس مستانه كه چشمش مرساد**

**زیر این طارم فیروزه كسی خوش ننشست**

**بە جوز ئان نەرگسی مەستانە كە چەشمەش مەرەساد ، زیری ئین تارەمی فیروزە كەسی خوش نەنشەست.**

جگە لەو چاوە مەستانە كە لە چاوی بەد دووربێ، لە ژێر ئەم تارمە پیرۆزەییەدا كەسێك بەخۆشی دانەنیشت.

بەجز: جگە   نرگس: نێرگز، مەبەست لە چاوی مەستە

چشمش مرساد: چاوی پیسی پێ نەگا، لە چاوی بەد دووربێ   طارم: تارم، ئاسمان

فیروزە: پیرۆزەیی، شین   نشستن: دانیشتن، گوزەراندن

جگە لە چاوە مەستەكانی كە لە ژێر تاقی برۆیدا بە مەستی و جوانی ئارامی گرتوە و ـ خوابكات لە چاوی بەد دوور بێ ـ لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا هیچ كەسێ بەخۆشی گوزەرانی نەكردوە و هەمیشە لە نارەحەتیدا بووە.

یاخود جگە لە چاوی یار كە لە شوێنی دروست و راستی خۆیدا لە ژێر تاقی برۆیدا مەستانە ئارامی گرتووە، هیچ كەسێ لەژێر ئەم تاقە پیرۆزەییەی ئاسماندا رێك و دلێرانە لە جێی شیاوی خۆی دانەنیشتووە.

**٦- جان فدای دهنت باد که در باغ نظر**

**چمن آرای جهان خوشتر ازین غنچه نبست**

**جان فیدای دەهەنەت باد کە دەر باغی نەزەر، چەمەن ئـارای جـەهان خوشـتەر ئـەزین غونچە نەبەست.**

گیان بە فیدای دەمت کە لە بـاغی تەماشـادا رازێنـەرەوەی بـاخی جیهـان لـەم خونـچەیە جوانتری خەلق نەکردوە.

دهن/دهان: دەم نظر: تەماشا

چمن آرا: ڕێکخەری باغ و مێرغوزار، ئەوکەسەی باغ و مێرغوزار دەڕازێنێتەوە

چمن آرای جهان: ڕازێنەرەوەی باغی ژیان، مەبەست لە خودایە

خواجە گیانی خۆی دەکاتە فیدا و قوربانی دەمی مەعشوق کە هەر لە خونچەیەکی نەکراوە دەچێ لە بچوکیدا و پێی وایە کە خودای رازێنەرەوە و ڕێکخەری ئەم باخەی جیهـان لـە بـاخی تەماشادا جوانتر لەم خونچەیەی خەلق نەکردوە.

**٧- حافظ از دولت عشق تو سلیمانی شد**

**یعنی از وصل تواش نیست بەجز باد بە دست**

**هافز ئەز دۆولەتی ئیشقی تو سولەیمانی شود، یەئنی ئەز ڤەسـلی توئـەش نیـست بـە جوز باد بە دەست.**

حافز لە بەرەکەتی عەشقی تۆوە گەیشتە پلەی سولەیمان، واتە لە وەسـڵ و بەیەکگەیـشتنی تۆ جگە لە با هیچی لەدەستدا نییە.

سلیمانی: وەك سلێمان، حەزرەتی سـولەیمان (سـڵاوی لەسـەر بـێ) کـە دەسـەڵاتی بەسـەر مەخلوقاتی سەر زەویدا هەبوو

باد در دست داشتن: با لە دەستدابوون، بوونە خاوەن با، هیچ لەدەستدا نەبوون

حافز پێی وایە بەهۆی بەرەکەتی عەشقی مەعشوقەوە بە مەقام و پلەی حەزرەتی سـولەیمان گەیشتوە و هەروەك چۆن سولەیمان ئەمری بە با دەکـرد و بـای لـەژێر دەسـتدابوو ئـەمیش لـە وەسڵی یار تەنیا بای لەژێر چنگدا ماوە، جوانی لێکچواندنەکە لەوەدایە کـە بـا بەدەسـتبوونی حەزرەتی سولەیمان نیشانەی دەسەڵاتە بەڵام با لەدەستبوونی حافز نیشانەی بە هیچ نەگەیشتنە. خواجە نەگەیشتوە بە وەسڵی یار و دەستکەوتی (با) زیاتر نییە، بەڵام ئەمـەش گەیاندویەتییـە مەقامی حەزرەتی سولەیمان، هەرچەندە بەیتەکە ئەوجۆرە ستایشکردنەی تێدا نییە.





## غەزەلی پەنجا و چوارەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی موسبەغ**

**(مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلان)**

**١- در دیر مغان آمد یارم قدحی در دست**

**مست از می و میخواران از نرگس مستش مست**

**دەر دەیری موغان ئامەد یارەم قەدەحی دەر دەست، مەست ئەز مەی و مەیخاران ئەز نەرگسی مەستەش مەست.**

یارم پێك بەدەست هاتە دێری موغانەوە، ئەو مەستی مەی و مەینۆشانیش لە تاو نێرگزی مەستی مەست بوون.

دیر مغان: پەرستگای زەردەشتیەکانە بەڵام حافز زیاتر بۆ مەیخانە و شوێنی مەستبوون بەکاری دەهێنێ چونکە لە دێرینیشدا مەینۆشی تیایدا ئاسایی بووە

قدح: پێك، جام     قدحی: پێکێ     در دست: لە دەستدا

میخواران: مەینۆشان     نرگس مست: چاوی مەست

یاری چاو مەستم پێك بەدەستەوە هاتە دێری موغان و جێگەی مەینۆشانەوە، هەموو مەینۆشان لە تاو چاوی مەستی مەستبوون، لە کاتێکدا یارم بە مەی و شەراب مەستببوو، واتە: لە کاتێکدا خۆی مەست بوو چاوی خومار و مەستیشی هەموو دێرنشینانی مەستکرد.

**٢- در نعل سمند او شکل مه نو پیدا**

**وز قد بلند او بالای صنوبر پست**

**دەر نەئلی سەمەندی ئو شەکلی مەهی نۆو پەیدا، ڤەز قەدی بوولەندی ئو بالای سنۆوبەر پەست.**

لە ناڵی ئەسپی ئەو شێوەی مانگی تازە دەرکەوت و لە بالاّی بەرزی ئەویش بالاّی سنەوبەر پەست و خواربوو.

نعل: ناڵ     سمند: ئەسپ، ئەسپێکە کە رەنگی مایل بە زەردییە

مە: مانگ     نو: نوێ، تازە     پیدا: دەردەکەوت، دەهاتەوە یاد

قد: قەد، بالاّ     بلند: بەرز     پست: پەست و خوار

خواجە لەم بەیتەدا وەسفی جوانی یار دەکات ئەو یارەی کە لە ناڵی ئەسپەکەی وردەبیتەوە شێوەی مانگی یەکشەوەت دەخاتەوە یاد، وەك بڵێی مانگی یەکشەوە لەم ناڵی ئەسپەی یار



وەرگیرابێ، هەروەها لەتاو بەژن و بالاّی بەرزی ئەم یارەشەوە بالاّی جوان و رێکی سنەوبەر خوار و پەست یاخود بێ نرخ و کورتە.

**٣- آخر به چه گویم هست از خود خبرم چون نیست**

**وز بهر چه گویم نیست با وی نظرم چون هست**

**ئاخەر بە چە گویەم هەست ئەز خود خەبەرەم چون نیست، ڤەز بەهری چە گویەم نیست با ڤەی نەزەرەم چون هەست.**

ئاخر چۆن بڵێم خەبەرم لە خۆم هەیە لە کاتێکدا لەخۆم بێ خەبر و بێ ئاگام و بۆچی بڵێم روی نەزەرم لەو نییە لەکاتێکدا کە وایە.

آخر: ئاخر، لێرەدا بۆ تەئکید و جەختکردنەوە هاتوە     از خود خبر داشتن: ئاگا لەخۆبوون، بەڵام لێرەدا بە نەرێ بەکارهاتوە     بهر: بۆ     وی: ئەو     نظر: تەماشاکردن

یار دێتە دێری موغان و ئێمەی عارفان و بادەنۆشانی رێگەی تەریقەتیش هەمومان بە هاتنی یار حەیران و سەرسام دەبین و لە خۆمان بێ ئاگا دەبین، ئیدی لەو بێئاگابوونەدا توانای سنوردارکردنی هیچیمان نامێنێت و دەشبینین، لەم حاڵەتەدا خواجە ئەم بەیتە دەڵێ: ئاخر چۆن بڵێم هەیە، دەکرێ لێرەدا هەیە بۆ (یار) یاخود بۆ (ئاگاداربوون) بگەرێتەوە (د.هروی) پێی وایە بۆ یار دەگەرێتەوە و دەنوسێ: بە هاتنی مەعشوق بەشێوەیەك لە خۆم بێ ئاگابووم لە بوونی خۆم بێ ئاگابووم، کاتێکیش لەخۆم بێ خەبەر بووم چۆن بتوانم لە بوونی ئەو خەبەر بدەم و بڵێم هەیە، بەڵام(سودی) پێی وایە کە: چۆن بڵێم ئاگام لە خۆیە لە کاتێکدا ئاگام لە خۆ نییە واتە چۆن دەتوانم بانگەشەی (من عرف نفسه) بکەم لەکاتێکدا وانیم.

لە راستیدا بە بەڵگەی نیوە دێری دووەمی بەیتەکە (ئەو) یارە، ئاخر چۆن بڵێم هەیە لەکاتێکدا کە ئەو دەردەکەوێ منی عاشق موسائاسا توشی بێ ئاگایی دێم و پێش رۆشتنی ئەو بە ئاگا نایەمەوە، ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە عارفەکان تێیدەکەون و لەکاتی جیلوەکردنی مەعشوقدا بوونی خۆیان دەخەنە لاوە. دیسانەوە چۆن و بۆچی بڵێم نییە لەکاتێکدا لە بەرامبەرمدایە و سەیری دەکەم، کە مەعشوق جیلوە دەکات بۆ عاشقان بە شێوەیەکی حەقیقی هەیە بەڵام بێ ئاگابوونی عاشقانیش دەبێتە مایەی نەتوانینی خەبەردان.

**٤- شمع دل دمسازان بنشست چو او برخاست**

**و افغان ز نظربازان برخاست چو او بنشست**

**شەمئی دلی دەمسازان بنشەست چو ئو بەرخاست، ڤە ئەفغان ز نەزەربازان بەرخاست چو ئو بنشەست.**

کاتێ ئەو هەستا مۆمی دڵی هاودەمان کوژایەوە، بەڵام کە دانیشتەوە هاواری شادی لە عاشقی نەزەربازەوە هەستا.

شمع: مۆم — دمسازان: هاودەمان، هاوڕێیان

بنشست: دانیشت، بەڵام لێرەدا لەگەڵ مۆمدا هاتووە و بە واتای کوژانەوە بەکاردێت

برخاست: هەستا — افغان و فغان: هاوار

نظر بازان: واتە ئەوەی کە هەرکەس ببینێ خۆشی بووێ، جوانبینان

وەك گوترا ڕۆنیشتنی مۆم کوژانەوەی مۆمە. شاعیر دڵی هاودەمانی کۆڕی مەعشوقی بە مۆم هێناوە و بە درکە دەڵێ: کاتێ یار نیازی ڕۆشتن بکات و هەستێ مۆمی دڵی هاودەمانی کۆڕی مەعشوق رو لە کزی دەکات و دەکوژێتەوە ، بەڵام کاتێ دادەنیشێتەوە و بڕیاری مانەوە دەدات ئیدی هاواری شادی لە جوانبینان و نەزەربازان بەرزدەبێتەوە، چونکە کۆڕیان بە یار گەرم و چرای دڵیان بەو درەوشانە.

**٥- گر غالیە خوشبو شد درگسیوی او پیچید**

**ور وسمە کمانکش گشت در ابروی او پیوست**

**گەر غالییە خوشبوو شود دەر گیسوی ئو پیچید، ڤەر ڤەسمە کەمانکەش گەشت دەر ئەبروی ئو پەیڤەست.**

گەر غالیە بۆنخۆش بووە لەبەر ئەوەیە کە لە پرچی ئەو پێچراوە و گەر وسمەش بووەتە تیرهاوێژ (کەماندار) لەم ڕووەوەیە لە برۆی ئەو گیراوە.

غالیە: ماددەیەکی ڕەشە لە میسك و عەنبەر دروست دەبێ کە ژنان بۆ ڕەنگکردنی پرچ و بۆنخۆشکردنی ئەندام و زولف و خاڵ بەکاری دەهێنن {فرهنگ زبان فارسی، آلاشتی}

خوشبوو: بۆنخۆش — گیسو: پرچ — پیچید: پێچرا

وسمە: مادەیەکی سەوزی مەیلەو شینە کە لە گەڵای گیای وەسمە وەردەگیرێت و ژنان برۆی خۆیانیان پێ ڕەنگ دەکرد — کمانکش: تیرهاوێژ، تیرئەنداز — ابرو: برۆ

پیوست: لێرەدا بە مانای (گیرا) دێت

هەمو شتە جوان و بۆنخۆشەکان لە مەعشوقەوە جوانی و بۆنخۆشییان وەرگرتوە، بۆ نمونە مادەی غالیە کە بە ڕەنگی جوان و بۆنی خۆش بەناوبانگە هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە پرچی یار پێچراوە و گیراوە بۆیە بۆنخۆش و جوان بووە، هەروەها گەر وسمەش وەك تیرهاوێژێك کاریگەری لەسەر دڵان دەکات و بۆ ڕەنگکردنی برۆ بەکاردێ لەوەوەیە کە لە برۆی



یار گیراوە و سەرنجڕاکێشی برۆی یار ئەو سەرنجڕاکێشی و تیرئەندازەیەی بەویش داوە کە تیر لە دڵان دەدات.

**٦- باز آی که باز آید عمر شدەء حافظ**

**هرچند کە ناید باز تیری کە بشد از شست**

**بازئای کە بازئایەد ئومری شودەیی هافز، هەرچەند کە نایەد باز تیری کە بشود ئەز شەست.**

بگەڕێوە تا تەمەنی تێپەڕیوی حافز بگەڕێتەوە، هەرچەندە تیرێك کە لە کەمان دەرچوو ناگەڕێتەوە.

باز آی: بگەڕێوە — شدە: ڕۆشتوو

عمر شدە: تەمەنی ڕۆشتوو، تەمەنی تێپەڕیو

ناید باز: نایەتەوە — بشد: دەرچو، تێپەڕی

شست: پەنجەگەورە، لێرەدا مەبەست لەو جێگەیەیە کە لەکاتی تیرهاویشتندا تیرەکە و کەمانەکەی پێدەگیرێت

هەروەك چۆن تیرێك هاوێژرا ئیدی جارێکی دیکە مەحاڵە بگەڕێتەوە نێو کەوان لەگەڵ زانینی ئەم ڕاستیەشدا کە حافز دەزانێ تەمەن وەك ئەو تیرەیە و کە تێپەڕی ئیتر ناگەڕێتەوە بەڵام بە مەعشوق دەڵێ: وەرە تا لەگەڵ هاتنی تۆدا و لەخۆشی هاتنی تۆوە تەمەنی ڕۆشتووم بگەڕێتەوە هەرچەندە مەحاڵە.

## غەزەلی پەنجا و پێنجەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- به كوى ميكده هر سالكى كه ره دانست**

**درى دگر زدن انديشهء تبه دانست**

**به كوی مەیكەدە هەر سالكی كە رەه دانست، دەری دیگەر زەدەن ئەندیشەیی تەبەه دانست.**

هەر ڕێبوارێك ڕێگەی كۆڵانی مەیخانەی دۆزییەوە، لە دەرگای دیكە دانی بە بیرێكی پوچ زانی.

سالك: ڕێبوار، ڕێبواری ڕێگەی تەریقەت    دانست: زانی    در: دەرگا

زدن: لێدان    اندیشه: بیر    تبه: پوچ، خراب

لە بەتیەكەدا باس لە گرنگی و گەورەیی مەیخانە دەكرێت، ئەو سیحرەی كە مەیخانە هەیەتی كە هەموو ماڵەكانی دیكەش دەخاتە ژێر جادووی خۆیەوە، پێش ئەوەی لە بەیتەكە بدوێین ـ هەرچەندە پێشتر لێی دواوین ـ لە خودی مەیخانە ئەدوێین، لە حافز یاخود لە شیعری عیرفانیدا، مەیخانە و خەرابات بە (كۆڕی هێمن و ئارامی دۆستان، خانەقا، دڵی مورشیدی تەواو{ سجادی، فرهنگ لغات و اصطلاحات و تعبیرات عرفانی، میخانە خرابات...} دراوەتە قەڵەم، هەروەها لە فەرهەنگەكەی (حافظ تیموری)دا بە (قدم مناجات) لێكدراوەتەوە. (سالك)یش هەمان عارفی ڕێگەی تەریقەتە، لە ڕاستیدا ئەو حاڵەتەی كە لە ناخی عارفدا بە گەیشتن بە هەر یەكێك لەم مانا جوانانەی مەیخانە دروست دەبێ دابڕانێكی ڕوحییە لە دەرگاكانی دیكەی دونیا و پەیوەست بوونە بە دەرگای موناجاتەوە ـ لە مانای موناجاتی مەیخانە ـ دا، هەربۆیەش كاتێ پەی بە گەورەیی ئەو ماڵە جوانە دەبات چوونە نێو بووارەكانی دیكە یاخود دڵدان بە بووارە مادیەكانی دونیای بەلاوە پوچ دەبێ، خواجە لەم باكگراوندەوە دەڵێ: هەر عارفێك ڕێگەی مەیخانەی دۆزییەوە و گەیشتە حاڵە جوانەكانی موناجات ئیدی چونە نێو هەر بوارێكی دیكەی مادی یاخود لە دەرگا دانی ماڵەكانی دیكە و شوێنەكانی دیكە بە پوچ و بێ سوود دەزانێت، یاخود لە مانای گشتی مەیخانەدا كە عەشق و عاشقییە، هەر كەسێك كە ڕێگەی گرتەبەر بەردەوام دەچێتە بەردەرگای عەشق و مەیخانە و سەرچاوەكانی دیكە بە پوچ و بێ سوود دەزانێ.



**٢- بر آستانهء میخانه هركه یافت رهی**

**ز فیض جام می اسرار خانقه دانست**

**بەر ئاستانەیی مەیخانە هەركە یافت ڕەهی، ز فەیزی جامی مەی ئەسراری خانەقەه دانست.**

هەر كەسی ڕێگەیەكی بۆ گەیشتنە بەردەرگای مەیخانە دۆزییەوە، بە بەرەكەتی جامی مەی نهێنییەكانی خانەقای زانی.

آستانە: بەردەرگا    فیض: لافاو، بەرەكەت، لافاوی ڕەحمەت و بەرەكەت

خانقه: خانەقا

میسراعی یەكەم هەروەك میسراعی یەكەمی بەیتی پێشووە، چونكە بەرەكەت و سوودی چوونە نێو عەشقی ئیلاهی و موناجات تەنیا بە پوچ زانینی بیر و ڕێگەكانی دیكە نییە، بەڵكو یەكێكی دیكە لە بەرەكەت و سوودەكانی دیكەی میسراعی دووەمی ئەم بەیتەیە كە تیایدا ئاگاداربوونە لە(اسرار خانقه) نهێنییەكانی خانەقا، ئەم نهێنیانەی خانەقا لای (د.هروی) ڕیا و ڕیاكاری و ڕووپۆشی خانەقانشینانە، واتە ڕیا و بانگەشەی سۆفیە دونیا ویستەكان{ج١، ل٢٥٠}، بەڵام لای (سودی) ئاگاداربوونە لە نهێنییەكانی خانەقا، بوونە ئەهلی كەشف و زانینە واتە مرۆڤ وەك خانەقانشینان نهێنییەكان دەزانێ{ج١، ل٣٢٠}، وەك دەردەكەوێ د.هروی ڕووە نێگەتیڤەكەی ئەم دەربڕینەی وەرگرتووە و سوودیش ڕووە پۆزەتیڤەكەی و هەردو لێكدانەوەكەش جێگەی تێڕامانن.

خواجە حافز دەڵێ: كاتێ مرۆڤ دەچێتە نێو دونیای عیرفان و عەشقی حەقیقی خودا، ئیدی لەو عەشقەدا هەموو نهێنییەكانی خانەقای بۆ دەردەكەوێت و دەیانزانێت، ئەمەش بەرەكەتی ئەو عەشقەیە وای لێدەكات ئاگادار بێت لە نهێنییەكانی خانەقا، چ ڕووە نێگەتیڤییەكانی بێت یاخود ڕووە پۆزەتیڤییەكانی، بەڵام كاتێ مرۆڤ دەبێتە عارف بیری لای شتە لاوەكییەكان نامێنێت و لەم بارەشدا نهێنییەكان هێندە ڕوحی و بەرز دەبن ئەوەندە مادی و نزم نابن، هەربۆیە بەندە وادەزانم بەرەكەتی عەشق شتی جوان و بەرز بۆ مرۆڤ دەردەخات، چونكە بەبێ ئەوەش نهێنی خانەقا دەزانرێت.

**٣- زمانه افسر رندى نداد جز به كسى**

**كه سرفرازى عالم درين كله دانست**

**زەمانە ئەفسەری ڕیندی نەداد جوز بە كەسی، كە سەرفەرازی ئالەم دەرین كولەه دانست.**

ڕۆژگار تاجی ڕەندی نەداوە بە کەس ئەو کەسە نەبێ، کە سەربڵندی جیهانی لەم کڵاوەدا بینی.

زمانە: ڕۆژگار　　　　افسر: تاج　　　　رندی: بێ باکی

سرفرازی: سەربڵندی، سەرفرازی　　　　کله/کلاه: کڵاو

مەسەلەیەکی سادە، بەڵام قووڵ لەم بەیتەدا بەدی دەکرێت، ئەویش مەسەلەی شیاوبوونی مرۆڤەکانە وەك ئەوەی کە هەن، کورد وتەنی (خودا کاری نابەجێ ناکات، تاکێو نەبینێ بەفری تێ ناکات) خودا کاتێ خۆشییەك یاخود بارێك یا جۆرە ژیانێك یاخود هەر تایبەتمەندییەکی دیکە دەبەخشێ بە کەسێك شیاوی ئەو کەسەیە، بەڵام مرۆڤەکان بەم حقیقەتە نازانن، لە مەسەلەی ڕەندی و گرتنەبەری ڕێبازی بێ باکیدا جیاوازییەك بەدی دەکرێ، چونکە هەر کەسێك بایەخ و بەهای ئەم جۆرە ژیانە نەزانێت زەمانە/خودا پێی نابەخشێت، بەڵکو پێداویستی گەورەی بەخشینی ڕێبازی ڕەند/عارفی بە مرۆڤ ناسین و زانینی بەهای ئەم جۆرە ژیانەیە، ئەمەش هەمان ئەو ئایەتە قورئانییە دەخاتە بیر کە (والذین جاهدوا فینا لنهدینّهم سبلنا ـ ئەوانەی هەوڵ لە پێناو گەیشتن بە ئێمە دەدەن، ڕێنوێنیان دەکەین بۆ ڕێگاکانی خۆمان) {العنکبووت، ٦٩} بەڵام لە بەیتەکەدا تەنیا لە بری هەوڵدان دەرککردن بە بەها و نرخی ئەم مۆدیلە لە ژیان بەسە بۆ ئەوەی کە بدرێت بە مرۆڤ. خواجە لە بەیتەکەدا دەڵێ: زەمانە تاج و شکۆی ژیانی ڕەندی و بێ باکی و ئازادی لە بەندوداوەکانی کۆمەڵگە تەنیا بە کەسانێك دەدات کە سەربڵندی و گەورەیی جیهان لەم جۆری (کڵاو) ژیانەدا هەست پێ بکەن، کڵاو بیرخەرەوەی دەستەی ڕەندەکانە کە کڵاوێکی تایبەتیان لەسەرناوە.

**٤- ورای طاعت دیوانگان ز ما مطلب**

**که شیخ مذهب ما عاقلی گنه دانست**

**ڤەرای تائەتی دیڤانەگان ز ما مەتەلەب، کە شەیخی مەزهەبی ما ئاقلی گونەه دانست.**

جگە لە عیبادەتی شێتەکان هیچ لە ئێمە داوا مەکە، چونکە شێخی مەزهەبی ئێمە عاقڵی بە گوناه زانی.

ورای: لە پشت، زیاتر لە، جگە لە، لە (ورا )ی عەرەبییەوە هاتووە

طاعت: گوێڕایەڵی، عیبادەت　　　　دیوانگان: شێتەکان　　　　گنه: گوناه



طاعت دیوانگان: عیبادەتی شێتەکان لە عیرفاندا (دیوانە) کەسێکە کە یاساکانی عەشق بە سەریدا زاڵ بووبێت و شێتیش حاڵەتی زاڵبووی یاساکانی عەشقە، ئیدی عیبادەتی شێتەکانیش دەبێتە عیبادەتی عاشق و عارفەکان.

ڕوو بە مەعشوقی حەق و زۆر بە سادەیی و دۆستانە دەڵێ: جگە لە عیبادەتی شێتەکان، یاخود زیاتر لە عیبادەتی شێتەکانمان لێ داوا مەکە، چونکە لە مەزهەبەکەی ئێمەدا و کە زۆرجار خەڵکی بە عاقڵی دەدەنە قەڵەم و خۆشمان لە نێوان عەقڵ و عەشقدا پەیوەندییەکی دۆستانە نابینین، یەکێك لە بۆچوونە عاشقی و عارفییەکان پەیوەندی نێوان عەشق و عەقڵ بە پەیوەندییەکی نێگەتیڤی دەزانن و لە نێو عیرفان و و فەلسەفەدا تا ئێستاش قسە لەو پەیوەندییە دەکرێت و بە بنبەست نەگەیشتووە، (یوهان کریستف بوورگل) لە وتارێکدا کە (خوسرەو ناقد) وەریگێڕاوەتە سەر فارسی بە ناوی (عەقڵ و عەشق لە دیدگای حافزەوە)، بە دوورودرێژی لە پەیوەندی نێوان عەقڵ و عەشق لای حافز دەدوێت، لە هەندێ بەشی وتارەکەیدا هاتووە: ئەو کەسەی ئاشنای شیعری فارسی یا عیرفانی ئیسلامییە ئاگاداری دژایەتی نێوان عەقڵ و عەشقە و ئاگای لەو سووککردنەشە کە شاعیرە عاشقە لاهوتی و ناسوتییەکانیش لە ئیسلامدا قسەی لە بارەوە دەکەن، ئەمە سونەتێکی کۆنە کە تیایدا ئەزموون و نەزەرگەری پێکەوە گرێ دەدرێن. ئەفلاتوون لە (فایدروس)دا عەشق بە (شێتی ئیلاهی) ناو دەنێت و ئەو سرودەش کە (پۆلسی نێردراو)یش لە یەکەم نامەیدا بۆ قەرەنتینییەکان نووسیویەتی ستایشی عەشقی کردووە. بۆ نموونە ئەم بەیتەی (مەولانا جلال الدینی ڕۆمی ـ قدس سره ـ) کە دەفەرمووێ:

دوور بادا عاقلان از عاشقان　　　　دوور بادا بووی گلخن از صبا

مەولانا لە شیعرێکی دیکەدا شێتی دێوانەیی وەك ڕێگەی ڕزگاری عاشقان بەم شێوەیە وەسفدەکات:

چارەای کو بهتر از دیوانگی　　　　بُسکلد صد لنگر از دیوانگی

ای بسا کافر شده از عقل خویش　　　　هیچ دیدی کافر از دیوانگی

رنج فربه شد، برو دیوانه شو　　　　رنج گردد لاغر از دیوانگی

واتە: (چارەیەك باشتر لە دێوانەیی کوا، سەد لەنگەر لە دێوانەیی پەیدا دەبێ، چەندەها لە عەقڵی خۆیەوە کافر بوو، هیچ کافرێکت دیوە کە لە دێوانەییەوە بوو بێت، ڕەنج قەڵەو بوو بڕۆ دێوانە بە، لە دێوانەییدا ڕەنج لاواز دەبێ)

ڕوانگەی حافزیش بۆ عەقڵ و عەشق لەسەر سونەتی کۆن و شێوازە جیاوازەکانییەتی، چەندین جار حافز عەشق و ڕەندی دەکاتە هاوتای ڕەندی، لای فەیلەسووفانی ئیسلامی بە

تایبەتی فەیلەسووفەکانی ڕۆژهەلاَت وەك (ئیبن سینا، شهاب الدینی سوهرەوەردی و ئیبن عەرەبی ئەندەلوسی) زۆر فراوانیان کردووە و لەم دنیابینییەدا عەشق وەك بالاَترین ئەسلَی جیهان و بالاَتر لە (گیانی بیرکەرەوە- nous)ەوەیە و بالاَترە لە عەقلَ بە پلە جۆراوجۆرەکانییەوە.

هەربۆیە ئەی مەعشوق بە عیبادەتی شێتانە و عاشقانە و عارفانەی ئێمە ڕازی بە، چونکە شێخ و ڕابەری بۆچوون و مەزهەبەکەی ئێمە باوەڕی بە سەرداری عەقلَ نییە و بە گوناهی دەزانێ.

خواجە لەم بەیتەدا ئەو مەزهەبە دەخاتەڕوو کە دەیەوێ لێیەوە مەعشوق ڕازی بکات و تاعەتی بکات کە ئەویش ڕێبازی عاشقانەی شێتانەیە نەوەك مەزهەبی عەقلَ.

**٥- هر آنکه راز دو عالم ز خط ساغر خواند**

**رموز جام جم از نقش خاك ره دانست**

**هەر ئانکە ڕازی دو ئالەم ز خەتی ساغەر خاند، ڕموزی جامی جەم ئەز نەقشی خاکی ڕەه دانست.**

هەر ئەوەی کە توانی نهێنی دوو جیهان لە هێلَی پێکدا بخوێنێتەوە، ڕەمز و هێماکانی خامەکەی جەمشیدی لە هێلَی سادەی خاکی ڕێدا زانیوە.

آنکە: ئەو کەسەی کە          دو عالم: دوو جیهان، دونیا و ئاخیرەت

خط ساغر: هێلَی کێشراوی سەر پێك یاخود پیالَە، دەلَێن (جەمشید) لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی خۆیدا پێکێکی تایبەتی هەبوو، کە حەوت هێلَی ڕێکی تێدابووە بۆ هەر یەکێ لە ئامادەبووان بە پێی لە باری و ئامادەیی خۆی تا هێلێکی دیاریکراو شەرابی بۆ تێکردووە لە ئەدەبیاتی ئێرانی پاش هاتنی ئیسلام ئەم هێلانە هێنراون هەر هێلێك ناوێکی هەبووە

ڕموز: هێماکان، ڕەمزەکان          جام: پێك

جام جم: پێکێك بووە کە بەگوتەی ئەفسانەکان جەمیشد هەوالَی جیهان و نهێنییە شاراوەکانی تێدا بینیوە و سیفەتی دەرخستنی غەیبی هەبووە.

نقش خاك ره: هێلَی خاکی سەرڕێ، جێگە پێ و شتی دیکە کە لە خاکی ڕێگەدا دەردەچن

لەم بەیتەدا جامی جەم لە بەرامبەر دلَی عارف یاخود پێکی شەرابدا هاتووە کە دەبێتە شوێنی دەرکەوتنی غەیب و نادیارییەکان، لە کاتێکدا کە جامەکەی جەمشید زۆر بە نرخ بووەو لەو سەردەمەدا هاوتای نەبووە، بەلاَم لێرەدا شاعیر دەلَێ: ئەو کەسەی کە بە هۆی تەریقەت و عیرفانەوە بە پلە و پایەیەکی وا بلَند دەگات کە ڕازی هەردوو جیهان لە پێکی سادەی شەرابدا



دەبینێ، واتە ڕاز و نهێنی هەردوو جیهان لە عەشق و عیرفاندا دەبینێ بە شێوەیەك ئەو نهێنییانەی کە جامەکەی جەمشید لەوپەڕی توانایدا نمایشیان دەکات ئەم لەو شوێن پێ و هێلانەدا دەیانبینێ کە لەسەر خاکی سەرەڕێدا دەکێشرێن یاخود بەجێ دەمێنن، بێگومان لە خاکی سەرەڕێشدا بەردەوام هێلَەکان کالَ دەبنەوە یاخود ڕەش دەبنەوە.

واتە: دلَی مرۆڤ دەتوانێ بە پلە و پایە و مەقامێك بگات کە لە نهێنییەکانی جامەکەی جەمشید زۆر زیاتر بزانێت و ئاگادار بێت.

**٦-دلم ز نرگس ساقی امان نخواست بەجان**

**چرا که شیوەء آن ترک دل سیه دانست**

**دلَم ز نەرگسی ساقی ئەمان نەخاست بە جان، چرا کە شیڤەیی ئان تورکی دل سیەه دانست.**

دلَم بۆ زیندووبوون (گیانی خۆی) داوای لە ساقی نەکرد، چونکە شێوە و ڕێوڕەسمی ئەو تورکە دلَڕەقەی زانی.

نرگس: نێرگز، درکەیە لە چاو          امان: دالَدە، پەنا

امان خواستن: داواکردنی دالَدە          چراکە: چونکە          ترك: جوانی دلَڕەق

دل سیە: دلَڕەش، مەبەست لە سۆمای چاوە کە ڕەشە

دەلَێ: دلَم چونکە دەیزانی چاوی ڕەشی ساقی دلَڕەق و بێ بەزەییە و خەریکی عاشق کوژییە بۆیە داوای دالَدە و پەنای لەو چاوە ڕەشە نەکرد کە گیانی بە سەلامەت دەربکات و نەیکوژێ.

**٧- ز جور کوکب طالع سحرگهان چشمم**

**چنان گریست که ناهید دید و مه دانست**

**ز جۆوری کەوکەبی تالئ سەهەرگەهان چەشمەم، چونان گریست کە ناهید دید و مەه دانست.**

کاتی سەحەران چاوم لە تاو زولَم و ستەمی ئەستێرەی بەخت بە شێوەیەك گریا کە ناهید بینی و مانگ زانی.

جور: جەور، ستەم          کوکب: ئەستێرە

طالع: بەخت          کوکب طالع: ئەستێرەی بەخت

سحرگهان: کاتی سەحەر          گریستن: گریا، لە چاوگی (گریستن) گریان وەرگیراوە

ناهید: ئەستێرەی زوهرەیە سێیەمین ئەستێرە لە پێکهاتەی ئاسمانی زەویدا کە لە عەرەبیدا پێیان دەوترێ:

قمرست و عطارد و زهره

شمس و مریخ و مشتری و زحل

بەڵام لە فارسیدا بەم شێوەیە ناونراون:

کواکب مه و تیر و ناهید میدان

چو خورشید و بهرام و برجیس و کیوان

{سودی، ج١، ل٣٢٣}

لە راستیدا بەخت و ئەستێرەی بەخت یەکێکە لەو چەمکانەی کە بەپێی کات و شوێن و حاڵەت پێناسەی خۆی دەگۆڕێت و زۆر مەحاڵە بتوانرێت پێناسەیەکی دیاریکراوی تەنانەت لای کەسێکیش هەبێت، چونکە پەیوەندی راستەوخۆی بەسەر میزاج و کات و شوێنی پێناسە کردنەکەوە هەیە، لێرەدا شاعیر لە بەخت و ئەستێرەی بەخت دڵگرانە و پێیوایە کە زوڵم و جەوری لێکردووە لە بەرامبەر ئەم زوڵم و جەوری ئەستێرەی بەختەدا هیچی پێ ناکرێت کە دەڵێن: لە چارەنووسی مرۆڤدا کاریگەری هەیە، هەر بۆیە لە کاتی سەحەردا دەگریەت و ئەم گریانەش هێندە بە خوڕ دەبێت مەخلوقاتی ئاسمانەکان لێی ئاگادار دەبن خودی خواجە دەڵێ: شاعیر لەتاو ئەستێرەی بەختم کە مەینەت و ناڕەحەتی دەکاتە بەشم لە کاتی سەحەر و بەیانیاندا چاوانم هێندە زۆر گریا ئەستێرەی زوهرە یاخود ناهید بینی و مانگیش پێی زانی.

**٨- خوش آن نظر که لب جام و روی ساقی را**

**هلال یکشبه و ماه چارده دانست**

**خوش ئان نەزەر کە لەبی جام و روی ساقی را، هەلالی یەکشەبەڤو ماهی چاردە دانست.**

خۆشبەحاڵی ئەو چاوەی کە لێوی جام و رووی ساقی بە هیلالی یەکشەوە و مانگی چواردە زانی.

لب: لێو، لێوار — لب جام: لێو، لێواری جام، لێواری پێك

هلال یکشبە: مانگی یەکشەوە — چاردە/چهاردە: چواردە

خۆش بە حاڵی کەسێك کە لێواری پێك و رووی ساقی لە لای هێندە جوان بن کە یەکەمیان وەك مانگی یەکشەوە کە باریکە و لە دەمەداس دەچێ و دووەمیان وەك مانگی چواردە کە رووناك و پڕە بێتە پێش چاوی.

لێرەدا بە مانای عیرفانی هەریەك لە جام کە حاڵەکانە و ساقی کە واسیتە و هۆکاری تەریقەتە مەبەست لەو چاوانەیە کە تەریقەت و عیرفانیان پێ جوانە و بەو چاوانە دەڵێ خۆش بە حاڵیان.



**٩- حدیث حافظ و ساغر که می زند پنهان**

**چه جای محتسب و شحنه پادشه دانست**

**هەدیسی هافز و ساغەر کە می زەنەد پەنهان، چە جای موهتەسیب و شیهنە پادشەه دانست.**

دەنگوباسی حافز و پێکەکەی کە بەدزییەوە هەڵی دەدا، چ جای مەحتەسیب و شەحنە، پادشاش زانی.

حدیث: چیرۆك، دەنگوباس، هەواڵ — می زند: هەڵی دەدا، دەیخواردەوە

پنهان: بە شاراوەیی، بە دزییەوە

محتسب: مەئموری ئیجراکردنی یاسا ئاینییەکان، رەنگە بە زمانی ئەم سەردەمە پۆلیس بێ

شحنە: والییەك کە دەنێردرا بۆ ویلایەتەکان، لێرەدا بەگشتی مەبەست لە حاکمە.

دیارە حافز بە پەنهانی خەریکی مەیخواردنەوەیە، یاخود هاوڕێیەتی بووە لەگەڵ جامدا، بەڵام ئەم دەنگ و باسە نهێنییە نەك هەر گەشتە لای پۆلیس و والی، بەڵکو گەشتە لای پادشاو ئەویش زانی واتە بە هەموو وڵاتدا بڵاوبوویەوە، پەیوەندی حافز و (ساغر، جام/ حاڵاتەکان) لە نهێنیدابوو، خواجە نەیدەویست بە سۆفی یاخود بەکەسێك ناوبانگ دەرکات کە حاڵ و حاڵاتی هەیە و هەربۆیە ئەمەی لە نهێنیدا دەکرد، بەڵام ئەم چوونە نێو حاڵ و حاڵگرتنەی حافز بە هەمو وڵاتدا بڵاوبوویەوە تەنانەت خودی پاشاش پێی زانی.

**١٠- بلندمرتبه شاهی که نُه رواق سپهر**

**نمونه‌یی ز خَم طاق بارگه دانست**

**بوولەندمەرتەبە شاهی کە نوە روڤاقی سیپیهر، نەمونەیی ز خەمی تاقی بارگەه دانست.**

پادشایەکی پایەبڵندی وا کە نۆ سەقفی ئاسمانی بە نموونەیەك لە خواری و چەماوەیی تاقی بارەگای خۆی زانی.

بلند مرتبە: پایە بەرز — نە: نۆ — رواق: ئاسمان، فەلەك

نە رواق: نۆ فەلەك، نۆ سەقف، زاناکانی فەلەکناسی بڕوایان وابوو کە نۆ فەلەك هەیە و زەوییان بە سەنتەری جیهان دەزانی کە ئەستێرەکانی دیکە بە چواردەوریدا دەسوڕێن، هەروەها حەوت کەوکەبەکەی بریتین لە (زحل و مشتری و مریخ و شمس و زهرە و عتارد و قمر) و نۆ ئاسمان لە نێو یەکتریدان و ئاسمانی نۆیەم لە (فلك الافلاك) یا (فلك اطلس) نێودەبرا، فەلەکەکانیش لە سەرەوە بۆ خوارەوە بریتی بوون لە: (فلك ثوابت، فلك زحل، فلك مشتری،

فلك مريخ، فلك زهره، فلك عطارد، فلك قمر) له نێو فەلەکی قەمەریشدا تۆپی ئاگر و ئاو و پاشان زەوی دروست بوون، بەم شێوەیەش زەوی لە سەنتەری جیهاندایە {سودی، ج۱، ل۳۲٤ـ۳۲۵، پەراوێزی ۱}

دەکرێ لێرەدا باس لەو پادشایە بێت کە لە بەیتی پێشوودا باسکراوە و لە حاڵ و حاڵاتەکانی حافز ئاگادار بووە، ئەو پادشایە هێندە بەدەسەڵات و پایەبەرز بووە کە نۆ سەقفی ئاسمان بە نموونەیەك لە چەماوەیی سەقف و تاقی بارەگاکەی خۆی زانیوە.

یاخود هەر پادشایەك بێت، کاتێ پایەبەرز دەبێ کە خاوەن روحییەتی بەرز بێت و چاوشۆڕ نەبێ و نۆ فەلەك بە نموونەیەك لە تاق و سەقفی بارەگاکەی خۆی بزانێ.



## غەزەلی پەنجا و شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- عارف از پرتو می راز نهانی دانست**

**گوهر هرکس ازین لعل توانی دانست**

**ئارف ئەز پەرتوڤی مەی رازی نەهانی دانست، گۆوهەری هەرکەس ئەزین لەئل تەڤانی دانست.**

عارف لە پرتەو(تیشك)ی شەرابدا نهێنییە شاراوەکانی زانی، دەتوانی گەوهەری هەر کەسێك لەم شەرابە سوورەدا بزانی.

پرتو: پرتەو، تیشك، رووناکی گوهر: گەهەر، کرۆك

لعل: یاقوتی، سوور، مەبەست لە شەرابی سوورە توانی: دەتوانی

عارف و عەشقی عارفانە دەبێتە مایەی کەشفکردنی نهێنییە شاراوەکان لەم حاڵەتەشدا دەتوانرێ کرۆك و گەوهەری هەر مرۆڤێك بناسرێت.

لە بری (عارف) لە نوسخەکاندا (صوفی) هاتووە، بەڵام لە یەکێ لە نوسخە دێرینەکاندا (عارف) هاتووە، هەڵبەت ئەمە چاکترە، چونکە لای حافز عارف هەمیشە جێگەی ستایش و سۆفی جێگەی تانە لێدان بووە، دەکرێ جاروبار ئاوڕێکی میهرەبانانەشی بۆ سۆفییەکان هەبووبێ، بەڵام بە ناوهێنانی ئاشکراو بەم شێوەیە سۆفی لای خواجە ستایش نەکراوە، بۆیە بە رای بەندە (عارف) حافز مەشرەب ترە تا (سۆفی)، هەروەها (سودی)ش لە شەرحەکەی خۆیدا (عارف)ی هێناوە و دەڵێ: لە هەندێ نوسخەدا لە بری (عارف) (سۆفی) هاتووە، بەهەرحاڵ لە غەزەلەکەدا چ سۆفی بێت یا عارف هیچ جیاوازی نییە و جێگە ستایشی خواجەیە.

**٢- قدر مجموعهء گل مرغ سحر داند و بس**

**که نه هرکو ورقی خواند معانی دانست**

**قەدری مەجموئەیی گول مورغی سەهەر دانەد و بەس، کە نە هەرکو ڤەرەقی خانەد مەئانی دانست.**

بەها و رێزی دەفتەری گوڵ بوولبوول دەیزانێ و بەس، چونکە وانییە هەرکەسێ پەڕەیەکی خوێندەوە مانای زۆر بزانێ.

قدر: قەدر، ڕێز، بەها

مجموعە: کۆما، دەفتەرێکە بابەتی جیاوازی تێدا کۆکرابێتەوە، کتێبی گیرفانی

مجموعـە گل: دەفتەری گوڵ، چونکە گوڵ لە پەڕی زۆر دروست بووە بـە دەفتـەر یـا کۆمـا داراوەتە قەڵەم    مرغ سحر: بوولبوول، باڵندەی سەحەر    داند: دەزانێ

بس: بەس، تەنیا    هرکو: هەرکەسێ    ورق: پەڕە

معانی: واتاکان، ماناکان    دانست: زانی

لەم بەیتەدا مەسەلەی عەشق (مەی)ی بەیتی یەکەم زیاتر ڕووندەکاتەوە، بێگومان بوولبوول عاشقی گوڵە و دەگوترێ هەمو بەیانیانێك زوو لـە خـەو رادەبـووریێ و کێـشکی ئـاونگی گـوڵ دەگرێت تا بیخواتەوە هەربۆیە بە باڵندەی سەحەر ناسراوە، لێرەدا عاشـقی بوولبـوول بـۆ گـوڵ زیاتر مەبەستە، چونکە بوولبوول بەو عەشقەی خۆیەتی کە توانیویەتی بەها و ڕێـزی دەفتـەری گوڵ بزانێ، یاخود نهێنی و شاراوەکانی نێو دەفتەری عیرفان لێکداوەتەوە و تێیان بگـات. بـەم واتایەی کە عارف عاشقی گوڵ و بێداری سەحەرانە دەتـوانێ لـە نهێنییـەکان بگـات و واتـا و ماناکان دەربهێنی نەوەك ئەو کاڵفامانەی کە پەڕەیەکیان خوێندووەتـەوە و هـەر لـە سـەرەتاوە بانگەشەی مانا عیرفانییەکان دەکەن.

**۳- ای که از دفتر عقل آیت عشق آموزی**

**ترسم این نکته به تحقیق ندانی دانست**

**ئەی کە ئەز دەفتەری ئەقل ئایەتی ئیشق ئـاموزی، تەرسـەم ئـین نوکتـە بـە تـەهقیق نەدانی دانست.**

ئەی ئەو کەسەی دەتەوێ لە دەفتەری عەقڵدا پەی بـە مـوعجیزەی عەشـق ببـەی دەترسـم نەتوانی بە چاکی لەم نوکتەیە تێ بگەی.

دفتر عقل: کتێبـی عـەقڵ، درکەیە لەو کتێبانەی کـە لەسـەر بنـەمای عـەقڵی و فەلـسەفی نووسراون

آیت: نیشانە، بەڵگە، ئایەت    آموزی: فێرببـی

این نکتە: ئەم خاڵە، ئەم مەسەلەیە    ندانی: نەزانی

بەتحقیق ندانی دانست: بە تەواوی فێرنەبی یاخود لە ڕێگەی ئەزموونەوە فێرنەبی

لە ئاست زۆر غەزەل و بەیتی خواجەدا ئیدی بە ناچاری دەبێ ڕاوەستین و جگە لـە درود بـۆ گیانی ئەو پیاوە مەزنە هیچی دیکە نەڵێین.



ئەم غەزەلە و بە تایبەتی ئەم بەیتە یەکێکە لەو بەیتـە دانـسقانەی کـە هـەرگیز شـەرحی کۆتایی نایەت، چونکە هەر لە سەرەتای بابەتـە فەلـسەفییەکانەوە و چـوونە نێـو لێکۆڵینـەوە مرۆیی و غەیبییەکانەوە، هەمیشە دوالیزمەی عەشق/عەقڵ وجودی هەبووە، ئایا کام ڕێگایـان بە مەنزڵمان دەگەیەنن، ئایا ئێمە بە بنەما عەشقییەکان بە ڕاستی مـرۆڤ دەگـەین یـاخود بـە بنەما ئـەزموونکراوە عەقڵییـەکان. تـازەترین و پەیوەنـدارترین کتێـب بـەم بەیتـەوە هـەمان کتێبەکەی (د.غلام حسین ابراهیم دینانی)یە کە هەمان نێوی لێناوە (دفتر عقل و آیت عشق) و بەم بەیتەش دەست پێدەکات. دکتۆر لەوێدا بە تێروتەسەلی باس لە پەیوەنـدی نێـوان عـەقڵ و عەشق دەکات لە ڕوانگە و بۆچوونی عارف و عاقڵـە گەورەکانـەوە و هـەوڵێکی زۆری داوە بـۆ نزیککردنەوەی عەقڵ و عەشق لە یەکتری و عەقڵی دروست زۆر لە عەشق نزیکدەکاتەوە، بـەڵام ئەم دوو چەمکە بەردەوام لێکدی دووردەکەونەوە. هەر لـە کتێبەکـەی (دینـانی)دا دان بـەوەدا نراوە کە لە وجودی مرۆڤدا سێ مەیدان هەیە کە ئەوانیش (مەیدانی ئیرادە و مەیـدانی عەشـق و مەیدانی مەعریفە و عەقڵ)ن کە ئەم سێ مەیدانە جیاوازییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە و مەرز و سنوور لێکدیان جودا دەکاتەوە، هەربۆیە زۆرێك لە عارفەکان عەقڵ لە عەشق جودادەکەنـەوە، یاخود بە تەئویلاتێکی زۆر لە مانای عەقڵدا پێی ڕازی دەبن خواجەش هەمان ڕای هەیە و پێـی وایە کە عەقڵ و عەشق جیاوازن لە یەکتری و دومەیدانی لێکجـودان و تێکـەڵکردنیان دەبێتـە مایەی سەرلێشێوان، کە لە ڕاستیدا ئەم مەسـەلەی سەرلێـشێوانە لـە مەیـدانی عەقڵیـدا بـە تایبەتی بۆ بوواری خواناسی زۆر جێگەی تێڕامانە، چونکە عارفـەکان پێیـان وایـە کـە عـەقڵ هەرگیز خودبەخود توانای دەرککردنی خودای نییە، لە یەکێ لە گەورەکانی ئەهلی مەعریفـەت (ابوو الحسین نوری)یان پرسی کە ڕۆڵی عەقڵ چییە لـە ناسـینی خـودادا؟ گـوتی عـەقڵ بـێ توانایەکە کە جگە لەسەر بێ تواناکانی وەك خۆی دەلالەت ناکات هەروەها دەڵێ: کـاتێ خـودا عەقڵی دروست کرد پێی گوت من کێم؟ عەقڵیش بێ دەنگ بـوو، تـا خوداوەنـد خـۆی چـاوی عەقڵی بە سورمەی نوری خۆی ڕووناك کردەوە.{دفتر عقل و آیت عشق، د. غلامحسین ابراهیمی دینانی، چاپ اول، انشارات طرح نو، ۱۳۸۰، تهران، ل۲۷}

لەم بەیتەدا حافز بەو کەسانەی کە دەیانەوێ لە دەفتەری عەقڵەوە واتە لە بووار و مەیـدانی عەقڵدا لە موعجیزە و ئایەتەکانی عەشق تێبگەن و فێربن دەڵێت: دەترسم ئـە مەسـەلەیە بـاش نەزانی کە ئەم دوو مەیدانە لە یەکدی دوورن و بەڵگەکانی عەشق لـە دەفتـەری عەقڵـدا نـین و ڕێت لێ تێکچێ و بە کوێرەڕێدا بڕۆیت، ئامۆژگاری یاخود ئاگاداری ئەدات بەوکەسانەی کە لـە

نێو مەیدانی عەقڵدا بۆ ئایەتی عەشق دەگەڕێن و پێیوایە بە کوێرەڕێدا چونە، بۆیە دەترسم ئەم حەقیقەتە نەزانی.

**٤- عرضەکردم دو جهان بر دل کارافتادە**

**بجز از عشق تو باقی همە فانی دانست**

**ئەرزە کەردەم دو جەهان بەر دلی کار ئوفتادە، بەجوز ئەز ئیشقی تو باقی هەمە فانی دانست.**

هەردوو دنیام بۆ دڵی دنیادیدەم نمایش کرد، جگە لە عەشقی تۆ کە بە نەمری زانی هەموو شتێکی بە لەناوچوو زانی.

عرضە کردم: نمایشم کرد    کارافتادە: کاردیدە، ئەزموودار، دنیادیدە    فانی: لەناوچوو

لێرەدا مەسەلەی (دڵی عارف) جارێکی دیکە دێتەوە ئارا، کە دڵیش لای عارف و عاقڵە گەورەکان جێگەی پرسیار و تێڕامان بووە (ابوو طالب مکی) لە (قوت القلوب)دا پێیوایە کە دڵ گوێ و چاو و زمان و هێزی بینینی هەیە، هەروەها (حەکیم ترمزی) پێیوایە کە خوا پلە و مەقام و پایەی بۆ دڵی مرۆڤەکان دروستکردووە و (سهل توشتەری) کە یەکێکە لە عارفە پلە بەرزەکان، دڵی بە دەریا زانیوە و وشەی (بحر)ی لە ئایەتی (مرج البحرين يلتقيان) دا بە (دڵ) لێکداوەتەوە. {ابراهیم دینانی، ل٢٢ ـ ٢٣}

هەربۆیە لێرەشدا خواجە دڵی وەك تەنێکی زیندووی دنیادیدە هێناوە کە لە رای عارفەکانەوە هەڵدەقوڵێ و دەڵێ: ئەی مەعشوقی حەق هەردوو دونیام نمایش کرد یاخود خستە بەردەستی دڵی دونیادیدە و بەئەزموونم تا چاك و خراپ یان نەمری و لەناوچوونیانم پێ بڵێ، ئەویش جگە لە عەشقی تۆ کە بە هەرماو و نەمری دایە قەڵەم هەرچی شتی دیکەی نێو هەردوو دونیا بوو بە فانی و لەناچووی زانی، لێرەدا زیاتر ئەو سروشتەی (رابیعەی عەدەوی)یە کە جگە لە عەشقی خودا هیچی دیکەی بەلاوە پەسەند نەبوو، تەنانەت بەهەشت و خۆشییەکانی جیهانی دوارۆژیش، لێرەشدا دڵی بەئەزموونی خواجە جگە عەشقی حەق هیچی دیکە بە باقی نازانێ.

**٥- سنگ و گل را کند از یمن نظر لعل و عقیق**

**هرکە قدر نفس باد یمانی دانست**

**سەنگ و گیل را کونەد ئەز یومنی نەزەر لەئل و ئەقیق، هەرکە قەدری نەفەسی بادی یەمانی دانست.**

بە بەرەکەتی نیگا بەرد و گڵ دەکاتە یاقوت و عەقیق، هەر کەسێ کە بەهای هەڵکردنی هەوای یەمەنی زانی.



سنگ: بەرد    گل: گڵ، خۆڵ، خاك    یمن: بەرەکەت

نظر: نیگا، تەماشا    لعل: بەردی بە نرخ، یاقوت

عقیق: مادەیەکی نەرمە لە شێوە سروشتییەکانی سیلیست کە لەخاکدا هەیە و لە شێوەی شووشەی رەقی گرانبەها دایە، دەڵێن گوایە سەرەتا نەرمە و پاشان رەق دەبێت و دەبێتە ئەو مادە بریسکەدارە    نفس: نەفەس    بادیمانی: هەوای یەمەن

بۆ تێگەیشتن لە بەیتەکە پێویستە دوو مەسەلەی گرنگ روونکرێتەوە، کە یەکەمیان پەیوەندی نێوان بەرد و گڵ و یاقوت و عەقیقە و دووەمیان نەفەسی هەوای یەمەنە

سەبارەت بەخاڵی یەکەم، زانا پێشووەکان لەو بڕوایەدا بوون کە گەرما و تیشکی هەتاو و کاریگەری هەوا بەرد و گڵ بە یاقوت و عەقیق دەگۆڕێت. (سودی) لە شەرحی ئەم بەیتەدا نووسیویەتی: پەیوەندی لعل (یاقوت) لەگەڵ بەرد و عەقیق لەگەڵ گڵدایە، چونکە عەقیق کاتێ لە زەوی دەردەهێنرێ وەکو مۆمی هەنگوین نەرمە و پاشان بە هۆی گەرمکردنەوە یەکدەگرێت و رەق دەبێ، (نصیر توسی) لە (جوهرنامە)دا فەرموویەتی کە کەس نازانێ مادەی عەقیق و عەنبەر لە کوێیە، سەرەتا هەردووکیان لە کەناری دەریا کۆدەکردەوە {سودی، ج١، ل٣٢٧ — ٣٢٨}یاقوت و عەقیق هەردووکیان دوو مادەی گرانبەها و جوانن. هەرچی خاڵی دووەمە: پیوەندی بە فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەرەوە هەیە کە سەبارەت بە(وەیسی قەرەنی) فەرموویەتی (انی لأجد نفس الرحمن من قبل اليمن) بێگومان وەیس یەکێکە لە وەلیەکانی خودا و عاشقانی پێغەمبەر کە نەیتوانی لە ژیاندا ببینێ، ئەو(وەیسی قەرەنی) یەکێك بوو لە عارف یاخود زاهیدەکانی سەرەتای ئیسلام کە لە یەمەن دەژیا و لەبەر ئەوەی کە خزمەتی دایکی دەکرد و نەیتوانی رەزامەندی وەرگرێت کۆچی نەکرد بۆ مەدینە و پێغەمبەری نەبینی، پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بە وەیس فەرموویەتی: "انی لأجد نفس الرحمن من قبل اليمن) هەندێك پێیان وایە کە وەیس یەکێکە لە (هەشت زاهیدەکە) کە بە هۆی شەوبێداری و و پشتکردنە دنیا و بەهەندگرتنی فەرز و سونەتەکان جیاوازییان لە خەڵکی دیکە هەبوو، ئەوانیش بریتی بوون لە(ربیع بن خثیم، هرم بن حیان، اویس قرن، عامر بن عبدقیس، ابوو مسلم خولانی، مسروق بن اجدع، حسن بصری، اسود بن فرید). وەك گوترا وەیس ئارەزوویەکی زۆری هەبوو بۆ دیداری پێغەمبەر، بەڵام لەبەر دایکی نەیتوانی بڕوات و پێغەمبەری نەدی، هەربۆیە لای عارفەکان پلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە، هەر لەمەشەوە ئەوەی لەم پۆلە مورشید و سەردار هەڵنەبژێرێ (وەیسی) پێ دەڵێن، بە گوتەی (شێخ عطار) لە(تذکرة الاولیاء)دا

دواجار وەیسی قەرەنی پشتی حەزرەتی عەلی گرت دژ بە معاویە و لە شەڕی صفین دا کوژرا {وحدت وجود، فضل الله ضیاء نور، انتشارات زوار، چاپ اول، ۱۳۶۹ هـ. ش، ل۹۶}

هەر بۆیە دەفەرمووێ من بۆنی هەناسەی خودا دەکەم لە لای یەمەنەوە، واتە لای مەنزڵی وەیسەوە.

لێرەدا خواجە دەڵێ: هەر کەسێ قەدر و بەهای ئەو نەفەسە خوداییە بزانێ کە لای یەمەنەوە هەڵدەکات، بە شێوەیەك خاوەنڕا دەبێ کە هەر بە تەماشاکردن بەرد و گڵ دەکاتە یاقوت و عەقیق. سودی دەڵێ: هەرکەس خۆشەویستی بۆ وەیسی قەرەنی یا وەلیەکانی خودا بەگشتی هەبێ ئەوا هێندە گەورە دەبێ هەر بە سەیرکردن بەرد و گڵ دەکاتە یاقوت و مجەوهەرات، یا ئەگەر بیانکات سەیر نییە.

گەر لە چۆنییەتی شەرحکردنەکەدا دوورییەك هەبێ ئەوا گومان لەوەدانییە کە هەرکەسێ خۆشەویستی بۆ خۆشەویستەکانی خودا هەبێت ئەوا بەرێز و کاریگەر دەبێت.

**٦- آن شد اکنون که ز افسوس عوام اندیشم**

**محتسب نیز درین عیش نهانی دانست**

**ئان شود ئەکنون کە ز ئەفسوسی ئەڤام ئەندیشەم، موهتەسیب نیز دەرین ئەیش نەهانی دانست.**

ئەوە تێپەڕی کە ئێستا بیر لە سەرزەنشتی خەڵکی ڕەمەکی بکەمەوە و هەراسان بم، چونکە موحتەسیب بە عەیش و خۆشیی شاراوەی من دەزانێ.

آن شد: ئەوە تێپەڕی    اکنون: ئێستا    افسوس: سەرزەنشت

عوام: خەڵکی ڕەمەکی    اندیشم: بیربکەمەوە، هەراسان بم

لە نوسخە جیاوازەکاندا لە بری (افسوس) (افسون و ابنا و تشویش) و لە بری (عوام) یش (زمان) هاتووە، بەڵام (افسوس) جوانتر مانا دەگەیەنێ.

خواجە پێیوایە ئیدی کاتی ئەوە تێپەڕیوە کە خۆمان لە سەرزەنشتەکانی خەڵکی ڕەمەکی و عەوام بپارێزین و ئیدی هەراسان نابێت یاخود هەر بیریان لێ ناکاتەوە، چونکە پۆلیس و مەئمورانی بەرگریکردن یاخود قەدەغەکردنی خراپەکاری (محتسب)، ئاگایان لەو ژیانە خۆشەی حافز هەیە کە لە نهێنیدا بەسەری دەبات، هەربۆیە گەر جاران لە ترسی گەیاندن و شکاتکردنی هەراسان ببووایە ئێستا شکاتکردنێك لە ئارادا نییە، چونکە مەئمورەکان خۆیان دەزانن، ئەم بەیتە ئاماژەیە بە ئاشکراکردنی هەڵوێستی عارفانەی حافز.



**٧- لطفش آسایش ما مصلحت وقت ندید**

**ور نه از جانب ما دل نگرانی دانست**

**لوتفەش ئاسایشی ما موسلەهەتی ڤەقت نەدید، ڤەر نە ئەز جانبی ما دل نیگەرانی دانست.**

لوتفی مەعشوق ئاسایشی ئێمەی بە مەسڵەحەت نەزانی وەگەرنا لە دڵنیگەرانی ئێمە بە ئاگابوو.

مصلحت ندید: بە مەسڵەحەتی نەزانی، بەچاکی نەزانی

ورنە: ئەگەرنا    از جانب ما: لەلایەن ئێمەوە

خواجە پێیوایە کە دلبەر و مەعشوق لە سەری لوتف و چاکی خۆیەوە بە چاکی نەزانیوە ئێمە ئێستا ئارام و ئاسایش بین و رزگارمان ببێ لە نیگەرانی ئەگەر نا لە نیگەرانی دڵی ئێمە ئاگادار بوو. لێرەدا گومانی چاك بردنە بە مەعشوق کە ئەو چاکتر دەزانێ چاکە و مەسڵەحەتی ئێمە لە چیدایە و ئەوەش کە ئێستا ئارامیمان پێ نابەخشێ لەبەر مەسڵەحەتی خۆمانە و ئەوچاکتر دەزانێ.

**٨- می بیاور که ننازد به‌گل باغ جهان**

**هرکه غارتگری باد خزان دانست**

**مەی بیاڤەر کە نەنازەد بە گولی باغی جەهان، هەرکە غارەتگەری بادی خەزانی دانست.**

مەی بهێنە، چونکە هەرکەسێ تاڵانگەری بای پایز بزانێ بەگوڵی باغی جیهانەوە نانازێ.

بیاور: بهێنە    ننازد: نانازێ    غارتگری: تاڵانگەری    بادخزان: بای پایز، بای خەزان

لای حافز چارەی جیهان عەشقە و پێیوایە کەسێ کە ئاگای لە تاڵانی بای خەزان و ئەجەل بێت هەرگیز شانازی بە گوڵی باغی جیهان و جوانی و تەمەنەوە ناکات، هەربۆیە بە ساقی دەڵێ: مەی بهێنە دونیا مایەی شانازی پێوەکردن نییە چونکە، زوو بە دەستی بای خەزان تاڵاندەکرێ.

**٩- حافظ این گوهر منظوم که از طبع انگیخت**

**اثر تربیت آصف ثانی دانست**

**هافز ئین گۆوهەری مەنزوم کە ئەز تەبئـ ئەنگیخت، ئەسەری تەربییەتی ئاسەفی سانی دانست.**

حافز کە ئەم مرواریيە هۆنراوانەی لە سروشتی خۆی دەرهێناوە بە کاریگەری پەروەردەی ئاسەفی دووەم دەزانێ.

گوهر: مرواری        گوهر منظوم: مرواری هۆنراو، مەبەست لە شیعرەکانییەتی

انگیخت: لێرەدا بە واتای هێنایەبوون، دەری هێنا هاتووە    اثر: کاریگەری، نیشانە

آصف ثانی: ئاسەفی دووەم، ئاسەفی بەرخیا وەزیری حەزرەتی سولەیمانە ـ سەلامی خوای لەسەر بێ ـ بەڵام لەم بەیتەدا جیاوازە، سودی پێیوایە کە مەبەست لە ئاسەفی دووەم (قوام الدین حسن)ە کە مامۆستا و پەروردەکەری خواجە حافز بووە و لەم دیوانەدا هەرچی ناوی ئاسەفی دووەم یا ئاسەف بێت مەبەست لە (قوام الدین)ە{ ج١، ل٣٣١}، بەڵام هروی بە نەقڵکردن لە (د. غنی) یەوە پێیوایە کە رەنگە مەبەست لە (جلال الدین تورانشاە) وەزیری (شوجاع پاشا) بێت {ج١، ل٢٥٨} هەروەها لە نوسخەی (امیر میرزای تەیموری)دا هاتووە کە مەبەست لە ئاسەفی دووەم (قوام الدین محمدی کوڕی علی) ناسراو بە (صاحب عیار) وزیری شوجاع پاشایە کە لە ساڵی (٧٤٦)دا بەدەستی هەمان پاشا کوژراوە{تیموری، شرح اعلام، ل١٢٦}

بەهەر حاڵ خواجە پێیوایە شیعرەکانی کە وەك ملوانکەی مروارین و لە سروشی خۆی دەری هێناون بە هۆی پەروەردەی مامۆستا و پەروەردەکەرەکەی یاخود وەزیرێکی بەخشندەوە نووسیونی و لێرەدا ستایشی دەکات.





نخستین صفحهٔ دیوان حافظ در مجموعهٔ آقای سبرپوش
و آخرین صفحهٔ همان مجموعه

## غەزەلی پەنجا و حەوتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- آن سیه چرده که شیرینی عالم با اوست**

**چشم میگون لب خندان دل خرم با اوست**

**ئان سیەه چەردە کە شیرینیی ئالەم با ئوست، چەشمی مەیگون لەبی خەندان دلی خورەم با ئوست.**

ئەو سەوزەڵەیەی کە زەوق و شیرینی دنیای هەیە، چاوی مەست و لێوی بەخەندە و دڵی شادی هەیە.

سیه/سیاه: رەش        چرده: رەنگی رووخسار و پێست

سیه چرده: سەوزەڵە، سەوزە، ئەسمەری تێر        شیرینی: زەوق، نەرمی، شیرینی

شیرنی عالم با اوست: هێندەی جیهان زەوق و شیرینی هەیە

میگون: مەی ئاسا، شەرابی، لە رووی زمانەوانییەوە بە واتای سوور دێت

چشم میگون: چاوی وەك مەی، بەڵام گەر مەبەست لە رەنگی مەی بێت واتە چاوێك کە سپیاتییەکەی سووری زۆر تێدا بێت و ئەم حاڵەتەش هیچ کاتێ بە جوان دانەنراوە، هەر بۆیە لێرەدا مەیگون واتە شەپۆلاوی بوونی چاو، مەستبوونی چاو، چاوی مەست، بەڵام گەر ئاوەڵناوی لێو بێت مەبەست لە سوورییە

لب خندان: لێوی بەخەندە        خرم: شاد و خۆشحاڵ

واتە: ئەو مەعشوقە ئەسمەرە تێرە (سەوزەڵە) ی کە هێندەی دونیا شیرین و نەرمی هەیە، مەعشوقێکە کە چاومەست و لێوبەخەندە و دڵشادە.

**٢- گرچه شیرین دهنان پادشاهانند ولی**

**او سلیمان زمان است که خاتم با اوست**

**گەرچە شیرین دەهەنان پادشەهانەند ڤەلی، ئو سولەیمانی زەمانەست کە خاتەم با ئوست.**

گەرچی لێوشیرینان پادشان، بەڵام ئەو سولەیمانی زەمانە کە ئەنگوستێلەی پێیە.

شیرین دهن: دەم و لێوی جوان و پەسەندکراو، دەمی بچووك، نقوڵ دەم



ئەنگوستیلە بچووکە و نقێمەکەی ناوی بچووکتر، لێرەدا دەمی یاری لە رووی بچووکی و دانسقەییەوە بە ئەنگوستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان چواندووە و دەڵێ: راستە جوانانێ کە دەمیان بچووکە و سەرنجڕاکێشن پادشا و سەروەرن، بەڵام هیچکامێکیان ناگەن بە مەعشوق چونکە دەمی مەعشوق وەك ئەنگوستیلەکەی سولەیمانە و گرەوی لە هەمووان بردۆتەوە، چونکە پادشا زۆر بوون لە دونیادا، بەڵام هیچیان نەگەیشتن بە حەزرەتی سولەیمان ئەویش لەبەرئەوە بوو کە ئەنگوستیلەکەی تاك و تەنها بۆ ئەو هاتبوو و کەس نەیبوو، یاریش لە سەردەمی خۆی سولەیمانی سەردەمە و هیچ کەسێکی پێ ناگات، واتە جوانان پادشان، بەڵام یاری من سولەیمانی زەمانە، چونکە ئەنگوستیلەی پێیە.

**٣- خال شیرین که بر آن عارض گندم گون است**

**سرّ آن دانه که شد رهزن آدم با اوست**

**خالی شیرین کە بەران ئارزی گەندوم گونەست، سرری ئان دانە کە شود رەهزەنی ئادەم با ئوست.**

خاڵی شیرین کە بەسەر ئەو روومەتە گەنم رەنگەوەیە، رازی ئەو دانەی تێدایە کە بووە مایەی لە رێ لادانی ئادەم.

خال شیرین: خاڵی شیرین و جوان        عارض: روومەت        گندم گون: گەنم رەنگ

دانە: دان، ئەو دانەی کە بۆ فریودان لە داو دادەنرێت

رهزن: جەردە، کەسانێ کە لە رێگەدا خەڵکی رووت دەکەنەوە، لەرێ لادەر

آدم: حەزرەتی ئادەم، لە رێگە لادانی ئادەم لە لایەن شەیتانەوە و خواردنی بەری درەختەکە کە لێرەدا بە دانی فریودان هاتووە و لە قورئاندا باسکراوە، وەك ئایەتی (٢٢) سورەتی (الاعراف) هاتووە، هەرچەندە لە خودی قورئانی پیرۆزدا نێوی ئەو درەختە نەهێنراوە کە شەیتان ئادەمی پێ فریوداوە، بەڵام لە تەفسیرەکاندا بە میوەیەکی وەك ترێ، سێو، هەنجیر یاخود گەنم ئاماژەکراوە و لە ئەدەبیاتدا (گەنم) زۆر بە ئاشکراتر زاڵبووە، لێرەشدا خواجە هەمان بۆچوونی هەیە. بە هەرحاڵ دەڵێ: خاڵی رەشی سەر روومەتی گەنم رەنگت بووەتە ئەو دانەی کە ئادەمی لە رێ لادا و نافەرمانی خودای کرد. سەبارەت بە (آن دانه) لەڕووی عیرفانییەوە نووسراوە: مەبەست لە (آن دانه) لای عارفەکان زانین و مەعریفەتە کە خودا بە ئادەمیدا و ئەمەش پێویستی ناسین و سەرەتای عەشقی جوانی ئەو بوو، بەم دەربڕینەش واتاکە دەبێتە رازی دانێك کە دەگوترێ ئادەم لەوی خوارد لە خاڵی رەشی مەعشوقەوە دەرك دەکرێ، واتە مەعریفە بە جوانی. لە راستیدا مەسەلەی مەعریفە و درەختەکەی ئادەم لە

تەوراتیشدا هاتووە کە کاتێ ئادەم لە بەری درەختی مەعریفەی خێر و شەڕی خوارد خودا لە ترسا لە بەهەشت دەری کرد {بڕوانە: سفر التکوین..} ئەم واتا نێگەتیڤییەی تەورات زۆر جیاوازە لەو واتا پۆزەتیڤیە عیرفانییەی کە عارفەکان خستویانەتەڕوو.

بەهەرحاڵ لێرەدا خواجە دەیەوێ فریودەریی خاڵی سەر رووومەتی مەعشوق بخاتەڕوو کە لە فریوداندا هێزێکی سەرنجڕاکێشی وای هەیە لەو درەختە دەچێ کە ئادەمی پێ خەڵەتا، ئەمیش خەڵکی فریو دەدات. لە هەندێ ساغکردنەوەدا لە بری (خال شیرین) (خالی مشکین) هاتووە کە لەبەر زۆر هاتنی شیرین دەبووا پەیڕەوی لێ بکرێت، بەڵام زۆرینەی نوسخە رەسەنەکان (شیرین) یان هێناوە بۆیە ئێمەش پەیڕەویمان لێکرد.

**٤- دلبرم عزم سفرکرد خدا را یاران**

**چه‌کنم با دل مجروح که مرهم با اوست**

**دلبەرەم ئەزمی سەفەر کەرد خودا را یاران، چە کونەم با دلی مەجروە کە مەرهەم با ئوست.**

دولبەرم عەزمی سەفەری کرد، بۆ خاتری خودا یاران، چی بکەم بەدڵی بریندارم کە مەرهەم بەئەوە.

عزم سفرکردن: بڕیاری سەفەردان      مجروح: بریندار      مرهم: مەرهەم، مەڵهەم

هەمیشە عاشقان لە کاتی سەفەری مەعشوقدا توانای بێدەنگییان نامێنێ و هەتا بتوانن داد و هاوار دەکەن، خواجە بە یاران دەڵێ: بۆ خاتری خودا یارم بڕیاری سەفەری داوە چی بکەم بە دڵی بریندارم، من کە مەرهەمی دڵی بریندارم بە یارە ئەگەر سەفەر بکات و بڕوات ئیدی دڵی بریندارم چارەسەر ناکرێ یاران چی بکەم.

**٥- روی خوب است و کمال هنر و دامن پاک**

**لاجرم همت پاکان دو عالم با اوست**

**روی خوب ئەست و کەمالی هونەر و دامەن پاك، لاجەرەم هیمەتی پاکانی دو ئالەم با ئوست.**

رووخساری جوانە و لە کەماڵی هونەردا و بێ گوناهە، بێگومان هیمەتی پاکانی هەردوو جیهان لەگەڵ ئەودایە.

روی خوب: خوب واتە چاك، بەڵام لێرەدا کە ئاوەڵناوی رووخسارە واتای جوان دەگەیەنێ، رووخساری قەشەنگ      هنر: چاکە، فەزیلەت



کمال هنر: لە کەماڵی فەزیلەتدایە      دامن پاك: بێگوناه، لە بەرامبەر (دامن آلودە)دا دێت کە بە مانای گوناهبار دێت، بێگومان پاکداوێنی لە کوردیدا واتای جوزئی و بەشی (پاکدامن) فارسییە      لاجرم: لابد، بێگومان      همت: دۆعاو نزا، هەوڵ و هیمەت

پاکان دو عالم: کەسانێ کە لە هەردوو جیهانی دونیا و ئاخیرەتدا پاکن

یار و دولبەر بڕیاری سەفەری داوە و مەرهەمی دڵی برینداری منیشی پێیە و ئەی یاران بۆ خاتری خودا چی بکەم، چونکە تەنیا بڕیارەکەی نییە من دەترسێنێ، بەڵکو یارم بە رووی جوانی و کەماڵی فەزیلەت و بێ گوناهی خۆیەوە، هیممەت و کۆششی پاکانی هەردوو دونیای هەیە و ئەم کۆشش و هەوڵە زۆرەی ئەویش بۆ سەفەر وایکردووە بڕیارەکەی بگەیەنێتە جێ، یاخود یار بەم سیفاتانەوە وایکردووە نزا و دۆعای پاکانی هەردوو جهان لەگەڵ ئەودابێ و نزای خێری بۆ بکەن بۆ سەفەرەکەی لە هەردوو باردا ئەو ترسە زیاتر دەخاتەڕوو کە بێگومان سەفەر دەکات.

**٦- با که این نکته توان گفت که آن سنگین دل**

**کشت مارا و دم عیسی مریم با اوست**

**با کە ئین نوکتە تەڤان گوفت کە ئان سەنگین دل، کوشت مارا ڤو دەمی ئیسیی مەریەم با ئوست.**

دەتوانرێ ئەم خاڵە بە کێ بگوترێ کە ئەو دڵڕەقە، ئێمەی کوشت و کەچی نەفەسی مەسیحایی هەیە.

کشت مارا: ئێمەی کوشت      دم: نەفەس، هەناسە

یەکێ لە موعجیزەکانی عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خوایان لەسەر بێ) ئەوەبوو کە بە هەناسەی خۆی مرۆڤی مردووی زیندو دەکردەوە و بۆ ئەمەش فوی دەکرد بە مردووەکەدا و بە فەرمانی خوا گیانی تێ دەکەوتەوە. لە ئەدەبیاتی کوردیشدا نەفەسی مەسیحایی هەیە، دولبەری خواجەش بۆ ئەم نەفەسی مەسیحایی هەیە و بینینی وەك هەناسەی حەزرەتی عیسا گیان دەکاتەوە بە بەری خواجەدا، بەڵام دولبەر هێندە دڵڕەقە بەم هەناسە زیندووکەرەوەشەوە عاشقان دەکوژێ، خواجە دەڵێ: دەتوانرێ ئەم مەسەلەیە بە کێ بگوترێ واتە کێ باوەڕ دەکات کە ئەو یارە دڵڕەقە لەگەڵ ئەوەی نەفەسی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەمی هەیە کەچی بە سەفەر و هیجرانی ئێمەی کوشت.

**٧- حافظ از معتقدان است، گرامی دارش**

**زانکه بخشایش بس روح مکرم با اوست**

**هافز ئەز موئتەقیدانەست، گرامی دارەش زانکە بەخشایش بەس روهی موکەرەم با ئوست.**

حافز لە باوەڕدارانە، خۆشت بووێ (ڕێزی بگرە)، چونکە جێگەی لێبووردەیی زۆربەی وەلیەکانە.

معتقدان: باوەڕداران    گرامی دارش: خۆشت بووێ، ڕێزی بگرە، بەگەورە سەیری بکە

بخشایش: لێبووردەیی    بس: زۆر

روح مکرم: گیانە گەورەکان، درکەیە لە وەلییەکانی خوا، بە واتای جوبرەئیلیش دێ

لێرەدا خواجە لەلایەکەوە شانازی بە باوەڕداری خۆیەوە دەکات و لەلایەکی دیکەوە باوەڕداریی بە هۆی لێبووردەیی و ڕێزداری دەزانێت. بۆیە بە یار دەڵێ: حافز لە باوەڕدارانە و ئەم باوەڕداریەش بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە وەلییەکانی خودا و گیانە بەرێزەکان داوای لێبووردنی بۆ بکەن تۆش ڕێزی بگرە و خۆشت بووێ.



## غەزەلی پەنجا و هەشتەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١- سر ارادت ما و آستان حضرت دوست**

**که هرچه بر سر ما می رود ارادت اوست**

**سەری ئیرادەتی ما ڤو ئاستانی هەزرەتی دوست، کە هەرچە بەر سەری ما می رەڤەد ئیرادەتی ئوست.**

سەری ویستی ئێمە بەردەوام لەسەر بەردەرگای حەزرەتی دۆستە، هەربۆیە هەرچی بەسەر ئێمەدا دێت ویستی ئەوە.

ارادت: ئیرادە، ویست، دۆستایەتی بێخەوش و نییەت پاکانە

برسرما می ورد: بەسەر ئێمەدا دێت، مانای زمانی دەبێتە، هەرچی بەسەر ئێمەدا دەڕوات

سەری ئیرادەی ئێمەی عاشقانی دۆست هەمیشە و بەردەوام خراوەتە سەر بەردەرگا و ئاستانەی حەزرەتی دۆستەوە، هەر بەم هۆیەشەوەیە کە ئێمە ئیرادەمان خستۆتە بەردەم ئاستانەی دۆست، ئیدی هەرچیمان بەسەردێ بە هۆی ئەو سەردانان و خۆشویستن و دۆستایەتییە بێخەوش و پاکەوە دێت کە لەگەڵ دۆستدا هەمانە، یاخود ئێمە هەرچیمان بەسەردێ بە مەیل و ویستی دۆست بەسەرمان دێ، چونکە ئیرادەمان داوەتە دەستی.

گەر (برسرما می رود) بە مانای مادیانەی زمانیی لێکدرێتەوە ئەوا بەیتەکە دەبێتە: ئێمە سەری ئیرادەمان لەسەر بەردەرگای ماڵی دۆستە و ئەو ماڵەش میوان و هاتووچۆکەرانی زۆرە هەربۆیە هەرچی بە سەرماندا تێدەپەڕێ و پێمان لێ دەنێ بە هۆی ئەو هاوڕێیەتی و سەردانانەوەیە.

لە ڕاستیدا بۆ تێگەیشتن لەمانای قووڵی بەیتەکە پێویستمان بە لێکدانەوەی تێڕوانینی عارفانەی عاشقانە هەیە بۆ مەسەلەی ئیختیار و ویستی مرۆڤ، عارفەکان یاخود عاشقەکانی مەعشوقی ئەزەلی بەوپەڕی خۆشەویستی و حەزەوە هەموو ویست و ئیختیاریان دەدەنە دەست مەعشوق و هیچ کاتێکیش هەست بە جەبرییەت و بێ ویستی خۆیان ناکەن، چونکە لەوکاتەدا کە عاشق خۆی بە بەشێك لە مەعشوقی ئەزەلی خۆی دەزانێ و من و تۆیەك لە ئارادا نایێنێت و هەمیشە بوونی من واتە بوونی ئەو و منێك لە ئارادا نابێ ئیدی عاشق هەست بە ویستی

خۆی ناکات و هەموو ئیختیاری دەداتە دەست یار لەم کاتەشدایە کە دوو بوونی داواکەر یاخود گلەیی – کەر لە بەرامبەر یەکتردا نابینرێن و هەست بە جودایی لە یەکتری ناکەن، هەرچەندە ئەم حاڵەتە لە رواڵەتدا خۆدانەدەست و (اجبار)ە، بەڵام لای عارفەکان ئەم خۆدانەدەستە عاشقانەیە و ئارەزوو و مەیلێکی ئازادانەی خۆیانە و بە جەبری سەرووی ئیختیار دەدرێتە قەڵەم، جەنابی (د. عبدالکریم سروش) لەم بارەیەوە نووسیویەتی:" لە کاتێکدا خواناسان و عارفان بە ئارەزووی خۆیان ملکەچی گەورەیی و رێزی ئەو دەبن، بەڵکو لەمەش زیاتر عارفان ئیختیاری خۆیان بە ئەو دەفرۆشن و لەم فرۆشتنی ئیختیار وکڕینی جەبرەدا، عاشقانە ئیختیارێکی بەرزتر لە ئیختیاری پێشووی خۆیان بەدەست دەهێنن ئەمەش جەبری سەروو ئیختیارە"{ عبدالکریم سروش، حدیث بندگی و دلبردگی، ل١٧٦} . لەم قەناعەتە عیرفانییەوەیە کە خواجە سەری خۆی دەخاتە بەر دەرگای ئارەزووی دۆست، چونکە لە نێوان خواجە و مەعشوقدا من و تۆیەك نەماوە و خواجە بەوپەڕی ئازادی خۆیەوە ئازادی دەداتە دەست ئارەزووی مەعشوقی ئەزەلی تاوەکو لەو رێگەیەوە ئازادی گەورە و گرنگی دیکە بەدەست بهێنی کە عەشقی ئەوە.

بە رای (د.سروش) لەم کاتەدایە کە ئیدی ئەم مەوجودە گرفتی جەبر و ئیختیاری نابێ و خودا دەبێتە ئارەزوو ویستی ئەو، واتە دەبێتە خۆشەویستێ کە ئەو لە هەموو دونیادا هەڵیبژاردووە، لەم حاڵەتەشدا هەرچی ئەو خۆشەویستە هەڵیبژێرێت، هەڵبژاردەی ئەم بەندەیە دەبێت{بڕوانە: عبدالکریم سروش، حدیث بندگی و دلبردگی، چاپی دووەم، ١٣٧٥هـش، مؤسسەء فرهنگی صراط، تهران، ل١٦١ـ١٦٢} .

**٢- نظیر دوست ندیدم اگر چه از مه و مهر**

**نهادم آینەها در مقابل رخ دوست**

**نەزیری دوست نەدیدەم ئەگەرچە ئەز مەه و میهر، نیهادەم ئایینەها دەر موقابیلی روخی دوست.**

هاوتای دۆستم نەدی، گەرچی لە مانگ و هەتاو ئاوێنەی زۆرم بەرامبەر رووخساری ئەم دانا.

نظیر: هاوتا    ندیدم: نەمبینی    مهر: رۆژ، هەتاو    نهادم: دامنا، رامگرت

آینە: ئاوێنە    در مقابل: بەرامبەر    رخ: رووخسار

خواجە لێرەدا دەیەوێ وەسفی جوانی رووخساری دۆست بکات و بە مانگ و هەتاو بەراوردی بکات و رووخساری دۆست بە جوانتر بداتە قەڵەم، دەڵێ: من گەرچی هەر دوو مانگ



و هەتاوم وەك ئاوێنە کە لە بەرامبەر رووخساردا رادەگیرێ ئاوها لە بەرامبەر رووخساری دۆستدا دانا و بەراوردم کردن، بەڵام هاوتای دۆستم نەبینی لە جوانیدا و رووخساری دۆست لە مانگ و هەتاو جوانتر بوو.

**٣- صبا ز حال دل تنگ ما چە شرح دهد**

**کە چون شکنج ورقهای غنچە تو بر توست**

**سەبا ز هالی دلی تەنگی ما چە شەرە دەهەد ، کە چون شکەنجی ڤەرەقهای غونچە تو بەر توست.**

بای سەبا چۆن حاڵی دڵی تەنگی ئێمە بخاتەڕوو کە وەك چین و پێچ پێچی پەڕەکانی خونچە لەیەکدی پێچراوە.

شرح دهد: شەرح بکات، شرۆڤە بکات، بخاتەڕوو    چون: وەك

شکنج: چین، پێچ و لول    ورق: پەڕەی گوڵ    تو برتو: توێ لە ناو توێ، لێك پێچراو

خواجە دڵی تەنگی خۆی بە خونچەیەکی تازە دەزانێت کە گشت پەڕەکانی لێکدی پێچراون و توێ لە ناو توێدان و هەرگیز بای سەبا ناتوانێ بە نێویاندا گوزەر بکات، هەربۆیە بەم شێوەیە هەرگیز بای سەبا ناتوانێ نهێنییەکانی دڵی تەنگی ئێمە شەرح بکات و بیانخاتەڕوو، چونکە دڵی ئێمە گوڵێکی کراوە نییە هەمووان نێو پەڕەکانی ببینن، بەڵکو خونچەیەکی داخراوە. واتە: دڵی تەنگی ئێمە وەك پەڕەکانی خونچە شاراوەیە و هەر بایەك ناتوانێ بە نێویاندا گوزەر بکات ئەم سیفەتەی دڵ و ناخ هەمیشە سیفەتی مرۆڤە کامڵەکانە و بە ئاسانی دڵیان لای هەر رێبوار و کەسێکی سادەی وەك هەوا و شەماڵ ناکەنەوە و هەر کەسێکیش بە ئاسانی نایانناسێ.

**٤- نە من سبووکش این دیر رند سوزم و بس**

**بسا سرا کە درین کارخانە خاك سبووست**

**نە مەن سەبووکەشی ئین دەیری ریند سوزەم و بەس، بەسا سەرا کە دەرین کارخانە خاکی سەبووست.**

تەنیا من مەینۆشی ئەم دێرە سووتێنەرە نیم و بەس، بەڵکو سەرانی زۆر لەم کارخانەیەدا وەك خاکی گۆزەیان لێهاتووە.

سبوو: گۆزەی دەسکداری شەراب

سبووکش: کەسێ کە بە گۆزە شەراب بخواتەوە یان کەسێ کە لەکوپەڵە و خومەکانەوە بە گۆزە (سبوو) شەراب لە ژێرزەمینەوە بهێنێتە دەرەوە بۆ مەیخانە

دیر: دێر، لێرەدا درکەیە لە دونیا          رندسوز: رەندسووتێنەر، سیفەتی دونیایە

بس: بەس          بس: زۆر      سرا: لە ئەسڵدا(سرها)یە کە(ه) سواوە، کۆی سەرە

کارخانە: کارخانە، درکەیە لە دونیا کە جێگەی کارە، چونکە کارخانە شوێنی کارە یان ماڵی کارە          خاك سبووست: خاکی گۆزەیە، واتە مردووە

خواجە پێیوایە تەنیا ئەم نییە کە لەم دونیا رەندسووتێنەرەدایە و عەزاب و مەینەتی دونیا دەنۆشێ (لەم واتایەدا سبووکشی بە مانای کاری گۆزەهەڵگر هاتووە)، چونکە ئەم کارە مرۆڤە نزمەکان پێی هەڵدەستن) خەریکی کاری سووك و بچووکە و گۆزەکێشە، بەڵکو دونیا هەر عەزابی خەڵکی چاك و رەند دەدات و زۆرێك لە سەری مرۆڤ لەم دونیایەدا بوونەتە خاکی گۆزە و مردوون.

یاخود گەر (سبووکش) بە مەینۆشی و کەسێ کە بە گۆزە بنۆشێ بدرێتە قەڵەم بەم شێوەیە لێك دەدرێتەوە: لەم دونیایەدا کە مرۆڤە رەند و بە هۆشەکان دەسووتێنێ تەنیا من نیم مەینۆش بم و بەس یاخود تەنیا من نیم خەریکی عەشق و عاشقی بم و بەس، بەڵکو زۆرێك لەو سەرانەی ئێستا لە کارخانەی دونیا دەرچوون و بوونەتە خاکی گۆزە بە عەشق و عاشقیەوە مەشغوڵ بوون.

**٥- مگر تو شانه زدی زلف عنبر افشان را**

**که باد غالیه‌سای است و خاك عنبربووست**

**مەگەر تو شانە زەدی زولفی ئەنبەرئەفشان را، کە باد غالیەسای ئەست و خاك ئەنبەر بووست.**

دەڵێی تۆ زولفی عەنبەرپرژێنی خۆتت شانەکردووە، وا با بۆنی غالیە دەدات و خاکیش بۆنی عەنبەر.

مگر: مەگەر، دەڵێی     شانە: شانە      شانە زدن: شانەکردن

عنبر: مادەیەکی چەور و بۆنخۆشی خۆڵەمێشییە کە لە گەدە یان ریخۆڵەی جۆرێك ماسی بە نیۆی عەنبەر وەردەگیرێ          عنبرافشان: عەنبەرپرژێن، واتە بڵاوکەرەوەی عەنبەر

باد: هەوا          سای: لە (سایدن)ەوە هاتووە بە مانای سوین، تێسوین

غالیەی سای است: غالیەی تێگیراوە، لێسواوە       بوو: بۆن

هەروەك هەموو جارێك خواجە جوانییە سروشتییەکانی یار لە جوانییە دەستکردەکان بە جوانتر دەداتە قەڵەم، لێرەشدا بە دۆست دەڵێ: لە ئەنجامی شانەکردنی پرچتەوە هەوا بۆنی خۆشی غالییە و خاك بۆنی خۆشی عەنبەر دەگرێت، خودی بەیتەکەی خواجە دەڵێ: دەڵێی تۆ



زولفی عەنبەرینی خۆتت شانەکردووە، وا بۆنی خۆش بە دەوروبەردا بڵاوبۆتەوە و کە با هەڵدەکات وەك کەسێکە کە غالییەی پێوەیە و بۆنی خۆشە و لە خاکیش بۆنی عەنبەر دێت.

د.هروی دەڵێ: دەکرێ بەیتەکە وەسفی بەهاربێت لە عیرفاندا بە درکە لە مەحبووبی عیرفانی، کە ئەم بۆنە خۆشانەی بەهار بۆنی ئەو مەحبووبە ئەزەلییەیە{هروی، ج١، ل٢٦٦}

**٦- نثار روی تو هر برگ گل که در چمن است**

**فدای  قد تو هر سروبن که بر لب جوست**

**نیساری روی تو هەر بەرگی گول کە دەر چەمەنەست، فیدای قەدی تو هەر سەرڤ بوون کە بەر لەبی جوست.**

هەر پەڕەی گوڵێك کە لە گوڵزاردایە پێشکەشی رووی تۆ بێت و هەر درەختێکی سەروش کە لە کەنار جۆگەدایە فیدای تۆ بێت.

نثار: قوربان، پێشکەش، هەر شتێ کە وەك هەدیە لەبەر پێی کەسێکدا دەیپرژێنن، یا دەیرێژن، یا دەیدەن بە زەویدا          هر برگ گل: هەر پەڕەگوڵێك، هەموو پەڕەگوڵێك

سروبن: درەختی سەرو          برلب: لەکەنار          جو: جۆگەلە

خواجە گشت پەڕەگوڵەکانی گوڵزار وەك هەدیە لە بەردەم پێی مەحبووبدا دەپرژێنێ و قوربانی دەکات و گشت دارسەروەکانی گوێ جۆگەکانیش دەکاتە فیدای ئەو.

**٧- زبان ناطقه در وصف شوق نالان است**

**چه جای کلك بریده زبان بیهده گوست**

**زەبانی ناتیقە دەر ڤەسفی شۆوق نالانەست، چە جای کلکی بووریدە زەبانی بیهودە گوست.**

زمانی خاوەن توانای گۆکردن لە وەسفی شەوقدا دەناڵێنێ، چ جای قەڵەمی زمانبڕاو کە قسەی پوچ دەکات.

ناطقە:  قسەکەر، توانای قسە و دەربڕین   شوق: ئارەزوو، ئیشتیاق، ئارەزوویەکی ئازاراوی

نالان: ناڵان، دەناڵێنێ، بێ توانایە      کلك: قەڵەم       بریدە زبان: زمان بڕاو

کلك بریدە زبان: قەڵەمی زمانبڕاو، چونکە قەڵەم دادەدرێ، نوکی قەڵەمەکەی بە زمان چواندووە و بە زمانبڕاو داویەتە قەڵەم       بیهدە: بی هودە: پوچ

بیهدەگو: بێ هودەگۆ، کەسێ کە قسەی پوچ دەکات

زمانی خاوەن توانای دەربڕین کە بە حکمیەتەوە قسە دەکات یاخود نەفس و روحی سەرەتا و ئەزەلی لە وەسف و خستنەڕوی ئارەزووی زۆری دیدار و وەسڵی مەعشوقدا داد و ناڵەیەتی و

تواناى ئەو وەسفەى نییە، ئیدى قەڵەمى زمانبڕاوى بێهودەگۆ چۆن دەتوانێ وەسفى ئەو شەوق و حەزە بکات کە من بۆ مەعشوق هەمە.

ئەم بەیتە لە نوسخەی(عیوضی) و کۆمەڵێ نوسخەی دیکەدا بەیتی کۆتاییە و لە (امیر میرزای تیموری و سودی و قزوینی)و نوسخەی دیکەدا بەیتی حەوتەمە، لە سودی دا لە بری (نالان است) (او لال است) و لە امیر میرزای تەیموری و هەندێ نوسخەی دێرینیشدا (ما لال است) ٠ واتە لە وەسفی شەوقی ئێمە/ئەودا لاڵە) لە قزوینیشدا میسراعی دووەم بەم شێوەیە:

(چ جای کلك بریده زبان گو بیهده گوست)واتە: چ جای قەڵەمی زمان براو بلێ بێهودەگۆیە

**٨- رخ تو در دلم آمد مراد خواهم یافت**

**چرا که حال نکو در قفای فال نکوست**

**روخی تو دەر دلەم ئامەد موراد خاهەم یافت، چرا کە هالی نیکو دەر قەفای فالی نیکوست.**

رووخسارت هاتە ناخمەوە، بۆیە بە مەبەستی خۆم دەگەم، چونکە خۆشحاڵی لە پشت خاڵی چاکەوەیە.

در دلم آمد: هاتە ناخمەوە، بە خەیاڵمدا تێپەڕی    مراد: مەبەست، ئارەزوو

خواهم یافت: پێی دەگەم    نکو: چاك    حال نکو: خۆشحاڵی

قفا: پشت، دوا    فال نکو: فاڵی ئومێدبەخش، فاڵی چاك

د. هروی میسراعی دووەم بە مانای فەرموودەی (تفالوا بالخیر تجدوه) دەزانێ لەگەڵ راستی رای جەنابیان بەندە پێم وایە کە پەیوەندییەکی نزیکتر لە نێوان فەرموودەی (انا علی ظن عبدي بي) و تەواوی بەیتەکەدا هەیە.

روو بە مەعشوقی حەق دەڵێ خەیاڵی رووی تۆ بە دڵمدا هات، بێگومان بە شێوەیەکی جوان، بەم گومانە جوانەی من بە تۆ، تۆ هاتنە ناخی منەوە دڵنیام کە بە ئاوات دەگەم، چونکە کاتێ مرۆڤ بە ئومێدەوە فاڵ بگرێتەوە خۆشبەخت دەبێ یاخود فاڵی چاك خۆشحاڵی لە هەگبەیدا هەڵگرتووە. خوداش لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموویت من لە گومانی بەندەکەمدام پێم، گەر گومانی چاکم پێ ببا چاك دەبم بۆی.

**٩-نە این زمان دل حافظ در آتش هوس است**

**کە داغدار ازل همچو لالەء خودروست**

**نە ئین زەمان دلی هافز دەر ئاتەشی هەڤەسەست، کە داغداری ئەزەل هەمچو لالەیی خودروست.**



دڵی حافز تەنیا ئێستا نییە کە لە ئاگری هەوەس و تەمەنادا دەژی، بەڵکو هەروەك گوڵاڵە سورەی خۆڕسك داخکراوی ئەزەلە.

نە این زمان: ئەم زەمانەی ئێستا نا، تەنیا ئێستا نییە    آتش: ئاگر

داغدار: داغدار، داخکراو    همچو: هەروەك

لالە: گوڵاڵە    خودرو: خۆڕسك

بێگومان رەشاییەك لەسەر پەڕەی سووری گوڵاڵەدایە و خواجە پێیوایە کە ئەمە هەر لە ئەزەلەوە داغکراوە و بە خۆڕسکی کە دەڕوێ ئەم داغەی پێیوە، ئەم داغە ئاگری حەز و تەمەنایە و بەسەر دڵی حافزیشەوەیە، بەڵام گەر کۆمەڵێ پێیان وابێ ئەم داغە تازەیە ئەوا خواجە ئەوە رەتدەکاتەوە و دەڵێ: ئێستا و تازە نییە دڵی حافز لە ئاگری تەمەننا و ئارەزوودایە بۆ گەیشتن بە مەعشوق، بەڵکو هەر لە ئەزەلەوە ئەم داغەکراوە وەك چۆن گوڵاڵە خۆڕسك داغکراوە.

(د.محمد استعلامی) لە (درس حافظ) دا لە بارەی ئەم غەزەلەوە نووسیویەتی:" ئەم غەزەلە زیاتر زاراوە و گوزارشت و مانای عیرفانی تێدایە و لە بارەی حەزرەتی دۆستەوە قسە دەکرێت، کە هەرچی لەم جیهانەدا روو دەدات پەیوەستە بە ویست و مەشیئەتی ئەوەوە. حافز لە عەشقی ئەودا ـ داغکراوی ئەزەلە ـ " لە کۆتایی غەزەلەکەشدا نووسیویەتی:" ئەوەی لەم غەزەلەدا بینیمان شرۆڤەی هەوەسی جەستەیی نەبوو، حافز لە ئەزەلەوە داغکراوی عەشقێکی دیکەیە دروست وەك گوڵاڵە خۆڕسکەکانی بەهار، وەك گوڵاڵە سوورەکان. داغکراوی ئەزەلیش واتە کەسێ کە لە ئەزەلەوە عاشقی حەق بووە."{ د. محمد استعلامی، درس حافظ، ج١، تهران، ١٣٨٢هش، ل٢١٩}.





## غەزەلی پەنجا و نۆیەم:

**بەحری خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- دل سرا پردەء محبت اوست**

**دیده آیینەدار طلعت اوست**

**دل سەراپەردەیی مەهەبەتی ئوست، دیده ئایینەداری تەلئەتی ئوست.**

دڵ چادر و خەیمەی خۆشەویستی ئەوە، چاو ئاوێنە هەڵگری رووخساری ئەوە.

سراپرده: جێگایەك کە لە سەفەردا لە چادر بۆ پاشایان رێکدەخرێ، خێمەی شکۆدار

دیده: چاو                    آیینه: ئاوێنە

آیینەدار: ئەو کەسەی کە لە پێش بووك یاخود سوڵتانەوە ئاوینە هەڵدەگری تا خۆیانی تێدا ببینن

دڵ چادر و خەیمەی جوانی خۆشەویستی مەعشوقە و چاوانیشم وەك ئاوێنەهەڵگری رووخساری ئەو وایە و هەمیشە لە نێو چاوانمدایە، بە دەربڕینی عارفەکان دڵ جێگای جیلوەی نورە خوداییەکان و پەیوەندی نێوان جەستە و واتایە. بە بۆچوونی (انصاری) دڵی مرۆڤ چوار پەردەیە کە یەکەمیان (صدر)ە و جێگەی ئیلهام و دووەم (قلب)ەو جێگەی نوری ئیمان و سێیەم (فؤاد)ەو چادر و سەرا پەردەی جیلوەی حەقە چوارەمیش پەردەی (شغاف)ەو مەیدانی عەشقە، {د.سجادی، فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی}

لەم بەیتەدا خواجە پەردەی سێیەمی دڵی لە بەرچاوگرتووە کە جێگەی شکۆداری جیلوەی مەعشوقی حەقە و دەڵێ: دڵی من سەراپەردەی شیاوی خۆشەویستی ئەوە و چاویشم جێگەی شیاوی رووخساری ئەوە.

**٢- من کە سر درنیاورم بە دو کون**

**گردنم زیر بار منّت اوست**

**مەن کە سەر دەرنەیاڤەرەم بە دو کۆون، گەردەنەم زیر باری مننەتی ئوست.**

من کە لە بەرامبەر هەردو گەردووندا سەر دانانەوێنم، گەردنم لە ژێر باری منەتی ئەودایە.

سردرنیاورم: سەردانانەوێنم، تەسلیم نابم                    کون: گەردوون

دوکون: مەبەست لە دونیا و ئاخیرەتە                    گردن: گەردن                    زیر: لەژێر

لە فەرهەنگەکاندا (سر در نیاورم) بە تێ ناگەم، سەرم لێ دەرناچێ راڤەکراوە، بەڵام واتاکەی لە ئەدەبی سەردەمی سەبکی خوراسانی و عێراقیدا بە واتای سەردانانەوێنم دێت، خواجە دەڵێ: من کە لە بەرامبەر هەردوو جیهاندا سەردانانەوێنم و سەربەرزم، گەردنم لە ژێر باری منەتی یارو مەعشوقی حەقدایە و بە گەورەیی ئەوەوەیە منیش گەورە، بووم و لە بەرامبەر کەسدا سەرنەوی ناکەم، یاخود وەك سودی و هروی دەڵێن لە کاتێکدا کە لە بەرامبەر دونیا و ئاخیرەتدا سەری تەسلیم دانانەوێنم لە بەرامبەر منەتی یاردا بۆ سوپاسگوزاری سەر دادەنەوێنم وەك بڵێی کە لە ژێر باردا گەردنم خواربووە، بەڵام ئەم بەندە ناچیزە پێیوایە کە سەر بۆکەس دانانەوێنم و بێ باکیم لە گەورەیی مەعشوقەوەیە و قەرزاری منەتی ئەوم. (د.استعلامی)ش نوسیویەتی:"میسراعی دوەم ئەمەیە کە بەم حاڵەوە منەتی پەروەردگارم بەسەرەوەیە چونکە ئەو منی بەم پلەی بێ نیازییە گەیاندووە"{استعلامی، ج١، ل٢١٥} بێگومان ئەم رایەی بەرێزیان هەمان ئەو رایەیە کە پێشتر خستمانەڕوو.

**٣- تو و طوبی و ما و قامت یار**

**فکر هرکس به قدر همت اوست**

**تو ڤو توبی و ما ڤو قامەتی یار، فکری هەرکەس بە قەدری هیمەتی ئوست.**

تۆ و درەختی توبا و ئێمە و باڵای یار، بیری هەر کەسێ هێندەی هیمەتی ئەوە.

طوبی: درەختێکی جوانە لە بەهەشتدا   تو و طوبی: توبا بۆ تۆ

به قدر: هێندەی   همت: هیمەت، مەبەست، ئیرادەی بەهێز، هەوڵ، ئارەزوو، سروشت

تۆ ئەی ئەهلی رووخسار و شێوەخوازی با توبا بۆ تۆ بێت و باڵای یاریش بە نسیبی ئێمەی ئەهلی عیرفان بێت، تۆ هەوڵت بۆ ئەوە داوە یاخود سروشتی تۆ هەر بۆ ئەوە باشە و هەوڵ و سروشتی ئێمەش لەگەڵ قامەت و باڵای یاردا یەکدەگرێتەوە و هەوڵی ئەوەمان داوە ئیدی بیری هەرکەسێکیش هێندەی هەوڵ و سروشت یاخود هیمەت و ئیرادەی خۆیەتی، واتە تۆ خۆشییەکانی بەهەشتت ویستووە ئێمەش دیداری یارکە خودایە، توبا بۆ تۆ و دیداری مەعشوقیش بۆ ئێمە.

لە (رابیعەی عەدەوی)یان پرسی تۆ بۆچی هەمیشە باس لە دیداری خودا دەکەیت و باس لە خۆشییەکانی بەهەشت ناکەیت ئەویش فەرمووی: لە پێشدا دراوسێ ئەوجا خانوو ـ الجار ثم الدار ـ"{وحدت وجود، بە نقلْ لە: تذکرة الاولیاء، ص٩١} واتە لە پێشدا پێویستە لە دراوسێ بپرسی پاشان لە خانوو، لای عارفەکان هەمیشە خۆشی بەهەشت لە دیدار و لیقای خوادا کورت دەکرێتەوە و بیریان لە خۆشی و لەزەتە مادییەکانی بەهەشت نییە، ئەمە لە کاتێکدا



لای ئەهلی شێوە و زاهیر خۆشییەکانی بەهەشتیان لەبەرچاوە، لێرەدا خواجەش بە رێبازی عیرفانی خۆیەوە بە رووخسارگەری دەڵێ: ئەندازەی هەرکەس بە ئەندازەی سروشتی خۆی بیرەکاتەوە تۆ بیر لە توبا دەکەیتەوە بۆ تۆ، ئێمەی عارفیش بیر لە قەد و باڵای یار دەکەینەوە خودا ئەو لیقایەمان بە نسیب بکات یاخود دەکات، چونکە بە پێی هیممەتە.

**٤- گر من آلوده دامنم چه زیان**

**همه عالم گواه عصمت اوست**

**گەر مەن ئالودە دامەنەم چە زیان هەمە ئالەم گوڤاهی ئیسمەتی ئوست.**

ئەگەر من گوناهکارم چ زیانی هەیە، چونکە هەموو جیهان گەواهی پاکی و بێ گوناهی ئەوە.

آلوده دامن: گوناهکار   زیان: زیان، زەرەر   گواه: گەواە، شایەد

عصمت: پاکی، بێ گوناهی، یەکێکە لە سیفەتی پێغەمبەران و (بە رای هەندێ لە زانایان) جێنشینەکانی ئەو، چونکە هەرگیز گوناهی بچووك و گەورە ناکەن. هەر بۆیە خواجە دەڵێ: ئەگەر من ئالودەی گوناهم و گوناهکارم چ زیانی هەیە یاخود قەیدی چ دەکا، چونکە هەموو جیهان گەواهی پاکی و بێ گوناهی ئەوە، لێرەدا ئەو یارە دەکرێ پێغەمبەر (د.خ) بێت یاخود مورشید و عارفانی خۆشەویستی خواجە بن. ئەمە لە کاتێکدایە کە (او) بە پێغەمبەر یا هەر مرۆڤێکی تر بدەینە قەڵەم، بەڵام گەر (او) خودی حەق بێت لێکدانەوەیکی دیکە هەڵدەگرێت و ئەوەیە کە ئەو بە میهرەبانی خۆی دەستی بەندەکانی دەگرێت و لە تێکەوتن دەیانپارێزێ{استعلامی، ج١، ل٢١٤}

**٥- من که باشم در آن حرم که صبا**

**پردەدار حریم حرمت اوست**

**مەن کە باشەم دەر ئان هەرەم کە سەبا، پەردەداری هەریمی هورمەتی ئوست.**

دەبێ من کێ بم لەو حەرەمەدا کە سەبا دەرگاوانی سنووری حورمەتی ئەوە.

من کە باشم: من کێ بم

حرم: ناوەوەی ماڵ، حەرەم، دەوروبەری جێگا پیرۆزەکان وەك حەرەمی مەکە

پردەدار: دەرگاوان   حریم: سنوور، ناوچەیەکی دیاریکراو   حرمت: ئابڕو، حورمەت، غیرەت

باس لە گەورەیی سنوور و گرنگی حەرەمی یار دەکات و دەڵێ: حەرەمێکی وەهایە کە بای سەبا لەگەڵ ئەوەی گەشت جێگایەك دەگەڕێ دەرگاوانە و بۆی نییە بچێتە ژوورەوە ئیدی دەبێ منێکی بچکۆلەی ناچیز لەو حەرەمەدا چ نرخێکم هەبێ و کێ بم.

**٦- بی خیالش مباد منظر چشم**

**زانکه این گوشه جای خلوت اوست**

**بی خیالەش مەباد مەنزەری چەشم، زانکە ئین گوشە جای خەلڤەتی ئوست.**

یاخوا تیلەی چاوم بێ خەیاڵی ئەو نەبێ، چونکە ئەم گۆشەیە جێگەی خەڵوەتی ئەوە

مباد: بۆ تەمەنایە، یاخوا نەبێ     منظر: جێگای تەماشاکردن وەك پەنجەرە

منظر چشم: تیلەی چاو کە دەریچەی روانینـە، گۆشـەی چـاو   ز انکـە: لـەو رووەوەیکـە، چونکە     گوشە: گۆشە، مەبەست لەگۆشەی چاوە     خلوت: خەڵوەت، تەنیا دانیشتن.

خواجە دەڵێ: گۆشەی چاوی تەنیا جێگای خـەڵوەتی یـارە و کەسـی دیکـە نـا هەربۆیـە تەمەنا دەکەم هەرگیز وێنەی خەیاڵی ئەو لە پێش چاوم ون نەبێ تا لـەو گۆشـەیەوە سـەیری بکەم، ئەمەش جگە لە تەمەننا بۆ ون نەبوونی یار دانپیانانە بەوەی کە گۆشەی چاوی تـەنیا یاری تێدایە.

**٧- هرگل نو کە شد چمن آرای**

**ز اثر رنگ و بووی صحبت اوست**

**هەر گولی نۆو کە شود چەمەنئارای، ز ئەسەری رەنگ و بووی سوهبەتی ئوست.**

هەر گوڵێکی تازە کە بووە مایـەی رازاندنـەوەی گـوڵزار بەکاریگـەریی رەنـگ و بـۆنی هاودەمی ئەوەوەیە.

نو: تازە، نوێ     چمن آرای: گوڵزار رازێنەرەوە     بووی: بۆن     صحبت: هاودەمی

وەك لە غەزەلی پێشوودا گوترا کە بـەهار و جوانییـەکانی لای عارفـەکان رەنـگ و بـۆنی جوانی و جەمالی خودان، هەربۆیە لێرەدا زیاتر جەختی لەسەر دەکاتەوە کە هەر گوڵێکی تـازە کە دەبێتە مایەی رازاندنەوەی گوڵزار و چیمەن لە هاودەمی ئەوەوەیە و رەنگـی جـوان و بـۆنی خۆشی لەوەوە وەرگرتووە.

**٨- دوور مجنون گـذشت و نوبت ماست**

**هرکسی پنج روز نوبت اوست**

**دۆوری مەجنون گوزەشت و نۆوبەتی ماست، هەرکەسی پەنج روز نۆوبەتی ئوست.**

رۆژگاری مەجنون تێپەڕی و سەرەی ئێمەیە هەرکەسێ پێنج رۆژ نۆرەیەتی.

دوور: رۆژگار، سەردەم، رۆڵ     گـذشت: بەسەرچوو، تێپەڕی     نوبت: نۆرە، سـەرە

نج روز: پێنج رۆژ، مەبەست لە ماوەیەکی کەمە، بۆ کورتی مۆڵەتی ژیانی دونیا بەکاردێ

مجنون: مەجنون، قەیسی عامری کە عاشقی لەیلا بوو، لە ئەدەبی عەرەبیدا رەمزی عاشقییە



بێگومان عەشقی مـەجنون عەشـقێکی زەمینـی مرۆییـە لای حـافز ئـەم جـۆرە عەشـقە سەردەمی بەسەرچووە و دەڵێ: رۆڵ و رۆژگاری مەجنون عەشـقەکەی بەسەرچـوو ئیـدی نـۆرەی ئێمەیە بۆ عەشقبازی کە ئەڵبەت عەشقی حەقیقی و ئیلاهییە، ئەم بەسەرچوون و تەواوبوونەش حاڵەتێکی ئاساییە و هەر کەسێ کە دێتە ئەم دونیایـە ماوەیـەکی کـەم یـا پێـنج و دوو رۆژێ ماوەی پێدەدرێت و پاشان زۆر خێرا مۆڵەت و نۆرەکەی تەواو دەبێ.

**٩- ملکت عاشقی و گنج طرب**

**هرچە دارم ز یمن دولت  اوست**

**مولکەتی ئاشقی و گەنجی تەرەب، هەرچە دارەم ز یومنی دۆولەتی ئوست.**

پادشایەتی عەشق و خەزێنەی شادی، هەرچیم هەیە لە بەرەکەتی ئیقباڵی ئەوەوەیە.

ملکت: پاشایەتی، مەملەکەت     گنج: خەزێنە، شایستەیی

طرب: شادی     یمن:  موبارەکی، بەرەکەتی     دولت: ئیقبال، عیزەت، گەورەیی

خواجە پێیوایە هەرچی هەیە لە پاشایەتی عەشق و خەزێنەی شادی هیچی هی خۆی نییـە، بەڵکو هەمووی بەرەکەتی گەورەیی و ئیقباڵ و بەختی یارە و بە خۆشەویـستی یـار خواجـە لـە عەشقدا بووەتە پادشا و خەزێنەی شادیشی پێکەوە ناوە.

**١٠- من و دل گر فدا شدیم چە باك**

**غرض اندر میان سلامت اوست**

**مەن و دل گەر فیدا شودیم چە باك، غەرەز ئەندەر میان سەلامەتی ئوست.**

گەر من و دڵ بووینە قوربانی چ گرنگی هەیە، چونکە مەبەست لەم نێوەندەدا سەلامەتی ئەوە.

چ باك: چ گرنگی هەیە     غرض: مەبەست     اندرمیان: لەمنێوەندەدا، لەم مەسەلەیەدا.

لە رێگەی عەشقدا مەبەستی سەرەکی سەلامەتی یارە و هیچی دیکە هەربۆیـە کـاتێ لـەم رێگەیەدا من و دڵ دەبینە فیدا، یاخود بووینەتە فیدا چ باکێك یاخود چ گرنگی هەیە، چـونکە لەم نێوەندی عەشقەدا مەبەستی بنەڕەتی سەلامەتی ئەو(مەشعوق)ە.

**١١- فقر ظاهر مبین کە حافظ را**

**سینە گنجینەء محبت اوست**

**فەقری زاهیر مەبین کە هافز را، سینە گەنجینەیی مەهەبەتی ئوست.**

سەیری هەژاری رووکاری مەکە، چونکە حافز سنگی گەنجینەی خۆشەویستی ئەوە.

خواجە لێرەدا جیاوازی لە نێوان هەژاری رووکاری و هەژاری راستەقینە دەکات و هەرگیز خۆی بە هەژار نازانێ، چونکە دڵی پڕە لـە خۆشەویـستی مەعـشوق، هەربۆیـە بـە خـەڵکی

دیکەش دەڵێ چاوت لە هەژاری رووکاری نەبێ و ئەوە بە هەژاری مەزانە و وامەزانە کە حافز هەژارە، چونکە حافز هەژار نییە و سنگ و دڵی گەنجینەی خۆشەویستی مەعشوقە و ئەمەش بەسە بۆ دەوڵەمەندبوون.



## غەزەلی شەستەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- دارم امیدی عاطفتی از جناب دوست**
**کردم جنایتی و امیدم به عفو اوست**

**دارەم ئومیدی ئاتیفەتی ئەز جەنابی دوست، کەردەم جینایەتی و ئومیدەم بە ئەفقی ئوست.**

ئومێد و هیوای بەزەیی و خۆشەویستییەکم بە دەرگا و ئاستانەی دۆست هەیە، تاوانێکم کرد و هیوام بە لێخۆشبوونی ئەوە.

دارم: هەمە عاطفت: شەفەقەت، بەزەیی و میهرەبانی، خۆشەویستی
جناب: دەرگا و ئاستانە، دەوروبەری ماڵ، جەناب جنایت: تاوان

خواجە لەگەڵ ئەوەی کە تاوانێکی کردووە، بەڵام هەر بە هیوا و ئومێدەوە دەژی و بە هیوای غوفران و لێخۆشبوونی دۆستە، میسراعی یەکەمی بەیتەکە بە دوو شێوە لێکدەدرێتەوە کە یەکەمیان ئومێد و هیوام بە بەزەییەکە لە دەرگا و ئاستانەی دۆستدا هەیە و دووەمیان (جناب) خودی دۆستە واتە هیوام بە بەزەییەکە لە جەنابی دۆست. لەهەردوو بارەکەشدا مانای بەیتەکە ئەوەیە کە خواجە تاوانێکی کردووە و ئێستاش بە ئومێد و گەشبینییەوە دەڕوانێتە لێخۆشبوون و عەفوی دۆست، چونکە لە میسراعی دووەمدا دەڵێ: تاوانێکم کرد و بەڵام ئومێدم بە لێخۆشبوونی ئەوە.

**٢- دانم که بگذرد ز سر جرم من که او**
**گرچه پریوش است و لیکن فرشته خوست**

**دانەم کە بووگزەرەد ز سەری جورمی مەن کە ئو، گەرچە پەریڤەشەست ڤە لیکین فریشتە خوست.**

دەزانم کە چاوپۆشی لە گوناهم دەکات، چونکە ئەو گەرچی پەری ئاسایە، بەڵام خوی فریشتەی هەیە.

دانم: دەزانم بگذرد ز سرجرم: چاوپۆشی لە تاوان دەکات پری: پەری، جنۆکە
پریوش: شێوەپەری، پەری ئاسا، مەبەست لە جوانییە، بەڵام پەری بێڕەحمن و لێبووردنیان نییە
فرشتە خو: خوی فریشتە، واتە سروشت و خوی وەك فریشتە لێبووردەیە.

تەواوکەری بەیتی یەکەمە خواجە ئومێدی بە لێخۆشبوونی یار هەیە، لێرەشدا دەڵێ: دەزانم لەم تاوانەی من دەبوورێ، چونکە یارم گەرچی لە جوانیدا پەری ئاساییە، بەڵام لە بەخشندەیی و میهرەبانیدا وەك فریشتەیە.

ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخە و بەیتی سێیەمە، بەڵام لەلایەکەوە لە تەواوی نوسخەکانی دیکەدا دووەمە وپەیڕەویم لە گەورەکان کردو، لەلایەکی دیکەوە تەواوکەری بەیتی یەکەمە.

**٣- چندان گریستیم که هرکس که برگـذشت**

**در اشک ما چو دید، روان گفت کاین چه جوست**

**چەندان گریستیم کە هەرکەس کە بەرگوزەشت، دەر ئەشکی ما چو دید رەڤـان گوفـت کین چە جوست.**

هێندە گریاین کە هەر کەسێ تێپەڕی کاتێ فرمێسکی ئێمەی بینی یەکسەر گوتی ئەمـە چ جۆگەیەکە.

چندان: هێندە، ئەوەندە   گریستیم: گریاین   برگـذشت: تێپەڕی

روان: یەکسەر   جو: جۆگا، جۆگە

خواجە باس لە گریانێك دەکات کە پەیوەندییەکـەی نەخستۆتەڕوو، بـەڵام بـە بەیتـەکانی پێشوودا وادەردەکەوێ کە گریانی پەشیمانی بێت و دەڵێ لە پەشیمانیدا هێندە گریـاین یـاخود لە دووری یاردا هێندە زۆر گریاین کە وەك جۆگایەکی لێهات و هەرکەس بـەو نێـوەدا گـوزەری کرد تووشی سەرسوڕمان بوو هەربۆیە یەکسەرە گوتی ئەمە چ جۆگایەکە!

**٤- بی گفت و گوی، زلف تو دل را همی کشد**

**با زلف دلکش تو که را روی گفت و گوست**

**بی گوفت وگوی، زولفی تو دل را هەمی کیشەد، با زولفـی دلکەشـی تـو کـە را روی گوفت و گوست.**

بێ هیچ قسەیەك زولفی تۆ دڵ بۆ خۆی رادەکێشێ لەگەڵ زولفـی سەرنجڕاکێـشی تـۆدا کـێ بوواری گفتوگۆی هەیە.

گفت وگوی: قسە، گفتوگۆ   همـی کـشد: رادەکێـشێ   دلکـش: سـەرنجڕاکێش

کە را: کێ، چ کەسێ   روی: لایەن، بووار   روی گفت وگوی: بوواری قسە

خواجە کاتێ دێتە سەر باسی زولفـی یـار ئیـدی جـوانترین و پڕمانـاترین و لـێڵترین قـسە دەکات، هەربۆیە دەکرێ بڵێین خواجە زولفی یـاری بـە لاوە سەرنجڕاکێـشترین لایـەنی عەشـقە، زولفیش هەمان نهێنییەکانی مەعشوقە و خواجەش زۆر لەسەر نهێنی و شاراوەکان پێدادەگرێت



و پانتاییەکی زۆری دیوانەکەی داگیر دەکەن، لێرەشدا زولفی یـارە کـە مەبەسـت لـە نهـێنی و شاراوە ئیلاهییەکانە ئیدی چ خودی خواجە و چ خوێنەریش تووشی حیرەت و سەرسوڕمان دەبێ و لێکدانەوەی ئـەو نهێنیانـە روحـی دەوێـت نـەوەك قـسە. لـەم بەیتەشـدا خواجـە حیرەت و سەرسوڕمانی خۆی لـە زولفـی یـار دەخاتـەڕو، ئـەو زولـف و پرچـەی کـە بـە بـێ قـسە دڵان کەمەندکێش دەکات و کەسێ نییە لەگەڵ ئەم پرچەدا بوواری قسە و گفتوگـۆی هـەبێت. واتـە: شاراوەیی و نهێنی تۆ دڵانی کەمەندکێش کردووە و کەسێکیش نییە کە لەگەڵ ئـەم نهێنیانـەدا بوواری گفتوگۆی هەبێ.

**٥- هیچ است آن دهان که نبینم ازو نشان**

**موی است آن میان و ندانم که آن چه موست**

**هیچەست ئان دەهان کە نەبینەم ئەزو نیشان، مویەست ئان میان و نەدانەم کە ئان چە موست.**

دەڵێی نییە ئەو دەمەی کە هیچ نیشانەیەکی نابینم ـ لە بچووکیدا ـ ئەو کەمەرە مویەکە و نازانم کە چۆن مویەکە.

هیچ است: هیچە، نییە   دهان: دەم

موی است: مویەکە   میان: کەمەر   ندانم: نازانم

شاعیر بە پێی سەردەمی خۆی وەسفی یار دەکـات کـە بـچووکی دەم و بـاریکی کەمـەرە، پێیوایە کە دەمی یار هێندە بچووکە هیچ نیشانەیەکی نییە و دەڵێی هەر نییە ئەو کەمـەرەش ئەوەندە باریکە هێندەی مویەکە، بەڵام نازانم چ جۆرە مویەکە.

**٦- عمری ست تا ز زلف تو بوویی شنیدەام**

**زان بووی در مشام دل من هنوز بووست**

**ئومریست تا ز زولفی تو بوویی شەنیدەئەم، زان بووی دەر مەشـامی دلی مـەن هـەنوز بووست.**

تەمەنێکە کە بۆنێکی زولفی تۆم کردووە، بەو بۆنە هەستی بۆنی دڵی من هێشتا بۆنخۆشە.

عمری ست: تەمەنێکە، ماوەیەکی زۆرە.

بووی شنیدەام: گوێم لە بۆنێك بووە، ئەم جۆرە دەربڕینە تایبەتمەندی زمانی فارسـییە و لـە کوردیدا بەم شێوەیە ناگوترێ واتە: بۆنێکم کردووە

مشام: هەستی بۆنکردن، جێگەی بۆنکردن لە مێشکدا

هنوز: هێشتا

شاعر بە شێوەی زیادەڕۆیی (مبالغە) وەسفی بۆنخۆشی پرچی یار دەکات و دەڵێ: ماوەیەکی زۆرە یاخود عومرێکە کە بوونێکی زوڵفی تۆم کردووە و هێندە بۆنخۆش بووە کە تا ئێستاش ئەو بۆنە لە مەشامدا ماوەتەوە.

**٧- دارم عجب ز نقش خیالیش کە چون نرفت**

**از دیدەام کە دم بە دمش کار شست و شوست**

**دارەم ئەجەب ز نەقشی خیالەش کە چون نەرەفت، ئەز دیدەئەم کە دەم بە دەمەش کار شوست و شوست.**

سەیرم لە وێنەی خەیاڵی ئەو دێ کە چۆن لە چاوانمدا نەشۆرایەوە لە کاتێکدا کە چاوی من سات بەسات کاری شووشتن ـ فرمێسك ڕژاندن ـ ە.

دارم عجب: پێم سەیرە نقش خیالش: وێنەی خەیاڵی رووخساری ئەو

دم بە دم: سات بە سات، بەردەوام

شست و شو: قەد و رەگی چاوگی (شووشتن)ن و بە واتای شووشتن دێت، لێرەدا مەبەست لە فرمێسك ڕژاندنە.

چاوانی خواجە بەردەوام دەگریەت و فرمێسك دەڕژێ و کاری بووەتە شووشتن، بەڵام بەو هەموو فرمێسکەش هێشتا خەیاڵی وێنەی رووخساری یار هەر لە چاوانیدا ماوەتەوە، بۆیە دەڵێ: سەیرم لە وێنەی رووخساری تۆ دێ کە لە چاوانمدایە هێندە کاریگەر و جێگیرە کە لەگەڵ ئەو هەموو فرمێسك ڕژاندنەدا ناڕوات و ناشۆرێتەوە تەنانەت چاوانم هێندە فرمێسك دەڕژێ کە دەڵێی کاری شووشتنی هەیە و بەردەوام ئاو دەڕژێ، بەڵام هێشتا وێنەی رووخساری تۆی تێداماوە.

**٨- حافظ بداست حال پریشان تو ولی**

**بر بووی زلف دوست پریشانیت نکوست**

**هافز بەدەست هالی پەریشانی تو ڤەلی، بەر بووی زولفی دوست پەریشانییەت نیکوست.**

حافز حاڵی پەشێوی تۆ خراپە، بەڵام بە بۆنی پرچی دۆستەوە پەرێشانیت چاکە.

بووی: بۆن، ئومێد نکو: چاکە

حافز بە خۆی دەڵێ: حاڵی پەشێو و پەرێشانی تۆ خراپ و چاك نییە، بەڵام گەر ئەم پەرێشان حاڵییە بە کاریگەریی بۆنی زوڵفی یارەوە هاتۆتە ئارا و بە سەرتا هاتووە، چاکەیە واتە گەر ئومێدی گەیشتن بە دۆست لە ئارادا بێت ئەم پەرێشانییە چاکە.



(هروی) لە کۆتایی ئەم غەزەلەدا چەند بەڵگەیەکی لەسەر سستی ئەم غەزەلە هێناوەتەوە و پێیوایە کە ئەم لاوازییە لە حافز دوورە و ڕەنگە هی حافز نەبێ و بە ناچاری و بە پەیڕەوی لە نوسخە باوەڕ پێکراوکان دووبارە نووسیویەتیەوە و دەڵێت:"غەزەلەکە بە گشتی لاوازە و دوورە لە شێوەی حافزەوە بۆ نموونە: (کردم جنایتی: تاوانێکم کرد) (هیچ است آن دهان: هیچە ئەو دەمە) و سێ جار دووبارەبوونەوەی (بووی ـ بۆن) لە بەیتی (عمر یست تا ز زلف تو بوویی شنیدەام) و خستنەڕوی راستەوخۆی چەمکی خراپی لە (بدست حال پریشان تو — خراپە حاڵی پەشێوی تۆ) بە گشتی غەزەلەکەیان لاواز کردووە و هەروەها لێکچوون و مانا ورد و باریکەکانی حافزیش لە غەزەلەکەدا نابینرێ. دووبارەکردنەوەی چەمکەکانی حافز بەبێ شتێکی نوێیە، بەڵام چونکە لە نوسخە باوەڕپێکراوەکاندا هاتوە بە ناچاری نەقڵمان کرد" {هروی، ج١، ل٢٧٦}.

## غەزەلی شەست و یەکەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- آن پیك نامَوَر كه رسید از دیار دوست**

**آورد حرز جان ز خط مشكبار دوست**

**ئان پەیکی نامەڤەر کە رەسید ئەز دیاری دوست، ئاڤەرد حیرزی جان ز خەتی موشکباری دوست.**

ئەو قاسیدە نامەبەرە کە لە دیاری دۆستەوە گەیشت نوشتەی گیانپارێزی بە خەتی میسکباری دۆست هێنا.

پیك: قاسید، کەسێ کە بە پیادە دەڕوات، نێردراو

نامَوَر: نامەبەر، د.هروی (نامْوَر)ی هێناوە کە واتای ناودار و بەڕێز و خۆشەویست دەگەیەنێت و ئەوەشی خستۆتەڕوو کە (د.غنی) بە نامەهێنی لێکداوەتەوە کە لەگەڵ واتای شیعرەکەدا زیاتر دەگونجێ، بەڵام سەرچاوەیەك نەبوو کە ئەم مانایە بسەلمێنێ لەوە دەچێ نامەبەربێ، بەڵام لە نێوان (نامْوَر) (نامَوَر) جیاوازییەکی تەواو هەیە و دەبێتە مایەی گۆڕانی کێشی بەیتەکە چ قەزوینی و چ فەرەیدون میرزای تیموری و نوسخەکانی دیکەش بە (نامَوَر) هێناویانە کە هەمان (نامەبەر)ە، چونکە لە فارسیدا تەنانەت لەکوردیشدا زۆرجار (ب) بە (و) دەگۆڕێت بەبێ ئەوەی گۆڕان لە واتادا بێتەکایەوە، هەروەها سودیش هەر بە (نامەبەر) هێناویەتی و ئەوەشی خستۆتەڕوو کە لە هەندێ نوسخەدا لە بری نامەبەر (نامەور) هاتوە. بەهەرحاڵ مادام کێشی غەزەلەکە بەحری موزاریع واتە (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)ە، ئەوا پێویستە (نامەور) بێت. لای عیوضییش (خوش خبر) هاتووە کە لەگەڵ کێشەکەدا دروست دێتەوە

رسید: گەیشت        دیار: دیار، شار و سەرزەوی

حرز: پەناگا، نوشتە، دۆعایەکە کە لە کاغەز دەنووسرێت و لەگەڵ خۆدا هەڵدەگیرێ، دەکرێ بەسەر شانەوە بێت یاخود لە دەست و مل دەکرێ، بازوبەند

حرز جان: نوشتەی گیانپارێز        خط: خەت

مشکبار: شتێ کە بۆنی میسکی لێوە بێت یاخود ڕەنگی ڕەشی وەك میسکی هەبێ، لە بەیتەکەدا ئاماژەیە بە ڕەنگی ڕەش و بۆنی خۆشی مەرەکەب، یاخود نامەی بۆنخۆشکراو

خط مشکبار: ئاماژەیەکی شاراوەیشی تێدایە بۆ خەتی ڕووخساری یار.



خواجە ناوی یار بە نوشتەی گیان دەزانێ، هەر لە سەرەتای غەزەلەکەوە هیوا و گەشبینییەك بەدەردەکەوێ، چونکە ئەو نامەبەرەی کە لە دیار و شوێنی نیشتەجێبوونی یارەوە گەیشتووە نامەیەکی بە دەست و خەتی ڕەش و بۆنخۆشی دۆست هێناوە کە دەبێتە نوشتەی گیانپارێزی خواجە، بەم پێیە دەبێ لە بەیتەکانی داهاتوودا بە ئارامی و خۆشبەختی زیاتری شاعیر ڕووبەڕووببینەوە.

**٢- خوش می دهد نشان جلال و جمال یار**

**خوش میکند حکایت عز و وقار دوست**

**خوش می دەهەد نیشانی جەلال و جەمالی یار، خوش می کونەد هیکایەتی ئیزز و ڤیقاری دوست.**

گەورەیی و جوانی یار چاك نیشان دەدات و چاکیش باسی بەڕێزی و ویقاری دۆست دەکات.

تەواوکەری بەیتی پێشووە و باس لە پەیکی نامەبەرە و خواجە دەڵێ ئەو نامەبەرە یاخود ئەو نامە میسکبارەی دۆست زۆر چاك گەورەیی و جوانی یار دەخاتەڕوو زۆر بە چاکیش باس لە بەڕێزی و ویقاری دۆست دەکات. میسراعی دووەمی ئەم بەیتە لە هەندێ نوسخەدا بەم شێوەیە هاتووە **(تا در طلب شود دل امیدوار دوست)** واتە پەیکی نامەبەر زۆرجوان جوانی و گەورەیی یار دەخاتەڕو تاوەکو ئەو دڵەی بە ئومێدی دۆستەوەیە بکەوێتە داوەوە.

**٣- دل دادمش به مژده و خجلت همی برم**

**زین نقد قلب خویش که کردم نثار دوست**

**دل دادەمەش بە موژدە ڤو خەجلەت هەمی بەرەم، زین نەقدی قەلبی خیش کە کەردەم نیساری دوست.**

دڵم دایە بە موژدانە و شەرمم بەخۆم دێ لەم سکە قەڵپەی خۆم کە کردمە قوربانی دۆست.

دل دادمش: دڵم دایە        به مژده: بە موژدانە

خجلت همی برم: شەرمم بەخۆم دێ، خەجاڵەتی دەکێشم        نقد: سکە

قلب: قەڵپ، تەزویر        نثار: قوربانی، پێشکەش، دیاری

کاتێ کە نامەبەر نامەکەی داوەتە دەستی خواجە یاخود موژدەی هێنانی نامەی داوەتە خواجە، ئەمیش وەك مژدانە دڵی خۆی داوەتی، بەڵام دەڵێ: خەجاڵەتی دەکێشم کە ئەم کارەم کردووە چونکە دڵی من وەك سکەیەکی قەڵپی تەزویر وایە و زۆر لەوە بچووکترە کە ببێتە قوربانی دۆست یاخود پێشکەشی ئەو قاسیدە بکرێ، بەڵکو دەبێ لە دڵی چاکتر بکرێتە دیاری و دڵی من شایستەیی ئەوەی تێدا نەبوو.

**٤- شكر خدا كه از مدد بخت كارساز**

**بر حسب آرزوست همه كار و بار دوست**

**شوكرى خودا كه ئەز مەدەدى بەختى كارساز، بەر هەسبى ئارەزووست هەمە كار و بارى دوست.**

سوپاسى خودا كە بە يارمەتى بەختى چارەساز هەموو كاروبارەكانى دۆست بە پێى ويست و ئارەزووى ئێمەيە.

مدد: يارمەتى، هاوكارى     كارساز: چارەساز، موافق     برحسب: بەپێى، هاورێك

خواجە سوپاسى خودا دەكات لەوەى كە بەختى باشى هەيە و بە يارمەتى بەختى باشى چارەسازى هەموو كاروبارەكانى دۆست بە پێى ويست و ئارەزووە.

**٥- سير سپهر و دوور قمر را چه اختيار**

**در گردشند بر حسب اختيار دوست**

**سەيرى سيپيهر و دۆورى قەمەر را چە ئيختيار، دەر گەردشەند بەر هەسەبى ئيختيارى دوست.**

هاتووچۆ وگەرانى گەردوون و سوڕانەوەى مانگ بەويستى خۆيان نييە، بەڵكو بەويستى دۆست دەجولێنەوە.

سير: هاتووچۆ، گەڕان، ماوەى دەورەيەك     سپهر: گەردوون، فەلەك، ئاسمان

دوور: سورانەوە     قمر: مانگ     گردش: گەڕان     برحسب: بە پێى، بە ويستى

سودى دەڵێ: كاتێ كە خواجە (چە اختيار)ى هێناوە وادەردەكەوێ كە رێبازى حەكيمەكان رەت دەكاتەوە، چونكە بە راى حەكيمەكان هاتووچۆ و سوڕانەوەى گەردوون بە ئارەزوو و ئيرادەييە و جولێنەرەكەى خودى گەردوونە نەوەك لە دەرەوەى بێت. {سودى، ج١، ل٣٩٣}

بە راى (د.هروى)ش ميسراعى دووەم ئاماژەيە بە ئايەتى (٥٤)ى سورەتى (الاعراف) كە دەفەرمووێ: ".. والشمس والقمر والنجوم مسخرات بامره..) {هروى، ج١، ل٢٧٦}

لەكۆندا باوەڕ وابوو كە ئەستێرە و گەردوون كاريگەرييان لەسەر چارەنووسى مرۆڤ هەبێت، تەنانەت ئەم رايە تا ئەو رادەيە بوو كە سەرەتا وا باوەڕ دەكرا كە ئەستێرەكان جەستە ياخود وێنەى فريشتەكانن و هەر ئەمەش بوو كە ئەستێرە پيرۆز راگيرا و تەنانەت پەرستراش {ئەكرەم عەنەبى، ئايين سيستەم و چالاكى ئايينى و هۆكارەكانى، گۆڤارى ژيار، ژ ٤} ئەوانەشى كە نەياندەپەرست هێشتا جۆرە پيرۆزييەكى هەبوو كە وايانىدەزانى كاريگەرييان لە چارەنووسى مرۆڤدا هەيە، خواجە لەم بەيتەدا هەموو ئەم رايانە رەتدەكاتەوە لە لايەكەوە چ ئەوەى كە گەڕان و



هاتووچۆى ئەستێرەكان و گەردوون بە ويست و ئيرادەى خۆيان بێت و لە لايەكى ديكەشەوە چ ئەوەى كە ئەستێرە و گەردوون كاريگەرييان لە دياريكردنى چارەنووسى مرۆڤدا هەبێ.

ئەو لێرەدا بە هێنانى كۆمەڵێ زاراوەى گەردووناسى وەك (سير، سپهر، دوور، قمر، اختيار، گردش) وەستايانە دەڵێ: گەڕان و هاتووچۆى گەردوون و ئاسمانەكان بە ئارەزوو و ويست و ئيرادەى خۆيان نييە، بەڵكو بە ويست و ئيرادەى دۆست (پەروەردەگار) دەگەڕێن، واتە ئەو گەردوونەى كە سوڕان و گەڕانى بەويستى خۆى نييە چۆن دەتوانێ چارەنووسى مرۆڤ ديارى بكات و كاريگەرى لە خۆشبەختى و بەدبەختيدا هەبێت.

**٦- گر باد فتنه هردو جهان را بهم زند**

**ما و چراغ چشم و ره انتظار دوست**

**گەر بادى فيتنە هەردو جەهان را بەهەم زەنەد، ما ۋ چراغى چەشم و رەهى ئينتيزارى دوست.**

گەر باى فيتنە هەردوو جيهان بەسەريەكدا بدا، ئێمە و چراى چاو و چاوەڕوانى دۆست.

باد: با     بهم زند: بەسەريەكدا بدا، بەسەريەكدا تێكبدا     ره انتظار: چاوەڕوان

خواجە خۆشەويستى خۆى بۆ دۆست دووبارە دەكاتەوە و دەڵێ: لە هەر بارودۆخێكدا بێت ئێمە بە چراى چاومان چاوەڕوانى دۆست دەكەين تاوەكو رێگەى بۆ رووناك بكەينەوە، خودى دەربڕينى حافز بريتييە لە گەر باى فيتنە و ئاشوب هەموو جهان داگير بكات و هەردوو دنيا بەيەكدا بدا و وێرانى بكات واتە لە هەموو بارودۆخێكى نالەبار و ناخۆشدا ئێمە بە چراى چاوانمانەوە چاوەڕوانى دۆستين و هەميشە بە وەفادارى دەمێنينەوە.

**٧- كحل الجواهرى به من آر اى نسيم صبح**

**زان خاك نيكبخت كه شد رهگذار دوست**

**كوهلى ئەلجەڤاهيرى بە مەن ئار ئەى نەسيمى سوبە، زان خاكى نيكبەخت كە شود رەهگوزارى دوست.**

كلى مروارى بۆ من بهێنە ئەى شەماڵى بەيان، لەو خاكە خۆشبەختەى كە بووە رێڕەوى دۆست.

كحل الجواهرى: جۆرە كلێكە كە بە مروارى تێكەڵ دەكرێ بۆ بەهێزبوونى چاو دەكرێتە چاو، جۆرێكە لە سورمە.     به من آر: بۆمن بهێنە

نيكبخت: خۆشبەخت     رهگذار: رێڕەوى تێپەڕين، راگوزەر

خواجە بە شەماڵى بەرەبەيان كە لە رێڕەوى دۆستەوە هەڵدەكات دەڵێ: لەو خاكە خۆشبەختەى كە يار پێى لەسەر دەنێت و بەسەريدا تێدەپەڕێ كەمێ خاك و خۆڵ بهێنە تا وەك

کلی تێکەڵ مرواری بیکەینە چاومان و وەك (توتیا ـ دەرمانی بەهێزکردنی چاو) ببێتە مایەی بەهێزکردنی چاومان.

**٨- مابیم و آستانهء عشق و سر نیاز**

**تا خواب خوش کرا برد اندر کنار دوست**

**مابیم و ئاستانەیی ئیشق و سەری نیاز، تا خابی خوش کەرا بەرەد ئەندەر کەناری دوست.**

ئێمە سەری پێویستیمان لە بەردەرگای عەشقدا دادەنەوێنین، تابزانین کێ لە کەناری دۆستدا خەوی خۆشی لێدەکەوێ.

| | | |
|---|---|---|
| مابیم: ئێمەین | سر نیاز: سەری پێوستی | اندر: لە، لە نێو |
| کنار: لا، کەنار | اندر کنار: لە لای، لە کەناری | |

ئێمە لە بەردەرگای عەشقدا هەمیشە سەری نیاز و پێوستی و موحتاجی بۆ دۆست و مەعشوق دادەنەوێنین و هەوڵی خۆمان دەدەین تا بزانین کێمان شیاوی ئەوەیە کە لە کەنار عەشقی دۆستدا و بە بەرەکەتی عەشقی ئیلاهییەوە خەوێکی خۆشی لێکەوێت یاخود تا بزانین کێمان بەو بەرەکەتە لە خەودا دۆست ببینێ.

**٩- دشمن به قصد حافظ اگر دم زند چه باك**

**منّت خدای را که نیم شرمسار دوست**

**دوشمەن بە قەسدی هافز ئەگەر دەم زەنەد چە باك، مننەت خودای را کە نییەم شەرمساری دوست.**

چ باکم هەیە گەر دوژمن بە مەبەستی ئازاری حافز قسە بکات، سوپاس بۆ خودا کە شەرمەزاری دۆست نیم.

| | |
|---|---|
| دشمن: دوژمن | به قصد حافظ: بە مەبەستی ئازاری حافز |
| دم زند: قسە بکات | چه باك: چ باك، چ خەم، گوێ پێ نادەم |
| منت: منەت | منت خدای را: منەتی خوام لەسەرە، سوپاس بۆ خودا |
| نیم: نیم | شرمسار: شەرمەزار |

ئەوەی بە لای شاعیرەوە گرنگە رووسووری بارەگای دۆست و شەرمەزار نەبوونە لە حزوریدا، ئیدی جگە لەمە باکی لە هیچی دیکە نییە، هەربۆیە ئێستا کە دوژمن لە بارەی حافزەوە قسەی خراپ دەکات و مەبەستی ئازاردانی هەیە هیچ باکی نییە و بێخەمە، چونکە سوپاس بۆ خوا لە بەردەم دۆستدا شەرمەزار نییە.



لە نوسخەی (فریدون میرزای تیموری)دا ئەم بەیتەی خوارەوە لە پێش بەیتی تەخەلوسدا هاتبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە نوسخە باوەرپێکراوەکاندا نەبوو لە چوارچێوەی غەزەلەکەدا نەمانهێنا تەنیا بۆ ئاگاداری و زانیاری خوێنەر لێرەدا دەینووسینەوە:

**آخر به دست چرخ گرفتار می شود**

**سرگشته آهویی که نگردد شکار دوست**

واتە: ئەو ئاسکە ونبووەی کە نەبووە نێچیری دۆست، ئاخرییەکەی بە دەستی چەرخ و گەردوون گرفتار دەبێت.

## غەزەلی شەست و دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١-صبا اگر گذری افتدت بەکشور دوست**

**بیار نفحەای از گیسوی معنبر دوست**

**سەبا ئەگەر گوزەری ئوفتەدەت بە کیشڤەری دوست، بیار نەفحەیی ئەز گیسوی موئەنبەری دوست.**

سەبا گەر ڕێت کەوتە وڵاتی دۆست، لە پرچی عەنبەربۆی یارەوە بۆنێکی خۆش بهێنە.

گذری افتدت: گوزەرت کردە، ڕێت کەوتە          کشور: وڵات

نفحە: یەکجار هەڵکردنی با، بۆنێکی خۆش          معنبر: عەنبەربۆ، بە عەنبەر بۆندارکراو

داوا لە شەماڵ یا سەبا دەکات کە ئەگەر هاتوو ڕێی کەوتە وڵاتی دۆستەوە و بەوێدا گوزەریکرد بەڵکو بۆنێکی خۆش لە پرچی عەنبەربۆی یارەوە بهێنێ.

**٢- بە جان او کە بە شکرانە جان برافشانم**

**اگر بە سوی من آری پیامی از بر دوست**

**بە جانی ئو کە بە شوکرانە جان بەرەفشانەم، ئەگەر بە سوی مەن ئاری پەیامی ئەز بەری دوست.**

بە گیانی ئەو ئەگەر لە لای یارەوە پەیامێکم بۆ بهێنی لە سوپاگوزاریدا گیانم دەکەمە دیاری.

او: ئەو، لێرەدا مەبەست لە دۆستە          بە شکرانە: لە سوپاسگوزاریدا

برافشانم: بە قوربانی دەکەم، دەکەمە دیاری، پێشکەشدەکەم          بە سوی من: بەرەو من، بەڵام لێرەدا بە واتای (بۆ من)دێت          آری: بهێنی، لە (آوردن)ەوە وەرگیراوە

پیام: پەیام          از بر دوست: لەلایەن دۆستەوە

دیسانەوە بە سەبا دەڵێ: بەگیانی دۆست ئەگەر بتوانی لە لایەن ئەوەوە پەیامێك یا قسەیەکم بۆ بهێنی هێندە سوپاسگوزارم لە سوپاسگوزاریدا گیانی خۆم دەکەمە دیاری.

**٣- و گر چنانکە درآن حضرتت نباشد بار**

**برای دیدە بیاور غباری از در دوست**

**ڤە گەر چونانکە دەران هەزرەتەت نەباشەد بار، بەرای دیدە بیاڤەر غوباری ئەز دەری دوست.**



وە ئەگەر مۆڵەتت نەبوو بچییە ژوورەوە بۆ لای دۆست، بۆ چاوانم لەبەر دەرگای دۆستەوە غوبارێ بهێنە.

بار: مۆڵەت          دیدە: چاو، دیدە          غبار: تەپ و تۆز          بیاوەر/بیار: بهێنە

خواجە دەزانێ کە چوونە ژوورەوە بۆ لای دۆست تەنانەت بۆ بای سەباش ئاسان نییە بۆیە پێی دەڵێ گەر مۆڵەتیان نەدای بچیتە خزمەتی دۆست لە غوبار و گەرد و خۆڵی بەردەرگای دۆستەوە هەندێ خۆڵ و تۆزمان بۆ بێنە تاوەك كل لە چاوانی بکەین و چاوانمان بەهێز بێت.

لێرەدا ئیدی قسەکردن لەگەڵ سەبا کۆتایی دێت.

لە هەندێ نوسخەدا وەك(عیوضی) لە میسراعی دووەمدا لە بری (برای دیدە) (بدین دو دیدە) هاتوە، بەڵام نە لە هیچ یەکێ لە (٣٦) نوسخەکەی (فریدون میرزای تیموری) و نە لە (سودی) و (قزوینی)دا بەم شێوەیە نەبوو، هەروەها لە هەشت نوسخە دێرینەکەی دیوانەکەدا پێنج نوسخەیان ئەم بەم شێوەیەی ئێستان، هەربۆیە لێرەشدا پەیڕەوی لە زۆرینەی نوسخەکان کراوە.

**٤- من گدا و تمنّای وصل او هیهات**

**مگر بە خواب ببینم خیال منظر دوست**

**مەنی گیداڤو تەمەننای ڤەسلی ئو هەیهات، مەگەر بە خاب ببینەم خیالی مەنزەری دوست.**

منی گەدا و تەمەننای بەیەکگەیشتنی یار، هەیهات مەگەر لە خەودا شێوەی ڕووخساری ئەندامی ببینم.

گدا: سواڵکەر، هەژار، ناچینر          تمنا: تەمەنا، خواست، داوا

هیهات: هەیهات، وشەی ئەسەفە، بەڵام لێرەدا بە واتای دوورە دێت یاخود ڕێی تێ ناچێ

بە خواب: لە خەودا          خیال: هەر وێنەیەك کە مجرد بێت، وەك وێنەی شتێ لە ئاوێنەدا

منظر: ئەوەی لە بەرامبەر چاودا بێت، دەرکەوتنی کەس

دەڵێ: منی سواڵکەر و گەدا یاخود منێك کە لە چینەکانی خوارەوەم و دیدار و بەیەکگەیشتنی دۆست کە گەورەیە و لە توێژ و چینە باڵاکانە زۆر لە یەك دوورە و مەحاڵە بۆیە گەر بمەوێ دۆست ببینم ئەوا تەنیا لە خەوندا دەتوانم وێنە و شێوەی ئەو لەبەرچاومدا ببینم.

**٥- دل صنوبریم همچو بید لرزان است**

**ز حسرت قد و بالای چون صنوبر دوست**

**دلی سنەوبەرییەم هەمچو بید لەرزانەست، ز هەسرەتی قەد و بالایی چون سنەوبەری دوست.**

دڵی سنۆبەریم هەروەك بی دەلەرەزێ (لەزرۆكە) لە حەسرەتی قەد و باڵای وەك سنۆبەری دۆست.

صنوبر: سنۆبەر　　همچو: هەروەك　　بید: بی

لرزان: لەزرۆك (دەلەرزێ)　　حسرت: حەسرەت، تاو　　قد و بالا: قەد و باڵا

لە بەیتەكەدا دووجار سنۆبەر هاتوە كە جارێكیان ئاوەڵناوی دڵە و جاری دووەم ئاوەڵناوی بەژن و قەدوباڵای دۆستە، لە جاری یەكەمدا مەبەست لە بەری درەختی سنۆبەرە و لە جاری دووەمدا مەبەست لە خودی درەختەكەیە.

خواجە دەڵێ: دڵی سنۆبەریم كە پتەوبوو لە حەسرەت و لە تاو قەدوباڵای وەك سنۆبەر ڕێك و جوانی دۆستەوە ئێستا لەزرۆكە و تووشی نیگەرانی بووە وەك بی. لەرینەوە یاخود لەزرین، واتە زۆر لەرزین و لە بەیتەكەدا ئاماژەیە بە لێدانی ئاوێزانی نیگەرانیی دڵ.

**٦- اگر چه دوست به چیزی نمی خرد ما را**

**به عالمی نفروشیم مویی از سر دوست**

**ئەگەر چە دوست بە چیزی نەمی خەرەد ما را، بە ئالەمی نەفروشیم مویی ئەز سەری دوست.**

ئەگەرچی دۆست بە هیچ شتێ ئێمە ناكڕێ، بەڵام ئێمە مویەك لە سەری دۆست بە دنیایەك نافرۆشین.

بە چیزی: بە شتێ، بە هیچ　　نمی خرد: ناكڕێت　　مویی: مویەك

خواجە لێرەدا دەیەوێ خۆشەویستی و عەشقی لە رادەبەدەر و یەكلایەنەی بۆ دۆست ڕووناكبكاتەوە و ئەم خۆشەویستییەش نابەستێتەوە بە خۆشەویستی بەرامبەری یارەوە، ئەو دەڵێ: گەرچی دۆست بەها و ئەرزش بۆ ئێمە دانانێ و لای ئەو لە هیچ بەنرخترنین و بە هیچ شتێ ئەمانفرۆشێت، بەڵام ئێمە هێندە ڕێز و بەهای ئەومان لایە كە تاڵە مویەكی سەری ئەو بە دنیایەك نادەین.

**٧- چه باشد ار شود از بند غم دلش آزاد**

**چو هست حافظ خوشخوان غلام و چاكر دوست**

**چە باشەد ئەر شەڤەد ئەز بەندی غەم دلەش ئازاد، چو هەست هافزی خوشخان غولام و چاكری دوست.**

چی دەبێ گەر دڵی حافز لە بەندی غەم ئازادبێ، چونكە ئەوی دەنگخۆش غوڵام و خزمەتكاری دۆستە.

چە باشد: چی دەبێ　　ار: ئەگەر



شود: ببێ　　خۆشخوان: دەنگخۆش　　چاكر: بەندە و خزمەتكار

خواجەی دەنگخۆش خۆی بە غوڵام و خزمەتكاری دۆست دەزانێ و بەمەش خۆی بە موستەحەقی ئەوە دەزانێ كە دڵی لە غەم ئازادبێ، خۆی دەڵێ: چی دەبێ و چی ڕوودەدا گەر حافزی دەنگخۆش كە بەندە و خزمەكاری دۆستە دڵی لە غەم رزگار بێ.

## غەزەلی شەست و سێیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات)**

**۱- مرحبا ای پیک مشتاقان بده پیغام دوست**

**تا کنم جان از سر رغبت فدای نام دوست**

**مەرهەبا ئەی پەیکی موشتاقان بدەھ پەیغامی دوست، تا کونەم جان ئەز سەری رەغبەت فیدای نامی دوست.**

ئافەرین ئەی پەیکی موشتاقان، بدە پەیامی دۆست، تا بە رەغبەت و ئارەزوو گیان بکەمە قوربانی ناوی دۆست.

مرحبا: ئافەرین، دەکرێ لە فارسی کۆندا هەر بە واتای (مەرحەبا)هاتبێ

پیك مشتاقان: نامەبەری ئارەزوومەندان، سەبا          بده: بمدەرێ، بدە

از سر رغبت: بەرغبەت، بەئارەزوو

ئافەرین بۆ تۆ ئەی قاسیدی موشتاقان ئەی بادی سەبا کە پەیامی دۆستت بۆ هێنام بێنە بمدەرێ تا بە ئارەزووی خۆم و بە بێ هیچ زۆرێك گیانم بکەمە قوربانی نێوی دۆست.

**۲- واله و شیداست دایم همچو بلبل در قفس**

**طوطی طبعم ز عشق شکّر و بادام دوست**

**ڤالەڤو شەیداست دایم هەمچو بوولبوول دەر قەفەس، توتیی تەبئەم ز ئیشقی شەککەر و بادامی دوست.**

توتی سروشتم لەتاو عەشقی شەکر و بادامی دۆست هەروەك بوولبوولی نێو قەفەس دایم شێت و سەرگەردانە.

واله: سەرگەردان، حەیران          شیدا: شێت، دێوانە، شەیدا

دایم: بەردەوام          همچو: هەروەك

خواجە سروشتی خۆی بە توتی چواندووە و بە درکەش لێو و چاوی (شەکر و بادام)دۆستی هێناوەتەوە و دەڵێ: توتی سروشتم لە عشقی شەکر و بادەمی دۆستەوە وەك بوولبوولی ناو قەفەس شەیدا و سەرگەردانە، واتە لە دووری لێو و چاوی دۆست حاڵم پەشێوە.



**۳- زلف او دام است و خالش دانهء آن دام و من**

**بر امید دانەیی افتادەام در دام دوست**

**زولفی ئو دامەست و خالەش دانەیی ئان دام و مەن، بەر ئومیدی دانەیی ئوفتادەئەم دەر دامی دوست.**

پرچی ئەو داوە و خاڵی دانی ئەو داوەیە و من بە ئومێدی دانێکەوە کەوتوومەتە نێو داوی دۆستەوە.

دام: داو          خالش: خاڵی          دانه: دان

آن: ئەو          افتادەام: کەوتومەتە

کاتێ داو بۆ باڵندە دەنرێتەوە دانی لە نێو دەکرێ بۆ ئەوەی باڵندەکان هەڵخەڵتێنی و بەرەو داوەکە راکێشرێن، لێرەدا خاڵی سەر روومەتی یار بە دان و پرچی یاریش بە داو چوێنراوە، دەڵێ: من بە ئومێدی دانێك هاتم یاخود بە ئومێدی خاڵێکی رەشی سەر روومەتی یار هاتم و بەڵام داوی پرچی گرتمی و ئێستا کەوتوومەتە نێو داوی پرچییەوە.

گەر لە زاراوەی سۆفیگەریدا (خال) وەحدەت بێت ئەوا (پرچ) زۆرجار رووپۆشی ئەو بەیەکگەیشتنەیە، خواجەش دەڵێ: بە ئومێدی گەیشتن نزیککەوتمەوە، بەڵام کەوتمە داوی نەگەیشتن و پەردەکانەوە.

**٤- سر ز مستی برنگیرد تا به صبح روز حشر**

**هرکه چون من در ازل یك جرعه خورد از جام دوست**

**سەر ز مەستی بەرنەگیرەد تا بە سوبهی روزی هەشر، هەرکە چون مەن دەر ئەزەل یەك جورئە خورد ئەز جامی دوست.**

هەر کەسێ وەك من لە ئەزەلدا لە جامی دۆستدا یەك قومی خواردبێتەوە لە تاو مەستی تا بەیانی رۆژی حەشر سەر بەرز ناکاتەوە.

برنگیرد: بەرز ناکاتەوە

سربرگرفتن: لەخەوهەستان و بێداربوونەوە، لە بەیتەکەدا بە واتای بەهۆشهاتنەوەیە لە مەستی، بەردان.     صبح: بەیانی     جرعە: قوم، تۆز     جرعەای: قومێك، تۆزێك

خواجە دەڵێ: هەرکەسێ وەك من هەر لە ئەزەلەوە قومێکی لە جامی دۆست خواردبێتەوە و عاشق و عارفی ئەو دۆستە راستییە بووبێت و چوبێتە نێو رێگای عیرفانەوە هەتا رۆژی حەشر واز لەو مەستییە ناهێنێ یاخود هەتا رۆژی حەشر ئەو عەشق و مەستییە بەری نادات و واز لە عارفی ناهێنێ.

**٥- من بگفتم شمّەیی از شرح شوق خود ولی**

**دردسر باشد نمودن بیش از این ابرام دوست**

**مەن بگوفتەم شەممەیی ئەز شەرهی شۆوقی خود ڤەلی، دەردسەر باشەد نـەمودەن بـیش ئەزین ئیبرامی دوست.**

من کەمێکم لە شەرحی ئارەزووی خـۆم بـە یـار وت ـ زۆر بڵێـیم نـەکرد ـ چـونکە زیـاتر پێداگرتن و تەکلیفکردن لە دۆست دەبێتە مایەی نارەحەتکردن و ئازاردانی.

شمەیی: بۆنێك، بەڵام لێرەدا بە مانای تۆزێك، کەمێك دێت

دردسر: نارەحەتی، ئازادران، دەردەسەر نمودن: خستنەڕوو، دەرخستن

بیش ازین: لەمە زیاتر ابرام: تەکلیف، پێداگرتن

خواجە هەرچەندە زۆر ئارەزووی دیداری دۆستی هەیە، بەڵام لەبـەر ئـەوەی کـە نـەوەك زۆر گوتن و باسکردنی ئەم ئارەزووە ببێتە مایەی ئازاردان و نارەحەتکردنی دۆست باسـی ناکـات و دان بە خۆیدا دەگرێت.

لە راستیدا لە نوسخە جیاوازەکاندا ئەم بەیتـە زۆر جیـاوازی هەیـە پێدەچـێ ئەمـە ببێتـە هۆکاری ئەوەی کە بگوترێ ئەم بەیتە هی خواجە نییە بۆ نموونە:

لە بری (من بگفتم) (من ـگفتم ـ بەبێ هـیچ خاڵێـك ـ، مـی بگفـتم، مـن نگفـتم، مـی نگویم، می نگفتم، بس نگویم)

لە بری (ولی) میسراعی یەکەم (ازان)هاتووە و لە بری (دردسر باشد)یش(من نمـی خـواهم، ...) هاتووە

لە سودیدا: من نگفتم شمەای از شرح شوق خود ازان، دردسر باشد..

لە قزوینی دا بەمشێوەیە هاتووە:

بس نگویم شمە از شرح شوق خود ازانك دردسر باشد نمودن بیش ازین..

هەروەها لە نوسخەی فریدون میرزای تەیموریشدا بە شێوەی ئەم شـەرحە هـاتووە کـە ئێمـە پـەیرەویمان لـەو کـردووە هـەر لـەو نوسخەیەشـدا چـەند جیاوازییـەکی نوسـخەکانی دیکـەی خستۆتەڕوو بۆ نموونە:

أ-ك. من نگوین شمەای از شرح شوق خود از ان..

م. من نگفتم من نمی خواهم نمودن بعد ازاین ابرام دوست

ج-حج: من نگفتم شمەای از شرح حال مستمند زان کـە نتـوانم ربـوون بـیش ازان ابـرام دوست {ل١٣٦، فریدون میرزای تیموری، غزل ٨٦}



بەهەرحاڵ جگە لە نوسخەی (حج) دەکرێ بگوترێ واتای بەیتەکە نزیکە لـە یەکدیـەوە کـە ئەویش بریتییە لەوەی کە خواجە لەگەڵ ئەوەی زۆر ئارەزوو و تاسـەی دیـداری دۆسـتی هەیـە، بەڵام لەبەر ئەوەی دۆست بێزار و نارەحت نەکات پێداگیری ناکات و تەنیا تۆزێکی دەخاتەڕوو.

**٦- گر دهد دستم کشم در دیده همچون توتیا**

**خاك راهی کان مشرّف گردد از اقدام دوست**

**گەر دەهەد دەستەم کەشەم دەر دیدە هەمچون توتیـا، خـاکی راهـی کـان موشـەررەف گەردەد ئەز ئەقدامی دوست.**

گەر بۆم دەستبدات خاکی ئەو رێگەیەی کە بە قـاچ لەسـەردانان و پێـدانانی یـار پـیرۆز و موشەرەف دەبێ وەك توتیا لە چاودەکەم.

دهد دستم: بۆم دەستبدات، بۆم بلوێ کشم: دەکێشم، لەچاودەکەم

دیدە: چاو توتیا: دەرمانی بەهێزکردنی چاو

مشرف گردد: پیرۆزبـێ اقدام: کۆی قدم، بە واتای پێ، هەنگاو

خواجە دەڵێ: ئەگەر بۆم بگونجێ خاك و تەپوتۆزی ئەو رێگایـە وەك دەرمـانی بـەهێزکردنی چاو لە چاودەکەم کە بە پێ و هەنگاوی یار پیرۆز بووە.

**٧- میل من سوی وصال و قصد او سوی فراق**

**ترك کام خود گرفتم تا براید کام دوست**

**مەیلی مەن سوی ڤیسال و قەسدی ئو سوی فـیراق، تـەرکی کـامی خـود گرفتـەم تـا بەرایەد کامی دوست.**

من حەز و مەیلم لە بەیەکگەیشتن و ویساڵە، بەڵام ویستی ئـەو دووری و فیراقـە، هەربۆیـە ئارەزووی خۆم وازلێهێنا تا ئارەزووی دۆست بێتەدی.

میل: حەز، ئارەزوو، مەیل وصال: بەیەکگەیشتن قصد: ویست

ترك: تەرك، وازلێهێنان کام: ئارەزوو

ترك کام خود گرفتم: وازم لە ئارەزووی خۆم هێنا براید: بێتەدی

دیسانەوە خواجە لەبەر خاتری دۆست واز لە ئارەزووەکانی خۆی دەهێنێ و دەڵێ: هەرچەندە من حەزم لە بەیەکگەیشتن بوو، بەڵام یار حەزی لە دووری و جودابوونەوەبوو، هەربۆیەش لەگەڵ ئەو حەزەشدا وازم لە بەیەکگەیشتنی هێنا و جودابوومەوە تا ئارەزووی یار بێتەدی کـە حـەزی لە جودایی و فیراق بوو.

**٨- حافظ اندر درد او  می سوز و بی درمان بساز**

**زانکه درمانی ندارد  درد بی آرام دوست**

**هافز ئەندەر دەردی ئو می سوز و بی دەرمان بساز، زانکە دەرمانی نەدارەد دەردی بی ئارامی دوست.**

حافز لە دەردی ئەودا بسووتیّ و بەبیّ دەرمان لەگەڵ ئەم دەردەدا بسازیّ، چونکە دەردی بیّ ئارامی دۆست دەرمانێکی نییە.

اندر: لەنێو، لە   می سوز: بسووتیّ   بساز: بسازیّ، رازی بە     زانکە: لەوەی کە، چونکە

درد بی آرام: دەردی بیّ ئارام، دەردی بیّ ئامان

خواجە بە خۆی دەڵیّ: دەردی عاشق بوون بە دۆست تەنیا چارەیەکی هەیە کە رازی بیت بەو دەردەی عەشق و هیچی دیکە، هەربۆیە تۆ لە نێو ئەو دەردە بیّ دەرمان و بیّ ئامانەی دۆستدا تەنیا چارەیەکت هەیە ئەویش رازیبوونە، هەربۆیە لەدەردی بی دەرمانی دۆستدا بسوتیّ و بسازیّ.

لە راستیدا دەکریّ بگوتریّ ئەم سیّ غەزەلەی دوایی کە پاشقافیەکەیان (دۆست)ە، یەك غەزەلن و بەڵام لەبەر نەبوونە قەسیدەیان لای خودی شاعیر دابەشکراون، دووبارەبوونەوە و لێکچونی زۆر زۆر لە نێوانیاندا هەیە. جگە لەوەی کە هەرسێکیان سادە و ئاسانن بە (بادی سەبا) دەست پێدەکەن و باس لە دووری یار و تامەزرۆیی شاعیر دەکەن بۆ دۆست و رازیبوون بەو دوورییە هەروەها لە هەر سیّ غەزەلەکەدا هەمان مەسەلەی هێنانی تۆزی ژێر پێی دۆست وەك توتیا هێنراوەتەوە.

هەربۆیە دەکریّ بگوتریّ هەر سیّ غەزەلەکە دووبارەبوونەوەیەکی سادە و جوانی یەکترین، بەڵام کاتیّ هەموویان پێکەوە دەخوێنرێتەوە هەست بە جۆرە ماندبوون یاخود بێزارییەك دەکرێت.

بەهەرحاڵ هەر غەزەلە و بە جیا جوانییەکی سادەی تایبەت بە خۆیی تێدایە.





## غەزەلی شەست و چوارەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- روی تو کس ندید و هزارت رقیب هست**
**در غنچەیی هنوز و صدت عندلیب هست**

**روی تو کەس نەدید و هەزارەت رەقیب هەست، دەر غونچەیی هەنوز و سەدەت ئەندەلیب هەست.**

هەزار رەقیبت هەیە و کەسیش رووتی نەدیوە، هێشتا لە خونچەدای و سەد بوولبوولی عاشقت هەیە.

ندید: نەیدی      رقیب: چاودێر، رەقیب
هنوز: هێشتا      عندلیب: بوولبوول

دەکرێ سەرەتا بڵێین تەواوی غەزەلەکە کەم تا زۆر بەیەکەوە پەیوەستە و باس لە یاری کەس نەدیوی هەمموو کەس ناسی نادیاری لە هەموو شوێن ئامادە دەکات کە بە کۆمەڵێ زاراوەی ئایینی و عیرفانی وەك: (خانقاە و خرابات وصومعە و ناقوس و دیر و راهب و صلیب) زیاتر ئەمە دەسەلمێنێ کە دۆست لە جێگا و ئایینە جیاوازەکاندا جیاوازی نییە.

لێرەدا خواجە بە یار دەڵێ: تا ئێستا یاخود هەرگیز کەس رووی تۆی نەدیوە کەچی هەزار رەقیبت هەیە واتە هەزاران کەس لە ململانێی بەدەستهێنانی خۆشەویستی تۆدان یاخود چاودێری تۆن، هەرئەم واتایە لە میسراعی دووەمدا بەو خونچەیە دەچوێنێ کە هێشتا نەپشکوتووە و سەد بوولبوول عاشقی بوون، دەڵێ: هێشتا لە خونچەدایت و سەد بوولبوول عاشقت بووە.

مەولانا خالیدی نەقشبەندی ـ قدس سرە ـ لە عەقیدە کوردییەکەیدا باس لە بینینی خودا دەکات و پێیوایە بینینی لە دونیادا جائیزە، بەڵام واقیع نەبووە و هێشتا رووی نەداوە{مەولانا خالیدی نەقشبەندی، عەقیدەی کوردی}.

ئەم بڕوایە بڕوای عارفەکانە کە پێیان وایە دەکرێ لە دونیادا مەعشوق (خودا) ببینرێ، بەڵام تا ئێستا رووی نەداوە، حافزیش ئەم رایە دەخاتەڕوو.



**٢- اگر آمدم به کوی تو چندان غریب نیست**
**چون من درین دیار  هزاران غریب هست**

**ئەگەر ئامەدەم بە کوی تو چەندان غەریب نیست، چون مەن دەرین دیار هەزاران غەریب هەست.**

ئەگەر هاتمە گەڕەکی تۆ زۆر سەرسوڕهێنەر نییە، چونکە لەم دیارەدا هەزاران غەریب و نامۆی وەك من هەیە.

کوی: گەڕەك      چندان غریب نیست: ئەوەندە جێگەی سەرسوڕمان نییە
چون: وەك      دیار: شار، دیار      غریب: نامۆ، غەریب

خواجە بە یار دەڵێ: گەر هانام بۆ تۆ هێنا و ڕوومکردە گەڕەکی تۆ و بەردەرگای تۆ زۆر سەرسوڕهێنەر نییە، چونکە هەزاران غەریبی وەك من لەم شار و دیارەی تۆدا هەیە کە هانایان بۆ تۆ هێناوە، واتە من یەکەم کەس و تەنیا کەس نیم کە هانات بۆ دەهێنم، بەڵکو غەریبانێکی زۆر وەك من پەنایان بۆ تۆ هێناوە، چونکە تۆ گەورەیت و خاوەن پلە و مەقامی.

**٣- در عشق خانقا و خرابات فرق نیست**
**هرجا کە هست پرتو روی حبیب هست**

**دەر ئیشق خانقاە و خەرابات فەرق نیست، هەرجا کە هەست پورتوڤی روی هەبیب هەست.**

لە عەشقدا لە نێوان خانەقا و خەراباتدا جیاوازی نییە، پەرتەوی رووی خۆشەویست لە هەموو شوێنێك هەیە.

هرجاکە هست: هەر شوێنێك کە هەیە، هەموو شوێنێك      پرتو: پەرتەو، تیشك

بەیتەکە هەوڵی ئەوەدەدات کە جیلوە بە مەزهەبی عەشق بدات کە پێیوایە مرۆڤ گەر عاشقی خودا بێت و بە راستی مەبەستی ئەو بێت ئیدی ناولێنانە سەزارەکییەکان کاریگەری نابێت و شوێنە جیاوازەکان و رووگە جیاوازەکان کاریگەرییان نابێت، عاشقان پێیان وایە مەعشوق لە مزگەوت و خانەقادا جیلوە دەکات، پیرە سۆفییەکی نورانی شاری هەڵەبجە دەیگوت: گرنگ ئەوە ئیدی هەرچی بیت گرنگ نییە: سۆفی، دەروێش، مەلا.. گرنگ ئەوەیە خودا لە پشت عەشقەوە بێ {سۆفی محەمەد، دیداری تایبەت}

خواجەش دەڵێ: لە مەزهەبی عەشقدا جیاوازی لە نێوان شوێنەکاندا نییە بۆ نموونە (خانەقاو خەرابات) کە خانەقا بە رووکەش جێگەی خوداپەرستی و خەرابات (مەیخانە) جێگەی شتی دیکەیە، چونکە تیشکی رووی مەعشوق لە هەموو جێگەیەك هەیە، هەروەك مەعشوقی حەق زاتی باری دەفەرموێ: (ولله المشرق و المغرب فاینما تولوا فثم وجە الله) {١١٥/٢}واتە:

ئێوە روو لە هەركوێ دەكەن ئەوێ رووی خوایە. واتە تیشكی رووی خوا لە هەر شوێن و ئاراستەیەكدا هەیە خواجەش هەرئەمە دەڵێ، لە هەموو شوێنێ تیشك و پرتەوی رووی خۆشەویست هەیە.

ئەم ئاماژە قورئانییە لە نوسخەی (فەریدون میرزای تیموری)دا دەست نیشانكراوە {بڕوانە: غزل ٨٧ ل١٣٧}.

**٤- آنجا كه كار صومعەرا جلوه می دهند**

**ناقوس دیر راهب و نام صلیب هست**

**ئانجا كە كاری سۆمەئەرا جیلڤە می دەهەند، ناقوسی دەیری راهیب و نامی سەلیب هەست.**

لەو شوێنەدا كە كاری عیبادەتگە رەونەق پێ دەدەن، ناقوسی كڵێسای راهب و ناوی خاچیش هەیە.

آنجا: لەوێ، لەوشوێنەدا

صومعە، دێر، كڵێسا، عیبادەتگای مەسیحی، بەڵام پاشان لە ئەدەبدا بە واتای عیبادەتگای موسوڵمانان بە شێوەیەكی گشتی بەكارهات وەك: مزگەوت و خانەقا و تەكیە..

جلوه می دهند: جیلوە دەدەن، رەونەق پێ دەدەن

ناقوس: ئەو مادەیە كە لە كڵێسا بۆ ئاگاداركردنەوەی كاتی عیبادەت دادەنرێ، ناقوس

راهب: پیاوی ئاینی مەسیحی        صلیب: خاچ

لە درێژەی بەیتی پێشوودایە كە گوترا لە عەشقدا جیاوازی نێوان خانەقا و خەرابات نییە، لێرەشدا دەڵێ: لە جێگەیەكدا كە مەسەلەی كاری عیبادەتگای موسوڵمانان، رەونەق پێدەدرێت و باسدەكرێت لە بارەی ناقوس و راهیبەكانی مەسیحیەتیشەوە قسە و باس دێتەگۆڕێ. دەكرێ ئەوێ بارەگای خودا بێت كە لە كاتێكدا موسوڵمانانی راست دەبینەوە باس لە مەسیحییە راستەكانیش دەكرێ.

**٥- عاشق كه شد كه یار به حالش نظر نكرد**

**ای خواجه درد نیست و گر نه طبیب هست**

**ئاشق كە شود كە یار بە هالەش نەزەرنەكەرد، ئەی خاجە دەرد نیست ڤە گەرنە تەبیب هەست.**

كێ عاشق بوو و یار ئاوڕی لێ نەدایەوە، بەڕێز گیان دەرد نییە وەگەرنا دكتۆر هەیە.



كە: (كە)ی یەكەم واتە (كێ) (چ كەسێك)، بەڵام (كە)ی دووەم ئامرازە بە واتای (كە)یە

بە حالش نظر نكرد: ئاوڕی میهرەبانی لێنەدایەوە    ای خواجە: ئەی بەڕێز، بەڕێز گیان    درد: دەرد، نەخۆشی، لە عیرفاندا ئەم جۆرە (دەرد)ە، واتە شەوق و ئارەزووی گەیشتن بە دۆست

طبیب: پزیشك، رێبەر، رابەر

گومانی چاك و ناسینی تەواوی دۆست و یارە كاتێ دڵنیایە كە یاری حەق ئاوڕ لە هەموو عاشقێك دەداتەوە، هەروەك خۆی لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرمووێ (ئەی بەندە گەر بستێ لێم نزیك بیتەوە هەنگاوێك بەرەو تۆدێم).

هەروەها پێیوایە كە پاڵنەر و شەوق و ئارەزوو بۆ عیرفان و عەشقی ئیلاهی نییە وەگەرنا پزیشك و رابەر و چارەكەری ئەم دەردە هەیە.

خواجە حافز بە زمانێكی شیرین دەڵێ: چ كەسێ عاشق بوو خودا و یار و مەعشوقی حەق ئاوڕی لێ نەدایەوە، بە راستی بەڕێزم ئێمە دەردی عەشقمان نییە و شیاوی ئەو عەشقە نین و پێی ناگەین، ئەگەرنا دكتۆر و چارەسازی ئەو دەردی دوورییە هەیە. دەكرێ میسراعی دووەم وەڵامی ئەو پرسیار و گومانانە بێ كە عیرفان بەبێ بنەما و خەیاڵ دەزانن و پێیان وایە خۆخەڵەتاندنە و عەشقی نێوان خوداو بەندە بێ بنەمایە و نایەتە دی.

**٦- فریاد حافظ این همه آخر به هرزه نیست**

**هم قصّەیی غریب و حدیثی عجیب هست**

**فەریادی هافز ئین هەمە ئاخەر بە هەرزە نیست، هەم قیسەیی غەریب و هەدیسی ئەجیب هەست.**

ئاخر ئەم هەموو هاوار و ناڵەیەی حافز بێ هودە نییە، چونكە هەم چیرۆكی نامۆ و هەم مەسەلەی سەرسوڕهێنەر هەیە.

فریاد: هاوار        بە هرزە: بێ هودە، لەخۆوە

خواجە حافز سەری مەسەلەیەكی ئاڵۆز دەردەخات بەبێ ئەوەی لەوە زیاتر سەبارەت بەوكێشە و گرفتانە بلێت، لەلایەكەوە دەڵێ: هاوار و ناڵەی حافز بێ هودە و لە خۆوە نییە و كێشە و گرفتی عەجیب و غەریب هەیە كەچی لە لایەكی دیكەوە پێمان ناڵێ ئەوكێشە وگرفتە نامۆ و سەرسوڕهێنەرانە چین. لە راستیدا لای عارف و سۆفیە راستەكان بڵاوكردنەوەی مەسەلە دژوارەكان و نهێنییەكان كارێكی چەوتە و پێیان وایە نابێ نهێنی و رازەكانی عەشق بڵاوكرێنەوە، هەروەك (قشیری)گوتویەتی سۆفییەكان زۆر پێداگیری لە شاردنەوەی بیروڕا و باوەڕ و دابوونەریتی سۆفیگەری دەكەن و هەوڵ دەدەن كە جگە لە یارانی خودا (اهل اللّه) كەسی تر

پێیان نەزانێ، ئەوان پێیان وایە زاراوە سۆفیگەرییەکان کۆمەڵێ چەمك و حەقیقەت دەخەنەڕوو کە خوای گەورە تەنیا خستویەتییە دڵی وەلییەکان و یارانی خۆی (اهل الله) و نابێ نامەحرەم و بێگانەکان پێیان بزانن {فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی، د. سید جعفر سجادی، چاپ دوم، ۱۳۷۹، تهران، سرآغاز، ل۱۱} خواجەش ئەم مەسەلەیە چاك دەزانێ، بەڵام روحی پڕ شور و هەیەجانی جاروبار وای لێ دەکات کە قسە بکات، بەڵام هەر زوو لە نیوەڕێدا پەشیمان دەبێتەوە لە رایەکەی و یان بە ئاڵۆزی دەیانڵێ یاخود بە تەواوی پەشیمان دەبێتەوە لە گوتنیان.



## غەزەلی شەست و پێنجەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١- اگر چه عرض هنر پیش یار بی ادبی ست**

**زبان خموش و لیکن دهان پر از عربی ست**

**ئەگەر چە ئەرزی هونەر پیشی یار بی ئەدەبیست، زەبان خەموش ڤە لیکین دەهان پور ئەز ئەرەبیست.**

گەرچی دەرخستنی فەزڵ و هونەر لە بەردەم یارا بێ ئەدەبییە، زمانم بێدەنگە، بەڵام دەمم پڕە لە عەرەبی.

عرض: نمایش کردن، دەرخستن، خستنەڕوو   هنر: هونەر، توانا و لێهاتویی، زانست و ئەدەب   پیش: لای، لە بەردەم   بی ادبی: بێ ئەدەبی، بێ رێزی

خموش: خامۆش، بێدەنگ   دهان: دەم، زار

عربی: عەرەبی، لەسەردەمی خواجەدا زمانی عەرەبی زمانی کولتوور و زانستە پێشکەوتووەکان بووە لێرەشدا دەکرێ بە مانای زانابوون یاخود پاراوبوونی زمان هاتبێت

خواجە دەڵێ: لە بەرامبەر یاردا بێ ئەدەبی ناکەم و هەرگیز خۆم هەڵناکێشم و بێدەنگم هەرچەندە لە زانستە پێشکەوتووەکانی سەردەم بە هەرەمەندم یاخود هەرچەندە زمانێکی پاراو دەزانم و دەتوانم بە پاراوی قسە بکەم، بەڵام هەر بێدەنگم.

**٢- پری نهفته رخ و دیو در کرشمەء حسن**

**بسوخت عقل ز حیرت که این چه بلعجبی ست**

**پەری نوهوفتە روخ و دیڤ دەر کریشمەیی هوسن، بسوخت ئەقل ز هیرەت کە ئین چە بوولئەجەبیست.**

پەری رووی داپۆشیوە و دێویش بەجوانیی نازدەکات، عەقڵ لە حیرەتدا سووتا کە ئەمە چ سەمەرەیەکە.

پری: پەری، جنۆکە، درکەیە لە کچی جوان   نهفته رخ: رووی داپۆشیوە

دیو: دێو   کرشمە: ناز   حسن: جوانی   حیرت: حیرەت

بلعجبی: سەیر و سەرسوڕهێنەری، سەمەرە (چونکە لەگەڵ سەرسوڕهێنەریدا جۆرە سووککردنێکی تێدایە) فێڵ و جادووبازی.

لە حاڵەتی ئاساییدا دەبێ جوانان و پەریڕویان نازی جوانی بکەن و خۆیان دەرخەن و دێوسیفەت و ناشیرینەکان و مایەپوچەکانیش خۆیان بشارنەوە و بکەونە یاخود بخرێنە لاوە. بەڵام لەم سەردەمەدا کە خواجە تیایدا دەژی پێچەوانە بووەتەوە، جوانان و کارزانان خۆیان دەشارنەوە یاخود دەشاردرێنەوە و هیچ لەباردانەبوو و ناشیرین و دێوەکانیش دەبنە کاربەدەست و نازی جوانی دەفرۆشن و خۆیان بە جوان دەزانن (هەروەك سەردەمی ئێستا و بە تایبەتی لەم وڵاتە وێرانەی خۆماندا) لە راستیدا عەقڵ ئەم حاڵەتە بە ئاسانی قەبووڵ ناکات و هەر خاوەن ژیرییەك لە سەرسوڕمان و حیرەتدا دەسووتێ بە راستی ئەمە سەیروسەمەرەیە یاخود جادووبازییە کە دێوی ناشرین دەچێتە مەیدانی نازی جوانی فرۆشتنەوە.

**٣- سبب مپرس که چرخ از چه سفله پرور شد**

**که کام بخشی او را بهانه بی سببی ست**

**سەبەب مەپورس کە چەرخ ئەز چە سوفلەپەرڤەر شود، کە کام بەخشی ئو را بەهانە بی سەبەبیست.**

مەپرسە بە چ هۆیەك چەرخ ناکەسپەروەربوو، چونکە بیانوی بەخشین و پێوانەی ئەو بێ هۆکارییە.

چرخ: گەردوون سفلە: ناکەس، هیچ و پوچ، کەسی نەشیاو

سفلە پرور: ناکەس پەروەر، ناکەس پێدەر بهانە: بیانوو.

کە سەیری دنیا و بەشەکانی نێو دونیا دەکەین عەقڵ و لۆژیکیش سەرزارەکی توانای دەرککردنی ئەم حاڵەتانەی نییە و مرۆڤ تورە و پەست یاخود دەم بە گلەیی و گازاندە دەبێ ، چونکە کاتێ سەیری بەشی ناکەسبەچەیەك یا مرۆڤێکی تەمەڵ و تەوەزەل تەنانەت هیچ و پوچێك دەکەین زۆر زیاتری پێدراوە لە عاقڵێ یاخود پیاو و مەردێك یان مرۆڤێکی کارکەر و زەحمەتکێش، ئەم هەموو پرسیارانە لە تەواوی مێژوودا بوونیان هەبووە و دەبێت، کە ئەم کاروبارە بۆچی و هۆی چییە، گەردوون یاخود دروستتر خودا بەم شێوەیە بەشی دەکات کە جیاوازی لە نێوان ئەرك و مافدا بەدی دەکرێ.

وەڵامی خواجە حافز سەبارەت بەم دیاردەیە وەك وەڵامی عاقڵەکانی سەردەمی خۆیەتی و ئەوانی تێپەڕاندووە، ئەویش ئەوەیە کە ئەم جۆرە بەخشینە هۆکاری نییە و بە بێ سەبەبە و بیەوێ دەیبەخشێ و نەیەوێ نایبەخشێ. بەڵام لەم بەیتەدا لە بری خودا کە ئەمەش جۆرە



خۆدزینەوەیەکە لە باسەکە(چەرخی چەپ، گەردوون، ئاسمان) بەکارهاتووە لەکاتێکدا کە ئەو شتانە هیچ کاریگەرییەکیان نییە هەروەك خودی حافز لە پێش چوار غەزەلدا واتە لە غەزەلی (٦١) دا ئەم راستییە دەخاتەڕو کە (سیر سپهر و دوور قمر راچه اختیار در گردشند برحسب اختیار دوست) واتە (هاتووچۆی ئاسمان و سوڕانەوەیەی مانگ کەی بەدەست خۆیانە هەموویان بە ویستی دۆست دەسوڕێنەوە).

هەربۆیە وەك گوتمان ئەو وشانە خۆدزینەوەیە لە مەسەلەی قەدەر کە لە مێژووی ئیسلامیدا خۆدزینەوەیەکی بەردەوامی زانایان لەسەر ئەم مەسەلەیە بەرچاو دەکەوێت.

لە راستیدا گەر ئێمە تەنیا شتێك (بۆ نموونە سەروەت و سامان) بە بەخشین و پێدراوە خوداییەکان بزانین ئەوا دەکەوینە نێو ئەم گێژاوەی کە خواجە باسی دەکات و تا رادەیەکیش خۆشی تێکەوتووە، بەڵام گەر بە شێوەیەکی گشتگیر و دوور لە بیروڕا و قەناعەتە مادییەکان لێی بکۆڵینەوە هەموو بەخشراوە خوداییەکان پێکەوە بە نیعمەت بزانین ئەوا هەرگیز ناکەس و هیچ و پوچێکی دەوڵەمەند لای کەسی عاقڵ و ژیر پەسەند نییە و پێموایە کە هیچ ژیرێك ناپیاوی و پارە و سەروەت پێکەوە قەبووڵ ناکات، هەر بۆیە بە رای بەندە بەها و ئەرزشی پێدراوەکان لای خودا و مرۆڤ جیاوازییان هەیە و ئەو پێدراوەی کە لای خودا بەهایەکی زۆری هەیە دەکرێ لای مرۆڤ ئەو بەهایەی پێنەدرێت و بە پێچەوانەشەوە، بۆ نموونە: سەروەت کە مرۆڤ لە نێو پێدراوەکاندا زیاترین و زۆرترین بەهای بۆ دادەنێ لای خودا کەمترین بەهای هەیە و مرۆڤ خۆی لە نێو پێدراوەکاندا یەکێکیان یاخود هەندێکیان تۆخ دەکاتەوە.

لێرەوە دەتوانین بگەینە ئەو راستییەی کە چەرخ ناکەس پەروەر نییە، ئەسڵەن چەرخ و گەردوون هیچ کاریگەریەکییان لەم مەسەلەیەدا نییە، رونتر خودا هەرگیز ناکەسپەروەر نییە و شتی چاك بە ناکەس و هیچ و پوچ نادات، بگرە هەر بەوەی کە ناپیاو و ناکەسی کردووە (ئەگەر ئەو کردبێتی!؟) یاخود خۆی ناکەس و ناپیاوکردووە گەورەترین زیانی پێکەوتووە {سەبارەت بەم باسە بگەڕێوە بۆ کتێبی: حکمت و معیشت، د.عبدالکریم سروش}

بەهەرحاڵ خواجە بە بیروڕای سەردەمی خۆی دەڵێ: رۆژگار و چەرخ بەبێ هۆکار و سەبەب دەبەخشێتە مرۆڤ، هەربۆیە لە هۆکاری ئەوە مەپرسە کە بۆچی دەبەخشێتە ناکەسبەچەکان، چونکە بیانووی ئەوەیە کە بەخشین و پێدان پێویستی بە هۆکار و سەبەب نییە.

**٤- درین چمن گل بی خار کس نچید آری**

**چراغ مصطفوی با شرار بوولهبی ست**

**دەرین چەمەن گولی بی خار کەس نەچید ئاری، چراغی موستەفەوی با شەراری بوولەهەبیست.**

لەم گوڵزارەدا کەس گوڵی بێدڕکی نەچنی، ئەریٚ نوری چرای پێغەمبەری لەگەڵ ئاگری ئەبوو لەهەبدایە.

خار: دڕك    نچید: نەیچنی لە(چیدن)ەوە هاتووە بە واتای چنین
آری: ئەریٚ    چراغ: چرا، رووناکایی، نور
مصطفوی: مستەفایی، موحەمەدی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)    شرار: ئاگر، گڕیسوتێنەر

بوولهب: ابوولهب عبدالعزی، یەکیٚ بوو لە گەورەکانی قورەیش، کوڕی عبدالمطلب و مامی حەزرەتی رەسوڵڵایە (د.خ) پیاوێکی سەرسەختی دوژمنی ئیسلام بوو، لەبەر سوری بە (ابوولهب) ناوبانگی دەرکردووە، چەند رۆژێك پاش جەنگی بەدر مرد، لەبەر ئەوەی لەگەڵ ژنەکەیدا زۆر ئازاری پێغەمبەرییان دەدا، هەر لە دونیادا سزای ئاگری دۆزەخی بەسەردا درا وەك خودای گەورە لە سورەتی (المسد)دا دەفەرمووێ: (سیصلی نارا ذات لهب).

مەبەست لەم باخ و گوڵزارە(درین چمن) دونیایە خواجە دەڵیٚ: لەم دونیایەدا هەرگیز جوانی و چێژ و لەزەتی رەها نییە و هەرگیز کەس گوڵێکی بیٚ دڕکی نەچنیوە و خۆشییەکانی بە ناخۆشی ئاوێزانن، گوڵەکانیشی بە دڕك دەورە دراون. بەڵیٚ ئەمە دنیایە هەر لەو مەکەیەی کە نوری رووناکی ئاییـنی پیرۆزی حەزرەتی موحەمەدی سەریهەڵدا، گڕی ئاگری ئەبوو لەهەبیش هەبوو.

دەکریٚ لە مانایەکی دووری بەیتەکەدا قسە لە دژەکان بکەین، چونکە دونیا لە دوالیزمە و دژەکان دروست بووە و بڵێین خواجە پێیوایە کە دونیا لە دوالیزمەدژەکان (لۆژیکی ئەرستۆیی) پێکهاتووە.

**٥- به نیم جو نخرم طاق خانقاه و رباط**

**مرا که مصطبه ایوان و پای خم طنبی ست**

**بە نیم جو نەخەرەم تاقی خانقاە و ریبات، مەرا کە مەستەبە ئەیوان و پای خوم تەنەبیست.**

بە نیو دەنکە جۆ تاقی خانەقا و ریبات ناکڕم، من کە شوێنی رازاوەی دانیشتنم پای خومی شەرابە.

جو: جۆ    نخرم: ناکڕم    طاق: تاق: هەیوان، گومبەت
رباط: شوێنێك بووە کە وەك خانەقا یا تەکیە سۆفی و فەقیٚ هەژارەکانی تێدا ژیاوە
مصطبە: سەکۆ    ایوان: تاق



طنبی: ژووری رازاوە و گەورەی وەك شانشین، ماڵێکە یا خانوویەکە پێشەوەی ئاچوغە و هەیوانی هەیە و لە باغدا دروست دەکرێت، بەڵام وادیارە لە بەیتەکەدا مانای یەکەمی مەبەست بێت

شاعیر خانەقا و ریباتی لەگەڵ مەیخانەدا بەراوردکردووە و دەڵیٚ: مەیخانە و سەکۆی مەیخانە لای من وەك تاق و هەیوان و تاقی خانەقا وایە و کەناری خومی شەرابیش وەك شانشینی ئەو وایە هەر بۆیە تاقی خانەقا و ریبات لای من هێندەی دەنکە جۆیەك بەهای نییە و بە لەتە دەنکە جۆیەکی ناکڕم و بە سەکۆی خانەقا و کەناری خومی شەرابی مەیخانە رازیم، بەهەرحاڵ ئەم بەیتە بۆ من زۆرگران بوو ئێستاش هەر بەترسەوە نووسیومە. هەرچەندە واتاکەی زۆر دیارە و وەك هەموو جارێك خواجە مەبەستی لەوەیە کە عەشق و عاشقی سەرزەنشتکراو لای من لە سۆفی بوونی رواڵەتی نێوخانقاکان چاکترە و ئەمەی دووەم بە لەتەدەنکە جۆیەك ناکڕم.

**٦- جمال دختر رز نور چشم ماست مگر**

**که در نقاب زجاجی و پردهء عنبی ست**

**جەمالی دوختەری رەز نوری چەشمی ماست مەگەر، کە دەر نیقابی زوجاجی و پەردەیی ئینەبیست.**

دەڵێی جوانی کچی رەز نوری چاوی ئێمەیە، چونکە لە پەردەی شووشەیی و پەردەی ترێی دایە.

جمال: جوانی    دختر: کچ    دختر رز: تریٚ، کچی رەز، مەبەست لە تریٚ یا شەرابە    ماست: ئێمەیە    نقاب: پەردە، حیجاب    زجاجی: شووشەیی
عنب: تریٚ عنبی: ترێی

کچی رەز جارێك دەنکە تریٚ و جارێکی دیکە شەرابە، لە هەردوو جارەکەشدا وەك چاوی ئێمە وایە، بە ئاماژە بەوەی کە چاوی مرۆڤ پەردەی شووشەیی یاخود روون و ئاوی و پەردەی ترێی یاخود گۆشتی هەیە، دەڵیٚ: دەڵێی رووخساری کچی رەز لە تریٚ، شەراب، نور و تیشکی چاوی ئێمەیە ـ یاخود وەك چاومان خۆشەویستە ـ چونکە هەروەك نور و تیشکی چاوی ئێمە جارێك لە پەردەی شووشە دایە (کە شەرابە) و جارێکی دیکەش لە پەردەی ترێیی دایە و وەك ترێیە.

**٧- دوای درد خود اکنون از آن مفرّح جوی**

**که در صراحی چینی و ساغر حلبی ست**

**دەڤای دەردی خود ئەکنون ئەز ئان موفەرریح جوی، کە دەر سوراهیی چینی و ساغەری هەلەبیست.**

چارەی دەردی خۆت لەو دەرمانە وزە بەخشە بووێ (داواکە) کە لە سوراحی چینی و پەرداخی حەلەبی دایە.

دوا: چارە، عیلاج، دەوا، دەرمان   اکنون: ئێستا   مفرح: دەرمانی وزەبەخش، دڵبەهێزکەر
جوی: داواکە، بووێ   صراحی چینی: سوراحییەك کە لە چین دروستکراوە
حلبی: مەبەست لە شووشەیەکە کە لە حەلەب دروستدەکرا.

خواجە دەڵێ: گەر دەتەوێ دەرمانی دەردی خۆتت دەستکەوێ لە دەوای وزەبەخشی دڵ (شەراب)دا هەوڵی بەدەستهێنانی بدە کە ئەو شەرابەیە لە سوراحی چینی و پێکی حەلەبیدایە.

مەبەست لەوەیە کە دەوا و چارەی دەردەکانت لە عەشقدایە.

**٨- هزار عقل و ادب داشتم من ای خواجه**

**کنون که مست خرابم صلاح بی ادبی ست**

**هەزار ئەقل و ئەدەب داشتەم مەن ئەی خاجە، کونون کە مەستی خەرابەم سەلاه بی ئەدەبیست.**

ئەی خواجە (گەورە) هەزار عەقڵ و ئەدەبم هەبوو، بەڵام ئێستاکە مەستی پەرێشانحاڵم چاکتر وایە بێ ئەدەبی بکەم.

داشتم: هەمبوو   مست خرابم: مەستی لە رادەبەدەر   صلاح: موسڵەحەت، چاکتر وایە.

مەبەست لەوەیە گەر لە کاتی هۆشیاریدا لەدوای رێورەسمەکان بین لە کاتی عاشقیدا چاکتر وایە ئەو کۆت و بەندە کۆمەڵایەتیانەی کە پێیان دەگوترێ بە ئەدەبی بکشێنرێن.

**٩- بیار می که چو حافظ مدامم استظهار**

**به گریهء سحری و نیاز نیم شبی ست**

**بیار مەی کە چو هافز مودامەم ئیستیزهار، بە گریەیی سەهەری و نیازی نیم شەبیست.**

مەی بهێنە کە وەك حافز بەردەوام بە گریانی بەیانیان و راز و نیازی نیوەشەو پشت ئەستورم.

| | |
|---|---|
| بیار: بهێنە | دام: بەردەوام |
| استظهار: پشتئەستوری، پشتقایمی | گریە: گریان |
| نیاز: پێویستی، رازونیاز | نیم شب: نیوەشەو |



گریان لە ئاییینی پیرۆزی ئیسلامدا هەمیشە بە دیاردەیەکی جوان و خۆشەویست باسکراوە و بە هۆکاری نەرمبوونی دڵ و رێگە و هۆکاری رزگاربوون لە ئاگر دانراوە وەك پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ (دو چاو ئاگر زەفەریان پێ نابات، چاوێك کە لە ترسی خودا بگری..).

لای عارفەکانیش گریان هەمیشە مایەی نەرمبوونی دڵ بووە (د. هروی) نووسیویەتی کە لە (باخرزی)یەوە وەریگرتووە: باخرزی سێ پلەی بۆ گریان داناوە:

١-گریانی ترس   ٢- گریانی تاسە و ئارەزوو   ٣-گریانی خۆشی

هەندێك جۆرێکی دیکە لە گریان دەستنیشان دەکەن کە لەم سێ پلەیە خۆشەویستر و باڵاترەو بریتییە لە گریانی ویژدان و ناوەوە، ئەو کاتەی کە عارف دەگاتە (حق الیقین) یەقینی تەواو ئەم جۆرە گریانە لە ناخیدا سەرهەڵدەدات.

خواجەش لەم بەیتەدا ئەم رێزە بە گریانی سەحەران و رازونیازی نیوەشەو دەداتەوە و دەڵێ: مادام ئێمە ئەم دو چەکەمان پێ بێ لە گوناهکردن ناترسین و خودا بەم گریان و پاڕانەوەی نیوەشەوە دەمانبەخشێ.

یاخود دەکرێ مانای دروست و عیرفانی بەیتەکە بەم شێوەیە بێت:

ئێمە کە گریانی سەحەری و رازونیاز و پاڕانەوەی نیوەشەومان هەیە و پێی پشتئەستورین ئیدی ئامادەیی وەرگرتنی عەشق و مەیمان هەیە و دەکرێ بچینە نێو قۆناغەکانەوە ئەی ساقی و رابەر مەی و عەشقمان پێشکەش کە.

## غەزەلی شەست و شەشەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- خوشتر ز عیش و صحبت و باغ و بهار چیست**

**ساقی کجاست گو سبب انتظار چیست**

**خوشتەر ز ئەیش و سوهبەت و باغ و بەهار چیست، ساقی کوجاست گو سەبەبی ئینتیزار چیست.**

خۆشتر لە خۆشگوزەرانی و هاوڕێیەتی و باغ و بەهار چییە، ساقی لە کوێیە بڵێ هۆکاری چاوەڕوانی چییە.

عیش: خۆشگوزەرانی، ژیان    صحبت: هاوڕێیەتی    انتظار: چاوەڕوانی

کە بە شێوەیەکی سەرزاری لەم بەیتە و زۆربەی بەیتەکانی ئەم جۆرە غەزەلانەی کە لە بەهار ئەدوێ بکۆڵینەوە وا دەردەکەوێ کە بە راستی خواجە عەیاش بووە، هەر ئەم روانگە سەرزارەکییە بوو کە وای لە هەندێ لە رەخنەگران کرد خواجە بە کابرایەکی عەیاش بدەنە قەڵەم، لە راستیدا ئەم دیدە سەرزارییە و مەشرەبێکی نیمچە عیرفانی بەندە دەبووە مایەی ئەوەی کە لە غەزەلەکان بێزار ببم و حەز بکەم زوتر کۆتاییان پێ بهێنم. بەڵام کە بە یارمەتی فەرهەنگە تایبەتەکان قووڵتر لە بەیتەکان ورد دەبیتەوە لە لایەکەوە گەورەیی خواجە حافز و لەلایەکی دیکەوە هێز و گوڕێکی تازە و چێژ و لەزەتێکی دیکە بەم بەندەیە دەبەخشێ، لە واتای سەرزاریدا وا هەست دەکەیت کە ئەم پیاوە حەزی لە بەهار و سەیران و گەشتی سەیرانگاکان و مەی و مەیخۆری بووە، بەڵام لە عیرفاندا وشەکان ئەم واتایانەیان پێدراوە:

عیش: بەردەوامی چێژی خۆگرتن و دۆستییە لەگەڵ خوا(حەق)دا، هەروەها لە فەرهەنگەکەی (د. سەجادی) هاتووە: درکەیە لە چێژی خۆگرتن و دۆستی لەگەڵ حەقدا و هەست و ئاگایی لەو چێژەدا.

صحبت: هاوڕێیەتی و هاودەمی لای عارفەکان لە بەرامبەر تەنیاییدایە، هاوڕێیەتی لە ئادابی تەریقەتە و لە ریوایەتدا هاتوە کە موسوڵمان لەگەڵ خەڵکدا هاوڕێیەتی دەکات و ئەوانیش دۆستایەتی دەکەن (نەسەفی) دەڵێ: بزانە کە هاودەمی کاریگەری و تایبەمەندی گەورەی هەیە، هەر رێبوار (سالک)ێك کە نەگەیشتە ئامانج و ئامانجی بە دەست نەهێنا لەوەوە



بوو کە هاودەمی عاقڵێکی (رابەرێکی) نەکرد، ریازەت و خۆگرتنەوە هەمووی بۆ ئەوەیە کە رێبوار شیاوی هاودەمی رابەر و عاقڵان بکات{ سجادی}

باغ: جیهانی مەلەکوت و ئەرواح، جیهانی پاکان، روحە پیرۆزەکان

بهار: مەقامی مەعریفەت    ساقی: هۆکاری چوونە نێو جیهانی عەشقەوە، پەیوەندی

بە رەچاوکردنی واتای عیرفانی ئەم وشانە واتای بەیتەکە دەبێتە: لە نێو جیهانی پاکان و مەقامی مەعریفەتدا هاوڕێیەتی و هاودەمی پاکان و چێژ و لەزەتبردن لە دۆستایەتی لەگەڵ مەعشوقی حەقدا خۆشە، کاتێ لەم شتانە خۆشتر نییە ئیدی ئێمە چاوەڕوانی چی دەکەین بۆچی واسیتە و ساقی نایەت کە بمانخاتە نێو دونیای پاکانەوە، بڵێ هۆی ئەم چاوەڕوانییە چییە.

**٢- هر وقت خوش که دست دهد مغتنم شمار**

**کس را وقوف نیست که انجام کار چیست**

**هەر ڤەقتی خوش کە دەست دەهەد موغتەنەم شومار، کەس را ڤقوف نیست کە ئەنجامی کار چیست.**

هەرکاتێکی خۆش کە دەست بدات بە غەنیمەت بژمێرە، چونکە کەس نازانێ کە سەرەنجامی کار چییە.

مغتنم: غەنیمەت، دەستکەوت    کس: کەس

وقوف نیست: نازانێ (واقف)یش هەمان واتای هەیە، هەروەك شاعیر دەڵێ:

(گفت واقف نیستی زین مسئله)

خواجە پێیوایە کە مرۆڤ دەبێ سوود لە کاتە خۆش و بەسوودەکانی ژیانی وەرگرێت و وەك غەنیمەت و دەستکەوت سەیریان بکات و بیانقۆزێتەوە بۆ خۆشییەکانی بەیتی یەکەم، چونکە کەس نازانێ سەرەنجامی کار چی بەسەر دێ و بە کوێ دەگا، رەنگە کاتێکی لەبارتر دەست نەدات.

**٣- پیوند عمر بسته به موییست هوش دار**

**غمخوار خویش باش غم روزگار چیست**

**پەیڤەندی ئومر بەستە بە موییست هوشدار، غەمخاری خیش باش غەمی روزگار چیست.**

تەمەن بە مویەك بەستراوە ئاگاداربە، خەمخۆری خۆت بە خەمی رۆژگار چییە.

پیوند: بەستنەوە، پەیوەند    هوش دار: ئاگاداربە    غمخوار: خەمخۆر

خویش: خۆت    باش: ببە

ژیان و تەمەن هێندە تیژپەڕە و زوو دەپچڕێ هەر دەڵێی بە مویەك بە ئێمەوە بەستراوەتەوە، هەر بۆیە ئەی مرۆڤی بەدونیا هاتوو ئاگاداربە و لەم تەمەنە کورتەدا لە خەمی دونیا و ڕۆژگاردا مەبە و خەمی خۆت بخۆ و توێشویەك بۆ پاش تەمەن کۆبکەرەوە.

**٤- معنی آب زندگانی و روضهء ارم**

**جز طرف جویبار و می خوشگوار چیست**

**مەئنیی ئابی زیندەگانی و ڕۆوزەیی ئیرەم، جوز تەرفی جویبار و مەیی خوشگوڤار چیست.**

واتای ئاوی حەیات و باغی ئیرەم چییە، جگە لە کەناری جۆگە و مەیی بەتام چییە.

آب زندگانی: ئاوی ژیان، ئاوی حەیات    روضە: باغ    روضهء ارم: باغی ئیرەم

ئیرەم: شار و باخێکی گەورەبوو لە بیابانەکانی عەدەن لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا و لەلایەن (شەدادی کوڕی عاد)ەوە کە بانگەشەی خوایەتی دەکرد دوورستکرا و نێوی باپیرەی خۆی (ئیرەمی کوڕی نوح) ی لێنا، هەروەها ڕاڤەکەرانی قورئانی پیرۆز لە ڕاڤەی ئایەتی (٦ و ٧)ی سورەتی (الفجر)دا باسیان لێوەکردووە کە خودای گەورە دەفەرمووێ (الم تر کیف فعل ربك بعاد، ارم ذات العماد)، باغی ئیرەمیش ئاماژەیە بە باغی ئەو شارە و درکەیە لە خۆشترین باغی بەهەشتی سەر دونیا

جز: جگە    طرف: لا، کەنار

جویبار: جۆگە، ڕووبار    خوشگوار: خۆش

دوو شتی گرنگی نیمچە ئەفسانەیی دەست پێنەگەیشتوو کە هەموان بە هیوای بەدەستهێنانی (ئاوی حەیات) یاخود ئاوی نەمری و جاویدان بوون و بەهەشت و باغی ئیرەمن، خواجە دەڵێ: ئەم دوو شتە کە ئەفسانەیین و لای خەڵکی زۆر گرنگن، واتاکانیان جگە لە کاتێکی خۆشی نێو حاڵەتەکانی عەشق هیچی دیکە نین، لێرەدا دەیەوێ ئەوە بڵێ کە چوونە نێو عەشق و حاڵاتەکان بەدەستهێنانی خۆشی و شادییە بەدەست نەهاتووەکانە.

**٥- مستور و مست هردو چو از یك قبیلەاند**

**ما دل بە عشوەء کە دهیم اختیار چیست**

**مەستور و مەست هەردو چو ئەز یەك قەبیلەئەند، ما دل بە ئیشڤەیی کە دەهیم ئیختییار چیست.**

چۆن مەستوور و مەست هەردووکیان لە یەك قەبیلەن، ئێمە دڵ بە ناز و عیشوەی کامیان بدەین ئیختیارمان چییە.



مستور: داپۆشراو، پیاوچاك، پاك    مست: مەست، عاشق (نغرۆ بوو لە عەشقدا) عارف

قبیلە: قەبیلە، خێڵ    عیشوە: ناز، عیشوە، هونەر    دهیم: بدەین

پیاوچاك و ئەهلی تەقوا و عارفەکان لە یەك خێڵن و هەردووکیان وەك یەك وان ئیدی لەم نێوەندەدا ئێمە نازانین دڵ بە مەستوری و شەریعەت و ئەهلی تەقوا بدەین و ئەو هەڵبژێرین یاخود عارف و عاشقی و ڕێگەی تەریقەت هەڵبژێرین، ئیختیار و هەڵبژاردن چییە.

د. هروی مەستور و مەستی بە (پیاوچاك و پیاوخراپ) و سوودی بە (صالح و طالح) لێکداوەتەوە و هەردووکیان پێیان وایە کە، چونکە پیاوچاك و پیاوخراپ لە یەك قەبیلەن واتە هەردووکیان لە خێڵی ئادەمن و مرۆڤن و خودا هەموویانی دروستکردووە ئێمە نازانین کە کامیان هەڵبژێرین، بەڵام ئەم واتایە واتای سەرزارەکی (مەست)ە، چونکە مەست لە عیرفاندا بۆ عارفەکان بەکاردێ.

**٦- راز درون پردە چە داند فلك، خموش**

**ای مدعی نزاع تو با پردەدار چیست**

**ڕازی دەرونی پەردە چە دانەد فەلەك، خەموش ئەی موددەئی نیزائی تو با پەردەدار چیست.**

گەردوون کەی نهێنی نێو پەردە دەزانێ، بێدەنگبە ئەی مودەعی، نیزاع و شەڕی تۆ لەگەڵ پەردەداردا چییە.

راز: نهێنی    درون: نێو    پردە: پەردە

چە داند: کەی دەزانێ، چی دەزانێ    خموش: بێدەنگ بە

مدعی: مودەعی، مرۆڤی بانگەشەکەری هیچ لە باردانەبوو، لە بەیتەکەدا مەبەست لەو نجومگەرانەیە کە پێیان وایە لە ڕێگەی نجومگەرییەوە دەتوانن پەی بە نهێنییەکانی جیهانی باڵا ببەن و پێشبینی چارەنووسی مرۆڤ بکەن    نزاع: نیزاع، شەڕ

پردەدار: پەردەدار، خاوەن پەردە، ئەو کەسەی کە ئاگاداری پەردەیە، لە بەیتەکەدا مەبەست لە خودایە کە پەردەی بەسەر نهێنییەکاندا کێشاوە و تەنێ خۆی دەزانێ چیان لە ناودایە

خواجە دیسانەوە دژایەتی خۆی بۆ ئەستێرەگەری دووپات دەکاتەوە و دەڵێ: گەردوون و فەلەك چۆن و کەی نهێنییە خوداییەکانی پشتی پەردە دەزانێ و لێیان ئاگادارە تاوەکو بە هۆی ئەوەوە ئێمە لە چارەنووسی خۆمان ئاگادار ببینەوە، ئیدی ئەو ئەستێرەگەرەی کە بانگەشەی ئەو شتانە دەکەی بێدەنگبە، چونکە هیچت لەباردانییە و هەمیشە ئەم قسانە

دەکەی کە گوایە چارەنووس لە دەستی گەردووندایە. ئەریّ تۆ شەرت لەگەڵ پەردەدار (خودا)دا چییە وا دان بە دەسەڵاتیدا نانێیت.

**٧- سهو و خطای بنده گرش هست اعتبار**

**معنی عفو و رحمت آمرزگار چیست**

**سەهڤو خەتای بەندە گەرەش هەست ئیئتیبار، مەئنیی ئەفڤو رەحمەتی ئامورزگار چیست.**

گەر هەڵە و تاوانی بەندە لای ئەو بەها و ئیعتیباری هەیە، واتای لێخۆشبوون و میهرەبانی غەفور و غەففار (کەسیّ کە لێخۆشبوونی هەیە) چییە.

سهو: هەڵە خطا: تاوان اعتبار: بەها، ئەرزش

آمرزگار: غەفار، چاوپۆشیکەر، یەکێکە لە ناو و سیفاتەکانی خودای گەورە

خواجە لێرەدا ئەو راستییە دەخاتەڕو کە هەڵە و تاوانی بەندە لای خودا هیچ بەها و ئەرزشێکی نییە، چونکە گەر هەبێت و خوا بە بەهاوە لە هەڵە و تاوانی بەندەکانی بڕوانێت و هەمیشە لە کەمیندا بێت بۆیان تاوەکو سزایان بدات ئیدی مانایەك بۆ لێخۆشبوون و رەحمەتی ئەو نامێنێتەوە، ئەمە بەرپەرچدانەوەی ئەو وێناکردنەیە کە تا ئێستاش لە نێو زۆرینەدا باوە و خودا وەك پۆلیسێك وێنادەکەن کە لە دوای بیانویەکی بچووك بگەڕێ بۆ سزادان، لە مەسەلەی بەخشینی تاوان و هەڵەکردندا ئایەت و فەرموودەی زۆرمان هەیە کە راشکاوانە باس لە چاوپۆشی خودا دەکەن لە تاوانی بەندە، چونکە خودا تەنیا لە شەریکقەراردان خۆش نابێت و جگە لەو لە گشت تاوانیّ خۆش دەبیّ، ئەمە بە رەچاوکردنی ئەو وردەکاریانەی کە لە تاوانە مرۆیەکاندا هەیە، واتە کاتیّ مافی خەڵکی بەسەر تاوانبارەوە هەیە کە مەسەلەیەکی دوورودرێژەو لێرە جێگای باسکردنی نییە ـ هەروەك لە ئایەتی ٤٨ و ١١٦ سورەتی (النساء) دەفەرموویّ: "ان الله لا یغفر ان یشرك به و یغفر ما دون ذلك لمن یشاء" هەروەها لە سورەتی (الزمر) ئایەتی (٥٣) دا زۆر بە نەرمی و روونی دەفەرموویّ: "قل یا عبادي الذین اسرفوا علی انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ان الله یغفر الذنوب جمیعا انه هو الغفور الرحیم". واتە ئەی محمد (د.خ) پێیان بڵیّ: ئەی بەندەکانم، ئەوانەی کە ئیسرافتان لەسەر نەفسی خۆتان کردووە ـ گوناهتان لە رادەبەدەرە ـ بیّ هیوا مەبن لە میهرەبانی و رەحمەتی خودا، خودا چاوپۆشی لە هەموو گوناهەکان دەکات، ئەوە کە چاپۆشیکەر و میهرەبانە .

هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویّ: "کل بنی آدم خطاء و خیر الخطائین التوابوون" ئیدی لە نێو قورئان و فەرموودە و قسەی عارفەکاندا سەبارەت بە بەخشین و میهرەبانی خودا



هێندە جوانی دەبیستین وا گومان دەبەین کە گەر دوژمنایەتییەکی گەورە لەگەڵ خودادا نەکەیت ئەو بە میهرەبانی خۆی لە هەمووان خۆش دەبیّ.

خواجەش هەر ئەمە دەڵیّ کە لای خودا هەڵە و تاوان هیچ بەها و ئەرزشێکی نییە، چونکە گەر هەبیّ مانا جوانەکانی خودایەتی ئەو لەکەدار دەبن، ئەم بەیتە کە لە شێوەی پرسیاریشدا دەگوترێت رەتکردنەوەی ئەو بیرە باوە نازانستی و نائاگایانەیە کە کۆلکە مەلاکانی ئێستاش خەڵکی پیّ تەڵقین دەدەن نەوەك گومان لە جوانییەکانی خودا، حاشا . میسراعی دووەمی ئەم بەیتە لە نوسخە دێرینەکاندا بەم شێوەیە: معنی لطف و رحمت پرودگار چیست.

**٨- زاهد شراب کوثر و حافظ پیاله خواست**

**تا در میانه خواستهء کردگار چیست**

**زاهید شەرابی کەوسەر و هافز پیالە خاست، تا دەر میانە خاستەیی کردگار چیست.**

زاهید شەرابی کەوسەر و حافز پیاڵەی ویست، تا ببینین لەم نێوەندەدا ویستی کردگار چییە.

کوثر: کەوسەر، حەوزی کەوسەر، یا جۆگەی کەوسەر کە لە بەهەشتدایە خواستە: ویست

خواجە دەڵیّ: زاهید عەشق و شەرابەکەی خستە ئەو دونیا، بەڵام حافز هەر لێرە رێگای عەشقی گرتەبەر و داوای پیاڵەی کرد تا بزانین ویست و مەشیئەتی ئیلاهی چییە و ئەو چی دەوێت و چی دەکات و فەرمانی بە چییە. کامیان بە نسیبی کامیان دەکات؟.

## غەزەلی شەست و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- بنال بلبل اگر با منت سر یاری ست**

**که ما دو عاشق زاریم و کار ما زاری ست**

**بناڵ بوولبوول ئەگەر با مەنەت سەری یاریست، کە ما دو ئاشقی زاریم و کاری ما زارییست.**

ئەی بوولبوول گەر مەبەستت هاوڕێیەتی کردنی منە بناڵێنە، چونکە ئێمە دوو عاشقی بێ هێز و لاوازین و کارمان زارییە.

بنال: بناڵێنە   با منت: لەگەڵ مندا   یاری: هاوڕێیەتی، هاودەمی   سر یاری: مەبەست و قەسدی هاوکاری و هاوڕێیەتی   زار: لاواز، بێ هێز، بێ توانا   زاری: زاری، گریان

لەم بەیتەدا خواجە دوو سیفاتی هاوبەشی عاشقان دەخاتەڕوو کە بێ توانایی و گریانن و بە بوولبوول کە ڕەمز و جەڤەنگی عەشق و عاشقییە دەڵێ: گەر بە نیازی لەگەڵ مندا ببیە هاودەم و دۆست دەبێ بناڵێنی، چونکە ئێمە هەردووکمان بێ تواناین و کارمان ناڵە و گریانە و هەر ئەوەمان لەدەست دێ.

**٢- در آن زمین که نسیمی وزد ز طُرّهء دوست**

**چه جای دم زدن نافەهای تاتاری ست**

**دەران زەمین کە نەسیمی ڤەزەد ز توررەیی دوست، چە جای دەم زەدەنی نافەهای تاتاریست.**

لەو سەرزەوییەی کە لە پرچی دۆستەوە شەماڵێك هەڵکات، چ جێگەی لافلێدانی ئاسکە تاتاریەکانە.

نسیم: شەماڵ   وزد: هەڵبکات   دم زدن: لاف لێدان

نافە: کیسەیەکە هێندەی نارنجێك کە لە ژێر سکی نێرینەی ئاسکی خوتەندا هەیە و دەکرێتەوە و مادەیەکی قاوەیی بۆنخۆش ی چەوری (میسك)ی تێدایە، ئاسك

نافەهای تاتاری: ئەو ئاسکانەی کە لە تاتارستان دەژین، ژینگەی ئاسکی میسکداری خەتاو خوتەن و تاتارستان بووە





خواجە وەسفی بۆنی خۆشی پرچی یار دەكات و دەڵێ: گەر لە شوێنێكدا شەماڵ بۆنی پرچی دۆست بڵاوبكاتەوە هێندە بۆنخۆشە ئیدی تەنانەت ئەو ئاسكانەشی كە لە تاتارستان دەژین و بۆنخۆشترین میسكیان هەیە ناتوانن لافی بۆنخۆشی میسكەكەیان لێبدەن و هیچ بۆنێكی خۆشی ئەم دنیایە ناگات بە بۆنی خۆشی پرچی دۆست.

**٣- بیار باده كه رنگین كنیم جامهء زرق**

**كه مست جام غروریم و نام هشیاری ست**

**بیار بادە كە ڕەنگین كونیم جامەیی زەرق، كە مەستی جامی غووریم و نام هوشیاریست.**

شەراب بهێنە تا كراسی ریای خۆمان رەنگین كەین، چونكە مەستی جامی غوورین و وادەزانین هۆشیارین.

بیار: بهێنە     رنگین: رەنگاوڕەنگ، رەنگدار

جامە: كراس، خرقە، (كراسشۆردن و رەنگینكردنی) واتە لادانی سیفەتە نزم و خراپەكان

زرق: نیفاق و دووڕوویی و ریا، واتە لە رووخساردا خۆ بەچاك خستنەڕوو، بەڵام لە ناوەوەدا خراپ و دوژمن.

(جامەی زرق خرقەی ریا و تزویر) لای خواجە زۆر دووبارە دەبێتەوە و رەخنەیان لێ دەگیرێت بێگومان كراس هەمیشە رووكاری دەرەوەیە بەم واتایە رەخنەی خواجە بۆ هەموو دووڕووەكانی دونیایە بە بێ دیاركردنی چین و توێژی تایبەتی، بەڵام جامە ـ بە واتای خرقە ـ گوتارەكە سنووردار دەكاتەوە بۆ توێژێكی تایبەتی نێو بزاڤە ئایینییەكان بە تایبەتی ئیسلامیی كە ئەویش (سۆفی)یە، كەواتە بەیتەكە رەخنەیە لە سۆفییەكان، ئەو سۆفی و شێخانەی كە بە درۆوە خۆیان كردووەتە زاهید و پیرۆز و بڕوادار، بەڵام لە ناخیاندا درۆزن و ریاكارن. (بادە) لە زاراوەی سۆفیگەریدا عەشقە، حافز روو بە شێخ و سۆفییە درۆزنەكان دەڵێ: عەشق بهێنە ئەی ساقی تا ئەم خرقەی ریاكاری و تەزویر و دووڕوییەی خۆمان رەنگ كەین و بیشۆینەوە یاخود عەشق بهێنە تا ئەم سیفەتە سووكەی دووڕوویی لە خۆمان داماڵین كە ئێمە مەستی غرورین. واتە خۆبەزلزانی مەغرورانە هێندە مەستی كردووین عەقڵمان لەكاركەوتووە كەچی خۆمان بە هۆشیار دەزانین و ناوی هۆشیاری لێنراوە.

**٤- خیال زلف تو پختن نه كار خامان است**

**كه زیر سلسله رفتن طریق عیّاری ست**

**خیاڵی زولفی تو پوختەن نە كاری خامانەست، كە زیری سیلسیلە رەفتەن تەریقی ئەییاریست.**



ئارەزووی گەیشتن بە زوڵفی تۆ كاری كاڵفامان نییە، چونكە چونە ژێر زنجیر شێوە و شێوازی عەیار و بێ باكانە.

پختن: ئامادەكردن، لە راستیدا (پختن) واتە گەرمكردنەوە یاخود لێنان یان ئامادەكردن یان گەیشتن، لێرەدا خیاڵ زلف تو پختن: خەیاڵی گەیشتن بە زوڵفی تۆ

خامان: كۆی (خام) واتە كاڵفام، هەرزە     سلسلە: زنجیر

عیار: عەیار، توێژێكی كۆمەڵایەتی بوون لە ئێراندا كە مرۆڤی ورت و وریا و زیرەك و بێ باك بوون، سیفەتی مەردایەتی، نهێنیپارێزی، دەستگرۆیی نەدار و بێ چارەكان، ئەمانەتداری و پەیمانپارێزییان هەبووە فرت و فێڵیشیان هەبووە. لە حافزدا عەیاری بە زۆری بە واتای زیرەكی و فیداكاری و رێگری و بێ باكانە كوشتن دێت كە دوانی دوایی زیاتر سیفەتی یارن.

خواجە دیلبوون لە زنجیری زوڵفی یار و كەوتنە نێو زنجیر وەك یەك سەیر دەكات و بۆ هەردووكیان ئازایەتی و بێباكی و فیداكاری بە پێویست دەزانێ لەم دوو چوونە نێو زنجیرەشدا دوو كۆمەڵە مرۆڤ دەهێنێتەوە كە كاڵفام و هەرزەكان و بێ باكەكان یا فیداكارەكان (عەیارەكان)ن و پێیوایە كە تەنیا عەیارەكانن دەتوانن بچنە نێو زنجیر. بۆیە دەڵێ: خەیاڵی گرفتاربوون بە زنجیری زوڵفی تۆ ئەی دۆست و یار كاری مرۆڤە كاڵفام و پێنەگەیشتووەكان نییە، چونكە چوونە نێو زنجیر كار و رێگەی بێ باك و فیداكارانە و چوونە نێو زنجیری زوڵفی تۆش هەروایە.

**٥- لطیفەیی ست نهانی كه عشق ازان خیزد**

**كه نام آن نه لب لعل و خطّ زنگاری ست**

**لەتیفەییست نەهانی كە ئیشق ئەزان خیزەد، كە نامی ئان نی لەبی لەئل و خەتتی زەنگاریست.**

نوكتەیەكی پەنهانی هەیە كە عەشق لەوەوە سەرچاوە دەگرێ (سەرهەڵدەدات) كە ناوی ئەو نە لێوی سوور و نە خەتی سەوزەیە.

لطیفە: نوكتە، سەنجڕاكێشی، لە سۆفیگەریدا ئاماژەی ورد و دەقیقە كە لێیەوە مانا بكەوێتە زەینەوە، بەڵام نەتوانرێ دەربڕێت     نهانی: شاراوەیی، پەنهانی

از ان: لەوەوە     خیزد: هەستان، لێرەدا واتە سەرچاوەگرتن، سەرهەڵدان

لعل: سوور     خط: خەت، موی رووخسار

زنگار: رەنگی مادەی زنگار كە سەوزێكی مەیلەوشینە، سەوزە

خط زنگاری: موی نەرمی سەوزەی سەر رووخسار، گەندەموی تازە دەرهاتوو

لەم بەیتە و لە بەیتی (٦)دا خواجە مەسەلەیەکی گرنگ دەخاتەڕوو کە ئەویش حەقیقەتی عەشقە بە شێوەیەکی گشتی، ئەو پێیوایە کە عەشق لە ئاماژەیەکی ورد و دەقیقی نادیاری زەینییەوە سەرچاوە دەگرێ کە ناکرێ یاخود ناتوانرێ بە وردی دەستنیشان بکرێ، لێرەشدا جیاوازی لە نێوان حەزی جەستەیی و عەشقدا دەکات، چونکە دڵنیایە لەوەی کە ئەو نوکتە باریك و ئیشارەتە وردەی عەشق لێوی سوور و گەندەموی سەر رووخسارە سەوزەڵەکان نییە، چونکە ئەمەی دوایی حەزی جەستەیی لێوە سەرهەڵدەدات نەوەك عەشق، خواجە دەڵێ: لەتیفەو ئاماژەیەکی وردی نادیار و پەنهان هەیە کە عەشق لەوەوە سەرهەڵدەدات کە بێگومان نێوی ئەو لەتیفە نادیارە لێوی سوور و خەت و گەندەموی سەر رووخساری تازە پێگەشتوی سەوزەڵە نییە. لەسەر بنەمای ئەم بەیتە لە بەیتی دواییدا درێژە بەم مەسەلەیە دەدات:

**٦- جمال شخص نه چشم است و زلف عارض و خال**

**هزار نکته درین کار و بار دلداری ست**

**جەمالی شەخس نە چەشمەست و زولف و ئاریز و خال، هەزار نوکتە دەرین کار و باری دلداریست.**

جوانی مرۆڤ نە چاوە و نە زلف و نە رووخسار و نە خاڵ، بەڵکو هەزار نوکتە و خاڵی ورد لە مەسەلەی عەشق و دڵڕفاندندا هەیە.

عارض: رووخسار، گۆنا   درین: لەم   دلداری: دلداری، کەسێك دڵی بۆ لای خۆی راکێشابێت.

خواجە لە درێژەی رایەکەی خۆیدا دیسانەوە دەڵێ: جوانی مرۆڤ کە ببێتە مایەی دڵڕاکێشانی کەسانی دیکە بۆ لای خۆی چاو و پرچ و رووخسار و خاڵ نییە، بەڵکو لەم مەسەلەی دڵداری و عەشق و دڵڕفاندنەدا هەزار نوکتە و مەسەلەی وردی دیکە هەیە، کە ئەسڵەن پەیوەندییان بە جوانییە دەرەکییەکانی مرۆڤەوە نییە.

**٧- برهنگان طریقت به نیم جو نخرند**

**قبای اطلس آن کس که از هنر عاری ست**

**بەرەهنەگانی تەریقەت بە نیم جو نەخەرەند، قەبای ئەتلەسی ئان کەس کە ئەز هونەر ئاریست.**

داڕنراوانی تەریقەت بە نیو جۆ ناکڕن کراسی (قبا- کەوا)ی ئەتڵەسی ئەو کەسەی کە بێ مەعریفە و هونەرە.

برهنگان: داڕنراوان، موجەڕەدان، یاخود تجرید: داڕنین لە عیرفاندا بریتییە لە خاڵی بوونەوەو داڕنینی رێبواری تەریقەت لە دونیا و هەرچی جگە لە خودایە هەروەها تجرید بە واتای خاڵی



بوونەوەی دڵ و سەری رێبوارە لە جگە لە خودا (فخلع نعليك) واتە پێویستە ئەوەی کە بەندە لە خودا دووردەخاتەوە لە خۆی داڕنێت. لە بەرامبەر ئەمەشدا نابێ بەندە بە هیوای پاداشت بێت، چونکە ئەوە تیجارەت و بازرگانییە نەوەك تەجرید {سجادی} کەواتە برهنگان طريقت (مجردان طريقت ـ لە هەندێ نوسخەدا): ئەو رێبوارانەن کە خۆیان دادەڕنن لە هەموو شتە دونیاییەکان تەنانەت دواییەکانیش. لە نوسخەی خلخالی و سودی دا لە بری مجردان طريقت (قلندران حقيقت) هاتوە کە هەمان واتا دەگەیەنێ

جو: جۆ   نخرند: ناکڕن

قبا: قەبا، کەوا، جۆرە کراسێکی بێ یەخەیە کە پێشەوەی کراوەیە و بە دوگمە پێکەوە دەبەسترێتەوە، پێم وابێ کەوای جافی هەمان قەبا بێت.

اطلس: ئەتڵەس، ئاوریشم، جۆرێکە لە قوماش کە ئاوریشمە، رەنگە ئەو قوماشە ئەتڵەسە نەبێت کە لە سەردەمی ئێمەدا هەیە.

هنر: هونەر، مەعریفەت و فەزیلەت   عاری: روت، داڕنراو

از هنرعاری ست: لە هونەر و مەعریفە خاڵییە، بێ هونەر، بێ مەعریفەت

لای قەلەندەرەکانی تەریقەت ئەوانەی بە مەرتەبە و پلەی تەجرید گەیشتون خۆیان لە دونیاو گشت تایبەتمەندییەکانی دونیا داڕنیوە، تەنیا بەها و ئەرزشی مەعریفەت و هونەریان لایە و جگە لەم مەعنەویاتە هیچ شتێکی مادییان بەلاوە هیچ نییە، هەروەك خواجە دەڵێ: قەلەندەران یاخود موجەڕەدەکانی تەریقەت و حەقیقەت کراس و کەوای ئاوریشمی پیاوی بێ هونەر و بێ فەزڵ و مەعریفەت بە نیو جۆ ناکڕن، واتە بەهای نیودەنکە جۆی بۆ دانانێن.

**٨- بر آستان تو مشکل توان رسید آری**

**عروج بر فلك سروری به دشواری ست**

**بەر ئاستانی تو موشکیل تەڤان رەسید ئاری، ئوروج بەر فەلەکی سەرڤەری بیە دشڤاریست.**

گەیشتنە بەر دەرگای تۆ زەحمەتە ئەرێ، بڵندبوونەوە بۆ گەردوونی سەروەری زۆر ناڕەحەتە.

مشکل: زەحمەت، ناڕەحەت، گران

رسید: گەیشت مشکل توان رسید: بە ناڕەحەتی گەیشتن

عروج: بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، بڵندبوونەوە بۆ ئاسمان، میعراج

بر: بۆ   فلك: گەردوون، ئاسمان

بە یار دەڵێ: دەرگای تۆ وەك ئاسمانێکی بەرز و بڵند وایە و پێویستە بۆی بەرزبینەوە و میعراجی بۆ بکەین، بەڵام ئەم بەرزبوونەوەیە کارێکی زۆر زەحمەت و نارەحەتە، چونکە گەیشتن بە دەرگای تۆ گەیشتنە بە گەردوونی سەروەری.

مەسەلەیەکی گرنگ لە بەیتەکەدایە کە (عروج ـ معراج)ەو، مەسەلەی میعراجی پێغەمبەر (د.خ) بیر دەخاتەوە و کارێکی زۆر زەحمەت بوو کە تیایدا هیچ هۆکار و ئامێرێك بەکارنەهاتووە و بە فەرمان و دەسەڵاتی خوا کراوە، گەر لە واتای زمانی (عروج) دەرچین ئەوا بەیتەکە ئاماژەیە بە گەیشتن بە دەرگا و ئاستانەی پەروەردگار کە ئەمەش وەك عروج و میعراج لە لایەکەوە نارەحەتە و لە لایەکی دیکەوە تەنیا نزیکی دڵ و قەلبی ئەوێ.

**٩- سحر کرشمهء حسنت به خواب می دیدم**

**زهی مراتب خوابی که به ز بیداری ست**

**سەهەر کریشمەیی هوسنەت بە خاب می دیدەم، زەهی مەراتبی خابی کە بیە ز بیداریست.**

سەحەر نازی جوانیتم لە خەودا دەدی، بەه بەه لە پلە و مەرتەبەی خەوێك کە چاکترە لە بێداری.

کرشمە: ئیشارەت و عیشوە، ناز      خواب: خەو      زهی: بۆ ئافەرین و ستایشە، بەه بەه

خواجە لە سەحەردا کە خەوی لێکەوتووە ناز و کریشمەی جوانی یاری بینیوە هەر بۆیە ئافەرین و ستایشی پلە و مەقامی ئەو خەوە دەکات کە چاکترە لە بێداری، چونکە تیایدا کریشمە و نازی جوانی یاری دیوە لە کاتێکدا لە بێداریدا نایبینێ.

**١٠- دلش به ناله میازار و ختم کن حافظ**

**که رستگاری جاوید در کم آزاری ست**

**دلەش بە نالە مەیازار و خەتم کون هافز، کە رەستگاریی جاڤید دەر کەم ئازاریست.**

حافز بە ناڵە دڵی ئازار مەدە و کۆتایی پێ بهێنە، چونکە رزگاری هەتاهەتایی (جاویدانی) لە کەم ئازاردانی خەڵکیدایە.

میازار: ئازار مەدە      ختم کن: کۆتایی پێ بهێنە      رستگاری: رزگاری، نەجاتی      جاوید: هەتاهەتایی      کم آزاری: کەم ئازاردان

خواجە لەم بەیتەدا ئاماژە بە بنەمایەکی گرنگی پێکەوەژیان دەکات کە ئازارنەدانی کەسانی دیکەیە، ئەگەر ئەو ئازاردانەش بە گریان و ناڵەبێت، هروی دەڵێ: رەنگە لەو کاتەدا کۆمەڵگە هێندە ئازاردانی یەکتری تێدابووە نەیتوانیوە کۆمەڵگەیەك بهێنێتە پێشچاوی کە بە



تەواوی لە ئازار خاڵی بکرێتەوە بۆیە بە کەم ئازاردان رازی دەبێ یاخود هەر باوەڕی وایە کە کۆمەڵگە ناگاتە پلەیەك کە ئازاری تێدا نەمێنێ. {هروی ج١، ل٣٠٥}

بەهەرحاڵ حافز بەخۆی دەڵێ: ئەی حافز بێدەنگبە و تەواوی بکە و دڵی بە ناڵە و گریانی خۆت ئازارمەدە (بێگومان ئەو لێرەدا یارە کە دڵی بە ناڵەی شاعیر ئازار دەدرێ)، چونکە رزگاری و نەجاتی هەتاهەتایی لەکەم ئازاردانی خەڵکیدایە.

لە راستیدا ئەم مەسەلەی ئازاردانەدانی خەڵکی و بەستنەوەی بە رزگاربوون و نەجاتی هەتاهەتاییەوە لای حافز وەك بنەمایەکی رەزامەندی خودایی سەیر دەکرێ و لە چەند شوێنێکی دیکەشدا هاتووە کە لە شوێنی خۆیاندا ئاماژەیان پێ دەکەین.

## غەزەلی شەست و هەشتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١- یا رَبّ این شمع دل افروز ز کاشانهء کیست**

**جان ما سوخت بپرسید که جانانهء کیست**

**یا رەب ئین شەمئی دل ئەفروز ز کاشانەیی کیست، جـانی مـا سـوخت بپورسـید کـە جانانەیی کیست.**

خوایە ئەم مۆمە دڵڕووناککەرەوەیە لە ماڵی کێوەیە، کە گیانی ئێمەی سووتاند بپرسن کە ئازیزی کێیە.

یا رب: خوایە، ئەم دەربڕینە بۆ نزاکردن یاخود سەرسوڕمان بەکاردێت، لێرەشدا بە واتای دوەم بەکارهاتووە      دل افـروز: دڵ ڕۆشـنکەرەوە، دڵڕووناککـەرەوە، ڕوونـاکی بەخـشی دڵ
کاشانە: ماڵ، ماڵی زستانی      کیست: کێیە

سوخت: سووتا، سووتاند، لە زمانی فارسیدا کۆمەڵێ کار هەن کە لە هەمانکاتدا تێپـەڕ و تێنەپەڕن و بە پێی ڕستەکە ماناکەیان دەگۆڕێت ـ کە ئەم دیاردەیە لە کوردیدا نییە ـ و پێیـان دەگوترێ (فعلی ذو وجهین) (سوخت)یش لەو جۆرە کارانەیە بەڵام لەم بەیتەدا تێپەڕە و بە واتای (سووتاند)دێ      بپرسید: بپرسن      جانانە: خۆشەویست، مەعشوق.

بەیتەکە لە شێوەی پرسیاردا هاتووە و مەبەست لێی سەرسوڕمانە، خواجە بە مەعشوق دەڵێ: یا ڕەب، خوایە ئەم مەعشوقەی کە دەڵێی مۆمە و مایەی ڕووناکی دڵانە و دڵان ڕۆشن دەکاتەوە لە ماڵی کێیەوەیە ـ یاخود وەك سودی دەڵێ: منالی کێیە {ج١، ل٤٣٠}ـ کە گیانی ئێمەی لە شەوق و ئارەزوویدا سووتاند، بپرسن بزانن ئازیز و مەعشوقەی کێیە.

**٢- حالیا خانه برانداز دل و دین من است**

**تا در آغوش که می خسبد و همخانهء کیست**

**هالیا خانە بەرئەندازی دل و دینی مەنەست، تـا دەر ئاغوشـی کـە مـی خوسـبەد و هەمخانەیی کیست.**

ئێستا ماڵوێرانکەری دڵ و دینی منە، نازانم لە باوەشی کێدا دەخەوێت و هاوماڵی کێیە.

حالیا: ئێستا      برانداز: تێکدەر، کاولکەر



خانە برانداز: ماڵکاولکەر، ماڵوێرانکەر      آغوش: باوەش
کە: کێ      می خسبد: دەخەوێت

هم خانە: هاوماڵ، واتە لەگەڵ کەسێکدا یەك ماڵیان هەیە، پێکەوەبوون، هاوماڵ لە کوردیدا بە واتای دراوسێ دێت، بەڵام لێرەدا ئەم واتایە ناگەیەنێت.

میسراعی دووەمی ئەم بەیتە لە نوسخە دێرینەکانی (عیوضی) و سودی دا(تا هم آغوش کە می باشد و همخانەء کیست)ە، بەڵام لێرەدا پشت بە(خلخالی) بەستراوە کە قزوینی و خرمشاهیش پەیڕەوییان لەو کردووە.

خواجە دەڵێ: ئەو یارەی کە ئێستا بووەتە ماڵوێرانکەری دڵ و دینی من نازانم ئاخۆ ئێستا لە باوەشی کێدا دەخەوێت و لە ماڵی کێیە.

سودی دەڵێ: ڕەخنە لە خواجە دەگیرێ کە چۆن بە گومانەوە یاری کردووەتە هاوسەرینی خەڵکی دیکە و، کۆمەڵێ بیانوو دەهێنێتەوە کە ڕەنگە توڕەبووبێت، بەڵام دیسانەوە پاساو دەهێنێتەوە کە لە باوەشی کێدا مەبەست لە دایك و باوکیەتی. بەڵام لەبەر پاراستنی جوانی بەیتەکە خۆدوورخستنەوە لەم وردکردنەوە و وێناکردنە بێزارکەرانە پێویستە، هەروەك خودی سودی دەڵێ: واتە منی بەرباد و وێران کردووە ئاخۆ کێی ئاوەدان کردۆتەوە.

**٣- بادهء لعل لبش کز لب من دوور مباد**

**راح روح که و پیمان ده پیمانهء کیست**

**بادەیی لەئلی لەبەش کەز لەبی مـەن دوور مـەباد، راهـی رەوهـی کـەڤو پەیمانـدەهی پەیمانەیی کیست.**

شەرابی لێوی سووری کە خوانەکا لە لێوی من دوورکەوێتەوە، ئارامبەخشی گیانی کێیە و لەگەڵ پێکی شەرابی کێدا پەیمانی وەفاداری بەستووە.

بادە: شراب      کز لب من دوورمباد: کە خوا نەکات لە لێوی من دووربێ
راح: شادومانی، ئارامی، چالاکی، شەراب      راح روح: ئارامبەخشی گیان، شەرابی گیان
پیمان دە: وەفادار، پەیمان بەست      پیمانە: پێك

خواجە لە وەسفی لێوی یاری نادیاریدا دەڵێت: شەرابی لێوی سووری یاخود شەرابی سووری لێوی (کە خوانەکا لە من دووربێ) وزەبەخش یاخود ئارامبەخشی گیانی کێیە، یاخود شەرابی گیانی کێیە و لەگەڵ کێدا پەیمانی وەفاداری بەستووە کە هاوپێکی بێت.

**٤- دولت صحبت آن شمع سعادت پرتو**

**باز پرسید خدا را که به پروانهء کیست**

**دۆوڵەتی سوهبەتی ئـان شـەمئی سـەئادەت پـەرتوۋ، بـاز پورسـید خـودا را کـە بـە پەرڤانەیی کیست.**

بۆ خاتری (لەڕای خوا) دیسانەوە بپرسن کە بە مۆڵەتی کێ دەتوانرێ نیعمەتی هـاودەمی و هاوژیانی ئەو مۆمە بە دەست بهێنرێ کە پرتەوی خۆشبەختی دەداتەوە.

دولت: نیعمەت، سەروەت    صحبت: هاودەمی، هاوژیانی

سعادت: خۆشبەختی    باز: دیسان    پرسید: بپرسن، هەوڵ بدەن

خدارا: بۆخاتری خودا    پروانە: مۆڵەت، ئیجازە، ئیزن

لە ڕێی خودا، چاکەیەك بکەن و دیسانەوە هەوڵدەن تا روونببێتەوە کە ئایا مۆڵەتی ڕێگـەی گەیشتن و بەدەستهێنانی خۆشبەختی هـاودەمی ئـەو لای کێیـە و دەبـێ بـە پرسـی کـێ ئـەو خۆشبەختییە بەدەست بهێنین {خرمشاهی، ج ١، ل٣٥٦}.

**٥- می دمد هرکسش افسونی و معلوم نشد**

**که دل نازک او مایل افسانهء کیست**

**می دەمـەد هەرکەسـەش ئەفـسونی و مـەئلوم نەشـود، کـە دلی نـازکی ئـو مـایلی ئەفسانەیی کیست.**

هەر کەس جادوویەکی بەگوێدا دەخوێنی (دەکا) و ئاشکرانەبوو کە دڵی ناسکی ئەو مەیلی بە لای قسە ئەفسانە ئامێزەکانی کێوەیە.

دمیدن: فوکردن، هەڵکردن، هەڵخەڵەتاندن بە قسەی لوس

افسون: فێڵ، مەکر    معلوم نشد: ئاشکرانەبوو.

د.هروی دەڵێ: لە زۆربەی نوسخەکاندا لە بری (می دمد) (می دهد) هاتووە، بەڵام لەبەر پەیوەندی نێوان (مەکر و فوکردن)دا گومانی تێدانییە کە (می دمـد) راسـتە کـە نوسـخەی (سودی)یە، وەك لە نێوان جادووبازەکاندا رەسمە کە کاتێ جادوو دەکەن بەکرە یاخود دەزویەك گرێ دەدەن و فوی پێدادەکەن {هروی، ج١، ل٣٠٨}. هەروها (خرمشاهی) یـش دەڵـێ: لـە نوسخەی قەزوینی، جلالی نائینی، نزیر احمد، عیوضی ـ بهـروز، قدسـی، انجـوی، پـژمان دا هەموویان (می دهد) یان هێناوە تەنیا سودی و خانلری (می دمد) یـان هێنـاوە کـە ئەمـە راستە (ئەمەش بـە بەڵگـەی ئـەوەی کـە ئەفـسوون و جـادوو دەرچـوونە (دمیـدن) نـەوەك پێـدان(دادن){خرمـشاهی، ج١، ل٣٥٦}، شـایانی تێبینییـە کـە (عیوضـی) لـە نوسـخە نوێیەکەی خۆیدا (می دمد) ی نووسیوە{بڕوانە:دیوان حافظ، د. رشید عیوضی، غزلی٦٨}.



لێرەشدا خواجە دەڵێ: هەر کەسێك جادوویەك دەخوێنێ و فودەکا بەو یارە نادیارەدا تاوەکو جادووەکەی سەربگرێت و دڵی یار بۆ خۆی راکێشێ و فریوی بدات، بەڵام ئاشکرانەبوو کە دڵـی ناسکی ئەو ئازیزە مایلی ئەفسانە و جادووی کێ بووە و کاریگەری تێکردووە.

**٦- یا رب آن شاهوش ماهرخ زُهرەجبین**

**دُر یکتای که و گوهر یکدانهء کیست**

**یا رەب ئان شاهڤەشـی مـاهروخی زوهرەجـەبین، دووری یـەکتای کـە ڤـو گۆوهـەری یەکدانەیی کیست.**

خوایە ئەو پاشا ڕەفتـارە رووخـسار مانگـە ناوچـاو زوهرەیـە، دووری گرانبـەهای کـێ و گەوهەری بێ هاوتای کێیە.

آن: ئەو    شاهوش: شێوەپاشا، بەڵام د.هروی بە پاشـاڕەفتار لێکـی داوەتـەوە

ماهرخ: رووخسارمانگ، رووخسار وەك مانگ    زهرە جبین: ناوچاو زوهرە

در: دوور    در یکتا/در یتم: مراورییەك کە بە تەنیا لە سەدەفدایە، مراوری تاقانە

گوهر: گەوهەر، بەردی گرانبەها    گوهر یکدانە: گەوهەری بێشێوە، گەوهەری بێ هاوتا

دیسان لە وەسفی ئەو یارە نادیارەدا دەڵێ: خوایە ئەو ئازیزەی کە لە رفتـاردا پاشـایانەیە و رووخساری وەك مانگە و ناچاو و تەوێڵی وەك ئەسـتێرەی زوهـرە رووناکـە، دوور و گەوهـەری گرانبەها و بێ هاوتای کێیە واتە وەك دوور و گەوهەرێکی گرانبەها و بێ هاوتایە.

**٧- گفتم آه از دل دیوانهء حافظ بی تو**

**زیر لب خندەزنان گفت که دیوانهء کیست**

**گوفتەم ئاه ئەز دلی دیڤانەیی هافز بی تو، زیری لەب خەندەزەنان گوفت کە دیڤانـەیی کیست.**

وتم ئای لە دڵی دێوانەی حافز بێ تۆ، لەژێر لێوەوە بە خەندەوە گوتی کە شێتی کێیە.

آه: ئاه، وای    زیرلب: لە ژێر لێوەوە    خندەزنان: بە خەندەوە، بە بزەوە.

ئەم بەیتە نیمچە روونکردنەوەیەکی بەیتەکانی دیکەیە کە یار یاری خواجە خۆیـەتی، پێـی دەڵێ: وتم وای لە حاڵی دڵی شێت و دێوانەی حافز کە دوور لە تۆ چی بکات، بـە خەنـدە و بـە چرپە وتی: ئەری شێتی کێیە، واتە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانێ حافز شێت و شەیدای بووە، بەڵام بۆ ناز و عیشوە خۆی بێ ئاگا دەکات و دەیەوێ بڵێ ئاگام لە عەشقی تۆ نییە.

## غەزەلی شەست و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- ماهم این هفته شد از شهر و به چشمم سالی ست**

**حال هجران تو چه دانی که چه مشکل حالی ست**

**ماهەم ئین هەفتە شود ئەز شەهر و بە چەشمەم سالیست، هالی هیجران تو چە دانی کە چە موشکیل هالیست.**

مانگم ئەم هەفتەیە لە شار چوویە دەرەوە و لەبەر چاوم ساڵێکە، تۆ چوزانی حاڵی هیجران چەندە دژوارە.

ماهم: مانگم، دركەیە لە (یار)   شد از شهر: لە شار چووە دەرەوە

بە چشمم: لەبەر چاوم، لای من   سالیست: ساڵێكە   تو چە دانی: تۆ چوزانی

لە نوسخەی (عەلامە قزوینی و خورەمشاهی)دا لە جیاتی (شد از شهر) (بیرون رفت) هاتووە، کە جەنابی خورەمشاهی پێیوایە هێنانی (شد از شهر) لەلایەن (سودی و خانلری و عیوضی ـ بهروز) لەبەر (تناسب) و رێکەوتنە لەگەڵ وشەکانی دیکەی (ماه و هفتە و سال)، چونکە (شهر) جگە لە واتای شار واتای مانگیش دەگەیەنێ {حافظ نامە، ج١، ل٣٥٨} هەروەك سودی خۆی دەڵێ: ناوهێنانی (مانگ و هەفتە و شهر و ساڵ) موراعاتی نظیر (لەبەرچاوگرتنی هاوتاکان)ەو ئەگەر (رۆژیشی بهێنایە زۆر تەواوتر دەبوو{ج١، ل٤٣٥}

تەنیا ماوەیەکی کەمە مانگی شاعیر (یار) لە شار چووەتە دەرەوە و هەر زوو غوربەت رووی لە شاعیر کردووە بۆیە خواجە دەڵێ: مانگم ئەم هەفتەیە لە شار چووەتە دەرەوە، لە پێش چاوی من ساڵێکە. یاخود هەفتەیەکە یارم لە شاردا نییە لای من بە ساڵێك تێپەڕیوە، تۆ چوزانی حاڵی دابڕان و هیجران چەندە زەحمەت و ناڕەحەتە.

**٢- مردم دیده ز لطف رخ او در رخ او**

**عکس خود دید گمان برد که مشکین خالی ست**

**مەردومی دیدە ز لوتفی روخی ئو دەر روخی ئو، ئەکسی خود دید گومان بورد کە میشکین خالیست.**

سۆمای چاوم لە رووخساری جوان و درەوشاوەی یاردا وێنەی خۆی دی، وا گومانی برد کە خاڵێکی رەشە.



مردم دیدە: سۆما، گلێنە، رەشێنەی چاو   لطف رخ او: جوانی رووخساری ئەو، درەوشاوەیی رووخساری ئەو   عکس: وێنە

گمان برد: وای زانی: واگومانی برد   مشکین: رەش

خواجە لە جوانی و درەوشاوەیی رووخساری یاردا سۆما و گلێنەی رەشی خۆیی بینیوە و سۆمای چاو لە بینینی ئەم رەشیەدا کە وێنەی خۆی بوو وای زانی خاڵێکی رەشە لەسەر گۆنای یار، بەڵام وێنەی خۆی بوو لەبەر درەوشاوەیی و جوانی رووخساری یار کە وەك ئاوێنە وابوو دەبینرا.

**٣- می چکد شیر هنوز ز لب همچون شکرش**

**گر چه در شیوەگری هر مژەاش قتّالی ست**

**می چەکەد شیر هەنوز ز لەبی هەمچون شەکەرەش، گەرچە دەر شیڤەگەری هەر موژەئەش قەتتالیست.**

هێشتا شیر لە لێوی وەك شەکری دەتکێ، ئەگەرچی لە فریوکاری و دڵڕفاندندا هەر برژانگێکی پیاوکوژێکە.

می چکد: دەتکێ، دەچکێ   شیر: شیر   شیوەگری: ناز و دڵڕفاندن، فریوکاری

مژە: برژانگ   قتال: زۆر پیاوکوژ

لە وەسفی یاردا دەڵێ: یار تەمەنی زۆر کورتە و هێندە منداڵە هێشتا شیر لە دەمی شەکرین و شیرینی دەتکێ یاخود کورد گوتەنی: بۆنی شیر لە دەمی دێ، بەڵام هەر بەم منداڵییە هێندە بەناز و عیشوەیە لە دڵڕفێنی و دڵفریوداندا هەر برژانگێکی پیاوکوژێکی زۆر کارامە و بێ بەزەییە، واتە گەرچی منداڵە، بەڵام لە عەشقدا کارامە و بێ باکە.

**٤- ای که انگشت نمایی به کرم در همه شهر**

**وه که در کار غریبان عجبت اهمالی ست**

**ئەی کە ئەنگوشت نومایی بە کەرەم دەر هەمە شەهر، ڤەه کە دەر کاری غەریبان ئەجەبەت ئیهمالیست.**

ئەی ئەو کەسەی کە لە هەموو شاردا بە بەخشندەیی ناوبانگت دەرکردووە و پەنجەت بۆ درێژ دەکەن، وای کە لە کاری غەریباندا چەندە سەیر ئیهمالیت.

انگشت: پەنجە   انگشت نمایی: پەنجە بۆ درێژکردن

انگشت نمائی بە کرم: پەنجە بۆ بەخشندەیی درێژکردنی، ناوبانگ دەرکردن بە بەخشندەیی

وە: وای، بۆ سەرسوڕمانە   درکار غریبان: لە کاری غەریباندا، بەرامبەر غەریبان.

لای حافز یار هەمیشە بەرامبەر کەسانی دیکە و تەواوی خەڵکی شار خاوەن کەرەم و بەخشندەییە و بەڵام بەرامبەر عاشق و غەریبان بە تەواوی پێچەوانە دەبێتەوە و ئەو بەخشندەییەی نامێنێت، لێرەشدا بە یار دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی کە هێندە بەخشندەی لە شاردا بە بەخشندەیی ناوبانگت دەرکردووە و، خەڵکی پەنجەت بۆ درێژ دەکەن، بەڵام لە بەرامبەر غەریباندا زۆر ئیهمالیت و گوێیان پێ نادەیت و بۆ ئەوان بەخشندە نیت.

**٥- بعد ازینم نبوود شایبە در جو هر  فرد**

**که دهان تو درین نکته خوش استدلالی ست**

**بەئد ئەزینەم نەبوود شایبە دەر جۆوهەری فەرد، کە دەهانی تو دەرین نوکتە خوش ئیستدلالیست.**

لەمەودوا گومانم لە جەوهەری تاکدا نییە، چونکە دەمی تۆ لەم مەسەلەیەدا بەڵگەیەکی بەهێزە.

بعد ازینم: لەمە بە دواوە شایبە: گومان استدلال: بەڵگە.

جوهر فرد: گەوهەری تاك، بنچینەی تەن، بریتییە لە بچووکترین گەردیلە و بەشی تەنی بوون کە لەوە بچووکتر نابێتەوە و بە تەنی دابەشنەبوو ناسراوە (جزء لا یتجزء) مەسەلەی تەنی دابەشنەبوو، مەسەلەیەکی فەلسەفی یۆنانییە کە دەکرێ بە فەلسەفەی گەردوون بدرێتە قەڵەم. (تەنی دابەش نەبوو ـ جزء لا یتجزء) وەرگێڕدراوی وشەی یۆنانی (آتوموس)ە. فەیلەسووفەکان لە بوون و نەبوونی ئەم تەنە دابەشنەبووەدا ڕێکنەکەوتوون و جیاوازییان هەیە (دیموکراتیوس) باوەڕی بەراستی ئەم مەسەلەیە هەبوو، واتە پێیوابوو کە تەن لە کۆمەڵێ بەشی ورد دروست بووە کە دواجار دابەشنەبنەوە بۆ بەشی دیکە، واتە لە هەموو تەنێکدا دەگەینە تەنی دابەشنەبوو (گەوهەری تەن)، بەڵام ئەرستۆ باوەڕی بەم فەلسەفەیە نەبوو.

ئەم بیرە پاشتر گوێزرایەوە نێو فەلسەفەی ئیسلامی و زیاتر پەیڕەوی ئەرستۆیان کرد، هەرچەندە فەیلەسووفیش هەیە کە باوەڕی بەم تیۆرییە هەیە {بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: خرمشاهی، حافظ نامە، ل**٣٥٩** هەروەها: هروی، ج ١، ل**٣١١**}.

خواجەش ئاگاداری ئەم کێشە و گرفتەیە، بەڵام بە ڕێگە و شێوازی خۆی مەسەلەکە یەکلادەکاتەوە کە بوونی جەوهەری تەنەکان راستە و دواجار تەن دەگاتە ئەو جەوهەرە کەرتنەبووە کە لێی پێکهاتووە و بوونێکی هەیە. خواجە باس لە فەلسەفە ناکات و شاعیرانە و عاشقانە گشت پشتگیری و رایەکانی بە هێنانی بەڵگەی دەمی یار دەخاتەڕوو، ئەو دەڵێ: لەمەوپاش گومانم لە تەن و کەرتی دابەشنەبوو (جەوهەری تەن) نییە و گومانەکانم هەموو



ڕەوینەوە و پێموایە کە ئەم تەنە کەرتنەبووە هەیە و راستە، چونکە دەمی تۆ (یار) هێندە بچووکە و لێکناکرێتەوە هەر دەڵێی ئەو تەنە کەرتنەبوویە. هەربۆیە ئەمە (دەمی تۆ) بەڵگەیەکی هەم جوانە و هەم بەهێزیشە کە گومانی من بڕەوێنێتەوە و بڕوا بکەم کە جەوهەری کەرتنەبوو بوونی دەرەکی هەیە و وەهمی و خەیاڵی نییە.

**٦- مژدە دادند کە بر ما گذری خواهی کرد**

**نیّت خیر مگردان کە مبارک فالی ست**

**موژدە دادەند کە بەر ما گوزەری خاهی کەرد، نییەتی خەیر مەگەردان کە موبارەك فالیست.**

مژدەیاندا کە سەرێکمان لێ دەدەی، نییەتی خێرت مەگۆڕە کە فاڵ و پێشبینییەکی موبارەك و پیرۆزە.

بر ما: بۆ لای ئێمە، بە لاماندا گذری خواهی کرد: سەرێك دەدەی، تێدەپەڕی(لە داهاتوودا)

نیت: نییەت، ویست مگردان: مەگۆڕە فال: پێشبینی، فاڵ

وتیان و مژدەیاندا کە یار بەم زووانە سەرێکتان لێ دەدا. خواجەش دەڵێ: ئەم ویست و نییەتە نییەتێکی خێر و چاکە مەیگۆڕە، چونکە فاڵ و پێشبینییەکی موبارەك و پیرۆزە کە دەتەوێ سەرمان لێ بدەیت. (نییەت گۆڕین) ئاماژەیەکە بە نییەت هێنانی نوێژ.

**٧- کوە اندوە فراقت بە چە حیلت بکشد**

**حافظ خستە کە از نالە تنش چون نالی ست**

**کوهی ئەندوهی فەراقەت بە چە هیلەت بکیشەد، هافزی خەستە کە ئەز نالە تەنەش چو نالیست.**

کێوی خەمی دووریت بە چ شێوە و حیلەیەك هەڵگرێ (تەحەمول بکات)، حافزی داماو ـ خەستە ـ کە لە ناڵە، جەستەی وەك نای باریك و لاواز بووە.

کوە: کێو اندوە: خەم، فەخەت خستە: نەخۆش، لاواز، ماندو، هیلاك، داماو

نالە: ناڵە تن: جەستە نال: نای، درکەیە لە لاوازی و بێ هێزی

خەمی دووری یار لای خواجە وەك کێوێکی گەورە وایە، حافزیش لەتاو ناڵین، جەستەی زەرد و لاواز بووە و ئێستاش یار بەجێی هێشتووە، هەروەك لە بەیتی یەکەمدا ئاماژەی پێکرد کە چووەتە دەرەوەی شار بۆیە دەڵێ: حافزی هیلاکی داماو کە لەتاو ناڵە، جەستەی وەك نای سست و بێ هێز بووە چۆن بتوانێ باری گرانی خەمی دووری تۆ کە وەك کێو وایە هەڵگرێ، واتە من تەحەمولی ئەم خەمە گەورەیە ناکەم.

# غەزەلی حەفتایەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١- کس نیست که افتادهء آن زلف دوتا نیست**

**در رهگــذر کیست که دامی ز بلا نیست**

**کەس نیست کە ئوفتادەیی ئان زولفی دوتا نیست، دەر رەهگوزەری کیست کــە دامــی ز بەلا نیست.**

کەسێ نییە کە گرفتاری ئەو پرچە رەشە نییە، سەرەڕێی کێیە کە داوێك لە بەڵای تێدا نییە.

افتادە: بێچارە، گرفتار، زەبوونکراو، پەشێوی      دوتا: دوپارچە، دوبەش

زلف دوتا: پرچی دووبەش، پرچی چین چین و لول      رهگــذر: رێڕەو، رێگە

دامی ز بلا: داوێك لە بەڵا، داوی بەڵا و نارەحەتی

گەر (دوتا) بەواتای چەماوە و لار بێت ـ وەك هروی دەڵێت ـ ئەوا پرچــی چــەماوە و لــولی یار نهێنییە خوداییەکانمان بیر دەخاتەوە کە هەمیشە مرۆڤ بێچارە و پەشێوی ئەو نهێنیانەیــە و بەردەوام کەوتووی دەستی هەڵهێنانی ئەو نهێنیانەیە کە لای زۆرینەی مــرۆڤ بوونەتــە مەتــەڵ. میسراعی دووەمی بەیتەکە بەم شێوەیە کە زۆرینەی حافزناسەکان ئەمە بەراست دەزانن دەکرێ پەیوەندی بە میسراعی یەکەمەوە نەبێت و، چەمك و مەفهومێکی دیکەیــە کــە خواجــە پێــی وایە لە سەرەڕێی هــەر کەسـێکدا داوێــك لــە بــەڵا و زەحمــەت و مەینــەتی هەیــە و ئەمــەش سونەتێکی ژیانە و لە چەندین شوێنی دیکەدا خواجە ئاماژە بە پەیوەندی بەتینی نێوان (مــرۆڤ ـ بەڵا) دەکات و بە دوالێزمەیەکی ژیانی دەزانێ. چونکە دەڵێ: لە سەرەڕێی کێدایە کە داوێــك لە بەڵا و نارەحەتی نییە، واتە ناکرێ کەسێ پەیدا بێــت کــە داوی بــەڵا لــە ســەرەڕێی ژیانیــدا نەبێ. بەڵام گەر شـێوە پەسـەندکراوەکەی (عیوضــی و هــروی) وەرگــرین کــە نووســیویانە (در رهگــذر کیست کە این دام بلا نیست) ئەوا میــسراعی دووەم دەبێتــە تەواوکــەری میــسراعی یەکەم و مانای بەیتەکە دەبێتــە: کەسـێ نییــە کــە گرفتــار و زەبــوونی ئــەو پرچــە چــەماوە و دوولۆیەی تۆ نییە و لە هەر رێگەیەکەوە برۆین دەکەوینە ئەم داوەوە واتە پرچی تۆ داوێکــە لــە سەرەڕێگەی هەمووماندا.

ئەم غەزەلە یەکێکە لەو غەزەلانەی کە جیاوازی زۆر لە نێوان نوسـخەکاندا بــەدی دەکرێــت تەنانەت هروی لە شــەرحەکەیدا بــەیتی جیــاوازی لــە نوســخەی قــەزوینی و غنــی و ســودی و



خرمشاهی و عیوضـی و...هتد هەیە، ئێمە لێرەدا لە لایەکــەوە لەبــەر ئــەو پایــە زانــستییەی نوسخەی قەزوینی ـ غەنی و لە لایەکی دیکەوە کە د. هروی هیچ ئاماژەیەکی بەم جیاوازیانــە نەکردووە و لە کەشکۆڵی هەژارانەی ئەم بەندەیەشدا توێــشوی ئــەو لێکۆڵینەوەیــە نییــە و بــە پێویستیشی نازانم لێرەدا خۆم بەو کارەوە سەرقاڵ بکەم کــە گــەورەکان تــەواویان کــردووە هــەر ئەوەندە روون دەکەمەوە کە لەم غەزەلەدا بــە زۆری پــەیڕەوی لــە خوالێخۆشــبووان (قزوینــی ـ غنی) و نوسخە راستکراوەکەی جەنابی (د. رشید عیوضی) و هاوشێوەکانیان کراوە.

**٢- چون چشم تو دل می برد از گوشەنشینان**

**دنبال تو بوودن گنە از جانب ما نیست**

**چون چەشمی تو دل می بەرەد ئەز گوشەنشینان، دونبالی تو بوودەن گونەهـ ئــەز جــانبی ما نیست.**

چونکە چاوی تۆ دڵ لە گۆشەنشینان دەفڕێنێ، لەدوای تۆ بوون گوناهی ئێمە نییە.

دل می برد: دڵ دەبات، دڵ دەرفێنێ

گوشەنشینان: گۆشەنــشینان، لەخواترســان کــە بــۆ عیبــادەت گۆشــەی تــەنیایی دەگــرن و هەمیشە خەریکی خواپەرستین

دنبال: لەپشت، لەدوا      دنبال تو بوودن: لەدوی تۆبوون، بەدوی تۆدا هاتن

گنە: گوناه      ازجانب: لەلایەن

لە فەرهەنگە عیرفانییەکاندا چــاو ئاماژەیــە بــە بیــنین و موشــاهەدەی حــەق{بڕوانــە: فــرهنگ اصــطلاحات عرفــانی، ســجادی}لێرەشــدا خواجــە دەڵــێ: چــاوانی تــۆ هێنــدە سەرنجراکێشە کە دڵی لە گۆشەنشین و خواپەرستەکان رفانــدووە و هەربۆیــە گونــاحی ئێمــە نییە کە شوێنت کەوتوین، بەڵکو سەرنجراکێشی چاوانتە. گۆشەنشین هێنــدەی یادخــەرەوەی عارفەکانە ئەوەندە هێمای خواپەرستەکانی دیکە نییە، هەربۆیە ئەم شێوەیە ئاماژەیەکە بۆ روونکردنەوەی مانای عیرفانی (چاو) کــە(شــهودی حەقــە)، بــەم پێیــەش واتــای عیرفــانی بەیتەکە دەبێتە: حاڵ و مەقامی موشاهەدە و تەجەلی تۆ(حەق) دڵی لە عارفــان بــردووە و هەمیشە تەمەنای ئەو حاڵەتە دەکەن، کە ئەوە حاڵی ئەوان بێت ئیدی گوناهی ئێمــە نییــە کە بە دواتا دێین و شوێنت هەڵدەگرین، بەڵکو تام و چێژی حــاڵ و مەقامەکانــە کــە ئێمــە رادەکێشن و دەمانخاتە سەر رێگەی بەرەو تۆ هاتن، روونــتر ئــەوە جــوانی تۆیــە عارفــەکان رادەکێشی نەوەك ویستێکی خۆیان.

له میسراعی دووەمی ئەم بەیتەدا لە بری (دنبال) (همراه) هاتووە، بەڵام (دنبال) لە رووی واتاییەوە جوانترە و هەروەها ئەم میسراعە تێهەڵکێشی میسراعی یەکەمی ئەم بەیتەی شێخی سەعدییە:

دنبال تو بوودن گنه از جانب ما نیست    با غمزه بگو تا دل مردم نستاند

**٣- روی تو مگر آینهء لطف الهی ست**

**حقّا که چنین است درین روی و ریا نیست**

**روی تو مەگەر ئاییپنەیی لوتفی ئیلاهیست، هەققا کە چونینەست و دەریـن روی و ریـا نیست.**

هەڵبەت رووی تۆ ئاوێنەی لوتفی خوداییە، بە راستی وایە و لەم گوتەیەدا ریا و تەزویر نییە.

مگر: هەڵبەت، لێرەدا بۆ جەختکردن و دڵنیایی بەکارهاتووە    لطف: نیانی، میهرەبانی

حقا: بە راستی، بە دڵنیاییەوە، دیسانەوە واتای دڵنیایی و جەختکردن دەدات

درین: لەمەدا    روی و ریا: ریاکاری و تەزویر، درۆ و دەلەسە

خواجە رووخساری یار بە ئاوێنەی نیانی و چاکی و میهرەبانی جوانی خودایی دەزانێت و تەواوی گوتەکانی دیکەش بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە. هروی پێیوایە ئەم بەیتە ئاماژەیە بە رێبازی (ارباب تجلی) کە باوەڕیان وایە مەخلوقات ئاوێنەی جوانی حەقە، لەڕاستیدا جوان چووە بۆ یەکێ لە واتاکانی ئەم بەیتە و بەو پێیە خواجە، لێرەدا دەیەوێ بەبێ درۆ و ریاکاری بڵێ ئەی یاری زەمینی ئەی دۆست بە راستی رووخساری تۆ ئاوێنەیەکە بۆ رەنگدانەوەی لوتف و جوانی خودا.

**٤- نرگس طلبد شیوهء چشم تو زهی چشم**

**مسکین خبرش از سرو در دیده حیا نیست**

**نەرگس تەلەبەد شیڤەیی چەشمی تو زهی چەشم، مسکین خەبەرەش ئەز سەرڤ دەر دیـدە هەیا نیست.**

نێرگس داوای شێوەی چاوانی تۆ دەکات وای لەو چاوە! نێرگسی داماو هیچ هەواڵێ لە سەریدا نییە و شەرمیش لە چاوانیدا نییە.

نرگس: نێرگز، هەڵبەت حافز لە بری چاوانی یاریش بەکاریدەهێنی، بەڵام لێرەدا مەبەست لە خودی گوڵی نێرگزە    طلبد: داوا دەکات، دەخوازێ

زهی: وای، ئامرازی سەرسوڕمانە    مسکین: داماو، هەژار

خبرش از سر نیست: هەواڵ لە سەریدا نییە، درکەیە لە گێلی و بێ عەقڵی



خواجە و شاعیرانی ئەدەبیاتی عاشقانە بە تایبەتی لە شێوازی عێراقی بەدواوە ئەم جۆرە لێکچواندنە پێچەوانەیان لە نێوان جوانییەکانی سروشت و یاردا دەکرد، لێرەدا شاعیر لە بری ئەوەی بڵێ چاوانی یار لە نێرگس جوانترن، وێنەیەکی شیعری جوان دەخولقێنێ کە تیایدا روح بە نێرگز دەدات و وەك زیندوویەك رەفتاری پێ دەکات و نێرگز گیانی هەیە و داوای هەیە و .. هتد، لێرەشدا گوڵی نێرگز داوای شێوەی جوانی چاوانی یار دەکات، بەڵام خواجە سەیری لەو چاوانەی نێرگز دێت کە هێندە بێ شەرمە داوای شێوەی چاوانی یار دەکات، حەتمەن نێرگز عەقڵی لەدەستداوە و حەیا و شەرم لە روو و چاوانیدا نەماوە کە ئەم داوایە دەکات، چونکە دڵنیایە هەرگیز بە چاوانی تۆ ناگات و نابێتە خاوەنی شێوەی چاوی یار.

شایانی باسە عیوضی لە نوسخەکەی خۆیدا ئەم بەیتەی نەهێناوە و لە بری ئەمە بەیتی (زاهد دهدم پند ز روی تو زهی روی هیچش ز خدا شرم و ز روی تو حیا نیست)هێناوە کە لە رووی رووخسارەوە لە بەیتی نوسخەکانی دیکە دەچێت، بەڵام لە بری (نرگس)، (زاهد) هاتووە.

**٥- از بهر خدا زلف مپیرای که ما را**

**شب نیست که صد عربده با باد صبا نیست.**

**ئەز بەهری خودا زولف مەپیرای کە ما را، شەب نیست کە سەد ئەربەدە با بادی سەبا نیست.**

لە رێی خوا پرچت رێك مەخە، چونکە شەو نییە بەم هۆیەوە سەد دەمەقاڵەمان لەگەڵ بای سەبادا نەبێ.

از بهر خدا: بۆ خاتری خوا، لەڕێی خوا  مپیرای: رێکمەخە، مەڕازێنەوە(لە چاوگی: پیراستن وەرگیراوە)  عربده: دەمەقاڵە و هەرا

خواجە داوا لە یار دەکات کە بۆ خاتری خوا هێندە پرچت پەخشان مەکە و رێکی مەخە چونکە هەر جارێك وابکەیت من و سەبا دەبێتە دەمەقاڵە و هەرامان، بێگومان دەمەقاڵە و هەرای خواجە و بای سەبا لەسەر پرچی یارە، چونکە لەلایەکەوە پەخشانی پرچی یار دەبێتە مایەی ئەوەی کە بای سەبا نەوازشی بکات و دەستی لێ بدات، لێرەدا خودی سەبا دەبێتە رەقیب و شاعیر لە حەسادەتدا شەڕی لەگەڵدا دەکات، چونکە خۆی ناتوانێ نەوازشی بکات. لەلایەکی دیکەوە بەم رێکخستنە بای سەبا بۆنی خۆشی پرچی یار بڵاودەکاتەوە و رەقیبان بە جێگای عەشقی ئەو دەزانن، لێرەشدا سەبا هۆکاری دەستی رەقیبانە و دیسانەوە شاعیر هەرا و دەمەقاڵەی لەگەڵدا دەکات بۆیە بە یار دەڵێ: لە رێی خوا تۆ پرچت رێکمەخە با من شەڕ لەگەڵ سەبادا نەکەم.

**٦- باز آی که بی روی تو ای شمع دل افروز**

**در بزم حریفان اثر نور و صفا نیست**

**باز ئای که بی روی تو ئەی شەمئی دل ئەفروز، دەر بەزمی هەریفان ئەسەری نور و سەفا نیست.**

بگەڕێوە ئەی مۆمی دڵ ڕووناککەرەوە (ڕۆشنایی دڵان) که بە بێ رووی تۆ لە بەزمی هاوپێکەکاندا نیشانەی نور و سەفا نییە.

باز آی: بگەڕێرەوە، بگەڕێوە    شمع دل افروز: مۆمی دڵ ڕووناککەرەوە، ڕۆشنایی دڵان

بزم: بەزم، کۆڕ    حریفان: هاوشانەکان، هاوپێکەکان

اثر: نیشانە، شوێنپێ    نور: ڕووناکی    صفا: خۆشی، سەفا

خواجە رووی یار بە مایەی ڕووناکی و خۆشی و سەفای بەزم و کۆڕی حەریفان دەزانێ، ئێستا که یار ڕۆشتوە سەفا و ڕووناکیش لە بەزمی حەریفاندا نەماوە. هەربۆیە بە یار دەڵێ: ئەی ڕووناکی دڵان بگەڕێوە، تا سەفا و ڕووناکی بۆ بەزمی حەریفان بگەڕێتەوە.

**٧- تیمار غریبان سبب ذکر جمیل است**

**جانا مگر این قاعده در شهر شما نیست**

**تیماری غەریبان سەبەبی زیکری جەمیلەست، جانا مەگەر ئین قائیدە دەر شەهری شوما نیست.**

خەمخواری و بەدەمەوە چوونی غەریبان هۆکاری باسکردن بە چاکەیە، گیانە مەگەر ئەم یاسایە لە شاری ئێوەدا نییە.

تیمار: خەمخواری، بەدەمەوە چوون، خزمەتکردن، تیمار    ذکر جمیل: باسکردن بە چاکە

این قاعده: ئەم یاسایە، مەبەست لە یاسای باسکردن بە چاکەیە

لە شاری شاعیردا بەدەمەوەچوونی غەریبان و خزمەتکردنیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو غەریبانە لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ شاری خۆیان بە چاکە باسی شارەکەی دیکە بکەن، هەربۆیە بەدەم غەریبانەوە دەچن و بووەتە یاسا، بەڵام کاتێ خواجە چووەتە شاری یار، یار رووی تێ نەکردوە و بەدەمیەوە نەچووە، هەربۆیە بیری دەخاتەوە کە بەدەمەوەچوونی غەریبان هۆکار و نیشانەی باسکردن بە چاکەیە: بەڵام گیانە دەڵێی لە شاری ئێوەدا ئەم یاسایە نییە واتە یاسای خزمەتکردنی غەریبان و باسکردنی شار بە چاکە نییە.



**٨- دی می شد و گفتم صنما عهد به جای آر**

**گفتا غلطی خواجه درین عهد وفا نیست**

**دی می شود و گوفتەم سەنەما ئەهد بە جای ئار، گوفتا غەلەتی خاجە دەرین ئەهد ڤەفا نیست.**

دوێنێ دەڕۆشت و وتم ئەی بتی جوان پەیمان بەجێبهێنە، وتی هەڵەی خواجە، لەم زەمانەیەدا یاخود لەم پەیمانەدا وەفا نییە.

دی: دوێنێ    می شد: دەڕۆشت، لە ڕاستیدا مانای ئەم دوو وشەیە لە جێگای دیکەشدا لێکدراوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا بەکار نایەن و نامۆن بە پێویست دەزانم هەموو جارێك یاخود ناوە ناوە ماناکانیان بنووسمەوە

صنما: صنم: بت (ا) نیشانەی بانگردنە ـ کاتێ لەگەڵ ناودا بێت ـ واتە ئەی بت، لەگەڵ مانای بتدا مانای جوانیش دەگەیەنێ و یەکێکە لە ناوەکانی یار و مەعشوقی جوان

به جای آر: بەجێ بهێنە

گفتا: گوتی، ئەم شێوەیەش ئێستا بەکارنایەت و لە بری گفتا تەنیا (گفت) بەکاردێ

غلطی: هەڵەی، غەڵەتی    خواجه: بەڕێز، سەروەر

عهد: پەیمان، زەمانە، ئەم وشەیە لێلییەك دروست دەکات، چونکە هەردوو ماناکە دەگەیەنێ

دەکرێ پەیمانێك لە نێوان شاعیر و یاردا هەبووبێت کە وەفاداربن، بەڵام یار ئەمەی لەبیرکردووە و ڕۆشتووە و شاعیریش بیری دەخاتەوە، یاریش عەیارانە وەڵامی دەداتەوە: دوێنێ یار دەڕۆشت وتم ئەی بتی جوانم ئەی یار بۆ کوێ دەڕۆی، پەیمانەکەت بەجێ بهێنە و وەفاداربە، بەڵام یار گوتی ئەی خواجە (بەڕێز و سەروەر) تۆ هەڵەی، چونکە لەم پەیمان و عەهدەی ئێمەدا مەرج و شەرتی وەفاداری نییە و تۆ بە هەڵە تێگەیشتووی یاخود تۆ هەڵەی لەم زەمانە و ڕۆژگارەدا بە هیوای وەفاداریت، چونکە لەم زەمانەدا وەفاداری نییە.

**٩-گر پیرمغان مرشد من شد چه تفاوت**

**در هیچ سری نیست که سرّی ز خدا نیست**

**گەر پیری موغان مورشیدی مەن شود چە تەفاوت، دەر هیچ سەری نیست کە سرری ز خودا نیست.**

گەر پیری موغان بووە ڕابەری من چ جیاوازی هەیە (چ فەرق دەکات)، چونکە هیچ سەرێکی مرۆڤ نییە کە نهێنی خودایی تێدانەبێت.

مرشد: رابەر، ڕێنما چە تفاوت: چ جیاوازی هەیە، چ فەرق دەکات

سر: نهێنی

مورشید و رابەر لە سۆفیگەریدا مەسەلەیەکی گرنگە و هەر سۆفی و عارفێك کە قۆناغەکانی عیرفان و سەیر و سلوك تەی دەکات پێویستە شێخ و مورشیدێکی هەبێت، ئاشکرایە خواجە حافز شێخ و مورشیدێکی تایبەتی نەبووە، هەربۆیە بە سۆفیش نادرێتە قەڵەم، لەم بەیتەدا و لە زۆر جێگەی دیکەشدا (حافز) دان بە مورشیدی پیری موغاندا دەنێت ـ کە پیری مەیفرۆشی زەردەشتییەکانە و پاشتر لە ئەدەبیاتدا مانای پیری عاشقانی پێدرا ـ لە راستیدا پیری موغان وەك (د.خرمشاهی) دەڵێت: (لە مەیفرۆشی پیری خەرەفا و زیاتر نەبوو ئەو پلەوپایەیەی نەبوو کە حافز ڕێگەی نەجات لەو بپرسێت و ئەویش وەڵامی قووڵی هەبێت، هەربۆیە ئەفسانەی پیری موغان چنراوی خەیاڵی حافزە هەروەك ئەوەی بۆ نموونە رۆستەم بە واتایەك چنراوی خەیاڵی (فیردەوسی)یە {د.خرمشاهی، حافظ نامە، ج١، ل٩٩} بەم واتایانە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە لە لایەکەوە پیری موغان مانای یەکەمجاری لەدەستداوە و لەلایەن شاعیرەوە واتای نوێی پێدراوە لەلایەکی دیکەوە ئەم پیری موغانە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی خەیاڵی شاعیرە. بەهەرحاڵ پیری موغان زۆر جیاوازە لە مورشیدە ناسراو و ناودارەکانی ئەو سەردەمە و جێگەی ڕەخنە لێگرتنە و خواجەش لێرەدا وەڵامی ئەو رەخنەیە دەداتەوە.

ئەو دەزانێ کە مورشید و رابەری ئەم، شێخە ناسراوەکان نییە و دەڵێ: گەر پیری موغان بووە شێخ و مورشیدی من چ جیاوازییەکی هەیە ـ لەگەڵ فلانە شێخدا ـ چونکە هیچ کەسێك نییە، یاخود هیچ مرۆڤێك نییە کە نهێنی خودایی تێدا هەڵنەگیرابێت.

**١٠- عاشق چەکند گر نکشد بار ملامت**

**با هیچ دلاور سپر تیر قضا نیست**

**ئاشق چە کونەد گەر نەکەشەد باری مەلامەت، با هیچ دلاڤەر سپەری تیری قەزا نیست.**

عاشق چی بکات گەر باری سەرزەنشت و لۆمەی خەڵکی قبووڵ نەکات، چونکە هیچ پاڵەوانێك قەڵغانی تیری قەزای پێ نییە.

نکشد: نەکێشێت، قبووڵ نەکات ملامت: سەرزەنشت و لۆمە، نزمی و پەستی

دلاور: دلاوەر، پاڵەوان سپر: قەڵغان تیر قضا: تیری قەزا

وەك لە چەندین بەیتی دیکەدا ئاماژەمان پێکرد کە لە شیعرەکانی حافزدا بۆنی جەبرییەت دێت و لێرەشدا هەمان ئەو بیروڕایە خراوەتەڕوو، خواجە دەڵێ: عاشق لەژێر باری نزمی و



پەستی و سەرزەنشتدا جگە لە باربردن و رازیبوون هیچی دیکەی لەدەست نایەت، چونکە ئەمە دەستی قەدەرە وایکردووە کە پەست و نزم بێت و دەستی قەدەر و قەزاش تیرێکە هیچ پاڵەوانێکیش قەڵغانی بەرپەرچدانەوەی نییە و هیچ مرۆڤێك ناتوانێ ئەو چارەنووسە بگۆڕێت بۆیە رازیبوون و ملدان بۆ دەستی قەدەر تەنیا چارەیە.

د. خرمشاهی سەبارەت بە جەبرییەتی حافز نووسیویەتی:"جەبریەتی حافز هاوشانە لەگەڵ ئەشعەری بوونی ئەودا، ئەشعەرییەکان و عارفەکان ـ کە بەزۆری ئەشعەرین ـ هەموو ئیرادە و ئیختیارێك دەدەنە پاڵ خودا و هیچ هێز و دەسەڵاتێك لە مرۆڤدا نابینن، موعتەزیلە باوەڕیان بە ئیختیار و ئازادی تەواو هەبوو، ئەشعەرییەکان ئەم دانەپاڵەیان بە ناڕاست تەنانەت شیرکئامێز دەزانی، باوەڕیان وابوو کە بەندە ـ مرۆڤ ـ خالقی کردارە ئاسایی و عیبادییەکانی خۆی نییە، بەڵکو (کاسب) یان بەدەستهێنەری ئەوە و، هەڵسوڕێنەری ـ زنجیرجوڵێنەر ـ ی هەر ڕووداوێك لە جیهاندا ـ چ لە بوواری ژیانی مرۆیی چ لە سروشتدا رووبدات ـ خودایە". {خرمشاهی، ج١، ل٢٥٢ ـ ٢٥٣}

پێویستە ئەو خاڵە بڵێین کە زۆرینەی ئەهلی سونەت چ عارف و زاناکان و چ خەڵکی رەمەکی و عەوامەکان عەقیدەی ئەشعەرییان هەیە و کوردستانی خۆشمان هەمان رامان وەرگرتووە. لەراستیدا مەسەلەی جەبرییەتی ئەشعەری هێندە ڕێگە لە پرسیارکردن لە عەوام دەگرێت ئەوەندە داکۆکی لەسەر قووڵنەبوونەوە لەو مەسەلانەدا ناکات بە تایبەتی مەسەلەی تەکفیر و بەکافرکردنی خەڵکی، چونکە پەردەهەڵدانەوە لەسەر مەسەلەی وەك ئیختیارێك کە هەرگیز لە ژیاندا نایەتە ڕێمان لە لایەکەوە تووشی نائارامی و ـ انفصام شخصی ـ مان دەکات و لەلایەکی دیکەوە دەرگا بە ڕووی عەقڵی ناکامڵی عەوامان‌دا دەکرێتەوە.

بەهەرحاڵ (د. خرمشاهی) گوتەنی حافز هەمیشە جەبری نییە و ئەشعەریگەری ئەو میانگیری و ئیعتیدالییە و هەندێ رەگەزی بیری کەلامی موعتەزیلەی ـ شیعەی تێکەڵاوە، هەربۆیە لە دیوانەکەیدا ـ تەشبیهـ نەبێ ـ وەك قورئانی پیرۆز گوتەی جەبرییەت ئامێز و ئیختیاری هەیە. { حافظ نامە، ج١، ل٢٥٤}

**١١- در صومعەء زاهد و در خلوت صوفی**

**جز گوشەء ابروی تو محراب دعا نیست**

**دەر سۆومیئەیی زاهید و دەر خەلقەتی سوفی، جوز گوشەیی ئەبروی تو میهرابی دوئا نیست.**

لە عیبادەتگای زاهد و لە خەلۆوەتی سۆفیدا، جگە لە گۆشەی برۆی تۆ میحرابی دۆعــا و نزا نییە.

صومعە: عیبادەتگا　　　　　　محراب: میحراب

محراب دعا: میحرابی دۆعا، شوێنی دۆعا و نزا کردن

بێگومان مەبەست و ئامانجی زاهد و سۆفی ـ ئەڵبەت لێرەدا سۆفییە راستەکانە ـ لە چوونە عیبادەتگا و خەلۆەت، مزگەوت و خانەقا جگە مەعشوق و بەدەستهێنانی رەزامەنـدی ئـەو ـ خودا ـ هیچی دیکە نییــە، لێرەشـدا ئـەم بۆچـوونە دووبـارە دەکرێتــەوە کـە لـە مزگـەوت و عیبادەتگای زاهید و لە خواترسی و لە تەنیایی و خەلۆەتی سۆفیدا جگە لە گۆشەی بـرۆی تـۆ کە وەك میحراب وایە هیچ میحرابێکی دیکە بۆ دۆعاکردن نییە، واتە ئـەوان رووی نزایـان لـە گۆشەی برۆی تۆیە، (سودی) لە شەرحەکەی خۆیدا دەڵێ: واتە زاهید و عابد و سۆفی هــەمووبان عاشقی تۆن و دۆعا بۆ تۆ دەکەن{ ج١، ل٤٤٥} ، بەڵام پێ ناچێت کە ئەم واتایە بگەیەنێت.

**١٢- ای چنگ فروبرده به خون دل حافظ**

**فکرت مگر از غیرت قرآن و خدا نیست**

**ئەی چەنگ فروبوورده بە خونی دلی هافز، فیکرەت مەگەر ئەز غەیرەتی قورئان و خودا نیست.**

ئەی کەسێ کە چنگت کردووە بە خوێنی دڵی حافزدا مەگەر بـیرت لای غیرەتـی قورئـان و خودا نییە.

چــنگ: چــنگ، پەنجــە و نینــۆك فــرو بــردە: بــەناوداکردو، نــاوی بــەرکاری، فروبــردن (بەناوداکردن) یان پێداکردن، وەك پەنجەکردن بە ئاودا　　　　غیرت: غیرەت

بێگومــان حــافز، حــافزی قورئــانی پــیرۆزە و لــە چــەندین جێگــەدا ئامــاژەی بــەم راستییەکردووە وەك: (بە قرآنی کە اندر سینە داری)، گوتاری بەیتەکە دەکرێ سەبارەت بـە رەقیبان و کەسانێ بێت کە خۆشییان لە حافز نەهاتووە و هــەوڵی ئازاردانیـان داوە یـاخود مەعشوقی زەمینی بێت یاخود لێڵییــەکی تێـدابێت بـۆ ئـەو مەعــشوقە عیرفانییــەی کــە خەیاڵی شیعری دروستی کردووە و ئازاربەخشە، بە هەرحاڵ هەریەکێ لەوانە بێت، بەیتەکـە ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەو دەستە، چونکە ئەو دەستە کە چنگی لە خوێنی حـافز گیرکـردووە دەڵێی بیری چووە کە خواجە قورئان لە سنگی دایە و غیرەتی ئـەو قورئانــە و خـودای ئـەو بەڵایەکی بەسەر دەهێنێ بۆیە پێی دەڵێ ئاگادار بە.



(د.هروی) سەبارەت بە (چنگ خستنە نێو خوێنی دڵ) دەڵێ درکەیە لە سوورکردنی نینــۆك بۆ جوانکردن و رازاندنەوەیان بەم واتایەش، مانای بەیتەکە دەبێتە: ئەی کەسێ کـە بـە خـوێنی دڵی حافز نینۆکی پەنجەت بۆیاخ کردووە، مەگەر لە غیرەت و پایەی قورئان و خودا ناترسی کـە هێندە پێت راکێشاوە {هروی، ج١، ل٣١٨} .

## غەزەلی حەفتا و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- مردم دیدهء ما جز به رخت ناظر نیست**

**دل سرگشتهء ما غیر ترا ذاکر نیست**

**مەردومی دیدەیی ما جوز بە روخەت نازیر نیست، دلی سەرگەشتەیی ما غەیری تورا زاکیر نیست.**

سۆمای چاوانی ئێمە جگە رووخسارت سەیری هیچی دیکە ناکات، دڵی سەرگەردانی ئێمە جگە تۆ باسی کەس ناکات.

مردم دیدە: سۆما، بیلبیلەی چاو    رخت: رووخسارت

ناظر: سەیرکەر، تەماشاکەر    سرگشتە: سەرگەردان، ئاوارە، حەیران    ذاکر: باسکەر

خواجە وەفاداری خۆی بۆ یار دووبارە دەکاتەوە و پێی دەڵێ: سۆمای چاوانم تەنیا رووخسارت دەبینێ و جگە لەو سەیری هیچی دیکە ناکات و دڵی سەرگەردان و ئاوارەشمان جگە لە تۆ باسی کەسی دیکە ناکات و تەنیا تۆ لە دڵ و چاوانمدای.

**٢- اشکم احرام طواف حرمت می بندد**

**گرچه از خون دل ریش دمی طاهر نیست**

**ئەشکەم ئیهرامی تەڤافی هەرەمەت می بەندەد، گەرچە ئەز خونی دلی ریش دەمی تاهیر نیست.**

فرمێسکم ئیحرامی تەوافی حەرەمت دەبەستێ، گەرچی لە خوێنی دڵەی رێشم ساتێ پاك نییە.

اشك: فرمێسك، ئەشك، ئەسرین، رۆندك

احرام بستن: نییەتی حەجهێنان و چوونە نێو فەرزی حەجەوە بە کۆمەڵێ دابوونەریت و رێورەسمی تایبەتی خۆیەوە، وەك جلوبەرگی تایبەت لەبەرکردن کە ئیحرام بەستنی پێ دەگوترێ

احرام بندد: ئیحرام دەبەستێ، دەیەوێ، نیازی هەیە

طواف: تەواف، سوڕان لەدەوری بەیت ـ کەعبە ـ کە یەکێکە لە پایە و روکنەکانی بەجێهێنانی فەرزی حەج



حرم: دەوروبەری بەیت (کەعبە) حەرەمی پێدەگوترێت، بەڵام پاشان (حەرەم) بۆ دەوروبەری هەر خانوویەکی پیرۆز بەکاردەهات، تەنانەت بۆ ناو ماڵێش بەکاردێت

ریش: رێش، بریندار    دل ریش: دڵەی رێش، دڵی بریندار    دمی: ساتێك

فرمێسکی چاوانی خواجە دەیەوێ ئیحرامی تەوافی حەرەمی یاری عیرفانی ببەستێ و دەیەوێ بە فرمێسك رشتن لە خۆی دوورکەوێتەوە و لە خودیبوونی خۆی داڕنرێت و بچێتە مەقامی بێ رەنگی و لەدەستدانی خود، چونکە لە عیرفاندا مەبەست لە حەرەم مەقامی بێ رەنگی و لە خود دەرچوونە ـ بەڵام لەبەر ئەوەی دڵەی خواجە لە ئاهی دووری بریندارە و فرمێسکەکانی خوێناوین و یەکێ لە مەرجە سەرەکییەکانی ئیحرامیش پاك بوونە و خوێنیش پیسە بۆیە ناتوانێ ئەو ئیحرامە بهێنێتە جێ و ویست و مەرامی گەیشتن بە یار مەیسەر نابێت، لێرەدا خواجە خۆی بە هۆی نەگەیشتن بە تەوافی حەرەمی یار دەزانێت و کەمتەرخەمی ـ ئەگەر بەکەمتەرخەمی ناوزەدکرێ ـ لەلایەن خۆیەوەیەتی.

**٣- بستهء دام و قفس باد چو مرغ وحشی**

**طایر سدره اگر در طلبت طایر نیست**

**بەستەیی دام و قەفەس باد چو مورغی ڤەهشی، تایری سیدرە ئەگەر دەر تەلەبەت تایر نیست.**

ئەگەر باڵندەی سیدرە بەرەو تۆ هەڵنافڕێ دیلی داو و قەفەس بێت.

بستە: دیل، گرفتار    دام و قفس: داو و قەفەس    مرغ: باڵندە    وحشی: کێوی

طایر: باڵندە    سدرە: درەختی سیدرە کە لە بەهەشتدا یان لە ئاسمانی حەوتەمدایە

طایر سدرە: باڵندەی درەختی سیدرە کە درکەیە لە حەزرەتی جوبرەئیل (سودی) گوتەنی: واتە حەزرەتی جوبرەئیلی ئەمین کە مەقام و شوێنی (سدرە المنتهی)یە و کاتێ بیەوێ بەرەو شوێنێ هەڵفڕێ لەوێوە هەڵدەفڕێ و دیسانەوە واتە دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ{سودی، ج١، ل٤٤٩}

طایر: هەڵفەڕیو

لای خواجە حافز تەنیا ئەو (یاری عیرفانی/ خودا) جەوهەری گشتی مەسەلەکانە و هەر شتێ بەرەو ئەو لە جوڵەدابوو گرنگ و بە بەهایە و بە پێچەوانەشەوە بێ بەهایە، لێرەدا لە مرۆڤیش تێدەپەڕێت و روحی پیرۆز و ئەمین (جوبرئەیل) دەهێنێتە نێو ئەو هاوکێشەیەوە، خواجە یەکێ لە نازناوەکانی حەزرەتی جوبرەئیل دەهێنێت کە (باڵندەی سیدرە) یە، چونکە ئەوێ شوێن و مەقامی حەزرەتی جوبرئەیلە، حافز دەڵێ: ئەگەر جوبرەئیل کە باڵندەی درەختی سیدرەیە و لە ئاسمانی حەوتەم و بەهەشتدایە و ئەمینداری نیگا و وەحی ئیلاهییە و لە فریشتە

نزیکەکانی حەقە، بە ئومێد و ئارەزووی بە تۆ گەیشتن و بەرەو لای تۆ هاتن ـ ئەڵبەت لێرەدا تۆ یاری عیرفانییە کە زاتی حەقە ـ هەڵنافڕێ و هەوڵ نادات یاخوا وەك باڵندەی کێوی گرفتاری داو و قەفەس ببێت، چونکە باڵندەی کێوی کاتێ دەکەوێتە دەست مرۆڤ لە ترسی ئەوەی هەڵنەفڕێت هەمیشە لە قەفەس و داودا ژیان بەسەر دەبات، دەکرێ ئەم قەفەسە درکە بێت لە جیهانی هەستەکان (دونیا)، چونکە خواجە لە جێی دیکەدا دونیای بە قەفەس داناوە کە دەڵێ: (چنین قفس نه سزای چو منی خوش الحانیست)

هەربۆیە دەکرێ واتای دەستنیشانکراوتری بەیتەکە بریتی بێت لە: گەر حەزرەتی جوبرەئیلیش بەرەو تۆ هەڵنەفڕێت و مەبەستی تەنیا تۆ نەبێ یاخوا لەم قەفەسەی دونیادا گرفتاری داوی جەستەبێت.

**٤- عاشق مفلس اگر قلب دلش کرد نثار**

**مکنش عیب که بر نقد روان قادر نیست**

**ئاشقی موفلیس ئەگەر قەلبی دلەش کەرد نیسار، مەکونەش ئەیب کە بەر نەقدی رەڤان قادیر نیست.**

گەر عاشقی موفلیس سکەی قەڵبی دڵی خۆی کردە قوربانی، سەرزەنشتی مەکە، چونکە توانای نییە سکەی بەهاداری گیان بکاتە قوربانی.

مفلس: موفلیس، کەسێ کە هیچ پارە یا سەروەتی نییە

قلب: قەڵب، سکەی قەڵب و تەزویر کە زو رەشـهەڵدەگەڕێ، (قلب) پێچەوانەی (نقد)ە

نثار: قوربانی    مکنش عیب: عەیبی لێ مەگرە، سەرزەنشتی مەکە    نقد: پارەی ئەسڵی

روان: گیان، نەفس، یاخود بە بوونی (نقد) مانای رایج و سەردەمی دەدات واتە پارەی سەردەم و رایج.

خواجە بە یار دەڵێ: گەر ئەم عاشقە موفلیس و گیرفان بەتاڵە دڵی خۆی کە وەك سکەیەکی قەڵبی تەزویر وایە ـ ئەڵبەت لە بەرامبەرگیاندا ـ کردە قوربانی تۆ عەیبی لێ مەگرە و سەرزەنشتی مەکە، چونکە توانای بە سەر قوربانیکردنی گیاندا نییە کە سکەیەکی رایج و ئەسڵییە و هەر ئەوەندەی لەدەست دێت.

لە راستیدا مانایەکی قووڵتر لەم بەیتەدا هەیە کە هیچ یەك لە(سودی و هروی) تەنانەت (خرمشاهی)ش ئاماژەیان پێ نەکردووە، ئەم بەندەیە پێموایە کە قوربانیکردنی گیان پەیوەندیەکی دووراودووری بە شێخی عارفان حەلاجەوە هەبێت، چونکە ئەو گیانی لە پێناو عەشقی سووتێنەری ئیلاهیدا کردە قوربانی خواجە بە مەعشوقی حەق دەڵێ: کە من تەنیا دڵم



دەکەمە قوربانی و بە خۆشەویستی دڵداری رازی دەبم سەرزەنشتم مەکە، چونکە توانام نییە کە گیانم بکەمە قوربانی، یاخود راستتر بەو مەقام و پلە بەرزە نەگەیشتوم و لەو بووارەدا موفلیسێك زیاترنیم . درود بۆ عەشقی حەلاج و خواجە حافز.

**٥- عاقبت دست بدان سرو بلندش برسد**

**هرکه را در طلبت همت او قاصر نسیت**

**ئاقیبەت دەست بدان سەرڤی بوولەندەش برەسەد ، هەرکە را دەر تەلەبەت هیمەتی ئو قاسیر نیست.**

سەرەنجام دەستی بەو سەرووی بڵندە دەگات، هەرکەسێ لە هەوڵی بەرەو تۆدا کەمتەرخەمی ناکات.

عاقبت: عاقیبەت، سەرەنجام    بدان: بەو

سروبلند: سەروی بەرز، مەبەست لە باڵای بەرزی یارە    برسد: دەگات

هرکە: هەرکەسێ    همت او قاصر نیست: کەمتەرخەمی ناکات

هەر چەندە رێگای گەیشتن بە حەق لای زۆرکەس و تەنانەت جاروبار لای خودی حافزیش لە هەوڵ و کۆشش دادەبڕێت، بەڵام ئەم رایەی ئێستاش هەیە کە هەوڵ و کۆشش مرۆڤەکان بە قەد و قامەتی یار و مەبەست و مەرام دەگەیەنێ، خودای گەورە دەفەرمووێ: (والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سبلنا) رێگە بە ئەوانە پیشاندەدرێ و رێنماییان دەکرێ کە هەوڵ بدەن، ئەم بەیتە جۆرێکی دیکەی وەرگێڕانی ئەم ئایەتەیە.

خواجە لێرەدا دەڵێ: هەر کەسێ کە کەمتەرخەمی لە هەوڵی بەدەستهێنانی تۆدا ناکات سەرەنجام بە دیدار و وەسڵت دەگات.

**٦- از روان بخشی عیسی نزنم پیش تو دم**

**زانکه در روح فزایی چو لبت ماهر نیست**

**ئەز رەڤان بەخشیی ئیسا نەزەنەم پیشی تو دەم، زانکە دەر روح فەزایی چو لەبەت ماهیر نیست.**

لە حزوری تۆدا سەبارەت بە زیندووکردنەوەی عیسا قسە ناکەم، چونکە عیسا لە ـ زیندووکردنەوە ـ دا وەك لێوت لێزان نییە.

روان بخش: گیان پێدانەوە، زیندووکردنەوە    دم زدن: قسەکردن

نزنم پیش تو دم: لەلای تۆدا قسە ناکەم    زانکە: لەو رووەوەی کە، چونکە

روح فزایی: زیندووکردنەوە

مردوو زیندووکردنەوە یەکێك بووە لە موعجیزە (پەرجو)کانی حەزرەتی عیسا ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ بەڵام لێرەدا لێوی یاری حافز هێندە گیانبەخشە و لەو کارەدا ئەوەندە لێزانە کە خواجە پێی شەرمە لە حزوری یاردا باس لەو موعجیزە گەورەیە بکات کە دنیای لەوکاتەوە تا کۆتایی هەژاندووە و دەهەژێنێ.

ئەگەر ئەم بانگەشەیە موبالەغە و زێدەڕۆیی شاعیرانە نەبێت ـ کە وای بۆدەچم نەبێت ـ دەبێ بپرسین ئەو یارە کێیە کە لێوی هێندە گیانبەخشە، ئەسڵەن (لێو) لە عیرفاندا چ واتایەك دەدات، خودی لێو بە واتای کەلام و قسەی یاری عیرفانی دێت، لێرەشدا واتای بەیتەکە دەبێتە حەقیقی نەوەك زیادەڕۆیی شاعیرانە، خواجە دڵنیایە ئەوەی کە حەزرەتی عیسا دەیکرد زۆر کەمتربوو لە (کن فیکون)ی لێوی یار، ئیدی بەم حەقیقەتەوە پێی شەرمە لە حزوری یاردا باسی مردو زیندووکردنەوەی حەزرەتی عیسا ـ سەلامی خوای لەسەر بێ ـ بکات، چونکە لێوی یار لەو لێزانترە.

**٧- من که در آتش سودای تو آهی نزنم**

**کی توان گفت که بر داغ، دلم صابر نیست**

**مەن کە دەر ئاتەشی سۆودای تو ئاهی نەزەنەم، کەی تەڤان گوفت کە بەر داغ دلەم سابیر نیست.**

من کە لە نێو ئاگری تاسەی تۆدا ئاهێك نەکەم، کەی دەتوانرێ بگوترێ کە بەرامبەر داغ دڵم ئارامگر نییە.

آتش: ئاگر سودا: ئارەزوو، تاسە و ئیشتیاق

آهی نزنم: ئاهێك هەڵناکێشم، ئاهێك ناکەم

داغ: داغ، داخ، سوتاندن بە ئاگر یان بە ئاسنی گەرم

داغی عەشق مەسەلەیەکە و بەردەوام عارفەکان دووبارەی دەکەنەوە، ئاگری سووتێنەری عەشق، کە لە گیانی عارفەکان بەردەبێ یەکپارچە دەیانکاتە داغدیدە، بەڵام هەموان بەرگەی ئەم ئاگرە سووتێنەرە ناگرن و پاشەکشە دەکەن ئەم پاشەکشەکردنە لای عارفەکان نیشانەی تێکشکاندن و بەزینە، دەڵێی خواجەش بەمە تۆمەتبارەکراوە یاخود هەروا دەیەوێ پابەندی خۆی دووپات بکاتەوە ئەم بەیتەی گوتووە: من کە لە نێو ئاگری تاسە و ئارەزووی تۆدا ئاهێکم لە دەم دەرناچێ و هیچ نارەحەتیەك دەرنابڕم کەی دەتوانرێ بگوترێ کە دڵم لە بەرامبەر داغی عەشقدا ئارامگر نییە، واتە لە نێو ئاگری تاسەی تۆدا دڵم بەرامبەر داغی عەشق ئارامگرە.



**٨- روز اول که سر زلف تو دیدم گفتم**

**که پریشانی این سلسله را آخر نیست**

**روزی ئەڤڤەل کە سەری زولفی تو دیدەم گوفتەم، کە پەریشانیی ئین سیلسیلەرا ئاخیر نیست.**

ڕۆژی یەکەم کە سەری زوڵفی تۆم بینی گوتم: کە پەرێشانی ئەم زنجیرەیە کۆتایی نییە.

پریشانی: تێکئاڵاوی، پەرێشانی

سلسله: زنجیر، زنجیری زوڵفی یار، یاخود دەکرێ لێرەدا زنجیرەی عاشقان بێت

بێگومان دڵی عاشقان وابەستەی پرچی یارە و هەرچەندە ئەم پرچە تێکئاڵاوتر بێت دڵی عاشقانیش پەرێشان تر دەبێت (لولی و تێکئاڵاوی ئەم پرچە زنجیرییەی یار بریتییە لە نهێنییە خوداییەکان، کە لە بەیتی دووەمی یەکەمین غەزەلدا قسەی لە بارەوە کراوە) خواجەش دەڵێ:

هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کە سەری زوڵفی تۆم بینی کە تێکئاڵاو و لولە گوتم پەرێشانی ئەم زنجیرە کۆتایی نییە، دەکرێ میسراعی دووەم هەر مەبەست لە پرچ بێت کە هەر لە یەکەم بینینەوە هەستی کردبێ کە ئەم لولییە خاونابێتەوە، یاخود (زنجیر) بە زنجیرەی عاشقان لێکدرێتەوە و مەبەست لە (سلسله) عاشقان بێت و هەر لە یەکەم بینینی پرچی یارەوە هەستی کردبێ کە پەرێشانی عاشقان کۆتایی نایەت.

**٩- سر پیوند تو تنها نه دل حافظ راست**

**کیست آن کەش سر پیوند تو در خاطر نیست**

**سەری پەیڤەندی تو تەنها نە دلی هافز ڕاست، کیست ئان کەش سەری پەیڤەندی تو دەر خاتیر نیست.**

تاسە و ئارەزووی ویساڵی تۆ تەنیا ئارەزووی دڵی حافز نییە، کێیە ئەو کەسەی کە ئارەزووی ویساڵی تۆ لە بیریدا نییە.

سر: بیر، ئارەزوو پیوند: ویساڵ، پێگەیشتن خاطر: بیر، هزر و خەیاڵ

تەواوی عاشقان تاسە و ئارەزووی گەیشتن و ویساڵی مەعشوقیان هەیە و هەر ئەم ڕاستییەیە کە خواجەش دەیخاتەڕوو: تۆکە مەعشوقی ئەزەلیت تاسەی گەیشتن بە تۆ تەنیا لە دڵی حافزدا نییە، بەڵکو لە هەموو دڵ و بیرەکاندا هەیە و کەس نییە کە تاسەی دیدار و ویساڵی تۆی لە سەردا نەبێت.

## غەزەلی حەفتا و دووەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات)**

**١- زاهد ظاهر پرست از حال ما آگاه نیست**

**در حق ما هرچه گوید جای هیچ اکراه نیست**

**زاهیدی زاهیر پەرەست ئەز هالی ما ئاگاه نیست، دەر هەقی ما هەرچە گویەد جای هیچ ئیکراه نیست.**

زاهیدی رووکارپەرست ئاگاداری حاڵی ئێمە نییە، سەبارەت بە ئێمە هەرچی بڵێت جێگەی هیچ رەنجانێك نییە.

زاهد: کەسێ کە پشتی لە دونیا و خۆشیەکانی کردبێت، پشت لە دونیا کردو

ظاهر پرست: رووکارپەرست آگاه نیست: ئاگای لێ نییە، شارەزایی نییە

درحق ما: سەبارەت بە ئێمە

زاهد و متزهد دوو زاراوەن کە بە واتای زاهید و بەزاهیددەرکەوتوو دێن و جیاوازییەکی گەورە لە نێوانیاندا هەیە، زاهید و زاهیدیی بریتییە لە روو وەرگێڕان و پشتکردنە دونیا و خۆشییەکانی، بەڵام بەزاهیددەرکەوتوو کەسێکە کە خۆی بە زاهید بداتە قەڵەم و لە ناخیدا بەو شێوەیە نەبێت، هەروەك گوتراوە: زاهید کەسێکە کە زوهدەکەی بە کردارە، بەڵام بەزاهیددەرکەوتوو کەسێکە کە زوهدەکەی بە گوفتارە، {د.سجادی} بەم کەسەی دوایی زوهدفرۆشیش دەگوترێت.

دەکرێ لە بەیتەکەدا زاهیدی رووکارپەرست هەمان ئەو زوهدفرۆشە بێت کە تەنیا بە قسە رووی لە دونیا وەرگێڕاوە، بەڵام لە ناخدا دونیا و خۆشییەکانی خۆش دەوێ.

پێویستە ئەوە بگوترێت کە زوهد (پشتکردنە دونیا) یەکێکە لە مەقامەکانی تەریقەت هەروەك (عزالدین کاشانی) دەڵێ:"بزانە زوهد لە مەقام و پلە بەرزەکانە، هەروەك لە خەبەردا هاتووە هەرکەس لە دونیادا زوهدی پێ بدرێت ئەوە چاکەیەکی زۆری پێدراوە و مەقامی زوهد سێیەم مەقامی پاش تۆبە و وەرعە" {سجادی}

بەم پێیە زاهیدی راستەقینە ئاگاداری حاڵ و مەقامەکانی تەریقەتە و ئاگاداری حاڵی عارفەکانە، بەڵام لێرەدا خواجە لەو زاهیدانە دەدوێ کە رووکارپەرست و زوهدفرۆشن و زوهد لە ناخیاندا نییە ـ هەرچەندە بە زۆری حافز نیشانەیەکی نێگەتیڤی بۆ زاهید هەیە ـ ئەم



زوهدفرۆشانە هیچ کاتێ حاڵ و مەسەلەکانی عارفە راستەقینەکان تێ ناگەن و ئاگادار نابن بە سەریانەوە هەربۆیە سەبارەت بەو مەسەلانە هەرچی بڵێن لە خۆوە دەڵێن و جێگەی رەنجان نییە.

خواجە دەڵێ: زاهیدی رووکارپەرست ئاگای لە حاڵی ئێمەی عارف نییە بۆیە سەبارەت بە ئێمە هەرچی بڵێت جێگەی پێ ناخۆش بوون و رەنجان نییە و جگە لەوە هیچی لێ چاوەڕێ ناکرێت.

د. هروی پێیوایە کە دوور نییە ئەم بەیتە پەیوەندی بە حەللاج و فتوا رووکارییەکەی (جونەید)ەوە هەبێت کە سەبارەت بە کوشتنی حەلاج نوسیویەتی: (نحن نحکم بالظاهر).

**٢- در طریقت هرچه پیش سالك آید خیر اوست**

**بر صراط مستقیم ای دل کسی گمراه نیست**

**دەر تەریقەت هەرچە پیشی سالیك ئایەد خەیری ئوست، بەر سیراتی موستەقیم ئەی دل کەسی گومراه نیست.**

لە تەریقەتدا هەرچی بێتە رێی رێبوار قازانجی ئەوە، بەسەر رێگەی راستەوە ئەی دڵ کەسێ گومڕا نییە.

طریقت: تەریقەت، شێواز، لە سۆفیگەریدا تەریقەت بریتییە لە تەزیکە و چاککردنی ناخ کە لە بەرامبەر شەریعەتدا دێت کە بریتییە لە تەزیکە و چاککردنی دەرەوە، تەریقەت رێگەیەکە کە رێبواران بە خودا دەگەیەنێت، هەروەك لاهیجی لە (شرح گلشن راز)دا نووسیویەتی: شەریعەت حوکمە رووکارییەکانە و وەك پێستی ئایین وایە و تەریقەتیش کرۆکییەتی، تەریقەت رۆشتنە لە (حادث)ەوە بەرەو (قدیم) کە پاش ئەوەی لە مەقامی (فەنا)دا بە پلەی (بقا) گەیشت، دەڵێن لە رێگەی تەریقەتەوە بە حەقیقەت گەیشتوە {سجادی}.

سالك: رێبواری رێگەی تەریقەت خیراوست: بەقازانجی ئەوە

صراط مستقیم: رێگەی راست، زاراوەیەکی قورئانییە و رێگەی راستی بە خودا گەیشتنە، وەك لە سورەتی (الفاتحە)دا هاتووە (اهدنا الصراط المستقیم) ئەمە نزای موسڵمانانە لەسەر زمانی قورئان گمراه: گومڕا، سەرلێشێواو، رێ هەڵەکەر

لێرەدا خواجە تەریقەت بە (صراط مستقیم) دادەنێت و دەیەوێ بڵێت تەریقەت هەمان رێگەی راستی قورئانە، گەر بەیتی یەکەم ئاماژەیەکی تێدابێت بە حەلاج و فتوای کوشتنی ئەو ئەم بەیتەش بەرگرییەکی راستەوخۆیە لە حەلاج و قسەکانی و بەسەرهاتەکەی، چونکە دەڵێ لە تەریقەتدا هەر شت و رووداوێك دێتە بەردەم سالك و رێبوار قازانج و خێری خۆیەتی.

بەمەش ئەو بەسەرهاتە خەمناکەی بەسەر حەلاجدا هات کە بووە مایەی لەداردانی، خێر و قازانج بوو بۆی، نەوەك بەدبەختی و نەگبەتی وەك خەڵکی دیکە وەسفی دەکەن.

میسراعی دووەم بەرگرییەکە تۆختر دەبێتەوە، مادام تەریقەت ڕێگەی ڕاست بێت و حەلاجیش لەسەر ئەم ڕێگەیە بێت ئەوا هەرگیز حەلاج گومڕا یاخود قەرامیتە و کافر نەبووە، وەك کەسانی دیکە بانگەشەیان بۆ دەکرد، نەخێر هەرگیز بەسەر ڕێگەی ڕاست (صراط مستقیم)ەوە کەس گومڕاو سەرلێشێواو نابێت و حەلاجیش نەبووە.

**٣- تا چە بازی رخ نماید بیدقی خواهیم راند**
**عرصەء شطرنج رندان را مجال شاه نیست**

**تا چە بازی روخ نومایەد بەیدەقی خاهیم راند، ئەرسەیی شیترەنجی ریندان را مەجالی شاه نیست.**

سەربازێك دەجولێنین تا بزانین یاری چی بەسەر دێت، مەیدانی شەترەنجی ڕەندان جێگەی جولانی پادشا نییە.

بازی: یاری    رخ نماید: ڕوودات
تا چە بازی رخ نماید: تا بزانین چ یاریەك ڕوودەدات، یاری چی بەسەردێ
بیدق: سەرباز، پیادە، یەکێکە لە داشەکانی شەترەنج
خواهیم راند: دەجولێنین (لە داهاتودا)    عرصە: میدان
عرصە شطرنج: بۆردی شەترەنج، خانەکانی شەترەنج    مجال: بوواری، جولان
شاه: پادشا، مەلیك

بیدق و شا و زاراوەکانی دیکەش تایبەتن بە شەترەنجەوە و دەربڕینی ئەم جۆرە بیروبۆچوونە ئەوە دەخاتەڕوو کە خواجە شەترەنجزانە، چونکە ئەم جولاندنەی (بیدق/عەسکەر) لە کاتی ناچاریدا و بۆ گۆڕینی ئاراستەی یاری، کاری لێزانەکانە. دەڵێ: عەسکەرێك/بەیدەقێك دەجولێنین تا بزانین یاری چی بەسەردێ، چونکە مەیدانی شەترەنجی ڕەندان جێگە و بوواری جولانی پادشا نییە، ئەوەی ڕاستی بێت لە شەترەنجدا زۆر جولاندنی پاشا لەلایەکەوە هەڵەیەکی گەورەیە و لەلایەکی دیکەوە بوواری ئەو زۆر جولاندنەش نییە.

بەڵام ئەم واتا سەرزارەکییە زۆر جیاوازە لەو ئاماژە قووڵەی کە خواجە دەیەوێ بەم زاراوە تایبەتیانەی شەترەج بیخاتەڕوو. گەر مەیدان و خانەکانی شەترەنج کوچە و کۆڵانەکانی ژیانی ڕەندی بێت کە ژیانێکی ئازادانە و دوور لە هەر جۆرە ڕەسمیاتێکی کۆمەڵگەیە ئەوا پادشایەکی



خۆبەگەورەزان بەو هەموو ڕێوڕەسم و ڕەسمیاتانەوە هەرگیز ناتوانێ لەم کوچە و کۆڵانانەدا هاتووچۆ بکات، ئەسڵەن ئەم جێگایانە شوێن و بوواری جم و جوڵی ئەو پادشایە نییە.

لە ڕاستیدا خواجە دەیەوێ ئەوە بڵێت، نەوەك باس لە شەترەنج و کات و ساتی جولانی شا یاخود بەیدەق و فیل و.. هتد بکات.

**٤- چیست این سقف بلند سادەء بسیار نقش**
**زین معمّا هیچ دانا در جهان آگاه نیست**

**چیست ئین سەقفی بوولەندی سادەیی بسیار نەقش، زین موئەمما هیچ دانا دەر جیهان ئاگاه نیست.**

چییە ئەم سەقفە بەرزە سادە پڕ نیگارە، هیچ دانایەك لە جیهاندا ئەم مەتەڵە نازانێت.

چیست: چییە    سقف: سەقف    بلند: بەرز    بسیار نقش: پڕنیگار
زین: لەم    معما: مەتەڵ    آگاه نیست: نایزانێ، ئاگادارنییە

سادەی پڕ نەقش و نیگار دژیەکن لە واتادا، چونکە ئەو سەقفە بەرزە لە هەمانکاتدا سادەیە (واتە هیچ نیگاری تێدا نییە) هەروەها ڕەنگین و پڕ نەخش و نیگارە، بە ڕاستی ئەمە مەتەڵە کە سەقفێ لەیەك کاتدا سادەش بێت و پڕنەخش و نیگاریش، ئاشکرایە کە ئەو سەقفە بەرزە ئاسمانە و تا ئێرەی مەتەڵەکە ئاسانە، بەڵام سادەی پڕ نیگارییەکەی گرانە، (سودی) لە شەرحەکەی خۆیدا (سەقفی سادەی بە ئاسمانی کاتی ڕۆژ چواندووە کە سادەیە و ئەستێرەکان دەرناکەون و سەقفی پڕنەخش و نیگاریشی بەکاتی شەو داناوە کە پڕ لە ئەستێرەی بریسکەداری ڕازاوەیە) {سودی، ج١، ل٤٥٣} د. هروی پێیوایە، چونکە مانایەکی دیکە دەستناکەوێ پێویستە ئەم ڕایەی سودی قبووڵکرێت {هروی، ج١، ل٣٢٥}

بەهەرحاڵ ئاسمانی پڕ لە نهێنی تا ئێستاش جێگەی سەرسوڕمانی هەموو زانا و داناکانی جیهان بووە و هەتا زانست زیاتر پێشکەوێت مەزنی و نهێنی زیاتری دەردەکەوێ، خواجەش دەڵێ: ئەم سەقفە بەرزە سادە پڕ نیگارە وەك مەتەڵێك وایە کە تا ئێستا هیچ دانایەك نەیتوانیوە بیزانێت و نهێنی و شاراوەکانی بە تەواوی کەشف بکات.

لە قورئانی پیرۆزدا زۆر باس لە ئاسمان و گەردوون کراوە، دەستنیشانکردنی ئاسمان بە سەقف خۆی بۆ خۆی دەستنیشانکردنێکی قورئانییە و لە قورئاندا ئاسمان بە سەقفی زەوی دانراوە وەك دەفەرمووێ: (وجعلنا السماء سقفا محفوظا) {الانبیاء/٣٢}. هەروەها ئاسمان بە دەریایەك دانراوە کە خۆر و مانگ و ئەستێرەکان بە ڕێك و پێکی مەلەی تێدا دەکەن (لا الشمس ینبغي لها ان تدرك القمر ولا اللیل سابق النهار وکل فی فلك یسبحون) {یس/٤٠}

بەهەرحاڵ ئاسمان لە دیدگای قورئانیشەوە رازێکی خوداییە و پڕە لە نهێنی و گرنگییەکی زۆری پێدراوە، هەربۆیە خواجەش چەندەها جار ئەم سەرسوڕمانەی خۆی سەبارەت بە گەردوونی پڕ راز و نهێنی دووپات دەکاتەوە.

**٥- این چه استغناست یا رب وین چه قادر حکمت است**
**کاین همه زخم نهان هست و مجال آه نیست**

**ئین چە ئیستیغناست یا ڕەب ڤین چە قادر هیکمەتەست، کین هەمە زەخمی نەهان هەست و مەجالی ئاه نیست.**

خوایە ئەمە چ ئیستیغنا و چ توانای حیکمەتێکە کە ئەم هەمووە برینە شاراوە هەیەو بوواری ئاه نییە.

استغنا: پێویست نەبوون بە هیچ، پێویست نەبوون بە هیچی خودایە لە بەرامبەر بەندەکاندا، چونکە خودا هیچ کاتێ پێویستی بە کردار و عەشقی بەندە نییە، بەڵام ئیستیغنای بەندە بەرامبەر بە حەق دروست نییە چونکە هەمیشە بەندە پێویستی بە خودایە، گەر ئەم زاراوەیە بۆ عارفە ناودارەکان بەکاربهێنرێت مەبەست لە پێویست نەبوونە بە جگە لە خودا، مەسەلەی ئیستیغنای خودا لە دەوڵەمەندی زاتی پیرۆزییەوە سەرچاوە دەگرێت

یا رب: خوایە، بۆ سەرسوڕمان بەکاردێ.

قدر: بە توانا، دەسەڵاتدار قدر حکمت: فەلسەفە و حیکمەتێك کە دەسەڵاتی بەسەر مەسەلەکاندا هەیە تیۆری دەسەڵاتدار

زخم: برین، زام        نهان: شاراوە، پەنهان        آە: ئاه

لێرەدا گوتاری بەندەیەکی بریندار و کوشتەی عەشق بە بێ هیچ هۆکار و واسیتەیەك بە مەعبوودە و دەسەڵاتداری هەموو مەخلوقات دەگەیەنێت: خودایە ئەمە چ بێ نیازی و ئیستیغنایەکی جوانە کە تۆ هەتە و چ دەسەڵاتێکی گەورەیە کە عاشقەکان ئەم هەموو برینە شاراوەیان هەیە و توانای ئاه کێشانیان نییە و ناتوانن بە تۆ بگەن تا داخ و دەردی دڵی خۆیان هەڵڕێژن. لەڕاستیدا سودی و هروی لە شەرحەکەی خۆیاندا بەم شێوەیە ئەم بەیتەیان لێکداوەتەوە، هەروەها د.خرمشاهی لە (حافظ نامە)دا بە شێوەیەکی دیکە ئەم بەیتەی راڤە کردووە کە نووسیویەتی:

یا رەب (بۆ سەرسوڕمانە) حەیرانم و سەرم سوڕماوە کە خوداوەند چ ئیستیغنا و گەورەیی و حکیمەتێکی لە رادەبەدەری هەیە کە ئەم هەمو دەرد و رەنجە شاراوەیە لە کاروباری مرۆڤ و جیهاندا هەیە و کەس بوواری چۆن و بۆچی و رەخنەگرتنی نییە. ئەم بۆچوونە لەگەڵ مەشرەبی



ئەشعەریگەری حافزدا یەکانگیر دەبێتەوە ـ لەگەڵ کەمێ جیاوازی لەگەڵ بنەڕەتی رێبازەکەدا ـ چونکە بە پێی ئەو رێبازە خودا بە دەسەڵاتداری رەها دەزانن و (فعال ما یشاء) هەرچی بیەوێ دەیکات و هەر جۆرە چۆن و بۆچییەکی بەندە بە ناپەسەند و دەرچوون لە شەرع دەدەنە قەڵەم. {خرمشاهی، ج١، ل٣٧٢}

بە راستی راڤەکەی جەنابی (خرمشاهی)یش تینوێتی دڵی عاشقانی مانا شاراوەکانی شیعری حافز ناشکێنێ، من دڵنیام کە مانایەکی قووڵتر هەیە، بەڵام کاتێ ئەو گەورانە دەرەقەتی نەهاتبن ئەم بەندە هیچ نەزانە چۆن دەرەقەتی دێت، بەڵام هەرچی هەیە، زاتی حەق، مەعشوقی بێ نیاز (مستغنی)ی حافز هیچکات پێوستی بە عەشقی خواجە و ئێمەی بەندە نییە، هەربۆیە (گەر ئاه جۆرێ لە ناز یا هیلاکی بێت) و بریندار یان رەنجدیدە بتوانێ لە بەرامبەر مەعشوقەکەیدا (هەڵبەت ئەو مەعشوقەی کە پێویستی بە عەشقی عاشق هەیە) ئەوا ئەم جۆرە ئاهە لە بەرامبەر مەعشوقی بێ نیاز (مستغنی)دا هیچ جۆرە بووار و مەجالێکی بۆ نییە، ئەم بەندەیە وای بۆدەچێ کە خواجە حافز بڵێ: ئێمە کە عاشقی دڵ سووتاوی مەعشوقی ئەزەلی خۆمانین، ئەو مەعشوقەی کە هیچ پێویستی بە عەشقی ئێمە و بە کردار و گوفتاری ئێمە نییە، ئیدی بوواری (ئاه) کێشانمان لە بەرامبەر ئەو هەمو برینە شاراوەیەدا نییە کە عەشق نەشتەری بنەڕەتییانە، ئێمە لە بەرامبەر ئەم برینە شاراوانەدا جگە لە بێدەنگی چارەی دیکەمان نییە. چونکە مەعشوق پێویستی بە ئێمە نییە ئەو مەعشوقی (مستغنی) و (قادر حکمت)ە.

**٦- صاحب دیوان ما گویی نمی داند حساب**
**کاندرین طُغرا نشان حِسبةً لله نیست**

**ساهیبی دیڤانی ما گویی نەمی دانەد هیساب، کەندەرین توغرا نیشانی هیسبەتەن لیللاە نیست.**

دەڵێی (صاحب دیوان)ی ئێمە حیساب نازانێت، کە لەم بڕیارەدا نیشانەیەکی ـ حسبە لله ـ نییە.

صاحب دیوان: وەزیر، سەرکاری خەزێنە، مەئمورانی دارایی کە ئاگاداری کاروباری خەزێنە و دارایی و هاتوو و دەرچوو بوون، بە زاراوەی ئەمڕۆی رەنگە وەزیری دارایی یا بەڕێوەبەری گشتی باج و خەراج و گومرگ و هتد بێت.

طغرا: خەتی توغرا، خەتێکی شێوە چەماوەیی و قەوسی بووە کە لە سەرووی فەرمان و بڵاوکراوەکاندا لە نێوان نیشانەی سوڵتانەکان و (بسم الله) دا بە شێوەیەکی تایبەتی

دەیانکێشا، ئیمزای پادشا، دەکرێ ئەمڕۆ بە ئارم و نیشانەکانی سەر نامە و فەرمانەکان گۆڕدرابێت{خرمشاهی، ج٢، ل١١٢٤ ئەویش لە: فرهنگ اصطلاحات دیوانی دووران مغول، ل١٦٨، دایرە المعارف فارس..}، بەڵام د. هروی (طغرا)ی بە فەرمانێك لێكداوەتەوە کە بەوجۆرە خەتە نوسراوە {ج١، ل٣٢٦}سودیش (طغرا) بە فارسی (توقیع)ئیمزا دەزانێت کە بە نامە و فەرمانە رەسمیەکانەوە بووە.

حسبە للّٰە: بۆ رەزامەندی خوا، لەڕای خوا، ئەم (حسبە للّٰە)یە لەسەر مۆر هەڵکەندرابوو لە لای چەپی رووی سەرەوەی فەرمانەکان دەدرا (بەتایبەتی ئەو فەرمانانەی تایبەت بوون بە بەخشین) ەوە، بەڵام سودی دەڵێ: لە رۆمدا ئەو فەرمانانەی کە لە سەردەمی سوڵتانە پێشوەکاندا نووسراوە بینیومە کە تەنیا (حسبە) یان دەنووسی و وشەی (للّٰە)یان نەدەنوسی، کەواتە توغرا ئەو فەرمانانەیە و(حسبە للّٰە) ش وەك مۆر لە لای چەپی رووی سەروویانەوە دراوە

نشان: نیشانە گویی: دەڵێی نمی داند: نازانێ

حساب: حیساب و ژمارە، یاخود رۆژی حیساب (قیامەت)

بەیتەکە دوو مانا و لێکدانەوە دەدات، چونکە (حسبە للّٰە ـ حساب) دوو مانا دەگەیەنن:

ا- گەر (حسبە للّٰە) بە لە بەر رەزامەندی خودا و (حساب) بە رۆژیی دوایی لێکدرێتەوە ئەوا واتای بەیتەکە دەبێتە: دەڵێی وەزیری ئێمە یا بەڕێوەبەری دارایی ئێمە ئاگای لە رۆژی دوایی و حیساب لەگەڵدا کردن نییە وا لەم فەرمانەدا هیچی لەڕێی خوادا نەداوە، لێرەدا خواجە وەزیر بە رۆژی حیساب دەترسێنێ کە فەرمانی بەخشینی لەڕێی خوای تێدانییە. ئەو فەرمانەی جێبەجێی دەکات دوورە لە دادپەروەری و حوکمەکانی شەرع، لێرەدا زاڵمی وەزیر دەخاتەڕوو.

ب- گەر (حساب) هەمان حساب و ژمارە بێت و (حسبە للّٰە)ش ئەو نیشانە تایبەتییەی سەر فەرمانەکان بێت ئەوا واتاکەی دەبێتە: (دەڵێی وەزیری ئێمە سەری لە حیساب دەرناچێ و نەخوێندەوارە وا ئەو فەرمانەی دەری کردووە نیشانەی رەسمی پێوە نییە (بە گوتەی ئەمڕۆ فەرمانێکی بێ مۆر و ئیمزایە) لێرەشدا نەزانی وەزیرەکە دەخاتەڕوو.

لە هەردوو واتاکەدا باس لە نەهامەتی ئەو سەردەمە دەکرێت لە رووی ئیدارییەوە چونکە، وەزیر چ زاڵم و نادادپەروەر بێت چ نەزان بێت لە هەردوو بارەکەدا دەبێتە خۆرەی ئیدارە و دەسەڵات، لە راستیدا دروست وەك ئەم سەردەمەی ئەمڕۆی خۆمان (رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وڵاتانی عەرەبی، عێراق....هتد) وایە، چونکە لەم وڵاتانەدا زۆرینەی وەزیرەکان (گەر



هەموویان نەبێت) یان گیرفان پڕکەرن یاخود نەزان و گێلن، چونکە دانانی وەزیرەکان لەسەر بنچینەی (تەکنۆقرات) نییە و زۆرجار دۆستایەتی و خزمایەتی رۆڵ دەبینێت.

**٧- هرکە خواهد گو بیا و هرچە خواهد گو بگو**

**کبر و ناز و حاجب و دربان درین درگاە نیست**

**هەرکە خاهەد گو بیا و هەرچە خاهەد گو بگو، کیبر و ناز و هاجیب و دەربان دەرین دەرگاه نیست.**

بڵێ هەرکەس دەیەوێ بێت با بێت و هەرچی دەوێت بیڵێت، لەم دەرگایەدا خۆبەزلزانین و نازو دەرگەوان و پاسەوان نییە.

هرکە: هەرکەس، هەرکەسێ خواهد: دەیەوێ گو: بڵێ

بیا: وەرە کبر: خۆبەزل زانین ناز: ناز

حاجب و دربان: پاسەوانی بەردەرگا، سودی دەڵێ هێنانی ئەم وشەیە کە یەك واتایان هەیە (درێژکردنەوەی قەبیح)ە، واتە زیادەڕۆییە، لای سودی ئەو دەرگایەی کە خۆبەزلزانین و نازی پاسەوانەکانی تێدا نییە ـ چونکە سودی لە نێوان (ناز و حاجب)ی میسراعی دووەمدا (و) ی نەهێناوە ـ دەرگای (وەزیری دوەم قوام الدین حسن)ە، هەر لای سودی بەیتی پێشوو دەربارەی وەزیرێکی دیکە گوتراوە.

خواجە لێرەدا دەڵێ: هەرکەس دەیەوێ بێت و هەرچی دەوێ با بیڵێ چونکە دەرگای ئەم وەزیرە بە پاسەوانی خۆبەزلزان و نازکەر نەگیراوە و وەزیرێکی بەخشندەیە و بە پێچەوانەی وەزیرەکەی پێشووەوەیە{سودی، ج١، ل٤٥٥}، بەڵام هروی ئەو دەرگایە بە دەرگای خودا دەزانێ کە هیچ پاسەوانێکی نییە و مرۆڤ بە ویست و ئارەزووی خۆی رووی لێ دەنێ و هەرچی دەوێ داوای دەکات، بە هەرحاڵ هەردوو لێکدانەوەکە رازیکەرن و لە جێی خۆیاندان.

**٨- هرچە هست از قامت ناساز بی اندام ماست**

**ورنە تشریف تو بر بالای کس کوتاه نیست**

**هەرچە هەست ئەز قامەتی ناسازی بی ئەندامی ماست، ڤەرنە تەشریفی تو بەر بالای کەس کوتاه نیست.**

هەرچی هەیە لە قەد و قامەتی ناساز و ناڕێکی ئێمەوەیە، وەگەرنا گەورەیی تۆ بۆ بالای هیچ کەسێ کورت نییە.

هرچە هست: هەرچی هەیە قامت: قەدو باڵا ناساز: ناساز

بی اندام: ناڕێك ورنە: وەگەرنا

تشریف: گەورەیی، کراسی حازر و دووراوی دیاری          کوتاه: کورت

میسراعی دووەمی بەیتەکە بە دوو شێوە لێکدەدرێتەوە، بە شێوەیەکی کۆنکرێتی کە ئاماژە دەکات بۆ ڕووداوی بە دیاری ناردنی کراسێك لەلایەن یەکێکەوە، هەروەها شێوەیەکی ڕەمزی کە ئاماژەیەکی قووڵی ئەخلاقی تێدایە و بریتییە لە چاکە و گەورەیی بەردەوام و لەوێشەوە واتایەکی قووڵی عیرفانی:

ا-لێکدانەوەی کۆنکرێتی: لەم جۆرە لێکدانەوەیاندا باشترین را رای سوودییە و کە د. هرویش وەك خۆی نەقڵی کردووە سودی دەڵێ: مەلای لاری دەیگێڕایەوە کە ڕۆژێ قوام الدین حسن کراسێك بە دیاری دەداتە خواجە، بەڵام ئەم دیارییە کورت بوو بۆ خواجە پاشان قوام الدین بە شێوەی نوکتە بە خواجە دەڵێت: دیارییەکەی ئێمە کورت بوو یان گەورەیی ئێمە کورتی هێنا و خواجەش یەکسەر ئەم بەیتە دەهۆنێتەوە {سودی، ج١، ل٤٥٥ ـ ٤٥٦}.

کەواتە لێرەدا خواجە حافز بە قوام الدین دەڵێ: هەرچی هەیە (واتە هەرچی کورتی کراسە دیارییەکەی تۆیە) خەتای قەد و قەوارە نارێك و ناسازەکەی منە کە کراسە دیارییەکەی تۆ کورتە ئەگەرنا دیارییەکەی تۆ بۆ باڵای هیچ کەسێ کورت نابێ یا گەورەیی تۆ بۆ باڵای هیچ کەسێ کورت ناهێنێ.

ب- لێکدانەوەی عیرفانی: د.خرمشاهی سەرباری ئەوەی کە ئاماژەی بە مانای یەکەم کردووە، دەڵێت: مانای ناوەکی (عیرفانی) ئەم بەیتە ئەوەیە کە: بەخشش و فەیزیی خودایی کامڵ و تەواوە و کەمونوقسانی نییە. ئەگەر کەموکورتییەك لە وجودەکان (توانستەکان/ ماهیات)دا هەبێت لە کەموکورتی و نوقسانی توانا و ئامادەییە زاتییەکانی ئەوانەوەیە کە توانای وەرگرتن و قەبوڵکردنی فەیزیی ئیلاهییان نییە. {ج١، ل٣٧٤} کەواتە خواجە دەڵێ: ئەی مەعشوقی حەق (خودایە) ئەگەر ئێمە توانای وەرگرتنی فەیزیی تۆمان نییە و هەموان نابینە ئاوێنەیەك بۆ بەخششەکانی تۆ، کەموکورتی و نوقسانی لە خۆماندایە ئەگەر نا فەیز و بەرەکاتی تۆ بۆ هیچ کەسێ کورت ناهێنێ و هەرکەسێ کە بگاتە ئەو ئاستەی بتوانێ ئاوێنە بێت فەیزی تۆ ئامادەیە.

**٩- بر در میخانه رفتن کاری یکرنگان بوود**

**خودفروشان را به کوی می فروشان راه نیست**

**بەر دەری مەیخانە ڕەفتەن کاری یەکرەنگان بووڤەد، خودفروشانرا بە کوی مەیفروشان ڕاه نیست.**



چونە بەردەرگای مەیخانە کار و پیشەی یەکڕەنگەکانە، خۆفرۆشان ڕێگەی چوونە کۆڵانی مەیفرۆشانیان نییە.

یکرنگان/یکرنگ: یەکڕەنگ، واتە ئەو کەسانەی کە دەرەوە و ناوەوەیان وەك یەکە و دوورن لە ریا و دوورویی.

خودفروشان: خۆفرۆشان، ئەهلی ریا و خۆنمایش کەرەکان، ئەوانەی خۆیان بە گەورە دەدەنە قەڵەم

کوی: کۆڵان، کوچە.

وەك گوترا (مەیخانە) لای خواجە مانای نوێی پێدراوە، هەرچەندە پێشتر باسمان لێوەکردووە، ئەم وشەیە بە واتای (حافزی) ڕەمز و نیشانەیەکی ئەفسانەییە{بڕوانە: ج١، ل٣٠٧، خرمشاهی} لە بەرامبەر ریا و دوورویی ئەو سەردەمەی خانەقا و عیبادەتگا و مەدرەسە و مزگەوتدا دانراوە، کە بە لای کەمی تیایدا درۆ و دوورەنگی بەرچاو ناکەوێت، هەر ئەم واتایەیە کە دواتر و لە سەردەمی شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا لە نێوان شاعیرانی وەك نالی و مەحوی و ...هتد بڵاودەبێتەوە. بەهەرحاڵ خواجە لەم بەیتەدا بەم واتایەوە مەیخانە بە جێگەی یەکڕەنگەکان دەزانێ، بۆیە دەڵێ: چوونە بەردەرگای مەیخانە (شوێنی عەشق و عاشقانی پاك) کار و پیشەی ڕاستگۆیانە، ئەوانەی کە دوورەنگ و خۆبەزلزانن ڕێگەی ئەو کۆڵانەیان نییە و هەرگیز ناڕۆنە ئەو کۆڵانە پاکەی عەشقی ڕاستەقینە. مانای عیرفانی (میخانە) جوانتر واتای بەیتەکە دەخاتەڕوو، چونکە مەیخانە لە عیرفاندا بریتییە لە: ناخی عارفی کامڵ، جیهانی لاهوت، کۆڕ و کۆمەڵێ دۆستان کە بە خۆشییەوە لە عەشقی مەحبووبدا هەوڵ دەدەن{بڕوانە: سجادی}.

هەریەك لەم واتایانە بێت، خواجە دەڵێ: چوونە نێو کۆڕی عارفە گەورەکان یاخود بوونە عارف و عاشقی مەحبووبی حەق یان چوونە نێو جیهانی باڵای لاهوت و گیان تەنیا کاری ڕاستگۆیانی ڕێگەی عەشقی ئیلاهییە و دوورو و ریاکارەکان ڕێگەی چوونە ئەم جێگەیان نییە.

**١٠- بندەء پیر خراباتم که لطفش دایم است**

**ورنه لطف شیخ و زاهد گاه هست و گاه نیست**

**بەندەیی پیری خەراباتەم کە لوتفەش دایمەست، ڤەرنە لوتفی شەیخ و زاهید گاه هەست و گاه نیست.**

بەندەی پیری مەیخانەم کە لوتفی بەردەوامە، ئەگەرنا لوتفی شێخ و زاهید جارێك هەیە و جارێك نییە.

بندە: بەندە، کۆیلە، غوڵام          دایم: بەردەوام، دایم

پیرخرابات: پیری مەیخانە، پیری موغان، پیری خەرابات، دیسانەوە یەکێکە لەو وشانەی کە دەبێت لە حافز و شاعیرانی دیکەی وەك مەولانا و سنائی و عطار و.. هتدەوە تێبیگەین، پیر و پێشەوا دەبووایە لە خانەقا و تەکییەکانەوە پێ بگات، بەڵام لە ریا و دوورویییدا ناچار پیری موغان و خەرابات دروست دەکەن کە مورشید و پیری کامڵ و دوور لە کەموکورتییە مرۆییەکانە وەك غرور و دوورویی و رق و نەفرەت و...هتد

خواجە بەم شێوەیە لە پیری خرابات تێدەگات یاخود راستتر بەم شێوەیە پیری خەراباتی خولقاندووە کە لوتفی بەردەوامە بەبێ ئامادەیی (دوورویی و رق و سات ساتی) هەربۆیە خۆی بە غولام و نۆکەری دەزانێ وەگەرنا حافز لە ژیاندا هیچ مورشیدێکی نەبووە، لێرەدا خواجە دەیەوێ ئەمەش بسەلمێنێ کە من نابمە غولامی شێخ و زاهیدان بۆیە ئەم ئەفسانەی پیری موغانە دەخولقێنێ، ئەم زیرەکانە دەڵێ: غولام و بەندەی پیری میخانەم، چونکە لوتف و میهرەبانی بەردەوامە و داییمە و وەك شێخ و زاهیدەکان نییە کە لوتف و چاکەیان سات ساتییە ـ جارێك هەیە و جارێك نییە ـ لێرەدا خواجە رەخنە لە لوتف و چاکەی شێخ و زاهیدەکان دەگرێ.

**١١- حافظ ار بر صدر ننشیند ز عالی همّتی ست**

**عاشق دُردی کش اندر بند مال و جاه نیست**

**هافز ئەر بەر سەدر نەنشینەد ز ئالی هیممەتیست، ئاشقی دووردی کەش ئەندەر بەندی مال و جاه نیست.**

گەر حافز لەلای سەرەوە دانانیشێ لە هیمەت بەرزییەوەیە، چونکە عاشقی بادەی هەژارانە نۆش لە بەندی ماڵ و پلە و پایەدا نییە.

برصدر نشستن: لەلای سەرەوە دانیشتن، پلە و پایەی رەسمی وەرگرتن (سودی دەڵێ: کەسانێ کە بە مانای یەکەم لێکیان داوەتەوە لە شیعرەکە تێنەگەیشتون){ج١، ل٤٥٧}

عالی همت: هیمەت بەرزی، پایەدار دردی کش: بادەنۆش، بادەی هەژارانە نۆش   اندر: لەنێو

مال و جاه: سەروەت و پلە و پایە

حافز کاتێ هیچ پلە و پایەیەکی رەسمی قبوڵ ناکات لە گەورەیی خۆیدایە نەوەك توانای نەبێ، چونکە ئەو عاشقێکی راستەقینەیە ـ یەکێ لە مەرجەکانی عارفیش خۆکێشانەوەیە لە دونیا و سەروەت و پلە و پایە ـ عاشقی رێگەی عەشقی حەقیقی ئیلاهیش لە نێو بەند و داوی سەروەت و سامان و پلە و پایەی رەسمی و نارەسمیدا نییە و هەمیشە بیری لای مەعشوقییەتی نەوەك دونیای دون و شتە دونەکانی نێو دونیای دون کە بە زۆری کۆتایی خاوەنەکانیان کۆتاییەکی تراژیدییە، ئەم خۆگرتنەوەیە لە دونیا لە مەقامە سەرەتاییەکانی عیرفانە بە نێوی



(تبتل) واتە بڕین و دابڕان لە دونیا و هەرچی تێدایە و لە پلە باڵاکانیدا دابڕان لە هەرچی جگە لە مەعشوق (حەق)ەو گەیشتن بەوە{بڕوانە: د. زرینکوب، پلە پلە تا ملاقات خدا}.

## غەزەلی حەفتا و سێیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١- بحریست بحر عشق که هیچش کناره نیست**

**آنجا جز آن‌که جان بسپارند چاره نیست**

**بەهریست بەهری ئیشق کە هیچەش کینارە نیست، ئانجا جوز ئان کە جان بسپارەند چارە نیست.**

دەریایەکە دەریای عەشق کە کۆتایی نییە و لەوێدا جگە لەوەی کە رێبواران گیان بسپێرن چارەی دیکە نییە.

بحر: دەریا   کنارە: کەنار، کۆتایی   آنجا: لەوێدا

جز آن کە: جگە لەوەی کە   جان: گیان   بسپارند: بسپێرن، بدەن

لە نێوان (رێگەی عەشق و دەریای عەشق)دا ئەبڵەقم و وەستاوم و نازانم کامیان هەڵبژێرم بۆ سەرەتای غەزەلەکە هەرچەندە هەموو نوسخە رەسەن و دێرینە بەردەستەکان جگە لە (د. هروی و محمد حمید طباطبایی ـ کورتکراوەکەی مج نووسراوە، بەڵام مج نییە وەدەکرێ مح بێت) (راهیست راه عشق) نوسراوە، بەڵام بەندەی نەزان دڵم بەرە و لای ئەو دەریا بێ کەنارەی عەشق دەچێت (بحریست بحر عشق) من لێرەدا زانستی خۆم نافرۆشم، بەڵام دڵم پێم دەڵێ دەریای عەشق بێ کەنارە نەوەك رێگەی عەشق، دیسانەوە دەریا پێشینەی لای (عطار و سعدی و عبید و نعمت الله) هەیە {بڕوانە: فریدون میرزای تیموری، ل١٤٤} بەهەرحاڵ دڵی نەفام و شەیدای بەندە ئاوا دەڵێ.

رێگە دەکرێ ئاماژە بێت بەو سەفەرە کورتەی مرۆڤ کە لە روح و مەعشوق دادەبڕێت و لە نێو بەندی جەستەدا رێگەی تەمەن تەی دەکات و هەمیشە چاوی گیانی لە عەشقی حەقە بەڵام ئەم رێگەیە کۆتایی هەیە ـ هەرچەندە لە بەرچاوی رێبواران بێ‌کۆتا دێتە بەرچاو ـ ئەم دەربڕینە کەمتر لای خواجە بەرچاو دەکەوێ، بەڵام (دەریای عەشق)دەریای ترسناکی عەشق کە سەرەنجام دەبێ گیان بسپێرین و ببینە قوربانی لە یەکەمین غەزەلی خواجەدا هاتووە (شەوی تاریك و ترسی شەپۆل و گەرداوی ئاوا ترسناك، حاڵی ئێمە لەکوێ دەزانن بارسووکی کەنارەکان) گەر

له غەزەلی یەکەمدا بارسووکەکانی کەنار هەبوون یاخود کەنارێك هەبوو ئیدی لێرەدا و له نێو قولایی دەریای عەشقدا کەنارێك بوونی نەماوه، عاشق ئەوەنده نغرۆی دەریای عەشق بووه ئومێدی کەنار نەماوه.

بەهەر حاڵ عەشق چییه: شەوق و تاسەی له رادەبەدەر و مەیلی زۆر بۆ شتێك، کەسێك... عەشقە، عەشق ئاگرێکه له دڵدا کڵپه دەستێنێ، دەریایەکی بەلاّ و شێتی خوداییە و هەستانەوەی دڵە بۆ مەعشوق به بێ نێوان و واسیته. عەشق گرنگترین بنەمای تەریقەته و ئەم مەقامه تەنیا کامڵەکان دەرکی دەکەن، گوتراوه، ئەگەر کەوتیته داوی عەشقەوه هەوڵی رزگاربوون مەده ئەگەر کوژراوی دەستی عەشقی هەوڵی تۆڵەسەندنەوه مەده، چونکه عەشق ئاگرێکی سووتێنەر و دەریایەکی بێ کۆتاییه {سجادی}. عەشق به مەجازی و حەقیقی دابەشکراوه عەشقی مەجازی ئارەزووی گەیشتن و پەیوەندییه و سووتێنەری دڵە، بەلاّم عەشقی حەقیقی ئولفەتی خودایی و ئیلهامی تاسەی حەقە، عەشقی حەقیقی، عەشقی گەیشتنه به مەعشوقی حەق، که زاتی خودایه.

ئەم عەشقەی عارفەکان، که تا رادەیەك هێمنی و ئارامی بەخۆوه دەبینێ جیاوازه له عەشقی حافز که له زۆرینەی حاڵەتەکاندا ترس و مەینەتی دەهێنی، هەر بۆیه جاروبار سیماکانی عەشقی مەجازی تێدا دەردەکەوێ وەك تۆران و رەقیب و کۆتایی و ترس و... هتد، ئەمەش یەکێکه له جوانییەکانی شیعری حافز، هەرچی عەشقی حافزه به یەك دێڕی (د.سروش) لێکدەدرێتەوه که: "حافز پێی خسته ناو ئاو، بەلاّم سەری لەئاگرەوه دەرهێنا" عەشقی حافز ئاگرێکی سووتێنەر، دەریایەکی بێ ئامان و بێ کەنار بوو، هەربۆیه لێرەشدا دەڵێ: دەریای عەشق دەریایەکه که هەرگیز کەناری نییه و لەو دەریایەدا جگه له مردن و گیانفیداکردن هیچ چارەیەکی دیکه نییه، ئەم گیان سپاردنه دیسانەوه کۆتایی ئەو عەشقه عیرفانییەمان بۆ روونده‌کاتەوه که بەڵێ له دەریای عەشقی ئیلاهیدا جگه له مەرگ و گیانبەختکردن هیچی دیکه به تەواوی و به یەکجاری ناتگەیەنێته مەعشوق هەرچەنده هەوڵی تەواوی عارفەکان له هەموو سەردەمەکاندا ئەوەبوو که پێش مەرگ به مەعشوقی حەق بگەن، بەلاّم هەیهات هەرگیز به تەواوی ئەم دیداره نایەتەدی تا ئێمه بەند و زیندانکراوی جەستەبین هەروەك خواجه حافز له جێگایەکی دیکەدا دەڵێ:

حجاب چهرهء جان می شود غبار تنم        یاخود

چگونه طوف کنم در فضای عالم قدس        که در سراچهء ترکیب تختەبند تنم



ئێمه تاوەکو لەم ماڵۆچکەیەی بوون و جەستەدا بین به کەنارەکانی دەریای عەشق(مەعشوقی حەق) ناگەین و چاره تەنیا گیان فیداکردنه.

**۲- هرگه که دل به عشق دهی خوش دمی بوود**

**در کار خیر حاجت هیچ استخاره نیست**

**هەرگەه که دڵ به ئیشق دەهی خوش دەمی بووڤەد، دەر کاری خەیر هاجەتی هیچ ئیستیخاره نیست.**

هەرکاتێ دڵ به عەشق بسپێری ساتێکی خۆشه (موبارەکه)، لەکاری خێردا پێویستی به هیچ ئیستخارەیەك نییه.

هرگه: هەرکاتێ        دهی: بدەیت، بسپێری

کارخیر: کاری خێر، هەرکارێکی خێر، بەلاّم له کوردیدا واتای ئەم دەربڕینه کورتکراوەتەوه له (ژنهێنان)دا و کاری خێر واته ژنهێنان        حاجت: پێویستی

استخاره: داوای خێرکردن له هەر شتێکدا، چاکترین داواکردن له هەر کاروبارێکدا، ئیستیخاره له سەرەتای ئیسلامدا نوێژ یا نزا و دۆعای ئیستیخاره بووه له پێشکردنی هەرکارێکدا دەخوێنراو کارەکان تەسلیم بەخودا دەکرا، پێم وایه ئیستیخارەی حافزیش جۆرێك بێت لەم دۆعا خوێندنه، بەلاّم له کولتووری شیعەگەری ئێرانیدا ـ هەڵبەت تازەتره له سەردەمی حافز ـ ئیستیخاره جۆرێکی دیکەیه و شێوەی فاڵگرتنەوەی هەیه به قورئان واته قورئان دەکرێتەوه و یەکەم ئایەتی لاپەڕەی راستی قورئانه کراوەکه پەیڕەودەکرێ، یاخود به تەسبیح و شتی دیکه که زیاتر له فاڵ دەچێ تا دۆعا و تەسلیم بوون، ئەم جۆره فاڵگرتنەوەیه به قورئان له نێو سونییەکاندا باونییه و دەکرێ ئەم وشەیه لای حافز به مانای زمانیی بەکارهاتبێ، دووریش نییه له ژێر کاریگەری کولتووری ئێرانیدا بەو واتایەی دیکه هاتبێ، بەلاّم لێرەدا به تەواوی واتای زمانیی رەچاوکراوه {بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه:خرمشاهی، ج۱، ل۳۷۰ ـ ۳۷۸}.

له بەیتی یەکەمدا خواجه باسی له حەقیقەتی دەریا یا رێگەی عەشق کرد، لێرەدا مەیل و ئارەزووی خۆی بۆ چوونه نێو ئەو دەریا ترسناکه دەخاتەڕوو، تەنانەت ئەو ساتانەی نێو دەریا به ساتی خۆش و موبارەك دادەنێ، هەربۆیه درەنگکردن و وەستان بەشیاو نازانێ، تەنانەت دەگاته ئەو رادەیەی که ئیستیخارەش به دواکەوتنی بزانێ، ئەو دەڵێ: هەرکاتێ دڵ به عەشق بسپێری ـ بکەوێته نێو دەریای عەشقەوه ـ کات و ساتێکی خۆش و تەنانەت پیرۆزیشه، ئەم دڵ سپاردنه

بە عەشق کارێکی خێر و چاکەیە و لە کاری خێر و چاکەشدا دەبێ پەلە بکرێت و پێویست بە ئیستیخارە و دۆعاکردن ناکات، چونکە دوات دەخات.

**۳- ما را به منع عقل مترسان و می بیار**

**کان شحنه در ولایت ما هیچ کاره نیست**

**ما را بە مەنئی ئەقل مەترسان و مەی بیار، کان شیهنە دەر ڤیلایەتی ما هیچ کارە نیست.**

ئێمە بە رێگری عەقل مەترسێنە و مەی بهێنە، کە ئەو بەرپرسە لە هەرێمی ئێمەدا هیچ کارە نییە.

منع عقل: رێگری عەقڵ        شحنە: بەرپرس و پۆلیس (بە واتای ئەمرۆ) دارۆغە

ولایت: هەرێم، وڵات، نیشتمان        هیچ کاره نیست: هیچی لەدەست نایە، هیچ کارە نییە

د.هروی ئەم بەیتەی دواخستووە و لە بەیتی دووەمی جیاکردوەتەوە لە بەیتی چوارەمدا داینـاوە بەمەش ماناکەی دابڕیوە لە بەیتی دووەم و رێگری عەقڵی بۆ مەینۆشی بەکاردەهێنێ و دەڵێ: مەی بهێنە و ئێمە بەوە مەترسێنە کە عەقڵ مەیی قەدەغە کردووە، چونکە لە هەرێمی ئێمەی مەینۆشان و عاشقاندا پۆلیس و بەرپرسی عەقڵ هیچی لە دەست نایەت و هیچ کارە نییە.

بەڵام سودی و خرمشاهی پەیوەندی نێوان رێگری عەقڵ و عەشقیان باسکردووە کە لە نیشتمانی عەشقدا بەرپرسی عەقڵ هیچی لەدەست نایەت. ئەم واتایە دروستتر دێتە بەرچاو خواجە دەڵێ: ئێمە بە رێگری عەقڵ مەترسێنە و بەزمی عەشق بەرپاکە، چونکە لە نیشتمانی عەشقدا عەقڵ زەبوون و بێ توانایە و هیچی لە دەست نایەت، ماناکە لەمەش قووڵترە.

(عەقڵ)ی کەم و کورت و نوقسان تەنانەت لە ویلایەتە بەرتەسکەکەی خۆشیدا دەسەڵاتی تەواوی نییە چ جای ئەوەی دەم لە دەسەڵاتی هەرێمی عەشق بکوتێ (د.دینانی) لە (دفتر عقل و آیت عشق)دا بە درێژی لەم پەیوەندییە دەدوێت، وەك گوتمان ناوی کتێبەکە لە بەیتێکی خواجە حافز وەرگراوە بەهەرحاڵ لای عارفەکان عەقڵ زۆر بەبێ دەسەڵات سەیردەکرێ (ابو الحسین نوری) سەبارەت بە بێتوانایی عەقڵ لە مەسەلە خوداییەکاندا نووسیویەتی:" کاتێك خودای گەورە عەقڵی دروستکرد پێی گوت من کێم؟ عەقڵ لە بەرامبەر پرسیارەکەدا بێدەنگ بوو...." { دینانی، دفتر عقل و آیت عشق، ل۲۷}



هەر ئەم بێدەسەڵاتییەی عەقڵە لە ئاست مەسەلە نادیارەکانی عیرفاندا کە عارفەکانی هانداوە لە هەرێمەکەی خۆیاندا دەسەڵات لە عەقڵ بسەننەوە، چونکە عەقڵ لە سنووری هەستەکان دەرناچێت و هەر ئەم بێ دەسەڵاتییەی عەقڵە کە (باسکال) دەڵێ: (دڵ بەڵگەی وای هەیە کە عەقڵ لێیان بێ خەبەرە) {خرمشاهی، ج۱، ل٦٩١}

هەڵبەت پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەم عەقڵە جیاوازە لە عەقڵی گشتی کە هەندێ جار بەگیانیش ناوزەد دەکرێت و لای عارفەکان پەسەندکراوە.

خواجەی عارف یاخود دڵی عارفانەی خواجە دڵنیایە کە لەم هەرێمەی عیرفان و عەشقی ئەزەلیدا عەقڵی تازە و گیرۆدەی کات و شوێن هیچی لە دەستنایەت، بۆیە دەڵێ: مەی بهێنە و بەزمی عەشق بەرپاکە و بە رێگری عەقڵ لەو بەزم و رەقسەی عەشقە مەمان ترسێنە (واتە عەقڵ بڵێ کە ئەمە رێی تێ ناچێت و شێتییە) چونکە ئەو حاکمە یان ئەو پۆلیسی عەقڵە لە هەرێمی عەشقدا هیچ دەسەڵاتێکی نییە و تەنانەت هیچ کارەش نییە.

**٤- فرصت شمر طریقهء رندی که این نشان**

**چون راه گنج بر همه کس آشکاره نیست**

**فورسەت شومور تەریقەیی ریندی کە ئین نیشان، چون راهی گەنج بەر هەمە کەس ئاشکارە نیست.**

رێگە و رێچکەی رەندی بە فرسەت بزانە، چونکە نیشانەی ئەم رێگەیە وەك رێگەی گەنج لای هەمو کەس ئاشکرا نییە.

فرصت شمر: بە فرسەت دانە قەڵەم، بە غەنیمەت و دەسکەوت زانین

نشان: نیشانە، هێما        گنج: گەنج و جەوهەر        آشکار: روون، ئاشکرا

طریقهء رندی: تەریقەتی رەندی، رێکچەی رەندی

لە غەزەلەکانی پێشوودا کەمێك لە رەند و رەندی دواین کە بریتییە لە ئازادبوون لە بەند و قەیدی کۆمەڵگە و دووروویی و درۆکانی، دەکرێ ئەمە مانایەکی گشتی و سەرەتایی رەند و رەندی بێت، لای حافز و شاعیرانی دیکەی ئەو سەردەمانەی شیعری فارسی، (د.خرمشاهی) چەندین سیمای رەند و رەندی لای خواجە دیاری کردووە کە لێرەدا بە پێویستی دەزانم گرنگترینیان دەستنیشان بکەین:

رەند و رەندی پلەوپایەیەکی هێندە بەرزی پێدراوە کە ئەگەر (ولی الله) نەبن نزیك دەبنەوە لەو پلەیە، رەند کەسایەتیەکە کە لە رووخساردا دژیەك و (متناقض) و لە ناخدا هەماهەنگ و

(متعادل)ە، لە کاتێکدا رەند و رەندی و رندان لە دیوانی حافزدا زیاد لە هەشتا جار بەکارهاتووە ئەم سیمایانەی پێدراوە:

ا- رەندی چارەنووس و قیسمەتی ئەزەلییە و مرۆڤ بە ویست و ئارەزووی خۆی هەڵی نابژێرێ.

ب- رەند ئەهل و ئەربابی خۆشی و شادییە.

پ- رەند لە بەرامبەر زاهید و زوهد دایە و جیاوازە لە زاهدان.

ت- رەند و رەندی دوژمنی دوورویی و فریوکاری و ریایە.

ج- رەندان بەرژەوەندی خوازنین و قەلەندەرن و زۆرشت لێکنادەنەوە پێش ئەنجام دانیان.

چ- رەندان ناو و ناوبانگ رەتدەکەنەوە و مەلامەتین، واتە دەکرێ کارێ بکەن ببێتە مایەی سەرزەنشتکردنیان تا توشی ناوبانگ و دوورویی نەبن.

ح- رەندان عاشقن.

خ- لە رووخساردا گەدایانە هەڵسوکەوت دەکەن و داواکەری پلەوپایە نین، بەڵام لە ناخدا پلە و مەقامێکی بەرز و هەست بە شانازییان هەیە.

د- رەندان ئەهل و ئەربابی داوا و نزا و پاڕانەوەن.... {خرمشاهی، ج١، ل٤٠٦ ـ٤١٣}

کەواتە تەریقە و رێچکەی رەندی هەمو ئەم سیما و تایبەتیانەی هەیە و هەر ئەمەشە کە خواجە حافز بە گەنج و گەوهەری دەزانێ و بە دەسکەوتی دەژمێرێ و پێی وایە وەك چۆن هەمو کەس رێگەی گەوهەر نازانێ هەروایش نیشانەی ئەم رێگەی رەندییە لای هەموکەس ئاشکرانییە، بۆیە بە وانەی ئەو رێگەیان دۆزیوەتەوە دەڵێ: بە غەنیمەت و دەستکەوتی بزانە و لەکیسی مەدە.

**٥- او را به چشم پاك توان دید چون هلال**

**هر دیده جای جلوهء آن ماه پاره نیست**

**ئو را بە چەشمی پاك تەڤان دید چون هیلال، هەر دیدە جای جیلڤەیی ئان ماهپارە نیست.**

ئەو وەك مانگی یەکشەوە بە چاوی پاك دەتوانرێ ببینرێ، هەر چاوێك جێگەی جیلوەی ئەومانگ ئاسایە نییە.

توان دید: دەتوانرێ ببینرێ     هلال: مانگی یەك شەوە، کەوانەیی

ماهپارە: مانگ ئاسا، یاری جوان

بینینی (هلال) لە سەرەتای مانگی عەرەبیدا پێویستی بە چاوی پاك هەیە، یاخود وەك ئەو ئەفسانە ئاینییە پێویستی بە پاکی و نزا خوێندن هەیە ئەگەرنا نابینرێ. خواجە (مەعشوق)ی



بە مانگی یەکشەوە داناوە کە بە ئاسانی نابینرێ و پێویستی بە چاوی پاك (پاکی و نزا خوێندن) هەیە وەك مانگی یەکشەوەی جەژن کە ناپاکەکان ناتوانن ببینن هەرچاوێك جێگەی جیلوەی یاری جوان نییە و هەمو چاوێ ناتوانێ ببینێ.

ئەمەی سەرەوە واتای زمانی بەیتەکەیە بەڵام ئایا خواجە مەبەستی لە (ئەو) (پاك) چییە.

گەر (ئەو)خودا و مەعشوقی ئەزەلی و ئەبەدی عارفەکان بێت ئەوا بینینەکە (بە هێنانی چاو و دیدە) دەکەوێتە دوارۆژ چونکە بینین لە دونیادا واقیع نەبووە و لە چاکترین گومانەدا تصور و وێناکردنێکی زەینی تاکەکەسییە.

بێگومان لە دوارۆژیشدا هەمو مرۆڤەکان توانای بینینی ئەو (خودا)یە یان نییە چونکە خودا لە دوارۆژدا پەردە لەسەر روی خۆی تەنیا بۆ باوەڕداران لادەدا، وەك دەفەرموێ (وجوه یومئذ ناضرة الی ربها ناظرة) {القیامة/٢٢}و هەرگیز ئەم پەردەیە لەسەر چاوی بێ باوەڕان لانادرێ و خودا نابینن (کلا انهم عن ربهم یومئذ لمحجوبون){المطففین/١٥} بەم پێیە بێت (پاکی) باوەڕداری و داوێنپاکییە و دەبێتە مایەی بینینی خودا لە دوارۆژدا لەوێش (ئەو) لە هەمو چاوێکدا جیلوە ناکات و تەنیا چاوانی پاکان جێگەی جیلوەی (ئەو)مەحبووبە جوانە مانگ ئاساییە.

**٦- از چشم خود بپرس که ما را که می کشد**

**جانا گناه طالع و جرم ستاره نیست**

**ئەز چەشمی خود بپورس کە ما را کە می کوشەد، جانا گوناهی تالیئ و جورمی ستارە نیست.**

لە چاوی خۆت بپرسە کە کێ ئێمە دەکوژێ، گیانە گوناهی بەخت و تاوانی ئەستێرە نییە.

بپرس: بپرسە     می کشد: دەکوژێ     طالع: بەخت و ئیقباڵ

جرم: تاوان     ستارە: ئەستێرە

خواجە پێی وایە چاوانی یارە کە دەبێتە مایەی گرفتارکردنی ئێمە و کوشتنمان (بە واتای ئەدەبیانەی) و هەرچیمان بەسەردێ لە سایەی ئەوەوە بەسەرمان دێ نەوەك بەخت و ئەستێرەگەری لە چارەی ئێمەی نوسی بێت. دەکرێ هەریەك لە میسراعەکان تۆختر بکەینەوە، بۆ نمونە گەر بمانەوێ زیاتر لە زاڵمی چاوانی یار بدوێین و گوناهی سەر بەخت و ئەستێرەکانیش بخەینە سەر ئەستۆی چاوانی یار. بەڵام بەندە وای بۆ دەچم جەختکردنەوە لەسەر مانای میسراعی دوەم زیاتر لە مانای قوولی حافز نزیکمان دەخاتەوە چونکە خواجە زۆر بە توندی دژ بە کاریگەری ئەستێرە و ئەستێرەگەری لە چارەنوسی مرۆڤدا دەوەستێتەوە، لێرەشدا دەڵێ:

گیانە ئەی دۆست لە چاوانی خۆت بپرسە کە ئێمە گرفتاری کێین، بەخت و ئەستێرە هیچ کاریگەریەکیان نییە و توانای ئەوەیان نییە کە لە چارەنوسی مرۆڤدا رۆڵ بگێڕن دەکرێ (دۆست/جانان) هەمان ئەو دەسەڵاتدارە بەخشندەیە بێت کە چارەنوسی هەمومانی بەدەستەوەیە.

خۆ دەکرێ بەم واتا سادەیەش رازی نەبین و واتای عیرفانی (چشم) کە (بصیرت و تجلی جمال)ە، لەبەرچاوبگرین و قووڵتر بەیتەکە راڤە بکەین.

**۷ـ نگرفت در تو گریەء حافظ بە هیچ رو**

**حیران آن دلم کە کم از سنگ خارە نیست**

**نەگرفت دەر تو گریەی هافز بە هیچ رو، هەیرانی ئان دلەم کە کەم ئەز سەنگی خارە نیست.**

بە هیچ شێوەیەك گریانی حافز کاری لە تۆ نەکرد، سەرم لەو دڵە سوڕماوە کە هیچی کەمتر نییە لە بەردی خارا.

نگرفت در تو: کاریگەری لە تۆ نەکرد، تۆی نەگرت (ئەم دەربڕینە لە کوردیشدا بەکاردێت، هەر چەندە لە کوردیدا زیاتر بۆ حاڵەتی سلبی بەکاردێ، بۆ نموونە دەگوترێ خوای من بتگرێ، خوای من گرتی، ......)     گریە: گریان

بە هیچ رو: بە هیچ شێوەیەك     حیران: سەرسوڕماو، حەیران

سنگ خارا: سەنگی خارا، بەردی خارا کە بەردێکی رەشی رەقە

بە یار دەڵێ: حافز زۆر گریا، بەڵام بە هیچ شێوەیەك کاریگەریی لە تۆ نەکرد و دڵت نەرم نەبوو، هەر بۆیە سەرم سوڕماوە لە دڵی تۆ کە لە رەقیدا هیچی کەمتر نییە لە بەردی خارا و وەك ئەو سەخت و رەقە، بۆیە بەگریانی حافز نەرم نابێ.



## غەزەلی حەفتا و چوارەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**۱ـ روشن از پرتو رویت نظری نیست کە نیست**

**منّت خاك درت بر بصری نیست کە نیست**

**رۆشەن ئەز پەرتوڤی رویەت نەزەری نیست کە نیست، مننەتی خاکی دەرەت بەر بەسەری نیست کە نیست.**

سەیرکردنێك (چاوێك) نییە کە لە رووناکی پرتەو (تیشك)ی رووخسارتەوە رۆشن نەبووبێتەوە و چاوێکیش نییە کە منەتی خاکی بەردەرگای تۆی بەسەرەوە نەبێت.

روشن: رۆشن، رووناکی     نظر: سەیرکردن، چاو

درت: دەرگات     بصر: چاو

تۆ روناکی بەخشی روانین و چاوەکانی و خاکی بەردەرگاشت بەهێزکەری دیدەکانە و هەموو رووناکی چاوەکان منەت باری خاکی بەردەرگای تۆن.

گەر لە بەیت و غەزەلەکانی پێشوودا گەرد و تۆزی بەردەرگای یار سورمەی چاوی عاشق بووبێت، ئێستا سورمەی چاوی هەمووانە و ئەبێتە مایەی بەهێزکردنی و هەمووان لە ژێر منەتی ئەو گەرد و تۆزە توتیائاسایەدان و چاوان یا سەیرکردنەکانیش هەموویان لە تیشك و پەرتەوی رووخساری (تۆ)وە رووناکی وەردەگرن. بێگومان ئەو(تۆ) یە دەبێ رازێنەری گشت مەخلوقات بێت کە لە جوانترین شێوە خولقاندویەتی و لە پرتەوی حوسن و رووناکی خۆی بەشی داون. هەرچەندە (خاکی بەردەرگات) بەرەو شوێنێکی زەمینیمان دەبات، بەڵام (تۆ) ی بەیتی دووەم، بە تەواوی ئەم گومانەمان دەرەوێنێتەوە.

**۲ـ ناظر روی تو صاحب نظرانند آری**

**سرّ گیسوی تو در هیچ سری نیست کە نیست**

**نازری روی تو ساهیب نەزەرانەند ئاری، سیرری گیسوی تو دەر هیچ سەری نیست کە نیست.**

تەنیا(عارفانی خاوەن نەزەر) سەیرکەری رووی تۆن ئەرێ، نهێنی و رازی پرچی تۆ لە هەموو سەرێکدا هەیە.

ناظر: سەیرکەر، تەماشاکەر     صاحب نظر: خاوەن دیدەکان، عارفەکان

سر: نهێنی، راز        گیسو: پرچ

ئەكرێ بپرسین بۆچی بە جەختكردنەوەوە(ئەرێ) تەنیا عارف (صاحب نظر)ەكان تەماشاكەری رووخساری یارن و كەسی دیكە ئەم پلە و مەقامەی پێ نادرێت !.

لێرەدایە ناچار دەبین راڤە و شرۆڤەی عیرفانی بەیتەكە دەست پێ بكەین، چونكە یاری عیرفانی لە هەموو چاوێكدا جیلوە ناكات و پلە ومەقام پێویستە تا بگەینە پلەی (ناظر)ی كە رەنگە بەم ناوەوە، مەقامێكی تەریقەت نەبێ.

دیسانەوە پێویستە جیاوازی نێوان (تەماشاكەر) و (بینەر) بخەینەڕو، چونكە مەرج نییە تەماشاكەر بینەر بێت، بەڵكو پلەیەكی پێش بینینە كە رەنگە هەرگیز(بینین)یش روونەدات، هەروەك چۆن لە نێوان (روانین) و (بینین)دا جیاوازی هەبوو بینینی خودا لە دونیادا كارێكی مەحاڵی دوورە، چونكە هەرگیز ئەزەلی نایەتە نێو (زەمكانی)یەوە هەرچەندە عارفەكان لەو بڕوایەدان دەكرێ رووبدات، بەڵام رووی نەداوە، بەڵام (ناظر) و (نظر) ئاسایە، هەرچەندە بە (رویت قلبی)و... هتد تەئویل كراوە.

بەهەر حاڵ هەر چەندە ئەو كەسانەی كە گەیشتونەتە پلەی (ناظر) بەڕووی مەعشوق(كە مانای رووەرگێڕانە لە گشت مەخلوقات و رووكردنە خودا و بە ئومێدی رەحمەت و لوتفی ئەو ژیانیش دەگەیەنێت) تەنیا صاحێب نەزەر و دیدەكانن و بریتین لە ئەولیا و عارفە گەورەكان، بەڵام هەر كەسێك بگری مەسەلەی نهێنی و رازی گیسوی یاری (كە لە زاراوەی عیرفانیدا بە نهێنییە خوداییەكان و خەلق لێكدەدرێتەوە) لەسەریدا هەیە، هەوڵی كردنەوەی ئەو گرێیە دەدات. بە قسەی د.هروی (هەر كەسێ رێژەیەك ئامادەگی تەیكردنی قۆناغەكانی عیرفانی تێدایە) {ج١، ل٣٣٠}، بەڵام لە راستیدا هەوڵ و حەزی كردنەوەی نهێنی یە خوداییەكان كە لە هەموو سەرێكدا هەیە هێندە واتای (فضولی) دەگەیەنێ و واتای ئامادەیی تەیكردنی قۆناغەكانی عیرفان ناگەیەنێ، چونكە عیرفان بە (فضولی) دەست پێ ناكات، هەرچەندە خواجە ئەمە نالێت.

**٣ـ اشك غمّاز من ار سرخ برآمد چه عجب**

**خجل از كردهء خود پردەدری نیست كه نیست**

**ئەشكی غەمازی مەن ئەر سورخ بەرامەد چە ئەجەب، خەجەل ئەز كەردەیی خود پەردەدەری نیست كە نیست.**

فرمێسكی دوو زمانی من ئەگەر بە سوری لە چاوم رژا هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونكە هیچ دوزمانێك نییە شەرم لە كردەوەی خۆی نەكاتەوە.



غمّاز: قسەهەڵبەست، قسەهێنەر و قسەبەر بە مەبەستی تێكدانی نێوانی دوو كەس، دوزمان، دەم شڕ و نهێنی بڵاوكەرەوە

لای خواجە پاراستنی رازی عیرفانی و نهێنی پەیوەندی عاشقانەی عاشق و مەعشوق یەكێكە لەگرنگترین سیماكانی عاشق و زۆر داكۆكی لێدەكات، بەڵام ئێستا فرمێسكی چاوانی كە بە دەمشڕی یان دوزمانی خۆی ئەم نهێنی و رازە بڵاودەكاتەوە و لە جیهان دەگەیەنی كە خواجە عاشقە و من گەواهی ئەو حاڵەتەم. هەربۆیە ئەم فرمێسكە دەمشڕەی من ئێستا سوورهەڵگەراوە و خوێنین بووە سەرسوڕهێنەر نییە، چونكە لە شەرمدا سورهەڵگەڕاوە (بێگومان لە شەرمی ئەوەی كە دوزمانی كردوە و راز و نهێنی خواجەی بڵاوكردووەتەوە) ئەمەش جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونكە هەركەسێ ئەمە كاری بێت شەرمەزاری چاوەڕێی دەكات و شەرم لە پیشەكەی خۆی دەكاتەوە ـ كاتێ ئاشكرادەبێت ـ.

**٤- تا به دامن ننشیند ز نسیمت گردی**

**سیل خیز از نظرم رهگذری نیست كه نیست**

**تا بە دامەن نەنشینەد ز نەسیمەت گەردی، سەیل خیز ئەز نەزەرەم رەهگوزەری نیست كە نیست.**

تا لە ئەنجامی هەڵكردنی شەماڵەوە گەردێك لە داوێنت نەنیشێ، رێگەیەك نییە كە لە ئەشكی چاوانم لافاوی لێ هەڵنەسابێت.

دامن: داوێنی كراس        ننشیند: نەنیشێت        گرد: گەرد، تەپ و تۆز

سیل: لافاو        سیل خیز: شوێنێ كە لافاوی لێ هەستێ        نظر: چاو

خۆشەویستی و عەشقی بۆ یار وای لێ دەكات كە تەواوی رێگەكانی هاتووچۆی مەعشوق بە ئەشكی چاوی وەك لافاو بشواتەوە و ئاوپرژێن بكات، تاوەكو دامەنی یار بە تەپ و تۆز پیس نەبێت.

**٥- تا دم از شام سرزلف تو هرجا نزند**

**با صبا گفت و شنیدم سحری نیست كه نیست**

**تا دەم ئەز شامی سەری زولفی تو هەرجا نەزەنەد، با سەبا گوفت وشەنیدەم سەهەری نیست كە نیست.**

تاوەكو لە بارەی تاریكی پرچتەوە لە هەر شوێنێ قسەنەكات، بەیانی نییە لەگەڵ سەبادا قسە و باسم نەبێ.

دم نزند: قسەنەكات        شام: شەو

شام سرزلف: تاریکی پرچ، نهێنی پرچ، ڕەشایی پرچ        هرجا: هەر شوێنێ، هەموو شوێنێ.

گفت و شنید: گفتوگۆ، قسە و باس، جەروبەحس، هەرا        سحر: سەحەر

مەسەلەی بڵاوکردنەوەی رازی پرچی یار لەلایەن سەباوە مەسەلەیەکی بەربڵاوی ئەدەبیاتی عیرفانی و عاشقانەی ئێرانییە. لێرەشدا خواجە وەك هەموو جارێك قسەوباس و تەنانەت توڕەبوون و شەڕەکانی لەگەڵ سەبادا دووبارە دەکاتەوە، زۆرسادە و ساکار و بەبێ هیچ تازەکارییەك دەڵێ: بۆ ئەوەی سەبا نهێنییەکانی پرچی تۆ لە هەموو شوێنێ بڵاونەکاتەوە و قسەیان لەبارەوە نەکات، سەحەر و بەیانیان زوو نییە کە قسەوباس و هەرا و گفتۆمان نەبێ.

**٦- من ازین طالع شوریده به رنجم ورنه**

**بهرمند از سرکویت دگری نیست که نیست**

**مەن ئەزین تالیئی شوریدە بە رەنجەم و ڤەر نی، بەهرەمەند ئەز سەری کویەت دیگەری نیست کە نیست.**

من لەم بەختە پەرێشانەی خۆمەوە لە زەحمەتدام، ئەگەرنا کەسێکی دیکە نییە کە لە سەرکۆڵانی تۆدا شتێکی دەستگیر نەبووبێ.

طالع: بەخت، بوورج، لە ئەستێرەگەریدا مانگی لەدایکبوون بە بوورج و تالع دەدرێتە قەڵەم، کە گوایە کاریگەری لە چارەنووسی ئەوکەسەدا دەبێت، زۆرجار لە حافزدا هەر بە واتای بەخت هاتووە        شوریدە: پەرێشان، پەشێو، بەد

بە رنجم: لە زەحمەتدام، یاخود واتای (دڵشکاو و عاجز) دەگەیەنێ

ورنە: ئەگەر نا        دگر: کەسێکی دیکە

زۆرجار خواجە ئەستێرەگەری رەتدەکاتەوە هەربۆیە (بەخت) لێرەدا لەگەڵ قەڵەمەکەی قەدەردا یەکدەگرێتەوە کە چارەنووسی مرۆڤی پێ نووسراوە، خواجە دەڵێ: من لە ئەنجامی بەختی پەشێوی خۆمەوەیە لە ئەنجامی قەڵەمی قەدەری خۆمەوەیە کە لە عەزاب و رەنجدام، یاخود من لە بەختی خۆم عاجزم کە نەمتوانیوە لە سەرکۆڵانی تۆدا، لە میهرەبانی و لوتفە بەردەوامەکانی تۆ بەهرەمەندبم، ئەگەرنا هەمووان کەم و زۆر بەهرەمەندبوون، واتە لوتفی تۆ بەردەوامە و بۆ هەمووانە، من لە بەدبەختی خۆمەوە بەهرەمەند نەبووم لێی.

**٧- از حیای لب شیرین تو ای چشمهٔ نوش**

**غرق آب و عرق اکنون شکری نیست که نیست**



**ئەز هەیای لەبی شیرینی تو ئەی چەشمەیی نوش، غەرقی ئاب و ئەرەق ئەکنون شەکەری نیست کە نیست.**

ئەی چەشمەی زوڵاڵ شەکرێك نییە کە لە شەرمی لێوی شیرنی تۆدا غەرقی ئاو و عارق نەبووبێت.

از حیا: لە شەرمدا     چشمە: سەرچاوە، چەشمە     نوش: زوڵاڵ، شیرین، نۆش

غرق آب و عرق: نغرۆی ئاو و عارەق، مەبەست لە شەرم و تەریق بوونەوەیە.

دەکرێ (چشمە نوش) ئاوەڵناو بێت بۆ (تو) واتە تۆ کە وەك سەرچاوەی زوڵاڵی یاخود جیاواز بێت و ناوێك بێت، دەکرێ (شرین) و(شکر) دو ئاوەڵناو بن، یان ناوی دوو مەعشوقەکەی خوسرەو پەروێز بن.

گەر (چشمە نوش) ئاوەڵناوبێت و(شیرین) و (شکر) ئاوەڵناو، ئەوا مانای بەیتەکە بەم شێوەیە دەبێت:

ئەی یار کە وەك کانییەکی زوڵاڵی لە شەرم و حەیای لێوی شیرینی تۆدا هەرچی شەکرە ئێستا غەرقی ئاو و عارەق بووە، واتە شەکر شەرمەزار بووە و لە شەرما عارەقی کردۆتەوە.

گەر (چشمە نوش) ناو بێت و (شیرین) و (شکر) ناوی دوو مەعشوقەکەی (خوسرەو پەرویز) بن مانای بەیتەکە پێویستی بەم شیکردنەوەیە دەبێت: کاتێك خوسرەو پەروێز (عاشقی یەکەمینی شیرینی ئەرمەنی) ـ هەرچەندە لای ئێمە هێندەی شیرین و فەرهاد ناوبانگی هەیە خوسرەو پەروێز ناوبانگی نییە ـ دڵی لە شیرین رەنجا، رووی کردە یارێکی دیکە بە نێوی (شەکەری ئەصفەهانی)، بەڵام خوسرەو نەیتوانی لە عەشقی شیرین دەرچێت و دووبارە گەڕایەوە بۆ لای، (چشمە نوش)یش ئەو کانییەیە کە جارێك شیرین خۆی تێدا شووشت و خوسرەو ئەوی بینی (هەرچەندە پرچە زۆرەکەی ببووە حیجابی). بەم واتایە لێرەدا لەگەڵ ئەو کانییە زوڵاڵەدا دەدوێ کە شیرین خۆیی تێدا شووشتووە و دەڵێ: ئەی کانی زوڵاڵ لە تاو لێوی (شیرین)ی تۆ (شەکری ئەسفەهانی) شەرمی کرد و نغرۆی عەرەق بووە.{بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.هەروی، ج١، ل٣٣٦ ـ ٣٣٧}.

**٨- آب چشمم که بر او منّت خاك در تست**

**زیر صد منّت او خاك دری نیست که نیست**

**ئابێ چەشمەم کە بەرو مننەتی خاکی دەری توست، زیری سەد مننەتی ئو خاکی دەری نیست کە نیست.**

ئاوی چاوم کە منەتی خاکی بەردەرگای تۆی بەسەرەوەیە، خاکی بەردەرگایەك نییە کە لە ژێر سەد منەتی ئەودا نەبێ.

برو/بر او: لەسەر ئەو تست/تواست: تۆیە

خواجە لە بەیتی یەکەمدا هەموو چاوەکانی لەژێر منەتی خاکی بەردەرگای یاردا زانیوە، لێرەشدا دووبارەی دەکاتەوە کە فرمێسکی چاوم منەتباری خاکی بەردەرگای تۆیە، بەڵام جگە لەو دەرگا و ئاستانەی تۆ خاکی دەرگای دیکە نییە کە لەژێر سەد منەتی فرمێسکی چاوی مندا نەبێ، واتە کە فرمێسك دەڕژم لەبەر خاتری تۆیە یان بە پلەوپایەی بەرزی عارفەکان گەیشتوم و ئەمەش وای لێکردووم منەتی کەسی دیکە هەڵنەگرم جگە لە تۆ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەرگا نییە منەتباری من نەبێ.

**٩- از وجودم قَدَری نام و نشان هست که هست**

**ورنه از ضعف در آنجا اثری نیست که نیست**

**ئەز ڤوجودەم قەدەری نام و نیشان هەست کە هەست، ڤەرنە ئەز زەئف دەر ئانجا ئەسەری نیست کە نیست.**

لە بوونی من ئەوەندە ناونیشان هەیە کە بتوانی بڵێی هەیە، ئەگەر نا هیچ لاوازییەك نییە کە تیایدا نەبێ.

وجود: بوون قدر: ئەوەندە، هێندە، ئەندازە نام و نشان: ناونیشان اثر: نیشانە

بەیتەکە باس لە لاوازی شاعیر دەکات و دان بەوەدا دەنێ کە: لە بوون و وجودی من تەنیا تۆزێك ناونیشان ماوە (هەر ئەوەندەیە کە ناوم ماوە) ئەگەرنا لاوازی و بێ هێزی نییە کە تیایدا نەبێت. دەکرێ ئەم بەیتە نیشانەی پیری و لاوازی خواجە بگەیەنێ ـ هەرچەندە بەندە باوەڕم بەم جۆرە لێکدانەوەیە نییە، چونکە رەنگە ئەم شیعرە لە سەرەتای تەمەنی لاویەوە گوترابێ ـ کێ دەزانێ؟! کەی شیعر باس لە تەمەن و شتە جەستەییەکان دەکات تا ئەم جۆرە لێکدانەوەیەی بۆ بکرێت!.

**١٠- شیر در بادیهء عشق تو روباه شود**

**آه ازین راه که در وی خطری نیست که نیست**

**شیر دەر بادیەیی ئیشقی تو روباه شەڤەد، ئاه ئەزین راه کە دەر ڤەی خەتەری نیست کە نیست.**

شێر لە بیابانی عەشقی تۆدا دەبێتە ڕێوی، وای لەم ڕێگەیە کە تیایدا مەترسییەك نییە، کە نییە.

بادیە: بیابان، سەحرا روباه: ڕێوی



خواجە لێرەدا ترسناکی ڕێگەی عەشق دەخاتەڕوو، تەنانەت هێندە ترسناکە شێرێتی لە شێر دەسەنێتەوە و دەیکاتە ڕێوی، خواجە دەڵێ: وای لە ڕێگە و بیابانی عەشقی تۆ کە هەرچی مەترسی و خەتەر هەیە تیایەتی، ئەو بیابانەی کە شێر دەکاتە ڕێوی.

**١١- مصلحت نیست که از پرده برون افتد راز**

**ورنه در مجلس رندان خبری نیست که نیست**

**مەسلەهەت نیست کە ئەز پەردە بەرون ئوفتەد راز، ڤەرنە دەر مەجلیسی ریندان خەبەری نیست کە نیست.**

بەرژەوەندی و مەسڵەحەت نییە کە راز و نهێنی لە پەردە بێتە دەرەوە، ئەگەرنا لە کۆڕی رەنداندا خەبەرێك نییە، کە نییە.

مصلحت: بەرژەوەندی برون افتد: بکەوێتە دەرەوە، دەرکەوێ

کۆڕی رەندان هەموو هەواڵێکی تێدایە، کۆڕی رەندانی (حافزی) هەموو نهێنییەکانی تێدایە و رەندان/ عارفان ئاگایان لە نهێنی هەیە، بەڵام مەسڵەحەت نییە کە ئەو نهێنی و رازانە باسکرێن، هەربۆیە رەندان بێدەنگن، بێدەنگی رەندان لەوەوە نییە کە هیچ نازانن، بەڵکو لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە بە چاکی نازانن پەردە لەسەر نهێنییەکان لابدەن.

**١٢- غیر ازین نکته که حافظ ز تو ناخشنودست**

**در سراپای وجودت هنری نیست که نیست**

**غەیر ئەزین نوکتە کە هافز ز تو ناخوشنودەست، دەر سەراپای ڤوجودەت هونەری نیست کە نیست.**

جگە لەم خاڵەی کە حافز لێت ناڕازییە، لە سەراپای وجودتدا هونەرێك نییە، کە نەبێ.

نکتە: خاڵ ناخشنود: ناڕازی

هنر: هونەر، لێهاتن، توانا

یار تەنیا هونەرێکی نییە کە رازیکردنی خواجەیە ئەگەرنا هەرچی هونەر و لێهاتن هەیە لە وجودیدا هەیە، خواجەش دان بەمەدا دەنێ کە جگە لەم خاڵەی کە حافز رازیناکەیت هەرچی توانا و هونەرە لە وجودتدا هەیە.

## غەزەلی حەفتا و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**۱-حاصل کارگه کون و مکان این همه نیست**

**باده پیش آر که اسباب جهان این همه نیست**

**هاسیلی کارگەهی کۆون و مەکان ئین هەمە نیست، بادە پیش ئار کە ئەسبابی جەهان ئین هەمەنیست.**

بەرهەمی (دەسکەوتی) کارگەی گەردوون و شوێن هیچ نییە، بادە بهێنە کە هۆکارەکانی ژیان هیچ نییە.

حاصل: بەرهەم، دەسکەوت    کارگە: کارگە

کون و مکان: جیهان، دونیا و هەرچی تێدایە

این همه نیست: ئەم هەمووە نییە، هیچ نییە

پیش آر: بهێنە پێشەوە، ئامادەکە    اسباب: کاڵا، بەرگ، هۆکار

خواجە سەبارەت بە بێ بەهایی و بێ نرخی دونیا ئەدوێ و پێیوایە کە ئەگەر جیهان کارگەیەك بێت بەرهەم و دەستکەوتی ئەو کارگەیە هیچ نییە، هەربۆیە مرۆڤ نابێت دڵی پێ خۆش بێت و بە ساقی دەڵێ: بادە و شەراب بهێنە کە هۆکارەکانی ژیان، جوانی و کاڵاکانی ژیانی دونیا هیچ نییە، بێگومان بادەش عەشقە، کەواتە خواجە دونیا رەتدەکاتەوە و بە بێ بەهای دەزانێ لە بەرامبەر ئەودا عەشق (بادە) بە بەهادار دەداتە قەڵەم.

**۲- از دل و جان شرف صحبت جانان غرض است**

**همه آن است وگرنه دل و جان این همه نیست**

**ئەز دل و جان شەرەفی سوهبەتی جانان غەرەزست، هەمە ئانەست ڤەگەرنە دل و جان ئین هەمە نیست.**

مەبەست (غرض) لە دڵ و گیان شەرەفی هاودەمی خۆشەویستە، هەمووی بۆ ئەوەیە ئەگەرنا دڵ و گیان هیچ نییە.

شرف: رێز، گەورەیی، پایە، شەرەف وەك (شەرەفی هاورێیەتی تۆم پێدراوە)

صحبت: هاودەمی، هاورێیەتی، پێکەوەبوون    جانان: یار، خۆشەویست، مەعشوق

غرض: مەبەست، غەرەز.



دڵ و گیانیش گەر شەرەف و رێزی پێکەوەبوون و هاودەمی خۆشەویست یا مەعشوقی پێ رەوا نەبینرێ یا خود مەبەستی نەبێت هیچ جیاوازی لەگەڵ (کارگەی کەون و مەکان) و (اسباب جیهان)دا نییە و دەبێتە شتێکی دونیایی و بەهای خۆی لە دەست دەدات، هەربۆیە دەڵێ: ئێمە دڵ و گیانمان بە مەبەستی شەرەف و پایەی پێکەوەبوون و هاودەمی یار (مەعشوقی حەق) پێ بەهادارە ئەگەرنا بە بێ ئەمە (واتە بەبێ عەشقی مەعشوق) دڵ و گیان هیچ نییە.

واتە: دڵ و گیان خۆی لە خۆیدا بەهادار نییە، بەڵکو وابەستەیی ئەوان بە مەعشوقەوە بەهایان پێ دەدات ئەگەرنا بێ بەهان.

**۳- منّت سدره و طوبی ز پی سایه مکش**

**که چو خوش بنگری ای سرو روان این همه نیست**

**مننەتی سیدرە ڤو توبی ز پەی سایە مەکیش، کە چو خوش بنگەری ئەی سەرڤی رەڤان ئین هەمە نیست.**

لەبەر سێبەر منەتی درەختی سیدرە و توبا هەڵمەگرە، چونکە (ئەی سەرووی بەژن رێك) گەر جوان سەیر کەیت، ئەوەندەش نییە.

سدره و طوبی: دوو درەختن لە بەهەشتدا(یا لە ئاسماندا) رواون    سایە: سێبەر

منت مکش: منەت هەڵمەگرە    بنگری: سەیر کەیت

سرو روان: سەرووی بەژن رێك، سەرووی بەژن رێك خودی مەعشوقە و (سدره و توبی)ش دو درەختی بەهەشتین و دەکرێ مەبەست لە خودی بەهەشت بێت

ز پی: بۆ، لەبەر

خواجە لێرەدا لە نرخ و بەهای بەهەشت کەم دەکاتەوە (ئەو بۆچوونە باوەی کە عارفە گەورەکان پەیڕەوی لێدەکەن)، چونکە باوەڕیان وایە کە لەزەت و خۆشییەکانی بەهەشت بۆ مرۆڤە سادە و ئاساییەکانە و عارفەکان بە دوای شتێکی دیکەدا وێڵن، وەك وتە بەناوبانگەکەی رابیعەی عەدەوی کە داوای بەهەشتی لەخودا نەدەکرد بەڵکو تەنیا خودی مەعشوقی دەویست، خواجە بە شێوەیەکی دیکە دەڵێ: منەتی سێبەری درەختەکانی بەهەشت هەڵمەگرە، چونکە گەر جوان لێکی بدەیتەوە هێندە ناهێنێ و ئەو هەمووە بەهایەشی نییە کە باوەڕدارە بەرژەوەندیخوازەکان باسی دەکەن، بێگومان ئەمە لە بەرامبەر (مەشعوقی حەق)دا ئاوا بێ بەها دەبێت، نەوەك خوانەخواستە خواجە بیەوێ لە بەهای بەهەشت کەم بکاتەوە، بەڵکو دەیەوێ هاودەمی مەعشوقی (خاوەن بەهەشت) بەهادارتر بکات.

**٤- دولت آن است که بی خون دل افتد به کنار**

**ورنه با سعی عمل باغ جنان این همه نیست**

**دۆوڵەت ئانەست کە بی خون دل ئوفتەد بە کەنار، ڤەرنە با سەئیی ئەمەل باغی جینان ئین هەمە نیست.**

خۆشبەختی ئەوەیە کە بێ ڕەنج و زەحمەت دەستکەوێت، ئەگەرنا بە هەوڵی کار باخی بەهەشت هیچ نییە.

دولت: خۆشبەختی، سەرکەوتن خون دل: خوێنی دڵ، مەبەست لەم ئیدیەمە ڕەنج و زەحمەتکێشانی لەڕادەبەدەرە

افتد به کنار: دەست کەوێت، بێتە دەست          سعی عمل: هەوڵی کۆشش

باغ جنان: باخی بەهەشت

خۆشبەختی و دەستکەوت ئەوەیە کە بەبێ ڕەنج و زەحمەتکێشانی لە ڕادەبەدەر و خۆڕەتاندن دەستکەوێت و بەجۆرێك لە جۆرەکان پێی ببەخشن، وەگەرنا بە هەوڵی کردار و کۆشش باخی بەهەشت چێژ و تامی نییە، یان هیچ نییە. (سودی) پێیوایە مەبەست لە میسراعی دووەم ئەوەیە کە کاروکردەوە نابێتە مایەی چوونە بەهەشت {ج١، ل٤٧٠} لە ڕاستیدا ئەم ڕایە هەیە کە تەواوی کردەوەی مرۆڤ بەهای بەهەشتی نییە، بەڵکو خودا بۆ خۆی بەهەشت بە خەڵات دەبەخشێ، دەکرێ خواجەش هەر ئەمە بڵێ کە بەکردەوە هیچ کۆناکەینەوە بەهەشت ئەوەیە کە خودا بیبەخشێ وەك (جەنابی د. سروش) دەڵێ: بەهەشت بە بەها (نرخ) نییە، بەڵکو بە بەهانەیە. واتە بەکڕین ناکڕێ، بەڵکو خودا بیانوویەکی دەوێ تا بیبەخشێ.

**٥- پنج روزی که درین مرحله مهلت داری**

**خوش بیاسای زمانی که زمان این همه نیست**

**پەنج ڕوزی کە دەرین مەرهەلە موهلەت داری، خوش بیاسای زەمانی کە زەمان ئین هەمە نیست.**

لەم قۆناغ و مەنزڵەدا پێنج و دوو ڕۆژێك مۆڵەت هەیە، سەردەمێك بە ئارامی و خۆشی بژی، چونکە کاتی ژیان درێژنابێ.

پنج روزی: پێنج ڕۆژێك، لە کوردیدا لە بری پێنج ڕۆژێك، پێنج و دوو ڕۆژێك دەگوترێ، ماوەیەکی کەم

مرحله: قۆناغ، مەنزڵگە، ڕێکردن لە نێوان دوو خاڵدا قۆناغ دەگوترێت، مەبەست لە دونیایە

مهلت: مۆڵەت



بیاسای: ئاسوودەبە، ئارامگربە.

زمان این همه نیست: زەمان درێژ نابێ (تەمەن درێژ نابێ) یاخود کات بەها و ئەرزشی نییە

مرۆڤ لە دونیادا خەمی ئەوەیەتی کە چەند ساڵ زیاتر تەمەن بگوزەرێنێ لە کاتێکدا کە خۆشبەختی لە تەمەنی درێژدا نییە، یاخود بەلای کەمی وابەستەی تەمەنی درێژ نییە، ئێمە گەر هەمیشە لە خەمی تەمەنی بەسەرچووماندا بین هێندەش کە ماوە ناتوانین خۆشحاڵ بین، هەربۆیە بیرکردنەوە لە کات و تەمەن هێندە ناهێنێ، خواجە لەم جۆرە بۆچوونە دەدوێ، ئەو پێیوایە کە ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی لەم قۆناغەدا دەیگوزەرێنی بە ئاسوودەیی و ئارامی بەسەری بەری و لە بیری تەمەندا نەبی چاکترە، چونکە تەمەن بەشی ئەمە ناکات یاخود هێندە ناهێنێ بیری لێی بکەینەوە.

ئەو دەڵێ: کە لەم مەنزڵگەیەی دونیادا پێنج و دوو ڕۆژێك مۆڵەتت هەیە بە خۆشی و ئارامی هزر بژی، چونکە کات هێندە ناهێنێ خۆتی بۆ بکوژی و بیر و هزری خۆتی بۆ ئازار بدەیت.

**٦- بر لب بحر فنا منتظریم، ای ساقی**

**فرصتی دان که ز لب تا به دهان این همه نیست**

**بەر لەبی بەهری فەنا مونتەزیریم، ئەی ساقی فورسەتی دان کە ز لەب تا بە دەهان ئین هەمە نیست.**

لەسەر لێوی دەریای فەنا چاوەڕێین، ئەی ساقی بە فرسەتی بزانە، چونکە لە لێو تا دەم هێندە نییە.

لب: لێو، لێوار (لێو) لە کوردیدا کەمتر بۆ لێوی دەریا بەکاردێ و گۆڕاوە بە کەنار یا لێوار، بەڵام لە فارسیدا هەردوو واتاکە دەدات، لێرەدا لەبەر لایەنە ڕەوانبێژەیەکە هەر بە لێو نووسراوەتەوە          فنا: لەناوچون، مەرگ

فرصت: فرسەت، سەرە و نۆرە          دهان: دەم، زار

(فنا) بە مەرگ لێکدراوەتەوە، بەڵام دەکرێ واتای عیرفانی (فناء فی الله)ش مەبەست بێت بەڵام باسی لێوە نەکراوە، واتە دەکرێ بڵێ: ئەی ساقی، ئەی هۆکار و واسیتەی عەشق، من لەسەر لێواری مەقام و پلەی (فناء فی الله) ڕاوەستاوم و زۆرم نەماوە بەو پلەیە بگەم بە فرسەتی بزانە پێکی عەشقی ئیلاهیم بدەرێ تا بگەمە ئەو پلە و مەقامە، چونکە زۆرم نەماوە.

ئەم واتایەی سەرەوە تەئویلێکی ماندوکەرانەیە، هەروەها هەریەك لە(سودی و خرمشاهی و هروی) فنایان بە مەرگ لێکداوەتەوە بگرە جەختیان لەسەر ئەم واتایە کردووەتەوە. بەم پێیەش خواجە دەڵێت: ئێمە لە دونیادا لەسەر لێواری دەریای مەرگ چاوەڕێین و دەکرێ ئێستا یا ساتێکی دیکە بکەوینە ناوی، ئەی ساقی ئەم ساتەوەختەی ژیان کە چاوەڕوانی کردنی مەرگە

به فرسەت بزانە و خۆشی و چێژمان بدەرێ، چونکە لە لێو تا دەم هیچ دوورییەك نییە و مردنمان زۆر نزیکە.

له راستیدا قوولّی واتای ئەم بەیتە لە چاوەڕوانی کردن لەسەر لێواری دەریای فەنا دایە، چونکە ژیانی مرۆڤ هەمیشە چاوەڕوانییەکی تا رادەیەك ماندوکەرانەیە، ئەسڵەن چاوەڕوانی خۆی لە خۆیدا بە بێزاری یاخود سووتان و تاسە و ئارەزوو و دڵەڕاوکێ دەورە دراوە، هەربۆیە دەبێ لەم ساتی چاوەڕوانییەدا مەست بین، چونکە رەنگە ماوەیەکی درێژ لەسەر ئەم لێوارەی دەریای مەرگەدا چاوەڕێ بین.

**٧- دردمندیّ من سوختهء زار و نزار**

**ظاهراً حاجت تقریر و بیان این همه نیست**

**دەردمەندیی مەنی سوختەیی زار و نیزار، زاهیرەن هاجەتی تەقریر و بەیان ئین هەمە نیست.**

دەردەداری من کە سووتاوی پەرێشانی و بێ هێزیم ئاشکرایە و وادیارە پێویستی بە هیچ خستنەڕوو و بەیانکردنێك نییە.

دردمند: دەردەدار    زار: پەرێشان

نزار: لاواز، بێ هێز    حاجت: پێویستی

خواجە کە سووتاو و بێ هێز و پەرێشانی دەستی رۆژگارە و بە ئاشکرا بە جەستەیەوە دیارە کە لاواز و پەککەوتەیە پێی وایە هێندە روونە پێویستی بەوە نییە باسی بکات و بیخاتەڕوو.

**٨- زاهد، ایمن مشو از بازی غیرت زنهار**

**که ره از صومعه تا دیر مغان این همه نیست**

**زاهید ئیمەن مەشو ئەز بازیی غیرەت زینهار، کە رەه ئەز سۆومەئە تا دەیری موغان ئین هەمە نیست.**

زاهید، ئامان لە یاریی غیرەت بێ خەم مەبە، چونکە رێگە لە عیبادەتگا تا دێری موغان ئەوەندە نییە.

ایمن: بێ خەم

غیرت: غیرە، پێ ناخۆش بوون، حاڵەتی غیرەکردن یا غیرە بردن بە شتێ، وەك غیرەی پیاو لە ژنی خۆی یاخود ژن لە پیاو.. هتد، غیرەی خودا بۆ بەندەکانی لە کاتی سەرقاڵبوونی وەلیەکاندایە بە غەیری ئەو وەك لە (رسالەی قشیری) دا هاتووە: "بزانە کە سونەتی خودا لەگەڵ وەلییەکانی خۆیدا ئەوەیە کە کاتێ ئەوان بە غەیری ئەو سەرقاڵ دەبن یان دڵیان بە



غەیری ئەوەوە مەشغوڵ دەبێ، خەمیان بۆ دەخوا (لە) غیرە بۆ دڵی ئەوان تا بە ئیخلاصی عیبادەتی بکەن"{خرمشاهی، ج١، ل٦٠٤ }، د. هرویش سەبارەت بە غیرەی ئیلاهی نووسیویەتی:" غیرەت لە فەرهەنگدا بە واتای حەسودی و پێی ناخۆش بوونە، لە زاراوەی عارفەکانیشدا پاراستنی عاشقە کە دەیەوێ مەحبووب جگە لەم لە کەسی دیکە نەڕوانێت یان جگە لە خۆی کەسی دیکە مەحبووبەکەی ئەوی خۆش نەوێ" {ج١، ل٣٤٣} . لە شەرحی وشەکانی (بابا طاهر)دا هاتووە کە غیرەی (داکۆکی) عارف بۆ پەروەردگار ئەوەیە کە عارف نایەوێ یەکێکی دیکە لە ناودا بێت و غیرەی حەقیش لە عارفان ئەوەیە کە دەیەوێ ئەو لە زرق و برقی دونیا بپارێزێ {فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی، سجادی}

زنهار: ئامان    رە: راە، رێگە

صومعە: عیبادەتگای موسوڵمانان (رەمزی ئیمانە)

دیر مغان: عیبادەتگای مەجوسیەکان، لێرەدا رەمزی کوفرە

لای حافز زاهید چەندین سیفەتی تێدایە لەوانە:

ا- غورور و خۆبەگەورە زانین.

ب- خۆ بە خواپەرست دەرخەرە و هەمیشە لە عیبادەتگادایە.

پ- ریاکار و سست ئیمانە.

ت-حەزی لە پلە و پایەی دونیاییە .

ج- بێ وەفا و بێ پەیمانە.

چ- ئەهلی عەشق و حەقیقەت نییە.

لە رواڵەتدا خۆی بە دۆست و وەلی خوا دەزانێت و ئەم سیما و سیفەتانەی سەرەوەی تێدایە و خوداش غیرەی لە وەلییەکانی خۆی ئەوەیە کە روو لە دونیا بکەن و زاهیدیش ئەم پەیمانەی لەگەڵ مەعشوقدا شکاندوە، هەربۆیە خواجە زاهیدی مەغرور و ریاکار و خۆ بە وەلی زان ئاگادار دەکاتەوە کە ئامان لە یاریی غیرەی مەعشوق بێ خەم مەبە چونکە رەنگە دەرت بکات و لە ئان و ساتدا لە ئیمان دەرچیت و دەرچوون لە ئیمانیش ئەوەندە نییە، مانای میسراعی دووەم هەر ئەمەیە.

**٩- نام حافظ رقم نیک پذیرفت ولی**

**پیش رندان رقم سود و زیان این همه نیست**

**نامی هافز رەقەمی نیك پەزیروفت ڤەلی، پیشی ریندان رەقەمی سود و زیان ئین هەمە نیست.**

ناوبانگی حافز بە چاکە دەرچووە، بەڵام لای رەندان ژمارەی سوود و زیان ئەوەندە نییە.

نام: ناوبانگ      نیك: چاکە

پـــذیرفت: وەرگرت، قەبووڵ کرد      رقم نیك پـــذیرفت: نشانەی چاکەی وەرگرت

ئەم بەیتە جۆرێك پەیوەندی دووری لەگەڵ بەیتی پێشوودا هەیە، کە باس لە غیرەی ئیلاهی دەکات و لێرەدا حافز روو لە دونیایی خۆی رەتدەکاتەوە، ئەمەش یادخەرەوەی رێبازی مەلامەتیگەری حافزە، بەهەرحاڵ خواجە دەڵێ: حافز ناوبانگی چاکی دەرکردووە، بەڵام ئەمە هیچ بەهایەکی نییە، چونکە لای رەندان (کە لای حافز زۆر جێگەی بایەخ پێدانن) ئەم مەسەلەیە هیچ نییە و ئەوان گرنگی بەم ناوبانگە نادەن.



## غەزەلی حەفتا و شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- خواب آن نرگس فتّان تو بی چیزی نیست**

**تاب آن زلف پریشان تو بی چیزی نیست**

**خابی ئان نەرگسی فەتتانی تو بی چیزی نیست، تابی ئان زولفی پەریشانی تو بی چیزی نیست.**

خەوی ئەو چاوە فیتنەگەرەی تۆ بێ شت نییە، پێچ و لولی ئەو پرچە تێکئالاوەی تۆ بێ شت نییە.

فتان: فیتنەگەر    بێ چیزی نیست: بێ شت نییە (ئەم دەربڕینە لە شێوەزاری مندا ـ جاف ـ واتای هەیە و هەمان مانای فارسی دەگەیەنێت کە (بێ هۆنییە یاخود بە خۆڕایی نییە) واتە هۆکار و سەبەبێك هەیە لە پشت ئەم کارەوە    تاب: پێچ و لول    پریشان: تێکئالاو

خواجە بە یار دەڵێ: حەتمەن شتێك لە پشت خەوی ئەم چاوە فیتنەگەرە و لول و پێچی ئەو زولفە پەرێشانەی تۆوە هەیە. هۆکاری ئەم خەو و لولییە لای هروی بۆ رفاندنی دڵی ئەهلی زەوقە {ج١، ل٣٤٥}، بەڵام سودی پێیوایە کە هۆی خەوی چاو بۆ رەحم نەکردنە بە عاشقان و لولی پرچیش بۆ شکاری دڵی عاشقانە{ج١، ل٢٧٥} هەردووکیان رێیان تێدەچێ، بەڵام خودی خواجە هیچی نەگوتووە، تەنیا دەزانێ کە شتێك هەیە، بەڵام نەیوتووە، هەربۆیە نەگوتنی بەیتەکە جوانتر دەکات.

**٢- از لبت شیر روان بوود که من می گفتم**

**این شکر گرد نمکدان تو بی چیزی نیست**

**ئەز لەبەت شیر رەڤان بوود کە مەن می گوفتەم، ئین شەکەر گیردی نەمەکدانی تو بی چیزی نیست.**

شیر لە لێوت دەتکا کە من دەمگوت ئەم شەکرەی دەوری خوێدانی تۆ بێ شت نییە.

از لبت شیر روان بوود: شیر لە لێوت دەتکا، مەبەست لەم دەربڕینە واتە منداڵی شیرەخۆرە بوویت، لە کوردیدا دەگوترێ بۆنی شیر لە دەمی دێت

این شکر: ئەم شەکرە مەبەست لە لێوی یارە

**گرد: دەوری      نمکدان: خوێدان، درکەیە لە دەم، بەلاّم لە کوردیدا ئەم جۆرە لێکچواندنەمان نییە هەربۆیە لای ئێمە نەشاز یاخود نامەئلوفە**

خواجە بە یار دەڵێ: هێشتا منداڵێکی شیرەخۆرە بوویت من هەستم کرد کە لێوی دەوری دەمت کە وەك شەکری دەوری خوێدان وایە بێ هۆ نییە.

من پێموایە خواجە لەم دوو بەیتەدا هێندە دەیەوێ بڵێت من سەبارەت بە یار شتی زۆر دەزانم ئەوەندە جوانییەکان یاخود نهێنییەکانی یار ناخاتەڕوو هەروەك لە غەزەلێکی دیکەدا دەڵێ:

(من از آن حسن روزافزون که یوسف داشت دانستم

که عشق از پردهء عصمت برون آرد زلیخا را)

هەربۆیە گەڕان لەدوی ئەم راستییە کە لە پشت بەیتەکانەوە هەیە گرنگترە لە گەڕان لە دوای ئەو شتەی کە لە (بێ شت نییە)ی بەیتەکاندا هەیە.

**٣- جان درازی تو بادا که یقین می دانم**

**در کمان ناوك مژگان تو بی چیزی نیست**

**جان درازیی تو بادا کە یەقین می دانەم، دەر کەمان ناڤەکی موژگانی تو بی چیزی نیست.**

تەمەنت درێژ بێت هەرچەندە زۆر چاك دەزانم، لە کەوان خستنی تیری برژانگت بێ شت نییە.

دراز: درێژ

جان درازی تو بادا: تەمەن درێژ بیت، سەرسەلامەت بیت

یقین دانم: زۆر چاك دەزانم، تەواو دڵنیام      کمان: کەوان

ناوك: تیر، جۆرە تیرێکە      مژگان: برژانگ

خواجە زۆر چاك مەبەستی یار لە تیری برژانگ خستنە نێوکەوان دەزانێ ـ حەتمەن وەك هەموو خوێنەرێکی خواجە و ئەدەبی کلاسیکی دەزانێ مەبەستی پێکانی دڵی عاشقانە ـ بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا تەمەنای تەمەنی درێژ بۆ یار دەکات.

**٤- مبتلایی به غم و محنت و اندوه فراق**

**ای دل این ناله و افغان تو بی چیزی نیست**

**موبتەلایی بە غەم و میهنەت و ئەندوهی فیراق، ئەی دل ئین نالەڤو ئەفغانی تو بی چیزی نیست.**



گرفتاری غەم و مەینەت و خەفەتی جودایت، ئەی دڵ ئەم ناڵە و هاوارەی تۆ بێ شت نییە.

مبتلا: گرفتار      *محنت*: مەینەت

اندوە: خەفەت، خەم      افغان: هاوار

ئەی دڵ ئەم ناڵە و هاوارەی تۆ هەروا لەخۆڕا نییە، بەڵکو بە هۆی گرفتاریتە بە خەم و مەینەت و جوداییەوە.

**٥- دوش باد از سر کویش به گلستان بگذشت**

**ای گل این چاك گریبان تو بی چیزی نیست**

**دوش باد ئەز سەری کویەش بە گولستان بگوزەشت، ئەی گول ئین چاکی گەریبانی تو بی چیزی نیست.**

شەوی رابردوو با لەسەر کۆڵانی ئەوەوە بەرەو باغ هەڵی کرد، ئەی گوڵ ئەم یەخە دادڕینەی تۆ بێ شت نییە.

دوش: شەوی رابردوو    چاك: پارچە، دڕاو و کراوە

چاك گریبان: یەخەدادڕین کە لە بەیتەکەدا درکەیە لە پشکوتنی گوڵ

شەوی رابردوو لە سەرکۆڵانی یارەوە با هەڵی کردووە و بۆنی یاری بەرەو باخ هێناوە، هەنوکەش گوڵ یەخەی دادڕیوە (پشکوتووە) خواجە دەزانێ کە ئەم یەخەدادڕینە شتێکی تێدایە بەلاّم بەیانی ناکات یاخود رەنگە ئەویش نەزانێ بۆچی یەخەی دادڕیوە، بەلاّم هەروی و سودی پێیان وایە کە گوڵ لەبەر تاسە و شەوقی دیداری یار یەخەی دادڕیوە.

**٦- درد عشق ار چه دل از خلق نهان می دارد**

**حافظ این دیدهء گریان تو بی چیزی نیست**

**دەردی ئیشق ئەر چە دل ئەز خەلق نەهان می دارەد، هافز ئین دیدەیی گریانی تو بی چیزی نیست.**

گەرچی دەردی عەشق وا دەکات دڵ لە خەڵك بشاردرێتەوە، بەلاّم حافز ئەم چاوە گریاناویانەی تۆ بێ شت نییە.

خلق: خەڵك، *مخلوقات*      دیدهء گریان: چاوانی گریاناوی، چاوانی گریاو

حافز بە خۆی دەڵێ: گەرچی لە رێبازی عاشقاندا و بە دەردی عەشق، عاشق ئەوەی لە دڵیایەتی لای هیچ کەس ئاشکرای ناکات و دەیشارێتەوە، بەلاّم چاوی تۆ زۆر فرمێسك دەرێژی و هەمیشە دەگری، ئەم گریانە بێ شت نییە رەنگە رازت لە پەردە بهێنێتەدەرەوە یان ئەسڵەن رەنگە دەردی عەشقت نەبێ، یان...، یان...

## غەزەلی حەفتا و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**( مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان )**

**١- جز آستان توام در جهان پناهی نیست**

**سر مرا بجز این در حواله گاهی نیست**

جوز ئاستانی تو ئەم دەر جەهان پەناهی نیست، سەری مەرا بجوز ئین دەر هەڤالە گاهی نیست.

لە جیهاندا جگە لە بەردەرگای تۆ پەناگەیەکم نییە و سەری من جگە بۆ ئەم دەرگایە بۆ هیچ شوێنێکی دیکە حەواڵە نەکراوە.

جز: جگە پناە: پنا حوالە: حەواڵە،گەڕاندنەوە،ناردنەوە حوالەگاە: شوێنی ناردنەوە

خواجە پێی وایە بەردەرگای یار تەنیا پەناگای ئەمە و چارەنوسیشی هەروایە بۆ بەر ئەم بەردەرگایە نێردراوی، هەر بۆیە بە یار دەڵێ: لە جیهانی جگە لە بەردەرگای تۆ هیچ پەناگەیەکم نیە و جگە لەوەی، کە سەرم بەرەو دەرگای تۆ بێنەوە هیچ شوێنێکی دیکەم نییە رووی تێ بکەم.

**٢- عدو چو تیغ کشد من سپر بیندازم**

**که تیر ما بجز از نالەییّ و آهی نیست**

ئەدو چو تیغ کەشەد مەن سیپەر بیەندازەم،کە تیری ما بجوز ئەز نالەیی و ئاهی نیست.

کاتێ دوژمن شمشێر هەڵکێشێ من قەڵغان فڕێ دەدەم (تەسلیم دەبم)، چونکە تیری ئێمە جگە لە ناڵە و ئاه هیچی دیکە نیە.

عدو: دوژمن تیغ: شمشێر سپر: قەڵغان سپر انداختن: قەڵغان فڕێدان، ئیدیەمێکە لە فارسیدا بە واتای تەسلیمبون بەکاردێت (چەك دانان)

سپربیندازم: تەسلیم دەبم

ئێمەی هەژار جگە لە ناڵە و ئاه هیچ چەکێکی شەڕکردنمان نییە و تیرمان تەنیا ناڵە و ئاهێکە و هیچی دیکە، هەر بۆیە کاتێ دوژمن بەمەبەستی شەڕکردن لەگەڵ مندا شمشێر هەڵکێشێ من ناچارم تەسلیم دەبم و شەڕ ناکەم.



دەکرێ مەبەست لەوە بێت، کە منی عاشق کاتێ چەکم تەنیا ئاه و ناڵەیەکە پاڵەوانبازی مەیدانێکی دیکە ناکەم، کە شەڕی شمشێر و قەڵغانە. هەربۆیە ئەگەر دوژمنەکەم لە جۆری دووەم بو تەلسیم دەبم.

**٣- چرا ز کوی خرابات روی برتابم**

**کزین بِهَم به جهان هیچ رسم و راهی نیست**

چرا ز کوی خەرابات روی بەر تابەم، کەزین بیهەم بە جیهان هیچ رەسم و راهی نیست.

بۆچی روو لە کۆڵانی مەیخانە وەرگێڕم، کە بۆ من لە جیهاندا ڕێوڕەسمێکی لەمە چاکتر نییە.

روی بر تابم: روو وەرگێڕم به: چاك رسم وراە: ڕێوڕەسم، شێواز.

خواجە نایەوێ روو لە کۆڵانی عەشق وەرگێڕێ و بگەڕێتەوە، چونکە لای ئەو ئەم شێوازە عاشقبوون و عەشق چاکترین ڕێوڕەسم و شێوازە لە جیهاندا هەیە، هەربۆیە رەمزی عەشق (مەیخانە) دەهێنێ و دەڵێ: بۆچی روو لە مەیخانە وەرگێڕم لەکاتێکدا لای من لە جیهاندا لەم شێوازە چاکتر نییە.

**٤- زمانه گر بزند آتشم به خرمن عمر**

**بگو بسوز که بر من به برگ کاهی نیست**

زەمانە گەر بزەنەد ئاتەشەم بە خیرمەنی ئومر، بگو بسوز کە بەر مەن بەرگی کاهی نیست.

گەر زەمانە ئاگر لە خەرمانی تەمەنم بەردا،بهێڵە بسووتێ، چونکە لای لە پەلکە پووشێك چاکتر نیە.

آتش: ئاگر خرمن: خەرمان بگو: بڵێ، بهێڵە برگ: گەڵا،پەلك کاه: کا، پوش

وەك هەمیشە حافز تەمەنی بەلاوە بێ نرخە، لێرەدا تەمەنی خۆی لە پەلکە پوشێك بە چاکتر نازانێ هەربۆیە دەڵێ: گەر زەمانە ئاگر لە خەرمانی تەمەنم بەردا لێی گەڕێ با بسووتێ، چونکە ئەو تەمەنە لای من هێندەی پەلکەپووشێك قیمەتی نییە.

**٥- غلام نرگس جمّاش آن سهی قدم**

**که از شراب غرورش به کس نگاهی نیست**

غولامی نەرگسی جەمماشی ئان سەهی قەدەم،کە ئەز شەرابی غرورەش بە کەس نیگاهی نیست.

غولامی چاوی مەستی ئەو بەژنڕێکەم، کە لە تاو مەستی غروری سەیری کەس ناکات.

جماش: مەست،دڵفڕێن، شۆخ، عیشوەگەر          سهی قد: بەژنڕێك

هەرچەندە چاوانی مەست و عیشوەگەری یاری بەژنڕێك لە تاو مەستی غروری خۆی لا لە کەس ناکاتەوە و سەیری کەس ناکات، بەڵام خواجە هەرخۆی بە غوڵامی دەزانێ.

سودی وتەنی: واتە غروری جوان ڕێگرە لە بەردەم سەیرکردن و لاکردنەوەی بە لای کەسدا {ج١، ل٤٨٠}.

**٦- مباش در پی آزار و هرچه خواهی کن**

**که در شریعت ما غیر ازین گناهی نیست**

مەباش دەر پەیی ئازار و هەرچە خاهی کون،کە دەر شەریئەتی ما غەیر ئەزین گوناهی نیست.

لە هەوڵی ئازاردانی خەڵکیدا مەبە و هەرچیت دەوێ بیکە، چونکە لە شەریعەتی ئێمەدا جگە لەمە گوناهێ نییە.

مباش: مەبە          درپی: لەدوی، لەهەوڵی

خواجە خەڵك ئازاردان بە گەورەترین گوناه دەزانێ، هەربۆیە دەڵێ تەنیا ئەم گوناهە مەکە، ئیدی هەرچیت دەوێ بیکە و لە شەریعەتی ئێمەدا جگە لەمە گوناهێك نییە، (واتە گوناهی گەورەتر لەمە نییە، مەبەست نەفی گەورەیی گوناهە نەوەك خودی گوناهەکە، هەروەها مەبەست لە ـ هرچە خواهی کن ـ هەرچیت دەوێ بیکە ) فەرمان و مۆڵەت نییە، بەڵکو مەبەست لەوەیە، کە گوناهی دیکە لە چاو ئەم گوناهەدا وەك گوناه سەیرناکرێت، واتە کردنی گوناهی دیکە لە چاو کردنی ئەم گوناهە گەورەیەدا وەك بڵێی گوناه نییە.

خواجە لێرەدا هێندە هەوڵی ئەوە دەدات، کە مرۆڤ ئازاردان بەگوناهێکی گەورە بداتە قەڵەم. ئەوەندە هەوڵی روونکردنەوەی گوناه و دیدی خۆی سەبارەت بە گوناه نییە، دەکرێ ئەمە (تەشبیە نەبێ) وەك فەرمودەکانی (ترغیب و ترهیب) دابنێین.

**٧- عنان کشیده رو ای پادشاه کشور حسن**

**که نیست بر سر راهی که دادخواهی نیست**

ئینان کەشیدە رو ئەی پادشاهی کیشڤەری هوسن،کە نیست بەر سەری راهی کە دادخاهی نیست.

ئەی پاشای وڵاتی جوانی هێواش برۆ، چونکە سەرەڕێیەك نییە داواکارێکی تێدا نەبێ.

عنان: هەوسار، رەشۆ          عنان کشیده: هەوسار ڕێکشراو (کاتێ ئەسپ ڕێ دەکات گەر هەوساری بۆ شل کرێت خێرا دەڕوات، بەڵام گەر هەوسارەکەی راکێشرێت و توندکرێت



هێواش دەڕوات. لێرەدا مەبەست لە هێواش ڕۆشتنە          کشور: وڵات          سر راه: سەرەڕێ          دادخواه: داواکەر،مەزڵوم، شکاتکەر

ئەی یار کە تۆ پادشای وڵاتی جوانیت کاتێ گوزەر دەکەیت هەوساری ئەسپەکەت راکێشە، تا هێواش بڕوات، چونکە لە هەر سەرەڕێگەیەکدا مەزڵوم و داواکارێك راوەستاوە تا داواکەییت پێشکەش بکات و شکاتی خۆی لە زوڵمی مەعشوقمان بە تۆ بگەیەنێ.

**٨- عقاب جور گشادست بال در همه شهر**

**کمان گوشه‌نشینی و تیر آهی نیست**

ئوقابی جۆور گوشادەست بال دەر هەمە شەهر،کەمانی گوشەنشینی و تیری ئاهی نیست.

هەڵۆی ستەم باڵی بەسەر هەمو شاردا راکێشاوە، کەوانی گۆشەنشینی و تیری ئاهێك نییە.

عقاب: هەڵۆ          جور: جەور، ستەم، زوڵم          گشادست: کردوویەتیەوە          بال: باڵ

شار بە تەواوی کەوتوەتە ژێر سێبەی زوڵمەوە و زوڵم بە تەواوی سێبەری بەسەر شاردا کردووە، وەك هەڵۆیەکی لێهاتوە، کە باڵی بەسەر هەمو شاردا کێشاوە. ئایا گۆشەنشینی و پیاوی خودایەك نییە، کە دۆعایەك بکات ئەم زوڵم و ستەمەی سەر شار کۆتایی بێت، کە ئەو گۆشەنشینییە ببێتە کەوان و تیری ئاهونزولەی تێ بکرێت و هەڵۆی ستەمی پێ بکوژرێت.

**٩- چنین که از همه سو دام ره می بینم**

**به از حمایت زلفت مرا پناهی نیست**

چونین کە ئەز هەمە سو دامی رەه می بینەم،بیە ئەز هیمایەتی زولفەت مەرا پەناهی نیست.

مادام لە هەمو لایەکەوە داوی سەرەڕێ دەبینم، چاکتر لە پەنای زوڵفت هیچ پەنایەکی دیکەم نییە.

چنین: بەم شێوە، مادام          از همه سو: لەهەمولایەکەوە

لەلایەکەوە رێگەی خواجە لە هەمولایەکەوە پڕە لە داو و زوڵفی یاریش لەلایەکی دیکەوە بۆ خۆی داوێکە، لەم رێگەیەدا مرۆڤ گرفتاری داوێك دەبێت، خواجە پێی وایە کە چاکترین داوێك، کە دەبێتە پەناگەیەك لە داوەکانی دیکەی ژیان زوڵفی یارە، هەرئەمەیە کە لە بەیتی یەکەمیشدا بەردەرگای یار بە تاکە پەنا دەزانێت.

دەكرێ ئەم داوانەی ژیان بە ڕێباز و بۆچوونەكان بزانین و زولفی یاریش بە ڕێبازی عیرفان یان عەشقی ئیلاهی، ئەو داوەی كە لە جێگەی دیكەدا خواجە باسی لێدەكات، خواجەش بۆ خۆی لە نێو ئەو ڕێبازانەدا زولفی یار بە تەنیا پەنا بزانێت و عیرفان بە تەنیا ڕێباز بزانێت بۆ رزگاربون لە داوەكانی دیكە.

**١٠-خزينەی دل حافظ به زلف و خال مده**

**كه كارهای چنين حدّ هر سياهی نيست**

خەزینەیی دلی هافز بە زولف و خال مەدەه،كە كارهای چونین هەدی هەر سیاهی نیست.

گەنجینەی دڵی حافز مەدە بە پرچ و خاڵ، چونكە هەر ڕەشێك (كۆیلەیەك) حەدی ئەم كارانەی نییە.

حافز دڵی خۆی بە گەنجینەیەك دەزانێ، كە لای یاری داناوە، هەربۆیە بە یار دەڵێ: ئەم خەزێنە بە نرخە لای خۆت بهێڵەرەوە و مەیدە دەستی پرچ و خاڵی ڕەش (مادیاتی ژیان)، چونكە گەنجینە هەڵگرتن و بوونە ئەمینداری گەنجینە كارێكی زۆر گەورەیە و هەر كۆیلەیەكی ڕەشپێست حەدی نییە كە ئەم كارانەی پێ بسپێرن.



## غەزەلی حەفتا و هەشتەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسور**

**( فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات )**

**١-بلبلی برگ گلی خوش رنگ در منقار داشت**

**وندران برگ و نوا خوش نالەهای زار داشت**

بولبولی بەرگی گولی خوش رەنگ دەر مینقار داشت،ڤەندەران بەرگ و نەڤا خوش نالەهای زار داشت.

بولبولێك پەڕەگوڵێكی جوانی لە دەنووكدا بوو، لەگەڵ ئەم سەروەت و سامانەشدا ناڵەی خۆشی غەمناكی دەكرد.

برگ گل: پەڕەی گوڵ خوش رنگ: جوان منقار: دەنوك برگ و نوا: سەورەت و سامان، توێشو،زاد، دارایی زار: زەبون، ناڵە و گریانی بە سۆز و غەمگینانە،زاری كردن

بێگومان بولبول یەكێكە لە عاشقە سووتاوەكانی گوڵ لێرەدا بولبول ڕەمزی عەشق، پەڕەگوڵێكی جوانی بە دەنووكەوە بوو، لەگەڵ ئەم سەروەت و سامانەشدا ناڵەی غەمناك و بە سۆزی لێ بەرز دەبوویەوە.

لە ڕاستیدا ئەبوو بە پێچەوانەوە بێت، چونكە نزیكی گوڵ لە بولبولەوە دەبێ بولبول دڵشاد بكات نەوەك بناڵێنێ.دەبێ هەر خواجە خۆی وەڵامان بداتەوە بۆچی بولبول بە كەساسی دەناڵێنێ:

**٢- گفتمش در عين وصل اين ناله و فرياد چيست**

**گفت ما را جلوەی معشوق در اين كار داشت**

گوفتەمەش دەر ئەینی ڤەسل ئین نالەڤو فەریاد چیست،گوفت ما را جیلڤەیی مەئشوق دەرئین كار داشت.

پێم گوت لەكاتی دیداردا ئەم ناڵە و هاوارە چییە،گوتی جیلوەی جوانیی مەعشوق منی والێكردوە.

گفتمش: پێم گوت درعين وصل: لە نێو خودی دیداردا، لەكاتی دیداردا ناله و فرياد: ناڵە و هاوار

بەڵێ خواجەش هەمان پرسیار لە بولبول دەکات، کە هەمووومان بۆمان دروست دەبێت (لە کاتێکدا یارت لایە و لە کاتی دیداردایت ئەم گریان و هاوارە لە پای چیـ؟) خواجە ئەمە بە بولبول دەڵێت لە وەسڵدایت ئیدی ئەم گریان و هاوارە چییە، بولبول وەڵام دەداتەوە، جیلوەی جوانی یار، کەوتنە رووی جوانی یار منی خستۆتە هاوار و ناڵە، دەکرێ ئەم حاڵەتە گوزارشت لە گریانی عارفەکان بکات لە کاتی حاڵدا، چونکە ئەوانیش لەو کاتی دیدارەدا فرمێسکی تاسە و ئارەزو دەڕژن.

**٣- یار اگر ننشست با ما نیست جای اعتراض**

**پادشاهی کامران بود از گدایان عار داشت**

یار ئەگەر نەنشەست با ما نیست جای ئیئتیراز،پادشاهی کامران بود ئەز گیدایان ئار داشت.

ئەگەر یار لەگەڵ ئێمەدا دانەنیشت جێگەی گازاندە نییە، پاشایەکی خۆشبەخت و کامەران بوو، عەیبی لێهات لەگەڵ گەدایاندا دانیشێ.

ننشست: دانەنیشت،لەگەڵدا نەژیان    با ما: لەگەڵ ئێمە    اعتراض: گازاندە

کامران: خۆشبەخت، خۆشگوزەران،کامەران    گدایان: گەدایان، هەژاران

عار: عەیب، عار    عارداشت: پێی عەیب بو

یار تێکەڵاوی عاشقان ناکات و لە گەڵیاندا ناژی، خواجە لەم هەڵوێستەی یار نیگران نییە و پێی وایە، کە هیچ کاتێ جێگەی گازاندە و گلەیی نییە، چونکە یار پاشایەکی خۆشبەختە و ئەمانیش کۆمەڵێ هەژار و گەدا و پێی عەیبە لەگەڵیاندا بژی.

گەر (یار) عیرفانی بێت مانای بەیتەکە حەقیقی واقیعییە و یار هەمیشە دوورە لە ژینگەی بچووك و بەرتەسکی مرۆڤەوە.

**٤- در نمی گیرد نیاز و ناز ما با حسن دوست**

**خرّم آن کز نازنینان بخت برخوردار داشت**

دەر نەمی گیرەد نیاز و نازی ما با هوسنی دوست،خوررەم ئان کەز نازەنینان بەختی بەرخوردار داشت.

نیاز (داوا) و نازی ئێمە کاریگەری لە جوانی دۆست ناکات، دڵشاد ئەو کەسەی کە پشکێك لە نازەنینان لە بەختیدا هەیە.

درنمی گیرد: کاریگەری نابێت    نیاز: داوا، پێویستی    ناز: ناز، فەخر

خرم: دڵشاد، خۆشبەخت    نازنینان: کۆی نازەنینە    برخوردار: بەهرەمەند



خواجە بە ناز و داواکانی لە جوانی دۆست هیچی دەستگیرنەبووە، یان ئەم داوا و نازەی خواجە هیچ کاریگەریی لە جوانی دۆست نەکردوە، هەربۆیە لێرەدا ئەوە دەردەبڕی، کە تەنیا داوا و ناز تەنیا(تەنیا هەوڵ و کۆشش) بەس نین بۆ بەدەستهێنانی ئاوڕدانەوەی دۆست لە عاشق، بەڵکو بەخت و قەدەریش گرنگە یاخود ئەسڵەن و بەخت و قەدەر گرنگە، بۆیە دەڵێ: نیاز و نازی ئێمە کاریگەری لە جەمال دۆست نەکرد خۆشبەحاڵی ئەوکەسەی، کە بەخت یاوەریەتی و لە بەختیدا یاخود لە چارەی نووسراوە کە لە نازەنینان نزیك بێتەوە یان کاریگەری لە سەریان هەبێت، بەکورتی واتە: ئێمە لە چارەمان نەنووسراوە بەدیداری یار بگەین و داوا و نازمان بەس نییە بۆ ئەو بەیەکگەیشتنە.

**٥- خیز تا بر کلك آن نقّاش جان افشان کنیم**

**کاین همه نقش عجب در گردش پرگار داشت**

خیز تا بەر کلکی ئان نەقاش جان ئەفشان کونیم،کین هەمە نەقشی ئەجەب دەر گەردشی پەرگار داشت.

هەستە تاگیانی خۆمان فیدای قەڵەمی ئەو نیگارکێشە بکەین، کە ئەم هەموو نیگارە سەرسوڕهێنەرە لە سوڕی پرگاڵەکەیدا بو.

خیز: هەستە    کلك: قەڵەم    نقاش: نیگارکێش، وێنەکێش    جان افشان: گیان کردنە قوربانی    نقش: نیگار، رەسم

عجب: سەرسوڕهێنەر، جوان    گردش: سوڕ، سوڕانەوە    پرگار: پرگاڵ

بێگومان ئەو نیگارکێشەی کە ئەم هەموو نیگارە سەرسوڕهێنەر و جوانەی ژیانی کێشاوە و پرگاڵەکەی ئەم هەمو نەخشە جوان و سەیرەی تێدابووە شایانی ئافەرینکردنە، چونکە زاناترین و ئەندازیارترین کەس کە لەم هەمو نەخشە رێك و پێك و جوان و تا رادەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەرەی مەخلوقات و ژیان ورددەبێتەوە نەخشەسازی و دانایی دروستکەرەکەیی بۆ دەردەکەوێت.

خواجە زۆر روون خۆی دەکاتە قوربانی قەڵەمی نەخشەسازی ژیان کە خودایە، بۆ خاتری ئەو هەمو جوانکارییە سەرسوڕهێنەرەی کە لەدروستکردنی مەخلوقاتدا بەکاری هێناوە و لەسەرووی هەمووشیانەوە مرۆڤ کە بۆ خۆی دەفەرموێ ـ لە جوانترین شێوەدا دروستمان کرد ـ انا خلقنا الانسان فی احسن تقویم){التین/٤} .

گیانمان فیدای قەڵەمی تۆ ئەی نەخشەسازی مەخلوقات، کە پریشکێك لە جەمالی خۆت تێدا جیلوە داوە.

**٦- گر مرید راه عشقی فکر بدنامی مکن**

**شیخ صنعان خرقه رهن خانه‌ی خمّار داشت**

گەر موریدی راهی ئیشقی فیکری بەدنامی مەکون،شەیخی سەنئان خیرقە رەهنی خانەیی خەممار داشت.

گەر موریدی رێگەی عەشقی لە ناوزڕان مەترسە، لە ماڵی مەیفرۆشدا شێخی سەنعان خرقەی خۆی خستبووە رەهنی مەیەوە.

مرید: لە زماندا بە واتای خاوەن ئیرادە دێت، لە عیرفانیشدا بە کەسێ دەگوترێ، کە بۆ گەیشتن بە حەق ئیرادەی بداتە دەست یەکێ لە وەلییەکانی خودا و ئیتاعەتی فەرمانەکانی بکات{خرمشاهی،ج١،ل٣٨٥} مورید، رێبواری تەریقەت، کە بە پلەی شێخایەتی نەگەشتوە و لە ژێردەستی مورشیدێك دایە        بدنامی: بەدناوی، ناوزڕان        رهن: رەهن

مەسەلەی خرقە خستنە رەهنی مەی لە لایەن شێخی سەنعانەوە (سودی) نوسیویەتی: (.. کچی گاور مەی لە شێخی سەنعان داواکرد، بەڵام چونکە شێخ لە چینی هەژارەکان بوو توانای هیچی نەبوو، واتە خاوەنی هیچ شتێ نەبوو کە ویستی کچەکە بهێنێتە دی، خرقەکەی خۆی خستە رەهنی شەراب و شەرابەکەی هێنا و لەگەڵ کچەکە نۆشی کرد){سودی، ج١، ل٤٨٧}

لە راستیدا ئەم مەسەلەیە تەنیا (سودی) باسی کردووە و لە سەرچاوەکانی دیکەدا بەم وردیە باسنەکراوە. هەرچەندە رەنگە سوودیش ئەم مەسەلەیەی لە بەیتەکەوە هەڵێنجابێت، بە هەرحاڵ شێخی سەنعان لای خواجە رەمزی عاشقی تەواو و کامڵە کە هەرگیز لە ناوزڕان ناترسێ و عەشق هەرچی بوێت ئەنجامی دەدات.

بۆیە دەڵێت: گەر تۆش مورید و قوتابی و رێبواری رێگەی عەشقی، ترسی بەدناوی و ناوزڕانت نەبێت و هەرچی عەشق داوای دەکات ئەنجامی بدە، چونکە شێخی سەنعان کە مورشیدێکی گەورەی تەریقەت بوو ناوبانگێکی زۆری هەبوو (تەنانەت مورشید بوو نەوەك مورید) جگە لەوەی، کە ببوە گاور و مەیخۆر و شوانی بەراز بۆ رازیکردنی دڵی مەعشوقەکەی لە ماڵی مەیفرۆشێکدا خرقەکەی، کە رەمزی ئیمان و ناوبانگەکەی بوو خستە رەهنی شەرابەوە یان لە بری پارە دای بە مەی و شەراب.{سەبارەت بە چیرۆکی شێخی سەنعان بگەڕێوە بۆ غەزەلی (١٠)}

**٧- وقت آن شیرین قلندر خوش که در اطوار سیر**

**ذکر تسبیح مَلَک در حلقه‌ی زنّار داشت**



ڤەقتی ئان شیرین قەلەندەر خوش کە دەر ئەتڤاری سەیر،زیکری تەسبیهی مەلەك دەر هەلقەیی زوننار داشت.

کاتی ئەو قەلەندەرە خۆشەویستە خۆش بێت، کە بە پشتوێنی زونارەوە لە حاڵەتەکانی سەیر و سلوکدا وەك فریشتەکان زیکر و یادی خودای دەکرد.

قلندر: کەسێکە کە لە شێوە و سیفاتی عادەتی پاك بووبێتەوە و بە پلەی روح تەرەقی کردبێت لە بەند ئازاد بوبێت {خرمشاهی،ل٣٨٧}

شیرین قلندر: قەلەندەرە شیرینە، دەروێشە خۆشەویستە (مەبەست لە شێخی سەنعانە)

خوش: خۆش بێت، شادبێت        اطوار: کۆی طورە، بە واتای حاڵ و بارودۆخ دێت

سیر: رەوت، سەیر و سلوکی عارفان تەریقەتی عارفان        اطوار سیر: ئەو حاڵەتانەی کە لە رەوتی عارف لە نێو تەریقەتدا دێتەدی

ذکر: یاد، جۆرە یادکردنەوەیەکی خودا        تسبیح: سوبحانەڵاکردن، پاك و بێگەردی خودا گوتن یاخود (تەزبیح)ە کە لە کاتی یاد و زیکری خوادا بە دەستەوەیە

تسبیح ملك: پاك و بێگەردی خوداکردنی مەلائیکەکان، تەسبیحی فریشتەکان لە چەندین جێگەی قورئانی پیرۆزدا باسکراوە وەك {الزمر/٧٥} دەکرێ لێرەدا مەبەستیش لە یادێکی پاکی فریشتە ئاسابێت .

حلقە: ئەڵقە        زنار: ملوانکەیەك یان تەزبیحێك کە گاورەکان دەیکەنە ملیان یاخود پشتوێنی تایبەتی پیاوانی ئاینی مەسیحی.

دەروێشی خۆشەویست و شیرین لێرەدا شێخی سەنعانە، کە لەگەڵ ناوزڕانیدا، بەڵام فریشتەئاسا یاد و زیکری خودای دەکرد، هەرچەندە لە شێوەی مەسیحیدا بوو و زوناری هەبوو، لێرەدا بەیتی پێشو تۆکمەتر دەکات، کە شێخی سەنعان هەرچەندە ناوبانگی لە دەستدا، بەڵام یاد و زیکری خوای لە دەست نەدا و هەمیشە فرشتەئاسا لە زیکر و یادیدا بو، تۆش لە ناوزڕاندن مەترسە گرنگ دوەمیانە کە بەردەوامیە لە یادی خودادا.

**٨- چشم حافظ زیر بام قصر آن حوری سرشت**

**شیوه‌ی جنات تَجری تحتَها الانهار داشت**

چەشمی هافز زیری بامی قەسری ئان هوری سریشت،شیڤەیی جەناتی تەجری تەهتەهەلئەنهار داشت.

چاوی حافز لە ژێر سـەقفی قەسـری ئـەو حـۆری سروشـتەدا شـێوەی (جنـات تجـری تحتهـا الانهار)ی هەبو.

بام: سەقف          حوری سرشت: حۆری سروشت، وەك حـۆری، پێکهاتـەی ئـەو سروشـتی حۆری ئاسا

جنات: باغ، باغات، باغاتی پڕ درەخت          جنات تجری تحتها الانهار: باغاتێك کە رووباری تێدابێت و ئاو بە ژێر درەختەکانیدا بڕوات.

خواجە لە ژێر سەقفی یاردا کە وەك حۆریە گریاوە و چاوانی فرمێسکی رشتووە ئـەو باغـە رازاوەیەی یار کە پڕە لە دار و درەخت و فرمێسکی خواجەش رۆشتووە وەك ئەو باخانـە بـووە، کە لە قورئاندا باسیان لێوەکراوە و ئاو بە ژێـر درەختەکانـدا رۆشـتووە. سـەبارەت بـەم بەیتـە سودی نوسیویەتی: لەم بەیتەدا دوو رەخنەیان لە خواجە گرتوە، یەکێکیان ئەوەیە کە ـ زیر بـام قصر ـ لە ژێر سەقفی قەسر)دا، کە دەبوا لە ژێر قەسردا بوایە، چونکە رووبار بـە ژێـر قەسـردا دەڕوات نەوەك بە ژێر سەقفی قەسردا. دووەم (جنات تجری تحتها الانهار) واتـە رووبـار بـە ژێـر باخەکاندا دەڕوات لەکاتێکدا بە نێو باخەکاندا دەڕوات نەوەك بە ژێریاندا. هەندێك لە وەڵامـی رەخنەی یەکەمدا گوتویانە ئەم جۆرە مەسەلانە لە شیعردا رێپێـدراوە و هـیچ جـۆرە زیـانێکی نییە و لە وەڵامی رەخنەی دووەمیشدا سودی ئەم گۆڕانە بـە پێویـستی کـێش دەزانـێ، چـونکە ئایەتەکە لە ئەسڵدا (تنوین)ی هەیە، هەرچـەندە لـە قورئـانی پـیرۆزدا (مـن تحتهـا) هـاتوە.. هەڵبەت لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە سودی دەستنیـشانی کـردووە، کـە لـە هەنـدێ نوسـخە ـ قراءة ـ دا. هەروەها یـەکجار لـە قورئانـدا (مـن) نـەهاتوە. {سـودی،ج١، ل٤٨٩، هـەروەها خرمشاهی،ج١،ل ٣٨٩}

بەهەرحاڵ بەیتەکە لێکچواندنێکی سادە و دووبارەیە و باس لە گریان و فرمێـسك رژانـدنی لە رادەبەدەری خواجە دەکات، کە جارێك بە لافاو و جارێکی دیکە بە رووبار و.. هتد دەیداتـە قەڵەم، لێرەدا ئەم ئایەتەی بە نمونە هێناوەتـەوە، کـە خواجـە لـە بـەردەرگای یـاخود لـە نێـو حەوشەی ماڵی یاردا هێندە گریاوە، قەسرە رازاوەکەی یار وەك باخی بەهەشتی لێهـاتووە، کـە رووبار بە ژێر درەختەکاندا دەڕوات.



## غەزەلی حەفتا و نۆیەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**
**( مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل )**

**١- دیدی کە یار جز سر جور و ستم نداشت**
**بشکست عهد و از غم ما هیچ غم نداشت**

دیدی کە یار جوز سەری جۆور و ستەم نەداشت، بشکەست ئەهد و ئەز غەمی ما هیچ غەم نەداشت.

بینیت کە یار جگە لە جەور و ستەم مەبەستی دیکەی نەبوو، پەیمانی شکاند و هیچ غەمی غەمی ئێمەی نەبو.

دیدی: ببینیت، زانیت          سرداشتن: مەبەست و ئارەزووکردن          سر جور و ستم داشتن: مەبەستی جەور و ستەم، نیازی جەور و ستەم

(یاری زاڵم و ستەمگەر) چەمکێکە بەردەوام لای حـافز و لـە عەشـقی عیرفانیـدا دووبـارە دەبێتەوە، تەواوی جەور و ستەمی یاریش ئاوڕ نەدانەوەیە لە عاشق لێرەشدا یاری سـتەمگەری بێ رەحم و بەزەیی عەهد و پەیمانی شکاندووە، بە بێ ئـەوەی گـوێ بداتـە خەفـەتی خواجـە و خەمی ئەم خەمبارییەی ئەم بخوات، هەربۆیە دەڵێ: بینیت یا زانیت کە یار جگـە لـە سـتەم و زوڵم هیچ مەبەست و ئارەزوویەکی دیکەی نەبوو، چونکە پەیمانی لەگەڵ ئێمـە شـکاند و هـیچ خەمیشی لە خەمی ئێمە نەخوارد (هیچ گوێی بە خەمی ئێمە نەدا).

ئەم بێ وەفاییەی یار هەرگیز نابێتە مایەی سەرهەڵدانی رقی عاشق، بەڵکو بە پێـچەوانەوە عەشقی زیاتر دەبێ وەك لە بەیتی دووەمدا دەیخاتەڕوو:

**٢- یا رب مگیرش ارچه دل چون کبوترم**
**افکند و کشت و عزّت صیدحرم نداشت**

یا رەب مەگیرەش ئەرچە دلی چون کەبوتەرەم، ئەفکەند و کوشت و ئیززەتی سەیدی هەرەم نەداشت.

خوایە لێی مەگرە گەرچی دڵی کۆترئاسای منی خستەخوارەوە و کوشتی و ڕێزی راوی حەرەمی نەگرت.

یارب: خوایە، پەروەردگار مگیرش: لێی مەگرە، گوناهی بۆ مەنووسە ارچە: ئەگەرچی کبوتر: کۆتر،ئاسا افکند: خستە خوارەوە، بەردایەوە عزت: ڕێز، حورمەت صید: راو، شکار حرم: حەرەم، حەوشە و دەوروبەری شوێنە پیرۆزەکان

لە ئیسلامدا بە زۆری حەرەمی بەیت (دەوروبەری کەعبە) بەمە بەناوبانگە، دەکرێ حەرەم مەبەست لەم شوێنە پیرۆزە بێت یاخود کاتی ئیحرام بەستن بۆ حەج، کە لە هەردوو بارەکەدا راو و کوشتن دروست نییە و ئەنجامدانی ئەم کارە بە ویست کەفارەتی هەیە کە (کەفارەتەکەی قوربانی یا ناپێدانی هەژاران یا رۆژوگرتنە) جگە لە راوی دەریایی{سوودی، ج١،ل٤٩٦ و خرمشاهی، ج١، ل٣٩٢}

بێگومان زۆرگران پەیوەندی نێوان کوشتنی دڵی خواجە و راوی حەرەم دەدۆزرێتەوە، چونکە گەر راوی حەرەم راوی دەوروبەری بەیت یاخود راوی کاتی ئیحرام بێت پەیوندییەك نادۆزرێتەوە، مەگەر ئەوەی یار لە مەککە و دەوروبەری بەیتدا یاخود لەکاتی ئیحرامدا دڵی خواجەی راوکردبێت، کە ئەمەش تەئویلێکی دوورە، دەکرێ گوتەی د. هروی کە دڵی خواجە بەو کۆترانە دەداتە قەڵەم، کە بەسەر گومبەتەی شوێنە پیرۆزەکانەوە هەڵدەنیشن راستتر بیت.

کەواتە خواجە لە خودا دەپاڕێتەوە، کە خودایە گوناهی یار مەنووسە و لێیخۆشبە گەرچی دڵی وەك کۆتری سەر گومبەتەی شوێنە پیرۆزەکان منی خستەخوارەوە و کوشتی و ڕێزی ئەو سونەتەی نەگرت، کە راوکردنی کۆتری شوێنە پیرۆزەکان بێی ڕێزییە.

**٣- بر من جفا ز بخت من آمد و گرنە یار**

**حاشا کە رسم لطف و طریق کرم نداشت**

بەر مەن جەفا ز بەختی مەن ئامەد ڤەگەرنە یار، هاشا کە رەسمی لوتف و تەریقی کەرەم نەداشت.

جەفای من لە بەحتی خۆمەوە هات، ئەگەرنا حاشا، کە یار ڕێ و رەسمی لوتف و ڕێبازی بەخشندەیی نەبو.

برمن: بەسەرمندا، بۆمن جفا: جەفا حاشا: حاشا، هەرگیز رسم: ڕێ و رەسم، ڕێباز



دیسانەوە قسە سەبارەت بە بەخت و قەدەرە، خواجە دەڵێ جەور و ستەمێك کە لە من کراوە و دەڵێم لە لایەن یارەوەیە، وانییە چونکە هەموی خەتای بەختی خۆمە ئەگەرنا حاشا هەرگیز ناتوانرێ بگوترێ یار لوتف و بەخشندەیی نییە، بەڵکو هەرچی هەیە خەتای بەخت و چارەی خۆمە.

وەك هەموجارێك ئەم بەیتە بیانوهێنانەوەیە بۆ جەور وجەفاکانی یار، کە خواجە جەفاکان دەدا بەسەر بەختی خۆیدا نەوەك دڵرەقی و بێ بەزەیی یار.

**٤- با این همە هر آنکە نە خواری کشید ازو**

**هرجا کە رفت هیچ کسش محترم نداشت**

با ئین هەمە هەر ئانکە نە خاری کەشید ئەزو، هەرجا کە رەفت هیچ کەسەش موهتەرەم نەداشت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەوکەسەی خواری و زەبونی لەیارەوە نەکێشا (نەبینی) چووە هەر شوێنێ هیچ کەس بە بەرێزی نەزانی.

با این هم: لەگەڵ هەمو ئەمەدا خوار: زەبونی، زەلیلی نە خواری
کشید: زبونی نەبینی، نەبونی نەکێشا ازو: لە ئەو

جەفا و زەلیلی دەستی یار دەبێتە مایەی ڕێزی ئەوانی دیکە، ئەمە فەلسەفەی ئەم بەیتەیە، واتە هەرکەس بەندەیەکی ملکەچی دۆست بێت خەڵکی دیکە بە ڕێزدار سەیری دەکەن، هەر بۆیە پێچەوانەی ئەمەش ـ واتە هەرکەس بەندەیەکی ملکەچ نەبو بەرێز نابێ ـ هەر راستە لە بەیتەکەدا هاتووە، خواجە دەڵێ: لەگەڵ هەموو ئەمەشدا ـ جەور و جەفای یار و عەزابی دوری ئەو ـ هەرکەسێ زەبون و ملکەچی ئەو نەبوو ـ زەبونی ئەوی نەکێشا ـ چوە هەر شوێنی کەس بە موحتەرەم و بەرێزی نەزانی.

**٥- ساقی بیار بادە و مدّعی و محتسب گوی**

**انکار ما مکن کە چنین جام جم نداشت**

ساقی بیار بادەڤو موددەئی و موهتەسیب گوی،ئینکاری ما مەکون، کە چونین جام جەم نەداشت.

ساقی بادە بێنە و بە مودەعی بڵێ، رازی ببە، چونکە جەمیش ئەم پێکەی نەبووە.

مدعی: مودەعی محتسب: مەئموری فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە لە شاردا
انکار: ناشایستە، ناپەسەند، نائارام، باوەڕنەبون

جام: پێك        جم: جەمشید/ یەكێكە لەگەورەترین پادشاكانی زنجیرەی پیشدادیەكان، لە ئەدەبیاتی فارسیدا جامی جهان نما بۆ ئەو دەگەڕێتەوە كە نهێنی تێدا دیاربوە.

وەك گوتمان تایبەتمەندی پێكی جەمیشد لەوەدا بوو كە نهێنییەكانی جیهانی تێدا دەردەكەوت، بەڵام خواجە جامەكەی خۆیان كە پێكی عەشقی حەقیقییە لە پێكی جەمشید بە چاكتر دەزانێ، ئەمەش لەو رووەوە گەر پێكی جەمشید نهێنی جیهانی تێدا دەردەكەوت، پێكی عەشقی حەقیقی و عیرفانی نهێنییە خوداییەكانی تێدا دەردەكەوێت، هەربۆیە دەڵێ: ساقی بادە بێنە و بە موەعی یاخود بە موحتەسیب بڵێ پێمان رازی بە یاخود بە ناشایستەی مەزانە، چونكە جەمیش ئەم پێكەی ئێمەی نەبوو.

**٦- هر راهرو كه ره به حریم درش نبرد**

**مسكین برید وادی و ره در حرم نداشت**

هەر راهرۆو كە رەهـ بە هەریمی دەرەش نەبورد،مسكین بورید ڤادی یو رەهـ دەر هەرەم نەداشت.

هەر رێبوارێك كە نەگەیشتە بەردەرگای یار، داماوە بیابانی بڕی و رێی نەكەوتە حەرەم.

راهرو: رێبوار، سالك، رێبواری رێگەی تەریقەت        راە بردن: رێگە بردنەوە سەرشتێ، گەیشتن        حریم: دەوروبەر، باخ وحەوشە

مسكین: فەقیر، بێ چارە، داماو   برید: بڕی، تەی كرد        برید وادی: بیابانی بڕی، بیابانی تەی كرد.

عارفی بەو رێبوارە چواندووە، كە رێگەی حەج دەداتە بەر و دۆڵ و سەحرا دەبڕێ بە نیازی گەیشتن بە حەرەمی مەككە، بەڵام رێگە بڕین چ سوودێكی هەیە، گەر بەرە و كەعبە نەچێت، وەك ( سەعدی) دەڵێ:

**ترسم نرسی به كعبه ای اعرابی        كاین ره كه توی می روی به تركستان است**

كەواتە لە رۆشتندا ئامانجی بنەڕەتی گرنگە نەوەك تەی كردنی رێگە، خواجەش بە عارف و رێبواری رێگەی تەریقەت دەڵێ: هەر رێبوارێك رێ نەكەوتە حەرەمی بەردەرگاری یار وەك ئەوە داماوە وایە دۆڵ و دەشت دەبڕێت و ناگات بە بەیت و نابێتە حاجی.

لای خواجە گرنگی عارف و سۆفی بوون لەوەدایە كە بە دەرگای حەق بگەیت، ئەگەر نا بڕینی رێگەكان و قۆناغەكان و بوونە سۆفییەكی بەناوبانگ هیچ سوودێكی نییە، بەڵكو گرنگ گەیشتنە بە حەق(یار).



**٧- حافظ ببَر تو گوی فصاحت كه مدّعی**

**هیچش هنر نبود و خبر نیز هم نداشت**

هافز ببەر  تو گوی فەساهەت كە موددەئی، هیچەش هونەر نەبود وخەبەر نیز هەم نەداشت.

حافز تۆ گۆی فەساحەت ببەرەوە، چونكە مودەعی، هیچ هونەری نەبوو بێ ئاگاش بوو لەو بێ هونەریەی خۆی.

ببر: ببە، ببەرەوە        گوی: گۆ        گوی بردن: یاری گۆ و مەیدانە  كە هەركەسە گۆوەكە بباتە گۆڵەوە براوەیە

فصاحت: فەساحەت، روونبێژی، بێ عەیب بونی  قسە،قسەزانی

نیز: هەروەها

ئەم بەیتە شانازی خواجەیە بە قسەزانی و رونبێژی خۆی و خستنەڕووی بێ هونەری بانگەشەكەرە مایە پووچەكان، كە لێرەدا نەوەك هەر بێ هونەرن، بەڵكو ئاگاشیان لە بێ هونەرییەكەی خۆیان نییە و ئەحمەقن، چونكە گوتراوە (كەسێ نەزانێ، نەشزانێ كە نازانێ، ئەحمەقە).

دەڵێ حافز لە مەیدانی قسەزانی وهونەری قسەكردندا گۆ ببە و یاریەكە ببەرەوە، چونكە مودەعی نەك هەر قسەزان نییە و عەیب لە قسەكانیدا هەیە وادەزانێ دەزانێ و تووشی هەڵە دەبێ، چونكە بێدەنگ نابێ و دان بە نەزانیدا نانێ.

## غەزەلی هەشتایەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلات)**

**١-کنون که میدمد از بوستان نسیم بهشت**

**من و شراب فرح بخش و یار حور سرشت**

کونون که می دەمەد ئەز بوستان نەسیمی بیهیشت، مەن و شەرابی فەرەه بەخش و یاری هور سریشت.

ئێستا که شەماڵی بەهەشت له باغدا هەڵدەکات، من و شەرابی خۆشی بەخش و یاری پەری شێوە.

میدمد: هەڵدەکات      بوستان: باغ      نسیم بهشت: شەماڵی بەهەشتی

حور سرشت: حۆری شێوە

ئێستا که شەماڵی بەهەشتی له باغدا هەڵی کردووە و کاتی بەهارە من جگه له چێژبردن و مەیی خۆشی بەخش و یاری حۆری شێوە نەبێت، سەرقاڵی هیچی دیکە نابم، واته که وەرزی بەهارە من ئەم بەهارە بە بادەنۆشی و هاودەمی یاری پەری شێوە دەگوزەرێنم.

گەر مانای عیرفانی (نسیم) و (شراب) لە بەرچاوبگرین مانایەکی دیکەی بەیتەکە ڕووندەبێتەوە، چونکە: (نسیم) به واتای تەجەلی و دەرکەوتنی جوانی خودایی و ڕەحمەتی بەردەوام و نەفەسی ڕەحمانییە، بە تایبەتی هەڵکردنی شەماڵ لە باغدا ئەم واتایە ڕوونتر دەکاتەوە هەروەها (شراب)یش عەشقە، بەم پێیە واتای بەیتەکە دەبێتە:

ئێستا که له ژیاندا جەمالی خودایی جیلوە دەکات یاخود جیلوەی کردووە من جگە لە عەشق و دۆستی لەگەڵ مەحبوبی حەقدا چی دیکە ناکەم و چێژ لە هاودمی ئەو جیلوەیە و ئەو عەشقە خۆشی بەخشە دەبەم.

**٢- گدا چرا نزند لاف سلطنت امروز**

**که خیمه سایەی ابرست و بزمگه لب کشت**



گیدا چەرا نەزەنەد لافی سەلتەنەت ئیمروز، که خەیمە سایەیی ئەبرەست و بەزمگەه لەبی کیشت.

بۆچی ئەمڕۆ هەژار لافی سەڵتەنەت لێنەدا، کە خێمە سێبەری هەورە و کەناری مەزراش بەزمگا.

گدا: هەژار      نزند لاف: لاف لیٚ نەدا      سلطنت: سەڵتەنەت، دەسەڵات

خیمه: خێمە، چادر      سایه: سێبەر      ابر: هەور

بزمگه : بەزمگە، بەزمگا، شوێنی خۆشی و بەزم      لب: کەنار      کشت: مەزار

گەر لە ڕۆژانێکی گەرمی هاویندا سەیران پێویستی بە چادر و خێمە هەبێت و شوێنی خۆشی و رابوردان بوو بێت تەنیا پادشا و دسەڵاتداران توانای دەستبەرکردنی ئەمانەیان هەبێت، ئەوا لە مانگی بەهاردا کە سێبەری هەور چادری حەوانەوە و سەوزایی لێواری مەزارکانیش شوێنی خۆشی و بەزمگەیە، هەمووان پادشا و خاوەن سەڵتەنەتن، چونکە بەزم و سەیران هیچ تەدارەکێکی ناوێت.

هەربۆیە خواجە دەڵیٚ: بۆچی ئەمڕۆ هەژار لافی سەڵتەنەت لیٚ نەدا، کە سەیران و خۆشی هیچ تەدارەکێکی ناوێت و رازێنەری سروشت هەموی ئامادەکردووە.

**٣- چمن حکایت اردیبهشت می گوید**

**نه عارف است که نسیه خرید و نقد بهشت**

چەمەن هیکایەتی ئوردیبیهیشت می گویەد، نە ئارفەست کە نەسیە خەرید و نەقد بیهیشت.

مێرگوزار وەسفی مانگی ئوردیبەهەشت دەکات، کەسیٚ کە نەسیەی کڕی و نەقدی فرۆشت عارف نییە.

چمن:باغ، میرگوزار، چیمەن      حکایت: وەسف      اردی بهشت: مانگی (ئوردی بەهەشت) دوەمین مانگی ساڵی هەتاوییە کە دووەمین مانگی بەهارە لەم مانگەدا بەهار بە تەواوی سەوز و چڕە، ئەم ڕۆژژمێرە بە (ڕۆژژمێری جلالی)یش بە ناوبانگە، چونکە لە سەردەم و بە فەرمانی (جلال الدین مەلەکشای کوڕی ئەلپ ئەرسەلانی سەلجوقی ٢٦٥ ـ ٣٨٥) لە ئەسفەهان لەساڵی (٤٩٨) مانگی دا لە لایەن کۆمەڵێك لە زانایان و گەردووناسانەوە دانرا. وەك:(حەکیم عومەری خەیام، ابو مظفری اسفزاری، میمون واسطی، عبدالرحمن خازنی ){ج ١، سودی، ل٤٩٦، پەراوێزی د. ستارزادە}

(عارف/ عاقل) لەزۆربەی نوسخە دێرینەکاندا (عـارف) هـاتووە، بـەڵام لـە دوو نوسـخەی دێرین و (قەزوینی و خرمشاهی.. هتد)دا عاقڵ هاتووە بە هـەرحاڵ گـەر (عـارف) بـە واتـای زمانی لێکردێتەوە، ئەوا کێشەیەك دروست نابێ کە واتاکەی زۆر نزیك دەبێتەوە لە عاقڵ گـەر بە واتای عارفی ڕێگەی حەق لێکردێتەوە، ئەوا پێویستە واتای مەجازی (اردی بهشت) و (بهار) وەرگرین نەوەك واتای زمانییان گەر (عاقڵ)یش بێت، دەکرێ بەیتەکە جۆرێك زەمکردن بێت.

نسیە: کڕین یا فرۆشتن بە قـەرز؛ واتـە پارەکـەی ماوەیـەك پـاش مامەڵەکـە بـدرێت، لـە بەرامبەر نەقەد و حازردا دادەنرێت، قەرز، وازی لێ هێنا، هێشتیەوە

سودی و هروی کە (عارف)یان نوسیووە پێیان وایە کە لای خواجە پێویـستە (عـارف) لـە خۆشییەکانی ژیان بەهرەمەند بێت و لەبەر بەهەشت جوانی دونیـا لەدەسـت نـەدات د. هـروی وردتر بۆی چووە، کە دەڵێ: پێویستە عارف لە ڕێگەی ناسینی جوانییەکانی دونیاوە لـە خـالق نزیك بێتەوە و بەهار رووکاری جوانی جەمالی خالقە. { ج١، ل٣٦١،هروی}

بەهەرحاڵ ماناکە زۆر دوورناکەێتەوە خواجە روونتر لەمە دەڵێت: کەسێك عارف نییە، کە کاڵای نادیار بکڕێت و حازر لەدەست بدات، لە کاتێکدا (عارف) لە دوای بەهەشت نییە هێندەی لـە دوای جیلوەکردنی جەمالی حەق و گەیشتن بە حەقە، کەوابێ نابێ فرسەتی جیلوەکردنی جوانی حەق کە لە بەهار دایە. ئەگەر (غاقڵ) بێت؛ واتە کەسێ کە خۆشییەکانی بەهار لەدەسـت بـدات، بـێ عەقڵـە چونکە مرۆڤی عاقڵ حازر بە قەرز ناگۆڕێتەوە و هەمیشە بە بەرژەوەندیی خوازی بیردەکاتەوە.

هەروەك ئاشکرایە (عاقڵ) لای حافز ڕوویەکی پۆزەتیڤی نییە و هەمیشە بـە نێگـەتیڤی لێی دەڕوانێ.

**٤- وفا مجوی ز دشمن که پرتوی ندهد**

**چو شمع صومعه افروزی از چراغ کنشت**

ڤەفا مەجوی ز دوشمەن کە پەرتوڤی نەدەهەد، چو شەمئی سۆومیئە ئەفروزی ئـەز چـراغی کینیشت.

داوای وەفا لە دوژمن مەکە، چونکە ڕووناکی نادات، وەك ئەوەی کە مۆمی عیبادەتگا لـە چرای دێر داگیرسێنی.

مجـوی: داوا مەکـە    پرتـو: ڕوونـاکی، تیـشك    ندهـد: نـادات    افـروزی: داگیرسێنی    کنشت: دێر، کەنیسە، بەگشتی بە شوێنی پەرستنی کافران دەگوترێ



داوای وەفا لە دوژمنان مەکە، چونکە سودی نییە، ئەگەر بە وەفاش بن وەك ئەوە؛ وایە کە مۆمی عیبادەتگای حەق لە چرای عیبادەتگـای ناحـەق (کـافران) داگیرسـێنی کـە تیـشك و ڕووناکی ناداتەوە داواکردنی وەفاش لە دوژمن بەم شێوەیەیە.

**٥- به می عمارت دل کن که این جهان خراب**

**بران سرست که از خاك ما بسازد خشت**

بە مەی ئیمارەتی دل کون کە ئین جەهانی خەراب، بەر ئان سەرەسـت کـە ئـەز خـاکی مـا بسازەد خیشت.

بە مەی دڵ ئاوەدان بکەرەوە، چونکە ئەم جیهانە وێرانە نیازی؛ وایە لە خاکی ئێمـە خـشت دروست بکات.

عمارت: ئاوەدانکردنەوە    خراپ: وێرانە    بران سرست: بەونیازەیە، بەو هیوایەیـە
بسازد: دروست بکات    خشت: خشت

دیسانەوە دوژمنایەتی خواجە بۆ دونیای وێران و وێرانەی دونیا و نیازە گڵاوەکانی بەرامبەر بە مرۆڤ دووبارە دەبێتەوە، تەنیا ڕێگەی دەرچون ـ کە لەم بەیتەدا باسکراوە ـ ئاوەدانکردنەوەی دڵ و ناخە بە مەی ـ عەشق ـ چونکە وێرانەی دونیا بەو نیازەیە ـ هەرواش دەبێ ـ لـە خـاکی جەستەی ئێمە خشت دروست بکات.

بێگومان مرۆڤ گەر بیەوێت پاش مەرگ ـ کە دیاردەیەکی حەتمییە ـ زیندووبێت، پێویـستە دڵی ئاوەدان بکاتەوە و ئەمەش تەنیا بە مەی ـ عەشقی ئیلاهی و گرێـدانی بـە جیهـانی بـاڵا حەقەوە ـ دەبێت، هەربۆیە بەم بـارەدا ئیـدی دونیـا زەفـەرمان پـێ نابـات و پـاش مـەرگیش زیندوودەبین. من بێ گومانم ئەگەر پێش مەرگ ئەم ئاوەدانکردنەوەی دڵە دەست پـێ نەکـەیت، ئەوا هەر بەر لە بە خاك بوونی جەستەمان دەبینە خشتێکی بێ گیانی دەستی دونیا.

**٦- مکن به نامه‌سیاهی ملامت من مست**

**که آگه است که تقدیر بر سرش چه نوشت**

مەکون بە نامەسیاهی مەلامەتی مەنی مەست، کی ئاگەهەست کە تەقدیر بە سەرەش چـە نیڤیشت.

بە (نامەڕەشی) منی مەست سەرزەنشت مەکە کێ ئاگادارە، کە قەدەر چی لە چارەی نوسیووە.

نامەسیاهی: نامەڕەشی، مەبەسـت لـە نامـەی کـردار ڕەشـییە بـە واتـای گوناهابـاری و ڕەشبونەوەی نامەی کردارە بە گوناه    ملامت: سرزنشت

که: کێ          آگه: ئاگادار          تقدیر: قەدەر          برسرش: له چارەی
نوشت: نوسی

خواجه لێرەدا به سەرزەنشتکەرەکانی که به گوناهباری دەزانن دەڵێ: به گوناهباری و نامەی کردارڕەشی سەرزەنشتی منی مەست و عاشق مەکەن چونکه کەس نازانێ قەدەر چی له چارەی نوسیوە.

میسراعی دووەم به دوو شێوە لێکدەدرێتەوە:

یەکەم ئەوەی که من بەدەست خۆم نەبووە گوناهبارم و ئەوەی له چارەم نووسراوە و قەدەر بۆی دیاری کردووم هەر ئەوەم ئەنجامداوە، که ئەمەش بیری جەبریەتی خواجەیە .

دووەم: ئەوەی که کێ دەزانێ چی له چارەی نووسراوە کێ دەڵێ: من بەم گوناهبارییەم دوارۆژم پاکتر نییه له تۆ بەو غروری پاکییەتەوە؛ واته ڕەنگه قەدەر دوارۆژی منی به پاکی و دوارۆژی تۆی به خراپی نووسی بێت، ئیدی بۆچی سەرزەنشتی گوناهباری من دەکەی، کێ دەڵێ عاقیبەتی من چاکتر نییه له تۆ. (جەنابی سودی و هروی به واتای دووەم بەیتەکەیان لێکداوەتەوە).

**٧- قدم دریغ مدار از جنازەی حافظ**

**که گرچه غرق گناه است می رود به بهشت**

قەدەم دەریغ مەدار ئەز جەنازەیی هافز، که گەرچه غەرقی گوناهەست می ڕەڤەد به بیهیشت.

خۆت دوامەخە له جەنازەی حافز، چونکه گەرچی نغرۆی گوناهە، بەڵام دەچێتە بەهەشت.

قدم: پێ،هەنگاو          دریغ ندار: خۆت دوور مەگرە          جنازە: جەنازە، تەرم.

بەر له مەرگ و جەنازە پێویستە باس له گومانی چاك (حسن الظن) بکەین، که خواجه به خودای خۆیی هەیە، چونکه له فەرموودەی قودسیدا هاتووە (انا عند ظن عبدی بی) بەو مانایەی خودا به پێی گومانی بەندەکان له گەڵیاندا دەجوڵێتەوە؛ واته من گەر هەمیشه خودایەکی جوان و میهرەبان و لێبوردە و بەخشندە و بەسۆزم له زەیندا بێت، ئەویش به گەورەیی خۆی هەر بەم شێوە ڕەفتارم لەگەڵدا دەکات، خواجەش زۆر گەشبینە بەرامبەر به خودای خۆی و لەم گەشبینییەوە دڵنیایە، که خودا دەیخاتە بەهەشت گەرچی نغرۆی گوناهە یاخود خواجه خودی خۆی چاك دەناسێ، هەرچەندە خەڵکی وادەزانن غەرقی گوناهە، بەڵام پاکە و دەچێتە بەهەشت.

بێگومان یەکێك له مافەکانی موسڵمان بەسەر موسڵمانەکانی دیکەوە شوێنکەوتنی جەنازەیەتی له کاتی مردنیدا خواجەش به خەڵکی موسڵمان ـ ڕەنگه ڕەقیبەکانیش ـ دەڵێ: لەکاتی مەرگمدا درێغی نەکەیت و خۆت دوانەخەیت له شوێنکەوتنی جەنازەکەمدا و وا بیر نەکەیتەوە مافی ئەوەم بەسەرتەوە نەماوە، بەڵکو به پێچەوانەوە هەرچەندە گوناهبارم و نغرۆی گوناهم بەڵام دەچمه بەهەشت.

جەنابی سودی پێی وایه؛ که ئەم بەیتە وەك فاڵ بەکارهاتووە ـ پێشتر باسی فاڵی حافزمان کردووە ـ و چیرۆکێکی گێراوەتەوە، سودی دەگێڕێتەوە:"دەگێڕنەوە، که گوایه کەسێك ڕقی له خواجه بوە و هەمیشه تانەی له خواجه داوە و قسەی پێ گوتوە. کاتێ خواجه وەفات دەکات، ئەم کەسە نەك هەرخۆی ناچێ بۆ ناشتنی جەنازەی حافز، ڕێگری خەڵکیش دەکات، تاکاتێ یەکێ له دۆستانی حافز که لەوێ بوە دەڵێ: خواجه دەیگوت گەر دیوانی من به هەر نیەت و ویستێك بکرێتەوە به پێی بارودۆخەکە نیەتەکه ڕووندەکاتەوە، کەوایه وەرن با فاڵی حافز بگرینەوە و بزانین چی دەڵێ کاتێ دیوانەکه دەکەنەوە ئەم بەیتە دێت، ئیدی ئەوکەسە تۆبه دەکات و بەشداری ناشتنی جەنازەکەی خواجه دەکات"{سودی، ج١، ل٤٩٩}

هەروەها له پێشەکی (دیوانی حافظ)ی (لیمودهی)دا ئەم چیرۆکە به شێوەیەکی دیکه هاتووە (جەنابی لیمودەهی )له سەر زاری براون (ادوارد براون) دەگێڕێتەوە: کاتێ حافز کۆچی دوایی کرد، هەندێ لەو کەسانەی که ڕقیان له حافز بوو، نەیاندەهێشت که تەرمەکه له گۆڕستانی موسڵماناندا بنێژن، پاش ئەوەی ڕێکەوتن که فاڵ له دیوانەکەی بگرنەوە کاتێ فاڵی حافزیان گرتەوە ئەم بەیتە کرایەوە.{دیوانی حافظ،لیمودهی، چاپ شەشم، بەبێ ساڵی چاپ، پێشەکی ل١٩، مێژوی نووسینی پێشەکی ١٣٤٣کۆچی هەتاوی} .

**٧- خواهم شدن به کوی مغان آستین فشان**

**زین فتنەها که دامن آخر زمان گرفت**

خاهەم شودەن بە کوی موغان ئاستین فەشان،زین فیتنەها کە دامەنی ئاخەر زەمان گرفت.

لە تاو ئەو فیتنە و بەڵایانەی داوێنی ئاخر زەمانیان گرتوە بە چۆپی کێشانەوە تەرکی دونیا دەکەم و دەڕۆمە کۆڵانی موغانەوە.

آستین: قۆڵ     آستین فشان: قۆڵ بادان، فەقیانە بادان،چۆپی کێشان، مەبەست لە وازهێنانە لە شتێك بە سەما و خۆشحاڵییەوە

هاتنی ئاخر زەمان نیشانەی زۆری هەیە کە یەکێك لەوانە زۆر بوونی فیتنە و ئاشوبە لە نێو گەلاندا، گەر لە سەردەمی خواجەش وردبینەوە سەردەمی فیتنە و ئاشوب و شەڕ و نەهامەتیەکانی سەر گەلانی موسوڵمان بووە، سەردەمی دوای مەغۆل و سەردەمی تاریکی گەلانی موسوڵمان ـ هەرچەندە ئەم سەردەمی تاریکە زیاتر فەرهەنگی عەرەبەکان دەگرێتەوە نەوەك گەلانی دیکەی ئیسلامی ـ بەهەرحاڵ سەردەمی فیتنە و ئاشوب و بەڵا بووە، کوشتن و فڕ و فێڵ (وەك د. غەنی دەڵێ) لە هەمان سەردەمی سەرەتای ئیسلامەوە هەرکەس وای بۆچووە کە لە سەردەمی ئەودا ئاخر زەمان دێت {بە نقلْ لە خرمشاهی،ج١، ل٤٢٣}.

خواجەش سەردەمی خۆی بە ئاخرزەمان داناوە، هەربۆیە دەڵێ: بە خۆشی و شادیی و بە چۆپیکێشانەوە واز لە فیتنە و ئاشوب دەهێنم کە داوێنی ئەم سەردەمی ئاخر زەمانەی گرتووە، پشت لە دونیا دەکەم و روو دەکەمە مەیخانە و عەشق و رێگەی تەریقەت و عیرفان دەگرم.

**٨- می خور که هرکه آخر کار جهان بدید**

**از غم سبك بر آمد و رطل گران گرفت**

مەی خور کە هەرکە ئاخەری کاری جەهان بدید،ئەز غەم سەبوك بەر ئامەد و رەتلی گران گرفت.

مەی بنۆشە کە هەرکەسێ لە سەرەنجامی کاری دونیا تێگەیشت، بە ئاسانی وازی لە غەمی دونیا هێنا و پێکی قورسی شەرابی هەڵگرت.

خور/بخور: بخۆوە     بدید: بینی، تێگەیشت     سبك: بەئاسانی،بەسوکی
برآمد: دەرهات، وازی هێنا، خستیەلاوە

رطل: یەکەیەکی پێوانەیە وەك لیتر کە شەراب و مەیی پێ دەپێورێ، لە پێك گەورەترە، پێکی گەورە، سوراحی     گران: قورس     رطل گران: پێکی گەورەی قورس



خواجە ئامۆژگاری دەکات کە دەست بدەینە مەی خۆری و عاشقی و وەلانانی خەمی دونیا، چونکە دونیا سەرەنجامی نییە و هەرکەس غەمی دنیا بخوات تیا دەچێ. هەربۆیە دەڵێ: خەریکی عەشق بە ـ کە مەینۆشی رەمزی عەشقە ـ چونکە هەرکەس لەسەرەنجامی دونیاویستی تێگەیشت یاخود سەرەنجامی دونیاویستی بینی ـ بۆ نموونە سەرەنجامی دونیاویستانی وەك فیرعەون، ئەبوجەهل هتد... ـ واز لە خەمی سوکی دونیا دەهێنێ و دەست دەداتە پێکی گەورەی قورسی مەی و عەشق.

ئەم بەیتە دووبارەکردنەوەی دوژمنایەتی خواجەیە بۆ ئەو دونیایەی کە خواجە ـ بە پیرەژنی فەرهاد کوژی ـ دەزانێ.

**٩- بر برگ گل به خون شقایق نوشتەاند**

**کان کس که پخته شد می چون ارغوان گرفت**

بەر بەرگی گول بە خونی شەقایق نیڤیشتەئەند،کان کەس کە پوختە شود مەیی چون ئەرغەڤان گرفت.

بە خوێنی شەقایق بە سەر پەڕەی گوڵەوە نووسیویانە، هەرکەسێ کە کامڵ بوو مەی وەك ئەرغەوانی نۆشی.

بر: بەسەر، لە     برگ: پەرە     شقایق: گوڵاڵە سورە     نوشتەاند: نووسیویانە     پختە: کامڵ پێگەیشتوو و تێگەیشتوو، دنیادیدە، بە ئەزمون

ارغوان: گوڵی درەختی ئەرخەوان کە رەنگی سوری ئاڵە

میسراعی یەکەمی بەیتەکە لێڵییەکی پێوە دیارە کە لەکاتی شەرحکردنیشدا تا رادەیەك ئەو لێڵییە روننابێتەوە، خواجە دەڵێ: لە سەر پەڕی گوڵ بە خوێنی گوڵاڵەسورە نووسیویانە، گوڵاڵە سورە سەرباری سوری پەڕەکانی کە بە خوێنی دەدرێتە قەڵەم، خاڵێکی رەشی لە ناودایە کە شاعیرەکان بە داغی عەشقیان داوەتە قەڵەم، هەروەها شێوەی پەڕەکانی ئەم گوڵە لە پێك دەچێت، بەڵام ئەم داخ و خوێنەی گوڵاڵە لە بە تاڵی پێکەکەیەتی لە شەراب. بەهەرحاڵ پەند و عیبرەتی زۆر لە گوڵاڵەسورە وەردەگیرێ، بۆیە بە خوێنی ئەو نووسیویانە (بۆئەوەی لێرەشدا پەند و عیبرەت وەربگیردرێ)،ئاماژە بەوە نەکراوە کە بە خوێن نووسینی هەرشتێ نیشانەی گرنگی و بەهاداری ئەوشتەیە ـ هەرچەندە ئەم ئاماژەیە لە کوردی کۆندا هەبووە و ئێستاش ماوە، کە من باوەڕم وایە لە سەردەمی خواجەشدا هەبووبێت.

بە خوێنی شەقایق (گوڵاڵەسورە) لەسەر پەڕەی گوڵ ئەم پەندە یاخود ئەم ئامۆژگاری و روونکردنەوە زۆر گرنگە نووسراوە یاخود نووسیویانە، هەرکەسێ فامیدە و پوختەکراو بێت

مەیی سوری وەك گوڵی ئەرخەوانی نۆشکرد، بە لەبەرچاوگرتنی واتای عیرفانی (مەی) و فەزای گشتی غەزەلەکە واتای بەیتەکە دەبێتە:

بە خوێنی داخدارێکی وەك گوڵاڵەسورە لە سەر پەڕەی نوسراوە (کە ئەمە ئاماژەیە بۆ گرنگی و بەهای مەسەلەکە) هەرکەس فامیدە و کامڵ بوو دەستدەداتە عەشقی ئیلاهی و ڕێگەی عەشق دەگرێ.

**١٠- حافظ چو آب لطف ز نظم تو می چکد**

**حاسد چگونه نکته تواند بران گرفت**

هافز چو ئابی لوتف ز نەزمی تو می چەکەد،هاسید چگونە نوکتە تەڤانەد بەران گرفت.

حافز کاتێ ئاوی پاراوی لە شیعری تۆ دەتکێ،حەسود چۆن دەتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێت.

آب لطف: ئاوی پاراوی    می چکد: دەتکێ    نکته گرفتن: ڕەخنەگرتن

خواجە شانازی بە شیعری خۆیەوە دەکات کە هێندە تەڕ و پاراوە ئاوی پاراوی لێ دەتکێ کە شیعرێکیش هێندە پاراوبێت مرۆڤی حەسود هەرگیز ناتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێت و نەنگی و لەنگی تێدا بدۆزێتەوە.



## غەزەلی هەشتا و حەوتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات)**

**١-ساقی بیار باده که ماه صیام رفت**

**درده قدح که موسم ناموس و نام رفت**

ساقی بیار بادە کە ماهی سییام ڕەفت،دەردەه قەدەه کە مۆوسیمی ناموس و نام ڕەفت.

ساقی بادە بهێنە کە مانگی ڕۆژو ڕۆشت، پێکم بدەرێ کە وەرزی ناموس و ناوبانگ ڕۆشت.

بیار: بهێنە    درده: بدە، بدەرێ    قدح: پێك،جام

موسم: وەرزە، سەردەم، زەمان    ناموس: ناموس، ئابڕو    نام: ناوبانگ

ماه صیام: مانگی ڕۆژو، مانگی ڕەمەزان

خواجە داوا لە ساقی دەکات شەراب بۆ بهێنێ، چونکە مانگی ڕەمەزان ـ وەرز و سەردەمی کۆکردنەوەی ناموس و ناوبانگ و شۆرەت — تێپەڕیوە.

مانگی ڕەمەزان و نوێژ و تەقوا و دوورە پەرێزی کە دەبنە مایەی ناوبانگ و شۆرەت پەیداکردن و لەوێشەوە ریاکاری زاهیدەکان سەرچاوە دەگرێت: لای خواجە و تا ڕادەیەك لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا بە دیدگایەکی پۆزەتیڤییەوە لێیان ناڕوانرێت و هەمیشە لە بەرامبەر (مەی/عەشق)دا کە هەرگیز نابێتە مایەی ریاکاری دەهێنرێن و دووەمیان بە خۆشەویستتر دەزانن، لە ڕاستیدا ئەم مانگی ڕەمەزان و ڕۆژو و نوێژە خودی ڕۆژو و نوێژ نین، بەڵکو ڕۆژو و نوێژی ئەو ریاکارانەن کە بەدرۆ و بۆ ناوبانگ و ناموس بەجێیان دەهێنن ئێستاش کەم نین ئەوانەی کە مانگی ڕەمەزان هەوڵی خۆدەرخستن و چاکەکردنی سەرزاری دەدەن بەو هیوایەی ناوبانگ پەیدا کەن.

هەربۆیە خواجە پێی خۆشە مانگی ڕەمەزانی ئەم جۆرە کەسانە ـ وەزری ناموس و ناوبانگ ـ بەسەر چووە و داوا لە ساقی دەکات جارێکی دیکە بازاڕی عەشقی ئیلاهی گەرم بکاتەوە.

**٢- وقت عزیز رفت بیا تا قضا کنیم**

**عمری که بی حضوری صراحی و جام رفت**

ڤەقتی ئەزیز ڕەفت بیا تا قەزا کونیم،ئومری کە بی هزوری سوراهیی و جام ڕەفت.

کاتی ئازیز تێپەڕی وەرە تا قەزای بکەینەوە (بیگێڕینــەوە)، تەمەــنێك کــە بــێ ئامــادەیی سوراحی و جام تێپەڕی.

وقت: کات قضا کنیم: به قەزا بیگێڕینەوە،بیگێڕینەوە

وەخت،کات: بۆچی وەختی ئازیز؟ خواجەیەك کە زۆر وابەستەی دونیای نییە بۆچــی جۆرێــك لە خەفەت بۆکـات دەخـوات و دەیــەوێت وەك فــەرزێکی لەدەســت چــو قــەزای بکاتــەوە. لــە فەرهەنگی عیرفانیدا (وقت) ئەو حاڵانەیــە کــە دێتــە دڵــی رێبــواری رێگــەی تەریقەتــەوە وەك (خۆشەویستی خودا، توکل، تسلیم، رەزا) {جنابـذی شرح کلمات بابـاطـاهر،ل٧٨٩ سـجادی} یان (وەخت) لە یادکردنی رابردوو و بێخەبەر بوونە لە ئایندە و ژیانــە لــە حــاڵی هەنوکەییــدا. کەوابێ ئەم حاڵە ئەزیزانەیە کە بەسەر دەچن.

رەنگە ئێمەی ناکامڵ جاروبار یاخود لە ساتێکی تەمەنماندا بکەینە حاڵێکی کــرچ و کــاڵ و ناتەواوی خۆمانەوە و چــێژ و لــەزەتێکی زۆری لــێ ببیــنین و ئاواتــەخوازبین کۆتــایی نەیــەت و دواجاریش حــەز بــە هاتنــەوەی بکــەین . چ لەزەتبەخــشن ئــەو ســاتە بروسکەئاســایانەی کــە دونیاومافیا فانی دەبێت و هەموشتێ لە یاددەکەین و تەنیا و تــەنیا لــە حــاڵی تــەوەکول یــان تەسلیم یان رازیبوندا وەخت بەسەر دەبەین.

گەر ئێمە یەکی ناکامڵ ـ بەلای کەمی گەر بەندەیەکی کاڵفــامی وەك مــن ـ ئەمــە حــاڵی بێت دەبێت خواجەیەکی وەك حافز لە کاتی بەسەرچوونی حاڵێکی لەم بابەتــەدا چــۆن حــاڵێکی هەبوو بێت، بۆیە جێگەی خۆیەتی وەختی بەلاوە ئازیز بێت.

خواجە لێرەدا بە ساقی و واسیتەی عەشق دەڵێت: حاڵە ئازیزەکان بەسەرچــوون وەرە تــا بــە قەزا بیانگێڕینەوە، ئەو تەمەنەی کە بێ ئامادەیی سوراحی و جامی عەشقی حەق بەسەرچوو.

**٣- در تاب توبه چند توان سوخت همچو عود**

**می ده که عمر در سر سودای خام رفت**

دەر تابی تۆوبە چەند تەڤان سوخت هەمچو ئود،مەی دەه کە ئومر دەر سەری سۆودای خام رەفت.

لە ئاگری تۆبەدا تاکەی دەتوانین وەك بوخورد بسوتێین، مەیم بدەرێ کە تەمەن لە بۆچــوونی کرچوکاڵدا تێ پەڕی.

تاب توبە: ئاگری تۆبــە، عــەزاب و نارەحــەتی تۆبــە چــند تــوان ســوخت: تــا چەندە،تاکەی دەتوانرێ بەرگەی سوتان بگیردرێ عود: بخـور، ئــەوماده بۆنــدارەی کە دەکرێتە سەر ئاگر یاخود ئاگری پێوە دەنرێت، یاخود (عود)ی ئامێری مۆسیقایی



د. هروی پێی وایە کە لە بەیتەکەدا مانای دووەمی (عود) واتە سوتاندنی عــودی ئــامێری مۆسیقایی لەبارترە، چونکە سوتاندنی (عود/بوخور) لە هەر بۆنە و مەراسیمێکدا دەبێت، بەڵام ســوتاندنی یــان شــکاندنی عــودی ئــامێری مۆســیقا و پێــك و پیاڵــە لــە کــاتی تۆبەکردنــدا دەبێ{هروی، ج١، ل٣٨٩}

خواجە تۆبەکردن بە ئاگرێك یاخود عەزاب و نارەحەتی دەزانێت و پێی وایــە کــە نارەحەتــە بەرگەی سوتاندنی نێو ئاگری تۆبە بگرێت و ئەسڵەن ئــەم جــۆرە بیرکردنەوەیــە (تۆبــەکردن لــە عەشق) بە بۆچونێکی کرچوکاڵ دەزانێت و پێی وایە خۆ تەرخانکردن و بەسەربردنی تەمەن لــەم بیرە کرچوکاڵەدا (تۆبەکردن لە عەشق) پێویست نییە، هەربۆیە بە ساقی دەڵێت (عەشق/مەی)م بدەرێ با نغرۆبم لە عەشقدا و ئەم بیرە کرچوکاڵە لە یــاد کــەم.دەکــرێ ئــەم (تۆبــە)یــە تۆبــەی ریاکارەکان بێت.

**٤-مستم کن آن چنان که ندانم ز بیخودی**

**در عرصەی خیال که آمد کدام رفت**

مەستەم کون ئان چونان کە نەدانەم ز بیخودی،دەر ئەرسەیی خیال کە ئامەد کودام رەفت.

بە شێوەیەك مەستمکە کە لە تاو بێ ئاگایی نەزانم لە مەیدانی خەیاڵــدا کــێ هــات وکــام رۆشت.

آن چنان: بە شێوەیەك، بەوشــێوەیەی نــدانم: نــەزانم بیخـودی: بــێ ئاگــایی کدام: کام

مەستی یان حاڵەتی سەکر و مەستی حاڵەتێکە کە رێبواری رێگــەی تەریقــەت لــە تــەواوی مەخلوقات بێ ئاگا دەبێت و مەستی حاڵاتی خۆی دەبێت رەنگــە لــە تەجلیــدا مەســت بێــت، خواجە لەم بەیتەدا داوا دەکات بگاتە ئەوپەڕی مەستی بە شێوەیەك لە مەیدانی خەیاڵیشدا لــە بیری نەمێنێ کێ هات و کێ رۆشت.

**٥- بر بوی آنکه جرعەی جامت به ما رسد**

**در مصطبه دعای تو هر صبح و شام است**

بەر بوی ئانکە جورئەیی جامەت بە ما رەسەد،دەر میستەبە دوئایی تو هەر سـوبە و شــام رەفت.

بە ئومێدی ئەوەی کە لە پێکی تۆ قومێکمان پــێ بگــات، لەســەر ســەکۆی مەیخانــە هــەر بەیانی و ئێوارەیەك دوعات بۆ دەکەین.

بوی: ئومێد، هیوا    بربوی: بەئومێدی، بەهیوای    جرعە: قوم    رسد: بگات

مصطبە: سەکۆ، جاران لە دوکان یان مەیخانە و چاخانەکاندا لە تەنیشت دیواری پێشەوەدا سەکۆیەك دەکرا بۆ دانیشتن (لە بری کورسی ئێستا)    شام: ئێوارە

فەزای غەزەلەکە هێندە عاشقانە و عارفانەیە کە ئیدی زۆرڕۆشتن لەسەر واتای بەیتەکان بە زیادەڕۆیی دەزانم: خواجە بە یاری حەق، یاخود ساقی کە جاروبار دەبێتە خودی دەڵێت: بە ئومێدی ئەوەی پریشکێکی عەشقی تۆمان پێ بگات، لە نێو مەنزڵگەی عەشقی خۆماندا هەموو بەیانی و ئێوارەیەك دوعات بۆ دەکەین.

**٦- دل را که مرده بود حیاتی به جان رسید**

**تا بویی از نسیم میش در مشام رفت**

دل را کە مورده بود هەیاتی بە جان رەسید،تا بویی ئەز نەسیمی مەیەش دەر مەشام رەفت.

کاتێ بۆنێك لە شەماڵی مەیی ئەو بە مەشامی گەیشت دڵ ـ کە مرد بووـ گیانی بە بەردا کرایەوە.

مردەبود: مردبوو    میش: مەیی ئەو    مشام: مەڵبەندی بۆنکردن لە مێشکدا، لە کوردیدا زاراوەیەکی تایبەتیمان نیە

دڵ مرد بوو، بەڵام بە بۆنێکی عەشقی ئەو زیندوبوویەوە و دووبارە گیانی بە بەرداکرایەوە.دڵمردن یاخود دڵڕەقبون لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، خواجە مەبەستی لەمەیە کە دڵم رەق بوو یان دور لە یادی تۆ و خۆشەویستی تۆ مردبوو، بەڵام کاتێ بۆنی عەشقی تۆی کرد و بە (عەشق/مەی)ی ئەو (یاری حەق) ئاشنابوو سەرلەنوێ زیندوبوویەوە.

**٧- زاهد غرور داشت سلامت نبرد راه**

**رند از ره نیاز به دارالسلام رفت**

زاهید غرور داشت سەلامەت نەبورد راه،ریند ئەز رەهی نیاز بە داروسسەلام رەفت.

زاهید مەغرور بوو بە سەلامەتی ڕێگەی دەرنەکرد، بەڵام رەند لە ڕێگەی خۆبەکەم زانی و داواوە چووە بەهەشت.

غرور داشت: غروری هەبوو    رە نیاز: لەرێی خۆبەکەم زانی وداوا و نزا

دارالسلام: یەکێکە لە ناوەکانی بەهەشت

(زاهد) لای خواجە هەر لەبەر ئەم غرور و خۆ بە زلزانینەیەتی کە جێگەی نەفرینە و هەمیشە کەسایەتیەکی نێگەتیڤییە، بەڵام (رەند) ئەم سیفەتە جوانەی (خۆبەکەم زانی و



هەستکردن بەوەی کە هەمیشە پێویستی بە خودایە) کەسایەتییەکی پۆزەتیڤییە و لای خواجە پەسەندکراوە ـ پێشتر سیفاتەکانی رەندمان خستەروو ـ. (د.خرمشاهی) لە پێشەکی چاپی سێیەمی (حافظ نامە)دا سەبارەت بەلا غرور و خۆ بە پاکزانینی زاهید و خۆ بە کەمزانی گوناحکاران و رەندان بیروبۆچونی جوانی خستۆتەڕو، لەو پێشەکییەدا جەنابی دکتۆر سەبارەت بە بانگەشەی بێ گوناحی ئەم دێڕە شیعرە عەرەبییەی هێناوە:

اذا قلت ما اذنبت قالت مجیبة    وجودك ذنب لا یقاس به ذنب

د. خرمشاهی سەبارەت بە سەرچاوەی ئەم شیعرە دەڵێ: کۆنترین سەرچاوەیەك کە ئەم بەیتەی تێدابێ (کشف المحجوب ) ی (هجویری)یە، بەڵام ناوی شاعیرەکە نەهێنراوە،جەنابی دکتۆر ئەم بەیتەی بەم شێوەیە کردوە بە فارسی:

چو گفتمش که گناهی ندارم آن مه گفت    ز خویش دم زدنت بد ترین گناهانست    {ج١،لاپەڕە: چوار پێشەکی چاپی سێیەم}

واتە کاتێ پێم گوت: گوناهێکم نییە ئەم ماهە گوتی بە خۆتانازانیت خراپترینی گوناهانە.

بەهەرحاڵ خواجە پێی وایە بە سەلامەتی ڕێگە دەرکردن و رزگاربوون بە بە خۆدانازین نابێت، بەڵکو بە خۆبەکەم زانین و داواکردنە لە خودا، کاتێکیش (زاهید) سیفاتی یەکەم و (رەند) سیفاتی دووەمی تێدایە، یەکەم بەدبەخت و دووەم خۆشبەختی دوارۆژ دەبێت.

**٨- نقد دلی که بود مرا صرف باده شد**

**قلب سیاه بود از آن در حرام رفت**

نەقدی دلی کە بود مەرا سەرفی بادە شود،قەلبی سیاه بود ئەز ئان دەر هەرام رەفت.

نەقدی دڵێکم هەبوو دام بە بادە، پارەیەکی تەزویربوو، بۆیە لەحەرامدا سەرف بوو.

نقد: نەقد، پارە    صرف بادە شد: درابە شەراب    قلب سیاە: تەزویر، سکەی خراپی رەش هەڵگەڕاو    از آن: بۆیە، لەبەرئەوە،

خواجە دەڵێ گەر دڵم وەك پارەیەك درا بە شەراب لەبەر ئەوە بوو تەزویر بوو، بۆیە لە کاری حەرامدا رۆشت.

**٩- دیگر مکن نصیحت حافظ که ره نیافت**

**گم گشتەیی کە بادەی نابش بە کام رفت**

دیگەر مەکون نەسیهەتی هافز کە رەه نەیافت، گوم گەشتەیی کە بادەیی نابەش بە کام رەفت.

ئیتر ئامۆژگاری حافز مەکە، چونکە ڕێگەی نەدۆزییەوە ئەو ونبوەی کە شەرابی نایابی نۆشی.

دیگر: ئیتر، لەمەو پاش      ره نیافت: ڕێگەی نەدۆزیەوە، پەیدای نەکرد      گم گشته: ونبوو      به کام رفت: نۆشی، چووە گەروی

خواجە رو لە واعیز و ئامۆژگاریکەرەکان دەکات کە ئیدی ئامۆژگاریم مەکەن بۆ وازهێنان لە عەشق و عیرفان، چونکە هەرکەسێ قومێ لە شەرابی نایابی عەشقی ئەو بگاتە گەروی ئیدی ڕێگەی ئەم شتە مادیانەی جیهانی دیاری لێ ون دەبێت و ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سادەیی و واز لە عەشق و عاشقی بهێنێت.



## غەزەلی هەشتا و هەشتەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلات)**

**١-صبحدم مرغ چمن با گل نوخاسته گفت**

**ناز کم کن که درین باغ بسی چون تو شکفت**

سوبهدەم مورغی چەمەن با گولی نۆوخاستە گوفت،ناز کەم کون کە دەرین باغ بەسی چون تو شکوفت.

بەرەبەیان بولبول بە گوڵی تازە پشکوتەی گوت:کەم ناز بکە، چونکە لەم باغەدا زۆری وەك تۆ پشکوت.

صبحدم: بەرەبەیان      مرغ چمن: بولبول      نوخاستە: تازە پشکوتو، تازە پێگەیشتو      بسی: زۆر      شکفت: پشکوت

یەکێك لە سیفاتەکانی بولبول عاشق و شەیداییەتی بۆ گوڵ، کەچی لەگەڵ ئەم سیفەتەشدا بەرەبەیان کاتێ گوڵی تازە پشکوتبوو، خەریکی نازکردن و نازفرۆشتن بوو بولبول پێی گوت کەم ناز بکە: لەم باغەدا زۆر جوانی وەك تۆ پشکوتووە.

لە ڕاستیدا هیچ پەندێك لەم گوتەیەی بولبول جوانتر لە بەیتی دوەم وەرناگیرێت، کە خواجە دەڵێ:

**٢- گل بخندید که از راست نرنجیم ولی**

**هیچ عاشق سخن سخت به معشوق نگفت**

گول بخەندید کە ئەز ڕاست نەرەنجیم ڤەلی،هیچ ئاشق سوخەنی سەخت بە مەئشوق نەگوفت.

گوڵ پێکەنی: ئێمە لە قسەی ڕاست دڵگران نابین، بەڵام هیچ عاشقێ قسەی ڕەقی بە مەعشوقەکەی نەگوتووە.

بخنید: پێکەنی      نرنجیم: نارەجێین، دڵگران نابین      سخن سخت: قسەی ڕەق

بە ڕاستی جوانترین پەندە کە خواجە دەیڵێ،چۆن ئەبێ عاشق قسەی ڕەق بە مەعشوق بڵێ، دەبێ چۆن بولبول وێرابێتی بەم جۆرە بیر لە جوانی و نازی مەعشوق بکاتەوە، هەربۆیە گوڵ زۆری پێ سەیرە و دەڵێ: بەڵێ ڕاستە و من لە ڕاستی نارەنجێم بەڵام بزانە کە ـ ئەگەر واشبێ ـ ئەمە قسەیەکی ڕەقە و هیچ عاشقێ قسەی ڕەقی بە مەعشوقی نەگوتووە.

**٣- گر طمع داری از آن جام مُرصّع می لعل**

**ای بسا دُر که به نوک مژەات باید سفت**

گەر تەمەئ داری ئەز ئان جامی مورەسسەئ مەیی لەئل،ئەی بەسا دورِ کە بە نوکی موژەئەت بایەد سوفت.

ئەگەر بە تەمای شەرابی سوری ئەو پێکە بە گەوهەررِازاوەی، دەبێ دورِ و مرواری زۆر بە نوکی برژانگت بدۆزیتەوە.

طمع داری: بە تەمای جام مرصع: پێکێکە یاخود جامێکە کە بە گەوهەر و مرواری دەرِازێنرێتەوە، زیاتر ئەو جام و پێکانەی بە ئاڵتون و زیو یان مس دروستدەکرێن بە نقێم و دانەی مرواری دەرِازێنرێنەوە و پێیان دەگوترێ جام مرصع در: دورِ مژە: برژانگ
سفت: پەیداکردن، دۆزینەوە در سفتن: مرواری ودورِ دۆزینەوە، مرواری و دورِ پەیداکردن

د. خرمشاهی دەڵێ (دورِ پەیداکردن بە برژانگ) نیشانەی رەنج و عەزاب و نارِەحەتی بینین و کێشانی زۆرە، لە کولتوری ئێمەدا خوێ بە برژانگ کۆکردنەوە نیشانەی کاری نارِەحەت و عەزاب هێنەرە. خواجە دەڵێ: گەر دەتەوێ شەرابی لەعل، شەرابی سوری ئاڵ لە پێکی بە گەوهەر و نقێم رازێنراوەدا بنۆشی، پێویستە عەزاب و رەنجی زۆر بکێشی و هەوڵی لە رادەبەدەر بدەی.

واتە: گەر دەتەوێ عەشق و خۆشەویستی یار بە دەست بهێنی پێویستە هەوڵ بدەیت و رەنج و مەینەتی رێگەی عەشق قەبوڵ بکەیت.

**٤- تا ابد بوی محبت به مشامش نرسد**

**هرکه خاك در میخانه به رخساره نرفت**

تا ئەبەد بوی مەهیبەت بە مەشامەش نەرەسەد،هەرکە خاکی دەری مەیخانە بە روخسارە نەروفت.

هەرگیز بۆنی خۆشەویستی بە مەشامی ناگات، هەرکەسێ خاکی بەردەرگای مەیخانە بە روخساری نەماڵێت.

تا ابد: هەرگیز، تا ئەبەد نرسد: ناگات هرکە: هەرکەسێ، هەرکێ
بە رخسارە نرفت: بە روخسار نەماڵێ

میخانە جیهانی لاهوت و نادیار و ئیلاهیات و روحە، هەرکەس خاکی بەردەرگای مەیخانە بە روخسار نەماڵێ، هەرگیز بۆنی خۆشەویستی ناکات.

بەیتەکە بە تەواوی بەیتێکی عیرفانییە (محبت) خۆشەویستی خودایە، خواجە پێی وایە ئەم خۆشەویستییە ـ کە (ابو عبداللە قرشی) لە بارەیەوە گوتویەتی:" المحبة ان تهب كلك لمن احببت



ولا يبقى لك منك شيئاً". واتە: خۆشەویتی ئەوەیە کە هەموت بە مەعشوق ببەخشی و هیچ لە خۆت بۆ خۆت نەهێڵیتەوە ـ هەرگیز نایەتە دی تا ئەوکاتەی کە نەچینە نێو مەرزەکانی روح و ئیلاهیاتەوە، تا نەبینە بەندەیەکی گوێرِایەڵ و لەبەردەم ئەو جیهانەدا سەرنەخەینە سەرزەوی.

خۆشەویستی خودا بەم پێناسەیەی (ابو عبداللە) هەمان ئەو خۆشەویستییەی حەزرەت ئەبوبەکر بوو کە تەواوی ماڵەکەی بە خوا بەخشی و هیچی نەهێشتەوە، خواجە لێرەدا نایەوێ پێناسەی خۆشەویستی و موحیبەت بکات، بەڵکو دەیەوێ مەرجی خۆشەویستی بخاتەڕوو کە خۆ بەکەم زانینە لە بەردەم مەیخانە و جێگە و مەنزڵی عەشقدا کە جیهانی روح و لاهوتە.

**٥- در گلستان اِرَم دوش چو از لطف هوا**

**زلف سنبل به نسیم سحری می آشفت**

دەر گولستانی ئیرەم دوش چو لوتفی هەڤا،زولفی سونبول بە نەسیمی سەهەری مێ ئاشوفت.

شەوی رابردوو لە باخی ئیرەمدا بە نەرمی هەوا، پرچی سونبول بە شەماڵی بەیانیان پەرێشان دەبوو.

گلستان: باغ گلستان ارم: باخی ئیرەم،بە رای (سودی و د. غەنی) گولستانی ئیرەم باخێکە لە شیراز.جەنابی غەنی دەڵێ ئێستاش لە شیراز ئەوباغە بەو ناوەوە ماوە{ج١، سودی، ل٥١٠} رای دکتۆر غەنی لە{ ج١ هەروی، ل٣٩٤ و خرمشاهی، ج١، ل٣٩٩} وەرگیراوە

بەیتەکە وەسفێکی مادی باخێکی خۆشی شیرازە کە خواجە زۆر هۆگری شیراز و سروشتەکەی بووە، دەڵێ: شەوی رابردوو لە باغی ئیرەمدا هەوا بە نەرمی و شەماڵی بەربەیان پرچی گوڵی سونبولی پەرێشان دەکرد.

**٦- گفتم ای مسند جم، جام جهان بینت کو**

**گفت افسوس که آن دولت بیدار بخفت**

گوفتەم ئەی مەسنەدی جەم جامی جەهان بینەت کو،گوفت ئەفسوس کە ئان دۆڵەتی بیدار بخوفت.

وتم ئەی تەختی جەم، جامی جیهان بینت کوا، وتی ئەفسوس ئەو بەختە بێدارە خەوت.

مسند: تەخت، سودی پێی وایە مەبەست لە (مسند جم) هەمان باغی ئیرەمی بەیتی پێشوە جام جهان بین: ئەو پێکەی کە نهێنی جیهانی تێدا دەردەکەوێ، جامی جەمشید
کوا: کوا دولت: بەخت دولت بیدار: بەختی بێدار بخفت: خەوت

پەیوەندی لە نێوان ئەم بەیتە و بەیتی پێشودا هەیە، شەوی رابردو خواجە لە باخی ئیرەمدا جوانی و سەفای ژیانی بینیوە و تەخت و سەڵتەنەتی پادشاکانی پێشوی بیرکەوتوەتەوە و گوتویەتی: گوتم ئەی تەختی جەمشید (ئیدی مەبەست لە هەرچی بێت، من بە پێویستی نازانم قسەی لەبارەوە بکەم، چونکە هیچ یەك لە رایەکان نەیانگەیاندمە قەناعەتێکی تەواو) ئەی پادشایەتی و سەڵتەنەتی پێشو، سەڵتەنەت و هێز و شکۆمەندیەکانت کوا و بۆکوێ چوون، گوتی بەداخەوە و ئەفسوس کە ئەو بەختە بێدارەی جاران خەوت و هەموویم لەدەست چوو. بە هێنانی جەمشید و جامی جیهان بین دەکرێ باس لە شکۆمەندی ئێرانی بکات کە لە سەردەمی خواجەدا بە دەستی بێگانە و بە تایبەتی تورکان لەناوچووە. بڵێ ئەی باغ کە جاران تەختی پادشایانی ئێرانی بوویت شان و شکۆی جارانت کوا، لە وەڵامدا باغ یان (مسند جم) دەڵێ: بەداخەوە هەمیشە بەخت یاوەرمان نابێ و بەختی بێداری ئێمەش خەوت.

**٧- سخن عشق نه آن است که آید به زبان**

**ساقیا می ده و کوتاه کن این گفت و شنفت**

سوخەنی ئیشق نە ئانەست کە ئایەد بە زەبان،ساقییا مەی دەه و کوتاه کون ئین گوفت و شنوفت.

قسەی عەشق ئەوە نییە کە بە زمان بگوترێ، ساقی مەیم بدەرێ و ئەم قسەوباسە واز لێ بێنە.

کە آید بە زبان: بە زمان بگوترێ، بێتە سەر زمان     کوتاه کن: کورت کەرەوە وکۆتایی پێ بهێنە، وازی لێ بێنە     گفت و شنفت: قسەوباس

خواجە چەندین جار باس لە نەتوانینی قسە لەسەر عەشقکردن دەکات. سودی گوتەنی عەشق لای خواجە مەسەلەیەکی حاڵییە نەوەك قاڵ، هەربۆیە لێرەشدا بە ساقی دەڵێ واز لەم قسەوباسەی عەشق بهێنە و مەیمان بدەرێ، چونکە عەشق ناتوانرێ بە زمان گوزارشتی لێ بکرێت.

د.هروی ئەم عەشقە بە (عەشقی کۆنی تێپەڕیو، واتە ئەو خۆشەویستییەی کە بۆ دەوڵەت و دەسەڵاتی پێشوو هەیبوە، پێی وایە کە لەم سەردەمەدا ناتوانرێ قسە لە دەسەڵاتی حکومەتی پێشو بکرێت ـ بێگومان لە ترسدا){هروی، ج١، ل٣٩٥} بەڵام لە راستیدا بەیتەکە تەئویلێکی لەم جۆرە هەڵناگرێت و پەیوەندی بە بەیتی پێشوەوە نییە.

**٨- اشک حافظ خرد و صبر به دریا انداخت**

**چه کند سوز غم عشق نیارست نهفت**

ئەشکی هافز خیرەد و سەبر بە دەریا ئەنداخت،چە کونەد سوزی غەمی ئیشق نەیارەست نەهوفت.



فرمێسکی حافز هۆش و ئارامیی خستە دەریا، چی بکات نەیتوانی سوتانی غەمی عەشق بشارێتەوە.

خرد: هۆش،عەقڵ     بە دریا انداخت: خستیە دەریاوە واتە (بەبادا) لەناوبرد

نیارست: نەیتوانی     نهفت: بشارێتەوە

خواجە دەڵێ هەرچەندە ناتوانین بە زمان لە عەشق بدوێین، بەڵام فرمێسك گوزارشت لە ئاگری غەمی عەشق دەکات و لە بری زمان دەیخاتەڕوو، نەك هەرئەوە عەقڵ و سەبریش بەبادەدا، هەربۆیە دەڵێ: فرمێسکی من هۆش و ئارامی دام بە ئاودا و عەقڵ و سەبری لێ هەڵگرتم، چی بکەم ناتوانم ئاگری غەمی عەشق بشارمەوە.